دەروازەیەک بۆ مانوێل کاستێلس



ئازاد حەمە

## گەشەی کۆمەڵگەی نێتتۆرک

زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
کتێبی سەردەم ژمارە ( ٢٥٥ )

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

# چـــاخی زانیـــاری

بابەت: لێکۆڵینەوە
نوسینی: ئازاد حەمە
بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق
تیراژ: ٨٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن: ٣١٩ ی ٢٠٠٣



www.sardam.info

**پێشکەش:**

ئەم پلانێت (کەوکەب) ەی ئەمڕۆ لەسەری دەژین لە هەموو لایەکەوە مرۆڤێ بۆ ژیان ئامادە دەکا دەکرێ ناونرێ "مرۆڤی تازە".
"مرۆڤی تازە"، کە بەرهەمی هەموو مرۆڤەکانی پێش خۆیەتی، نایەوێ لەوەبگا تەنیا و پەرت و بێ ئیمان و بێ پرنسیپە. هەروەها تازەی ئەم مرۆڤە لەوەدایە کە ناخوازێ زیاد لە پێویست ویژدانی خۆی ببینێ و لە پچرپچرپەکانی بگا.
"مرۆڤی تازە"دەروەسی هیچ نایێ و ناشیەوێ خۆی بەهیچ ئەندێشەیەکەوە ببەستێتەوە، ئەندێشەیەك کە ئەوەی یادخاتەوە ماندوو و بێئاینده و نادلنیایە. ئەم مرۆڤە ئەو مرۆڤەیە کە دەبایە هەر ببایە و بەرهەمی ئەو هەموو ئاوەلناوانەشە کە بۆخۆی دروستیکردووە.

ئەم کتێبە پێشکەشە بە هەموو ئەوانەی نایانەوێ ببن بە مرۆڤێ تازە !

# نــاواخــن

## سەرەتا:

### ڕەوتی شیکردنەوە و شێوازی خستنەڕوو لەم کتێبە

ئامانج لە نووسینی ئەم کتێبە لەلایەك خستنەڕووی ڕوانینی کۆمەڵناسی ئەمەریکی بەڕەچەڵەك ئیسپانی "مانوێل کاستێلس "Manuel Castells ە (مواليدی 1942) لە بارەی کەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك، کە ئەمەش (واتە کەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك) بەرگی یەکەمی ئەو کتێبە سێ بەرگیەیە کە کاستێلس لەژێر ناوی "چاخی زانیاری" بەچاپیگەیاندووە. هەروەها لەلایەکی تر هەولدانە بۆ گفتوگۆکردن لەتەك مانوێل کاستێلس، لەسەر ئەو لایەنانەی کاستێلس قسەی لەسەردەکا و هەروەها ئەوی لەوبارەیەوە لە نێوەندی ئەکادیمی و ڕوناکبیری ڕۆژئاوا هەنووکەیە. ئەوەی ڕاستیبێ "چاخی زانیاری" بەخۆی ناونیشانی کارە ناودارەکەی کاستێلسە کە بە سێ بەرگ لە سێ ماوەی جیا(1996-1998) لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بەچاپی گەیاندوون. ناوبراو کە لە بواری کۆمەلناسی و نەخشە سازی کۆمەلایەتی پرۆفیسۆرە و بەرپرسیشە لە Center for Western European Studies (نێوەند بۆ دیراساتی ئەوروپای ڕۆژئاوا) لە زانکۆی کالیفۆرنیا، بیرکلی، پێش ئەم کارە سێ بەرگەی کاری تری نووسیوە کە ئەوەش بە جوگرافیای شار و تەکنیك و نەشونمای جیهانی و ناوچەیی تایبەت بووە: لەوانە (سەرلەنوێ بوونیادنانی گلوبال و پەرەپێدانی ناوچەیی لەتەك جیفری هێندێرسۆنJeffrey Henderson، 1987)، (شاری زانیاری، 1989) (جەمسەرەکانی تەکنیك لەتەك پیتەر هالPeter Hall، 1994). . . و هتد، و پاش ئەم کارەش (واتە چاخی زانیاری) کتێبێ قەبارە گەورەی لەسەر ئینتەرنێت نووسیووە (مەجەڕەی ئینتەرنێت، 2001). بەلام نێوبانگە نێودەولەتیەکەی بۆ کتێبی چاخی زانیاری دەگەڕێتەوە کە کارێ سێ بەرگیە و سێ ناونیشانی جیا لەخۆ دەگرێ (بەرگی یەکەم: کەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك، بەرگی دووەم: دەسەلاتی ناسنامە و بەرگی سێهەم: کۆتای هەزارینە). ئەم کارە سێ کوچکەییە یان هەرسێ بەرگەکە لەژێر سێ ناونیشانی جیا چاخی زانیاری ڕووندەکەتەوە و هەریەکەش لەو بەرگانە سەربەخۆی خۆیان هەیە و

دەکرێ بەبێ یەکتر بخوێنرێنەوە و ئەو تێگەیشتنانە بەدەستەوە بدەن کە بە چاخی زانیاریەوە تایبەتن. بەلام بە خوێندنەوەی بەرگی یەکەم، کە لەبارەی گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرکەوەیە، خوێنەر لەوەدەگا کە کاستێلس وەك پرۆفیسۆرێ لە کۆمەلناسی و خاوەنی ئەزموونێ بەربلاو لە زانکۆ و ئینستیتووتەکانی توێژینەوەی کۆمەلناسی لە ئەوروپا و دواتر لە ئەمەریکا چۆن دەیەوێ لە ئێستامان بدوێ و هەروەها بەچشێوەێ تەماشای پاش-ئێستامانیش دەکا. هەر لەو دەروازە و پێشەکیەی بۆ بەشی یەکەمی کارەکەی نووسیوە دەکرێ مرۆڤ هەندێ لێخوردبوونەوە و ڕوانین لای خۆی بەرجەستە بکا کە ئەم ڕوناکبیرە نێودەولەتیە دەیەوێ چی لەسەر ئایندە و دواترمان بلێ. بۆیە خوێندنەوەی بەرگی یەکەمی ئەم بەرهەمە کۆمەلناسیە گلوبالە توانایێ ئەوتۆمان بۆ تێگەیشتن و سێرکردن لادروستدەکا کە دەرك بەوەبکەین کاستێلس لە دوو بەرگەکەی تر، کە خۆیان لە 1000 لاپەڕەیەك دەدەن، چۆن پەرە بە توێژینەوەکەی دەدا و هەروەها بەچ جۆرێ ئەم کۆمەلناسە زانکۆییە فاکتە و ئارگومێنتەکانی بەکاردەبا تا بەو ئاکام و دەستکەوتانە بگا کە مەبەستیەتی بە خوێنەر بگا.

ئێمە هەر سێ بەرگی کارەکەی کاستێلسمان دوابەدوایەك لەماوەی (2000-1999) خوێندەوە، کە ئەوەش ئەو سێ ماوە جیایەن کە کارەکەی کاستێلسی تیا وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی سویدی. تێکڕای ئەو ڕاهێنان و خستنە ڕوانەی کە بۆ هەرسێ بەرگی کارەکەی کاستێلس لە ولاتی سوید لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا کراون توانیوومانە بەردەستمان کەوێ و بیانخوێنینەوە. بۆ بەدەستهێنانی ئەوی لە ولاتی سوید لەبارەی ئەم کارە سێ بەرگیەی کاستێلسەوە نووسراوە لەلایەك پەنامان بۆ "مێدیا ئارشیڤ" بردووە، کە تێکڕای نووسراوی ڕۆژنامەکانی تیا دەپارێزرێ، و، لەلایێ تر گەڕاوینەتەوە بۆ ئینتەرنێت تا ناوی ئەو گۆڤارانەمان دەستکەوێ کە لەبارەی ئەو کارەوە نووسراو و ڕاهێنان و خستنەڕوویان بلاوکردۆتەوە. ئەوەی لێرەدا جێی سەرنجیشە بووترێ ئەوەیە کە کاتێ کارەکەی کاستێلس یەك لەدوای یەك لە ئەمەریکا لە سێ قۆناغی جیا (ماوەی سالانی 1998-1996) بەچاپدەگەێنرێ نووسخەی دەگاتە سوید و هەر لەو ماوەیەشدا کە جارێ وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی سویدی چەندین خستەڕوو و نووسراو (ئەلبەتە لەشێوەی سەروتاری کورت کورت) لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەبارەیەوە بلاودەکرێتەوە. ئەو کات و دواتریش زۆربەی ئەو نووسراو و ڕاهێنانانەی لەبارەی بەرهەمەکەی

کاستێلسەوە نووسران بەری تێڕامانی مامۆستایانی زانکۆ و توێژەرەوەکان لە ئینستیتووتەکانی سوید و هەندێ ڕۆژنامەوان لە بەشی کولتووری ڕۆژنامە و گۆڤارە جیاجیاکان بوو، کە هەمووش ئاماژەیان بۆ ئەوەدەکرد کە ئەم کارە زەبەلاحە پێویستی بەخوێندنەوە و ئاوڕدانەوەی گەورە هەیە. بەپێی ئەو لێدوانانەش بێ، کە پاش بلاوبوونەوەی کارەکە بە جیهانا لەتەك کاستێلسدا کراوە، هەروەها بەپێی ئەو پێشەکییەش بێ کە کاستێلس بۆ چاپی دووەمی بەرگی یەکەم نووسیوویەتی، کە سوپاسێ زۆری ئەوانە دەکا کە بەنامە سەرنج و تێبینیان بۆ ناردووە کە لەوێڕا ناوی کەسانێ هاتووە کە خاوەنی باگرووندێ ئەکادیمی و ڕوناکبیری گەورەن و شوهرەتێ زانکۆیی و ڕۆشنفکریان هەیە ئەومان بۆدەردەکەوێ کە ئەم کارە کۆمەلناسیە چەند مولتی- ناوەرۆك بووە چەند بە جیهانا بلاوبۆتەوە. لەولاتی سویدیش ئەم بەرهەمە سێ کوچکەیەی کاستێلس بوو بە بابەتی گفتوگۆ و هەر لە بایەخدەران بە ژینگە و منالپارێزی و ئاشتی و، دۆست و یان نەیارانی دیاردەی جیهانگیری و زانستگەری و زانیاریگەری بایەخیان داێ تادەگاتە فێمینیستەکان، بە جیاوازی تەماشاکردنیان، ئەنارکیست و پۆست مۆدێرنەکان و داکۆکیکەران لە مۆدێرنە و عەقلگەرایی و هیچگەرایی و پسپۆر لە بواری فرە کولتووری و جیهانگیری و تەکنەلۆژیای زانیاری و زانستی ئابووری و یاسا و ماف و تیۆریزەکەرانی سیاسی و تەنانەت ئەوانەش کە بایەخدەرن بە فەلسەفەی سیاسی و یان خاوەن بۆچوونی مارکسیستی و یان ئیتنی و یان ئاینی و هەروەها ناسیۆنالین.

لەم سەرەتایەشدا مەرجە دانبەوەدا بنێین کە ئاراستە کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی سالانی 1990 کان نەك هەر کۆمەلناسێ وەك کاستێلسی والێکردووە تیۆریزە بەسەر گرفت و دیاردەکانەوە بکا بەلکو گەلێ کۆمەلناس و ئابووریناس و بیریاری تریشی وورووژاندووە و وایلێکردوون بەشداری گەورە لە بەردەستخستنی چارەسەر و ڕێگاچارەی جۆراوجۆر دا بکەن. ئەو بەشداریکردنەش هەموو وەك یەك نین و بەپێی ئەو تیۆری و مێتۆدانەی کاری تیادەکەن جوداوازن. قسەکردن بۆنموونە لەسەر ئێستا یان ئەمڕۆ لە کۆمەلناس و بیریارێکەوە بۆ ئەوی تر دەگۆڕدرێتەوە و ئەو ئاکام و دەرئەنجامانەی هەریەك لەو کۆمەلناس و بیریارانە پێیدەگەن جۆراوجۆرن. هەر لەوکاتەی کە کاستێلس کارەکەی لە ئەمەریکا بەچاپدەگەێنێ (واتە ماوەی سالانی نێوان 1996-1998) نووسینێ زۆر لەلایەن کۆمەلناس و ڕوناکبیرانی بوارەکانی تری زانستەمرۆییەکان لە ئەمەریکا و ڕۆژئاوا (داڤید هارڤیDavid Harvey،

جۆرج سۆرۆسGeorge Soros، پیتەر هال، ئولریش بێك Ulrich Beck، ئەنتۆنی گیدنس Anthony Giddens، زیگمۆنت باومان Bauman Zygmunt، داڤید لیۆنDavid Lyon، سکۆت لاشScott Lash، ستیوارت هال Stuart Hall و پێشتریش ئالان تۆرێن و دانیال بێلDaniel Bell و.. هتد) لەسەر هەمان باس و خواس (سەدەی نوێ، کاپیتالیزمی گلوبال، چاخی گلوبال، کۆمەڵگەی پاش-پیشەسازی، شارستانی ئەلەکترۆنی یاخود دیگیتال، کۆمەڵگەی گلوبال، سەدەی پۆست مۆدێرن) بەچاپ دەگەێنرێ. بەواتای تر، بیری کۆمەڵناسی لەم دە یان پانزە ساڵەی دوایی کارێ زۆری لەسەر کۆمەڵگە و شارستانی نوێمان کردووە و زۆربەی ئەو کارکردنەش لە نێوەندەکانی زانکۆ و ئینستیتووتەکانی ولاتانی ڕۆژئاوا و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا کراوە و شێوازی کارکردنەکانیش ئاڕاستەێ ئەوتۆی وەرگرتووە کە توانیوویانە ببن بە بناغە بۆ توێژینەوە و شیکردنەوە نەك هەر لەولاتانی خۆیان بەڵکو لە گشت جیهان. لەلای تریش بەشێ زۆر لەو نووسەر و ڕووناکبیرانە هەولیانداوە بۆچوونەکانیان گشتی بکەن و باسەکانیان بەجۆرێ داڕێژن کە نەك هەر ولاتانی ڕۆژئاوا بەڵکو تێکڕای جیهان بکرێتەوە. ئەمەش گرفتێ زۆری دروستکردووە و زۆربەی ئەو کێشانەش پێوەندی بەوەوە هەیە کە جارێ بەشە گەورەکەی جیهان دوورن لەوەی لەڕیزی چاخی زانیاری و سەدەی نوێ و کۆمەڵگەی گلوبال و شارستانی دیگیتال پۆلکرێن. بۆیە لە ولاتانی دەرەوەی ڕۆژئاوا نێوەندە ئەکادیمی و ئەمجار نێوەندە ڕۆشنبیری و تەنانەت مێدیاکانیش خۆیان لەنێوان هەڵگرتنەوەی ئەم کارانە و یان پشتگوێخستنیان دەبیننەوە. هەردووش کێشە و کاردانەوەی خۆی هەیە و تەگوچەڵەمەی سەیر سەیر لەبەردەم کاری توێژینەوە و پشکنین دادەنێ کە بەدلنیایەوە دواتر بەچەند خالێ دێینەوە سەری.

هەر لەم سەرەتایەدا ئاساییە ئاماژە بەوەبکەین کە ئەم بەرهەمە ناودارەی کاستێلس چ لە زێدی خۆی (واتە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) و چ لەدەرەوەی ئەم زێدەش(واتە لە ولاتانی ئەورووپا) زۆر بەخێرای شوێنی لە نێوەندی ئەکادیمی و ڕوناکبیری بۆخۆی دۆزیەوە و نەك هەر هەزارەها سەروتار و ڕاهێنانی لەبارەوە نووسرا (تەنێ لە ولاتی سوید ئەوی لەبارەی ئەو سێ بەرگەوە نووسراوە خۆی لە 300 سەروتار دەدا) بەڵکو هەزارەها نامەی ئەلەکترۆنی و نامەی ئاساییش ئاڕاستەی کاستێلس کرا، کە زۆربەیان سەرنج و بۆچوون و ڕەخنە و تێبینی جۆراوجۆر بوونە لەسەر ئەو

توێژینەوەیەی ناوبراو پتر لە 30 ساڵ کاری بۆکردووە. ئەمە و جگەلەو کەسانەی چوونەتە دیتنی تا لەنزدیکەوە گفتووگۆی لەتەکا بکەن یان لێدوانی لەتەکدا سازبکەن و، هەروەها ئەو دەعوەتانەی لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی دونیاوە ولەلایەن زانکۆ و ئینستیتووتەکانی توێژینەوەی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەکنیکی و کولتووریەوە بۆی سازکراوە. ئەوندەی ئاگام لێبێ لە جیهانی عەرەبی جارێ نەناسراوە و لەوڵاتانێکی تری ئاسیاش باسناکرێ.

کاتێ کە لەسەرەوەدا ئاماژە بەوەدەکەین کە ئەم بەرهەمە لە زێدی خۆی و لە دەرەوەی ئەم زێدە( لێرەدا مەبەستمان لەم دەربڕینە ئەوروپایە) بەپەلە شوێنی بۆخۆی لە نێوەندی ئەکادیمی و ڕوناکبیری پەیداکرد بەدلنیایەوە دەمانەوێ باس لەوەبکەین کە ناوەڕۆك و ناواخنی باس و توێژینەوەکانی کاستێلس زۆر لە واقیعی ژیانی سیاسی، ئابووری، کولتووری و کۆمەڵایەتی زێدی خۆی و ئەوروپاوە نزدیکە و بۆ خوێنەری کورد و بۆ کۆمەڵگەی ئێمە بەوجۆرە نییە. ئەمەش نەك هەر لەبەرئەوەی کە ئەو دیاردە و ڕووداوانەی کاستێلس باسیدەکا ڕۆڵەی زێدی نووسەرن بەڵکو لەبەر ئەوەش کە گەلێ هۆی تر لەئارادان، کە بەچەند خاڵێ لای خوارەوە، بۆ زێتر ڕوونکردنەوەی ئاقاری توێژینەوەکەی کاستێلس و ئەو واقیعانەی کەمتر و بگرە جارجار زۆر کەمتر لە بابەتەکانی کاستێلسەوە نزدیکن، دەستنیشاندەکەین. پێش ئەوەی بێینەسەر دەستنیشان کردنی خاڵەکان دەمانەوێ باس لەوە بکەین کە زۆربەی ئەم سەرنجانەی لایخوارەوە هەر بەوەوە تایبەت نین کە بۆچی کارەکەی کاستێلس لە هەندێ نێوەندی ڕوناکبیری و ئەکادیمی ئەوەندە پێشوازی لێناکرێ و ڕەهەند و تێکەیشتن و دووریی سێرکردنەکانی لەبەرچاوناگیرێ بەڵکو بەوەشەوە تایبەتن کە لە ناواخندا هەندێ سەرنجی دیشن لەسەر ئەوەی چۆن ئەزموونی ڕوناکبیری و ئەکادیمی جیا ژینگەی بیریاری و نووسەرایەتی جیاجیا ئەخولقێنن و دواتر ئەوانەش چەند کاریگەری بەسەر تێگەیشتن لە کاری توێژینەوە و ڕاقەکردن بەجێدەهێڵن:

1-کاتێ کاستێلس بەرهەمێ لەم جۆرە دەنووسێ، کە لەلایەك ناوەڕۆکی باسەکانی تایبەتن بەو کۆمەڵگانەی بەخۆیان بەرهەمهێنەری زانین و زانیاری نوێن و هەروەها جڵەوی بازاڕ و دەسەڵاتی سیاسی و کولتووریان بەدەستەوەیە، هەروەها کە لەلایەکی دیش ئەو کۆمەڵگانەی ئەم بەرهەمانەی تیا دەنووسرێ بەخۆیان جەمسەری گۆڕانکاریەکانن و ئامانجی ڕاستەوخۆی ئەو گۆڕان و گەشانەشن کە بەهۆی داهێنان و دۆزینەوەکانەوە بەرهەمدێ

ئەمەوادەکا بەرهەمەکان لە زێدی خۆیان پتر لەئامێزبگیرێن و جێی ئاوڕدانەوە بن. کاتێ کە ئەمەش لەو شوێنانەدا دەکرێ مەبەست تیایا پشتگیریکردن لە نووسەری بەرهەمەکە نییە، یان ئەمە بە هیوای دروستکردنی جۆرە دۆستایەتیێ یان دژایەتیێ لەتەك نووسەر دا ناکرێ، وەك ئەوەی لای ئێمە لەکاتی ئاوڕدانەوە لەبەرهەمی کەسێ دەکرێ. نەخێر. بەڵکو پێش هەموو شتێك خودی نووسینەکە وەك پێویستیەك تەماشادەکرێ و نووسەری بەرهەمەکەش هەر لەسەر ئەو بناغەیە ئەم کارەی نووسیوە. بەکورتی ئامانج لە پشت نووسینەکەوە هەیە و هەموو نووسەرێ لەسەرەتاوە هەولی وەلامدانەوە پرسیاری" بۆ ئەم نووسینە؟" دەداتەوە و نەخشە و ویستی خۆی بۆ خوێنەر ڕووندەکاتەوە کە دەیەوێ بەهۆی ئەم نووسینەوە چ چارەسەرێ بەدەستەوە بدا و بۆ چ جۆرە کێشەێ ئەم چارەسەرانە ڕوودەخا. کەواتە خوێنەر هەر لە ئەوەلەوە دەرك بەوەدەکا کە بوونی کێشەێ یان چەند کێشەێ بوونەتە هۆی نووسینی ئەم توێژینەوە(یان لێکۆلینەوە، شیکردنەوە، لێکدانەوە) یە و نووسەریش لەڕێگای ئەو مێتۆدو و تیۆریانەی لە کارەکەیدا پێوەی سەرقالە چارەسەری خۆی پێشنیاردەکا و بۆ ئەو مەبەستەش فاکتە و ئارگومێنتی باوەڕپێکراو و پەسەندرکراو بەردەستدەخا. بەلام ئێمە زۆرجار خۆمان لە کاری توێژینەوە نوێکان بەدووردەگرین و یان تەنێ بۆ مایەی گەلالەکردنی ڕۆشنبیرێکی سەرپێی دەکەوینە خوێندنەوەیان ئەمەش بەهیوای ئەوەی شتێکی لێهەلهێنجێنین نەك شتێکی لێوە فێربین و یان نەك لەسەر ئەو بناغەیەی باوەڕمان بەوە هەیە کە ئەو نووسینە قسە لەسەر ژیانمان دەکا. ئەم لایەنەش بەبێگومانەوە دەکرێ بە کارێ هەلە و دزێو لەقەلەم بدرێ. چونکە پلانێتی ئەمڕۆمان بەجۆرێ بەڕێوەدەچێ کە بەشێکی زۆر کەمی ئەم پلانێتە بەرهەمهێنەر و کاریگەرە و ئەوی دەمێنێتەوە، کە زۆرینەکەیە، بەکاربر و سستە. ئەمەش دۆزێ ئەوتۆی لەڕووی سیاسی و ئابووری و کولتووریەوە دروستکردووە کە دابڕان لەیەکتر و خۆدزینەوە لە ڕووداو و دیاردەکان بۆلەمەولا مەحالە.

2- کارەکەی کاستێلس جۆرە پسپۆری و پۆلگەرایەکیشی تیا بەدیدەکرێ. واتە نووسینەکە لەلایەن پرۆفیسۆرێك لە بواری کۆمەلناسی نووسراوە کە پتر لە 40 سالە کاری ئەکادیمی دەکا و زۆرترین سالیشی بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەم توێژینەوەیە تەرخانکردووە. ئەمەو کارەکەی بەشێوازێ ئەکادیمی ئەوتۆ نووسراوە کە بناغە بۆ توێژینەوەی ئیمپیری و تیۆری دادەنێ و لەهەمان

کاتیشدا واله کۆمەڵناسی دەکا کە بە چاخی زانیاری و ئەو دیاردانەی لەم چاخە نوێیدا بزێون، وەك جیهانگیری ئابووری و زانیاریگەری و سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی سەرمایەداری جیهانی و پرسی ناسنانە، تایبەتکرێ. هەموو یەکێکیش لەو باسانەی کاستێلس باسیلێوەدەکا زۆرترین سالی دەوێ تا مرۆڤ بکارێ توێژینەوەی لەبارەوە بکا و ئەوە ڕوونکاتەوە کە چۆن ئێستامان لەوە دوورخرێتەوە دیاردەی گرفتاوی بەرهەمبهێنێ و ڕادەێکیش بۆ نایەکسانی و ناتەبابیەکانی ئەمڕۆ دانرێ کە جیهانی نوێی تەنیووەتەوە. بەلام زۆرجار ئاستی ڕوناکبیری و ئەکادیمی ئێمە و ئەزموونی سیاسی و کۆمەلایەتیمان دەبن بە تەگەرە لەبەردەم تێگەیشتنمان لەو جۆرە دیاردانە و لەو شێوازەی لە توێژینەوەی دیاردەکانا بەکاربراون. ئەمەش بارێ دەهێنێتە پێشەوە کە نە کارەکەی کاستێلس زۆر بایەخداردەبێ بۆمان و نەش دەتوانین لە گروندی مێتۆدی و تیۆری کارەکە بگەین. دەکرێ بپرسین بۆ؟ لەڕاستیدا لەناو ئێمە بایەخدان بەولایەنانەی ئاماژەمانپێکرد نەبۆتە خەمی زۆربە و تەنانەت کاری ئیلیتیش (تاقمیش) نییە و بەلکو بووە بە کاری ئیلیتی ئیلیت. هەروەها ئەوەی هەستیشی پێدەکرێ لە نووسینە ئەکادیمی (زۆر بەڕاراییەوە ئەم دەربڕینە بەکاردەبەم) و غەیرە ئەکادیمیەکان ئەوەیە کە زۆربەی لە دەوری خۆناسینێ(کوردۆلۆژیایێ) بەرتەسك دەخولێتەوە کە هیچ جێگایێ بۆ ئەویترناسی جێناهێلێ. ئەم سەرنجەی ئێمە بەوە بێبەهاناکرێ کە لەم چەند سالەی دوایی لە چەند تێکستێکدا باوەش بۆ هەندێ بۆچوونی ڕۆژئاوای کراوەتەوە یان باس هێنراوەتە سەر بیری ڕۆژئاوا و تەوژمە فکرییەکانی. چونکە ئەوە لەژێر زەبری نووسینی کەسانێکەوە نەکراوە کە خاوەنی خوێندنێ بالای نوێ بن و یان بە پسپۆڕبوونیان لە هەندێ پۆل و بوار و یان بیری هەندێ بیرمەند و قوتابخانەی ڤکری پێیگەیشتوبێتن. دیسانەوە ئەم سەرنجە بەیادخستنەوەی ناوی یەك دوو کتێب یان یەك دوو نووسەر بێکەلکناکرێ. ئەمە کێشەێ کۆنە و کێشەی بەلایکەمەوە دوو سێ نەوە و بەگشتیش یەك نەتەوەیە. دواتر دەکرێ جەغت لەسەر ئەوەشکرێ کە نووسین بەمانای توێژینەوە ئەنجامدان لای ئێمە مانای نییە و نووسین بۆ گوزارەکردنە لە شتە ڕۆژانەیەکان و یان خۆهەلواسین بە هەندێ مۆدە و تەوژمەوە کە ئامانج تیایا دروستکردنی دۆزێ فکرییە بەلام ئەفسووس ئەوە دۆزێ فیکری ناتەندرووستی و ساغتەیە. ئەگەرنا بۆ میلەتێ هەمووی باس لە خراپەکانی مۆدێرنە یان بەپێچەوانەوە وەسفی مۆدێرنە دەکا، یان باس لە بیری کەسێ لە ولاتێ دەکا و ئەوە لە بیردەکا کە

هەموو فەڕەنسا لە فوکۆ بریتی نییە یان هەموو ئەڵمانیا لە هابرماز بریتی نییە. لەکاتێکدا ئێمە لەوە فەرامۆشدەکەین کە وەلاتێ وەك فەڕەنسا بۆنموونە پتر لە بیست بیریاری نێودەولەتی هەیە کە ناویان لەلای ئێمە هەرگیز بەرگوێ نەکەوتووە، یان لە ولاتێ وەك ئەڵمانیا پتر لە بیست کۆمەڵناس و فەیلەسوفی هاوچەرخ بەرچاودەکەون کە پەرە بە کۆمەڵگە و کەلەپوور و بیر و فەلسەفەی ئەڵمانی و جیهانی دەدەن و شوهرەتی ئەکادیمی و ڕۆشنفکریان گشت شوێنێکی گرتۆتەوە. ئەمە لەو لاوە بوەستێ ئێمە لەوەش بەئاگانین کە لەسەر بناغەی توێژینەوەکانی کەسێ وەك فۆکۆ لە ولاتی خۆی گۆڕان دێتە سەر یاسای ئەحوالی شەخسی یان دۆزی شێتخانە و بەندیخانەکان و مەسەلەی سزا گۆڕانی دێتەسەر. یان لەوە بێ ئاگاین بیری ئەم کەسە(واتە فوکۆ) دەبێ بە سەرتایەك بۆ هاتنەکایەوەی تەوژمی بایەخدان بە جەستەی خۆ (خودی خۆ) کە ئەمەش جۆرە سینیزمێ (بێ سەرنج، بێ خەیال) سێکسی دێنێتە پێشەوە، یان ئەوە لەیاددکەین کە ئێمە ناتوانین لە بیری بیرمەندێ وەك هابرماز بگەین ئەگەر توێژینەوە 1500 لاپەڕەییە کەیمان لەسەر" تیۆری کردەی گەیاندن" نەخوێندبێتەوە، یان ئەو کارانەیمان نەخوێندبێتەوە کە لە سالانی 1990کاندا نووسراون و، وەك توێژینەوەی بەشێ زۆر لە بیرمەند و ڕوناکبیری ڕۆژئاوایی تر، ئامانجیان دروستکردنی مالێ ئەورووپی بێ بێکاری و بێ جەنگ و لێوانلێو لە ماف و یاسایە. بۆیە کاتێ کە کارەکەی کاستێلس وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی ئەڵمانی یان فەڕەنسی خۆی لەبەردەم بیستەها کاری توێژینەوە و شیکردنەوەی ئەکادیمی و بیریاری هاوشێوە و هاوغەمی تر دەبینێتەوە، کە هەریەکەیان بەشێوەێ بەشداریان لە بەردەستخستنی ڕێگاچارەی گونجاو بۆ کێشەی کۆمەڵگەکانیان و کۆمەڵگەی جیهانیش کردووە. بەلام نابێ ئەوەش فەرامۆشکەین کە گەلێ نووسین و ساغکردنەوەی دیش هەن کە لە پشت دروستکردنی بێمانای و نەزۆکی و بەرژەوەندیگەرییەوە دەبن. نموونەش لەسەر ئەو جۆرە کارانە زۆرن و تەنانەت نووسینی ئەوتۆش هەن کە ئاشووب و ئاژاوە دەخەنەوە و کەسەکان بەهۆی نووسینە کانیانەوە دەبن بە ئامرازێ بۆ دروستکردنی ستەم و زۆرداری و ئەوی تر فەوتان. هیچ دوور نەڕۆین نووسینەکانی مالتۆس کە بەهۆی کارەکانیەوە داوا دەکا بەڕێوەبەرانی ولات جەنگ هەڵگیرسێنن تا دانیشتوان کەمببێتەوە یان نەخۆشی و پەتا بلاوببێتەوە بۆ ئەوەی ژمارەی دانیشتوان ڕوو لەکەمی بنێ. یان کاتێ کە ئەم کارەی کاستێلس وەردەگێڕدرێتە سەر زمانی چینی یان یابانی یان ڕووسی باسێ

زۆری لەبارەوە دەکرێ. چونکە باس لە ئەزموونی شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری یابانی و قۆرمی سیاسی و ئابووری چینی و هەروەها باسی رووسیای ئەمرۆ و کێشە تازەکانی کۆمەڵگەی پۆست-کۆمۆنیزم دەکا و ئەمەو لەبیرمان نەچێ کە بەرگی سێهەمی کارەکەی کاستێلس تایبەتە بە مەسەلەی هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و دەرئەنجامەکانی ئاوابوونی کۆمۆنیزم و رەنگدانەوەی ئەمە بەسەر سێستەمی ئابووری و سسیاسی گلۆبال.

3-پێش ئەوەی کاستێلسیش لە باسی وەك تیۆری ناسنامە و تەکنەلۆژیای زانیاری و کۆمەڵگەی گلۆبال و شارستانی دیگیتال و سەرمایەداری گلۆبال و دەرئەنجام و ئاکامەکانی هەریەك لەمانە بدوێ نووسەر و ڕوناکبیری زانکۆیی تر لەم باسانە دواونە و توێژینەوەی جۆراوجۆریان لەبارەیەوە ئەنجامداوە. بۆیە کارەکەی کاستێلس هەست بەنامۆی ناکا و زەمینەی مادی و غەیرە مادی بۆ قۆزتنەوەی رەهەند و تێندێنسەکانی کارەکە لەئارادایە. هەروەها بەرهەمێ ئاوا گلۆبال کە دەستکاری گشت شتێکی ناو کۆمەڵگەی گلۆبال دەکا نووسەرەکەی خوێندنەوەێ باشی بۆ کارەکانی پێش خۆی هەیە و لە تێندێنسی شیکردنەوە کۆمەلایەتی و کولتووری و ئابووریەکانی ئەم بیست ساڵەی دوای بەباشی ئاگادارە و، بە تەماشاکردنێکی سەرچاوەکانیش (لە هەر سێ بەرگی کتێبی چاخی زانیاری دا) ئەوەمان بەچاکی بۆ ڕووندەبێتەوە کە کاستێلس لە کارەکەیدا هەولیداوە بەرهەمی کەسانێ زۆر بخوێنێتەوە و لە توێژینەوەکەشیدا کۆششی ئەوەشیکردووە پشت بە ئارگومێنت و فاکتەی کەسانێ تر ببەستێ یان رەخنە لە بەڵگە و زانیاری کاری کەسانێ تر بگرێ و هەولی پێشنیارکردنی رێگا چارە و وەلامی تر بدا. بۆیشە کاتێ کاستێلس کارەکەی دەنووسێ یە تەوازعەوە ئاماژە بەوەدەکا کە بەرهەمی فلان و فیسکانە کەس بۆ توێژینەوەکەی گەلێ ماناداربووە و گەلێ شتیشی لێوە فێربووە. لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە، لەو دەمووەختەی کاستێلس لەبارەی دیارەی کۆمەڵگەی نێتۆرك و تەکنەلۆژیای زانیاری و ناسنامەی سیاسی دەنووسێ گەلێ نووسەر و ڕوناکبیری تر لەو دەوروبەرە کاریان لەسەر هەمان دیاردە کردووە و بەلام کێشەکانیان بەجۆرێ تر دیووە و چارەسەر و وەلاتی تریان پێشنیارکردوە، بەو مانایەی هەریەکە ئامانج و پلانی دیاریکراوی خۆی هەبووە و شێوازی خۆشی لە دروستکردنی چارەسەر و وەلام هەبووە.

بەلام خوێنەری کورد لەم حالەتانەدا هەست بەنامۆی دەکا، لەلایەك بەرامبەر بە ناواخن و ئاراستەکانی توێژینەوەکە و لەلاێ تر و بەتایبەت بەرامبەر بە

خودی کاری نووسین و ڕاڤەکردن کە بەم ئاستە لە ئاڵۆزی و بەرپرسیاریەتی گەیووە. دواتر ئەم نامۆییەی خوێنەری کورد بەکاریێ وا، یان بەگشتی بە کاری بیریار و ڕوناکبیرانی ڕۆژئاوا، پێوەندیشی بە توانای مەعریفی و ئەزموونی ئەکادیمی و پێشینەی ڕۆشنفکری خوێنەری کورد و ئەو دامەزراوە ڕوناکبیری و ئەکادیمیانەشەوە هەیە کە ئەم خوێنەرە (نووسەرە، ڕۆشتبیرە) یان پەروەردە کردووە و ڕۆلیان لە دانای زەمینەی تێگەیشتن و قوودرەتە مەعریقییەکەشیدا دیووە. ئەمەو جگەلەوەی لە نێوەندی ئەکادیمی و ڕۆشنفکریشماندا نە توێژینەوە ئەو حورمەتەی هەیە و نەش نووسەران زۆر لە ئوسولی نووسین و لێکدانەوە بەئاگان. بۆنموونە بەدەگمەن ڕێکدەکەوێ نووسەرێ مەبەست و ئامانجی لە نووسینی ئەو تێکستە یان کارە دیارییکا و بەو ئاگایەشەوە بنووسێ کە دەبێ لە نووسینەکەیدا بەشداری لە دروستکردنی ڕێگاچارە و وەلامی پەسەندکراو و باوەڕپێکراو بکا.

4- ئەم جۆرە نووسینە گلوبالیانە، واتە کارێ وەك ئەم کارەی کاستێلس یان بەگشتی کارە زانگۆییەکانی ولاتانی ڕۆژئاوا، دەبێ بەووریایی و بە ئەزموونێ پڕ و جۆراوجۆر و فرە ڕەهەندەوە بخوێنرێتەوە. چونکە زۆرجار هەندێ نووسەر و ڕوناکبیری ڕۆژئاوایی کێشە و ڕووداوەکان وەك یەك دەبینن و یان کار لەسەر ئەو جۆرە بنەما فکریی و مێتۆدانە دەکەن کە ڕۆژئاوا وەك مۆدێلێ تاك و نموونەیی نیشاندەدەن و هەولیش دەدەن لە کارەکانیانا ڕەوایەتی بۆ فەلسەفە سیاسی و و کۆمەلایەتیەکانی ڕۆژئاوا بدۆزنەوە. واتە کات و سەدە جیاجیاکانی مرۆڤایەتی تێکەل بەیەکدی دەکەن و بەجۆرێ تەماشای دونیا و شارستانییە جیاجیاکان دەکەن کە زادەی یەك شێوە کێشەی کۆمەلایەتی و سۆسیۆ-سیاسیین و چارەسەرەکانیشیان بەجۆرێ پێشنیاردەکەن کە زەمینە بۆ هەلگرتنەوەی فۆڕمی بیر و ژیانی نوێی ڕۆژئاوا خۆشدەکەن و بەشێوەێ دیدە سیاسی و ئابووریەکانی سێستەمەکانی ڕۆژئاوا ڕاڤەدەکەن کە لە شوێنەکانی تر لاسایکرێنەوە. بۆیە لەم حالەتانەدا، یان کاتێ کە بەرهەم و کاری کەسانێ پسپۆڕمان دەستدەکەوێ، مەرجە جیاوازی لەنێوان شێوازی کارکردنەکان بکەین و ئەو مێتۆد و تیۆریانەی لە خستنەڕوو و چارەسەرکردنی کێشەکان گیراونەتەبەر بناسینەوە و لەو ئاکام و دەرئەنجامانەش بکۆلینەوە کە ئەو توێژینەوانە پێیگەیشتوون.

بەلام لەناو ئێمە کە نە تیۆریزەکردن بە گشتی بوونی هەیە و نەش کۆمەلناسی وەك پۆلێ لە پۆلەکانی زانستە مرۆییەکان ئیشیپێدەکرێ/ ئیشیلەسەردەکێ/

ئیشیبێدەکرێ کارێ کۆمەڵناسی وەك ئەوەی کاستێلس یان ئەو چەند کۆمەڵناسەی لەم دە ساڵەی دوایی کۆششیان بۆ ڕوونکردنەوەی جیهانی نوێ کردووە شوێنی بایەخ نابێ. ڕەنگە ئەم جۆرە تێڕامانەشمان ئەو پرسیارانە دروستکا کە بیەوێ بلێ کوا کۆمەڵناس و کوا کۆمەڵناسی لەناو ئێمە؟ کوا نووسینە کۆمەلایەتیکان و کوا ئەو کتێبانەی کە بیری کۆمەڵناسی و کۆمەڵناسانی ڕۆژئاوا باسدەکا؟ لەهەموو ئەو پرسیارانەش سەیرتر ئەوەیە کە بپرسین بۆ لەزانکۆکانی لایخۆمان کۆمەڵناسی لە مارکس و ماکس فیبەر دا دەوەستێ؟. لەو شوێنە دەوەستێ کە ئەکادیمیکەری کورد ئیدی ناتوانێ هەقایەت بگێڕێتەوە. ئەو پرسیارانە وەلامەکانی ئالۆزدەبن کاتێ لەوە بەئاگابین ئەو گۆڕانانەی هاتوونەتە سەر مەنهەجی نووسین و خوێندی کۆمەڵناسی لەم 30 ساڵەی دوای بیستەها کۆمەڵناسی لە پشتەوەیە کە وا بەشێکیان دەمرن و یان لەبەر دەردی پیری لە قوژبنی زانکۆکانی ڕۆژئاوا کتوکوێر دەبن. هەروەها وەلامەکان لاوازدەبن کە نەتوانین لەوەبگەین بۆ ڕۆشنای توێژینەوە و ڕاڤەکردنەکانی ئەم کەسانە لەناو ئێمە دەرنەکەوتووە و خودی تێکستە خۆمالیەکانیش نەیانتوانیوە کۆمەڵناسیەك تایبەت بەخۆمان دروستکەن. بۆ گرفتەکان و گۆڕان لە بوونیادەکان نەیانتوانیووە کۆرسی کۆمەڵناسی سەرلەبەربگۆڕن؟

5-واباوە لە زۆربەی ولاتانی ڕۆژئاوا ئەو جۆرە بەرهەم و نووسینانەی بەپێنووسی کەسانێ پسپۆڕ دەنووسرێ دوای بلاوبوونەوەی لە نێوەندی ئەکادیمی سوودێ زۆری لێوەردەگیرێ و تاماوەیەکیش وەك سەرچاوە بەکاردەبرێ و خوێندنەوەی بۆ دەکرێ. سەبارەت بەم کارەی کاستێلس لە هەندێ لە بەشەکانی زانستە مرۆییەکانی هەندێ لە زانکۆ و کۆلێجەکان وەك مەنهەج بەکاردەبرێ. ئەمەش بۆماوەیەکە و دواتر بەکاری کەسانێ تر و جۆرە توێژینەوەێ تر بەڵەجیاتی دەکرێ. بەلام ئەم جۆرە ترادیسیۆنە (تەقلیدە) کاتێ بەڕێوەدەچێ و سەرکەوتنیش بەدەستدێنێ کە کەسانێ شارەزا و پسپۆڕ ئەو مەنهەجە سەرپەرشتی بکەن و بەخۆشیان لەو بوارەدا کەسێ بەرهەمهێنەر و لێهاتووبن. ئەم لایەنە بێ مانا دەبێ کاتێ بە هەندێ نێوەندی ئەکادیمی بەراوردی بکەی کە سەرچاوەی کۆرسەکانی خوێندن تیایا گەلێ دووبارە و سواون و بە هەنووکەوە پێوەندیان لەدەستداوە، یان تۆ چی لە مامۆستایێکی زانکۆییەوە فێردەبی کە جارێ خۆی گەلێ کۆلەوارە و کەلێنێ زۆر لە زانیاری و شارەزاییەکانیدا هەیە و بێئاگاشە لەو گۆڕانە مەمەهجی و تیۆرییانەی لە

دونیای ئەکادیمیدا ڕوویانداوە، یان چۆن دەکرێ تۆ ڕۆژانە سەدەها قووتابی بخەیتە بەردەست کەسانێ کە جارێ خۆیان پێویستیان بە زۆرترین فێربوونە لە زۆربەی بوارەکانا و کەمترین شارەزاییان لەو گۆڕانکارییە مێتۆدی و تیۆریانەیە هەیە کە هاتوونەتە سەر پۆلی زانستە مرۆییەکان. کێشەکە بەوە چارەسەرناکرێ ئەم مامۆستایانە بەپەلە فریای ئەوەبکەون کە خۆیان فێری ئینگلیزی بکەن یان هەندێ کتێب و سەرچاوەیان لە سوریا و ئێرانەوە بۆ دابینبکرێ یاخود ڕۆژانە هەولی ئەوەبدەن کە بچنە ناو ئینتەرنێت تا بتوانن سەرچاوە بەدەستبهێنن. ئەمە کێشەکە نییە و بەمجۆرەش چارەسەرناکرێ. کێشەکە زۆر لەوە ئالۆزو و کۆنترە. چونکە ڕاهاتن لەسەر فێربوون و دانی فێربوون کارێ پێداگۆگی و شەخسی و ئیندڤیدوالی ئالۆز و گومڕایە و بەوەرگرتنی کۆرسێ یان خوێندنەوەی چەند کتێبێ ڕیشەکێشناکرێ.

6- ئەم توێژینەوەی کاستێلس بەجۆرێ ئەنجامدراوە کە هەر لەسەرەتاوە هەلوێستی مێتۆدی کارەکەی و تەماشاکردنی بۆ تەوژمە فکریی و ئەکادیمیەکان(لەوانە پۆست مۆدێرنیزم، هیچەگەرای فەلسەفی، عەقلگەرایی) ڕووندەکاتەوە و پێ لەسەر ئەوەدادەگرێ کە باوەڕی بە دیدی سینیست(بێ ئەندێشە، بێ خەیال) و بێ ئایندە نییە. ئەمەش یارمەتیێ زۆری خوێنەر دەدا کە لە ڕەوتی کارەکەی بگا و لەوە دلنیابێ کە لەبەردەم توێژینەوەێ کراوە و ئەبیری ڕۆشنە. ئەمەش لە کاری توێژینەوەدا گرینگە و بایەخێ زۆری بۆ ئەو کێشانە هەیە کە توێژەرەوەکە کار بۆ چارەسەرکردنی دەکا. خوێنەری باسەکانی ئەم کۆمەلناسەش پێویستیێ زۆری بە شارەزابوون لە شەپۆلە ڕووناکبیری و فەلسەفی و فکریەکان هەیە. ئەم شارەزایەش تەنێ کارێ ڕووناکبیری سادە و لاوەکی نییە. بەلکو داوای بەئاگابوون و کارەمایێ تایبەتی دەکا. ئەمڕۆش کە شەپۆل و تەوژمی فکری و جیهانبینی قوتابخانەیی و ڕێبازی جیاجیای سیاسی و کۆمەلناسی لە زۆربووندایە ئاسان نییە کە مرۆڤ بتوانێ ببێ بەخاوەنی تواناێ جیاکارەی شیاوئامێزی ئەوتۆ کە لەناو ئەو هەموو جۆراوجۆری و ناهاوشێوەییە بیر و تێگەیشتنێ سەبارەت بە ژیان و بوون لای خۆی دروستکا. ئەم لایەنە پرۆسەێ درێژخایەنی قوولە و تێخوێندنەوە و خۆئامادەکردنێ زۆری دەوێ. چونکە زالبوونی بێ باوەڕی و بێ ئومێدی و ڕەگەزپەرستی و خۆویستی و دەیەها ڕوانینی سەیر و ناڕەوشتی و لێوانلێو لە ڕەوایەتی و هیچگەرایی کاری نووسینی توێژینەوە و ئەمجار خوێندنەوە و تێگەیشتنی ئالۆز و سەخت کردووە*.

هەر لەم سەرەتایەدا ئەوەش دەڵێین کە کاستێلس بۆئەوەی توێژینەوەی پەسەندکراو و گونجاو بەردەستخا هەر لەسەرەتاوە لە توێژینەوەکەیدا ئاماژە بە گۆڕانکاریەکانی سالانی 1980 کان دەکا و گرنگیش بەوەدەدا کە چەند ئەو گۆڕانکاریانە مانایان بۆ نووسینی ئەم کارە زانکۆییە هەبووە و ئەمجار چەندیش ئەو گۆڕانکاریانە ڕۆلیان لە دروستکردنی کات و شوێنێ تازە دیووە. هەر لەو سەرەتایەشدا ناوبراو مەسەلەی پرۆسێسی سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی سەرمایەداری جیهانیش کە لەهەمان دەمووەختدا وەگەڕکەوتووە بەرباسدەخا و زۆر باس و ڕووداوای لێوە هەلدەهێنجێنێ. بۆئەوەی وێنە و سێرکردنێ بەرین لەسەر شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری بەدەستەوە بدا کارێ ئەوتۆ دەکا کە خوێنەر بەهۆی کارەکەیەوە لەوەبگا کە بەرهەمهێنانی زانیاری و پاڕادیگمی ئەم زانیارییە لەتەك مێژوو، دامەزراوەکان، ئاستی پەرەپێدان، دۆزی زانینی زانستی و لەهەمووی گرینگتر سێستەمی ئابووری گلوبالیش هاوکاتە. بۆئەوەی ئەمەش ئەنجامدا پشت بە هێلکاری و نەخشە و ئامارێ زۆر دەبەستێ و سەرچاوەێ زۆریش بەکاردەبا. بەهۆی ئەوانەشەوە کاستێلس دینامیکی ئابووری و کۆمەلایەتی ئێستامان، کە ناوی چاخی زانیاری بۆدۆزیوەتەوە، دەستنیشان دەکا. بەشێ لە توێژینەوەکەش لە ئاکامی ئەو سەفەرانەی ئەنجامی داوە کە بۆ هەندێ شوێن لە جیهان کردوونی (هەندێ لە ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات بەتایبەت ڕووسیا و هەندێ شوێن لە ئەمەریکای لاتین، ناوچەی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای و ئەورووپای ڕۆژئاوا). بەهۆی ئەم سەفەرانەش توانیوویەتی تیۆرێ یەکانگیر لەبارەی کۆمەلگەی زانیاری و ئەو ئاکامانەی کە تەکنیکی زانیاری لە جیهانی مۆدێرندا بەرهەمی دێنێ فۆرمولێرە بکا. ئەم تەکنیکی زانیاریەش ئابوورێ گلوبالی دروستکردووە کە خودی ئەم ئابووریە گلوبالەش بەوە دەناسرێتەوە کە بریتییە لە شەپۆلی زانیاری، سەرمایە و گەیاندنی کولتووری کە کاریگەری بەسەر بەکارهێنان و بەرهەمهێنانەوە هەیە. توانای ئەم شەپۆلانەش لەوەدایە کە سنوور بەزێنن و لە دەرەوەی سنووری دەولەتی نەتەوەوە گەرادەنێن. هەر لە میانەی توێژینەوەکانی دا کاستێلس ئاماژە بۆئەوە دەکا کە پرۆسێسی جیهانگیری پەراوێزی گشت ولاتان و خەلکی لە نێتۆرکی زانیاریدا دەکا و، ئەوەش ڕوون دەکاتەوە کە کولتووری کارگەی نێتۆرك و ڕێکخراو و دامەزراوەکانی کاریگەرێ بێ سنوور بەسەر شێوازی بەرهەمهێنان بەجێدێلن و، یان لەژێرکاریگەری ئەم لایەنەدا کار و کارکردن گۆڕاتێ پەلەی بەسەردێ

یاخود گۆڕانی تەکنەلۆژی تابلێی کاردەکاتە سەر مێدیا، ژیانی شارنشینی، سیاسەتی گلوبال و تێگەیشتنمان لەبارەی ناسنامە، ماف، دادپەرەری، خێزان و سێکس و. . هتد.
وێرای ئەوی لەسەرەوە ووتمان گرینگە ئاماژە بەوەش بکەین کە، بەباوەڕی زۆربەی ئەوانەی لە نێوەندی ئەکادیمی و مێدیای ڕۆژئاوا خوێندنەوەیان بۆ کارەکەی کاستێلس کردووە پێیان وایە کاستێلس لە دووتۆی ئەو 1500 لاپەڕەیەی کە بەسێ بەرگ نووسیویەتی باسێ سەردەمی لەسەر ئەوەی پێیدەلێن "جیهانێ جیهانی" و "مرۆڤی جیهانی" پێشکەشدەکا. ئەو فاکتە و پێشنیهاد و ڕوونکردنەوانەی ئەم کۆمەلناسە ئیمپیرییە بەردەستیخستوون گرینگ و پێویستبوونە. ئەویش بۆ ئەنجامدانی ئەمە پشتی بە خشتە و هێلکاری و ئامار و ئارگومێنتێ زۆر بەستووە. بەخۆشی کاستێلس بەپێی تێگەیشتنی خۆی بۆ کێشەکانی ئەمڕۆ و دیاردەکانی ناو چاخی زانیاری هەولیداوە پرسیارێ زۆر بێدارکاتەوە نەك وەك هەندێ کۆمەلناسی تر کە هەر لە کۆششدان بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشە کۆنەکان.
ئەوەی ڕاستیبێ، خوێنەری کاستێلس لە ولاتانی ڕۆژئاوا هەرزوو دەرکی بەوەکرد کە بەرهەمەکەی کاستێلس کەلکێ زۆری لە نووسینەکەی ئالان تۆرێن"کۆمەلگەی پاش-پیشەسازی" و دانیال بێل " هاتنی کۆمەلگەی پاش - پیشەسازی" و تەنانەت بەرهەمەکەی داڤید هارڤیش"دۆزی پۆست -مۆدێرن" وەرگرتووە. بەلام کاستێلس ئاڕاستەی تری بە شیکردنەوەکانی داوە و توانیوویەتی ئەو گۆڕانە ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووریانە بەوردی بەرچاوبخا کە لەم بیست سالەی دوای لە جیهانا هاتۆتەکایەوە. ئەمانە هەموو لەو ڕەخنە و کەمووکوڕیانە کەمناکەنەوە کە لە کارەکەی کاستێلس بەدیکراوە.
بۆیشە دوای ئەوەی چاپی دووەمی بەرگی یەکەمی چاخی زانیاری(واتە گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك) دێتەدەرێ ناوبراو لەوێدا ئاماژە بەوەدەکا کە گەلێ ڕەخنە و بۆچوون و سەرنجی لە شوێن و کەسانێ زۆرەوە لە جیهان بەدەستگەیشتووە و هەولیشیداوە سوودیان لێوەرگرێ. ئەم شوێن و کەسانەش هەر لە ئینستیتوتەکانی توێژینەوە و لێکۆلینەوەی ئابووری، سیاسی، کۆمەلایەتی، کولتووری و جوگرافیەکان دەگرێتەوە تادەگاتە توێژەرەوە و کۆمەلناس و ڕووناکبیرە گەورەکان (لەوانە: ئەنتۆنی گێدینس، ئالان تۆرێن، ئەنتۆنی سمیت، پێتەرهال، داڤید لیۆن، زیگمۆنت باومان و. . . هتد). نازناوی ئەم کارەی کاستێلس تەنیا لەنێوەندی ئەکادیمی ئەمەریکا و ئەورووپا بلاونەبۆتەوە

بەلکو نێوەندی مێدیاشی گرتۆتەوە کە ئەمەش دیسانەوە پێوەندی بەوەوە هەیە کە گەیاندنی نوێ نوانیوویەتی نێوەندی ئەکادیمی و هەروەها ڕوناکبیریش بە مێدیاکانەوە ببەستێ و مێدیا ببێ بە تاکە کەنالێ بۆ گەیاندنی ڕۆشنفکری و بیریاریی و، شوێنێك بۆ دروستکردنی شوهرەت و باشترین بازاڕیش بۆ ساغکردنەوەی بیروڕاکان. کاتێ کە کاستێلسیش بەو مێتۆد و تیۆرییە ئیمپیرییە و بەزمانێ وەك زمانی ئینگلیزی توێژینەوە ئەنجامدەدا و لە شوێنێ وەك ئەمەریکا و وەك پرۆفیسۆرێ لە کۆمەلناسی نەك نووسەرێ هاوی(یان ڕۆشنبیرێ عیسامی) کاردەکا و لەسەر هەنووکەترین چاخ و دیاردەی سیاسی-ئابووری، کولتووری و کۆمەلایەتی دەنووسێ بەدلنیاییەوە مێدیاکان زۆرترین ئامێزی بۆدەکەنەوە و بازاڕی چاپکردن و پەخشکردنیش زۆرترین کار بۆ بلاوکردنەوەی ئەم کارە دەکەن. ئەمەش هەموو جارێ ڕوونادا و ئەو چاپخانە و مێدیایانە ئامانج و ویستی خۆیانیان هەیە کە لێیلانادەن و کاری بۆدەکەن و، خۆشیان لەکاری پەخش و بلاوکردنەوەی نووسین و بەرهەمی ئەو کەسانە دووردەخەنەوە کە لەگەل ڕەوت و پەیامی گەیاندنیان ناتەبا و ناجۆرن. . لەم حالەتەش خراپنییە گەر دوو نموونە لەسەر ئەم لایەنە بهێنینەوە. بۆنموونە کاتێ کە ژان بۆدریار، بیرمەندی پۆست مۆدێرنی فەرەنسی، ئەوکات (1986) کە لە ئەمەریکا دەژیا کە ویستی کتێبی (ئەمەریکا) کەی بەچاپبگەێنێ کێشەێ زۆری هاتە ڕێ و زۆربەی چاپخانەکان خۆیان لە چاپکردنی بەدوورگرت. هەروەها کاتێ کە ژاك درێدا ی بیرمەندی پاش-بنەماخوازی لە سەفەرێ لە کۆتای ئایاری 2000 دا لە دوو زانکۆ لە ولاتی سوید لەبارەی" دۆزی زانکۆکان لە ولاتانی ڕۆژئاوا" سمیناری گێڕا و کاتێ کە لەبەردەم زۆربەی مامۆستایانی زانکۆی ئۆپسالا و ستۆکهۆلم قسەی هێنایە پێشێ لەسەر نێوەندی ئەکادیمی و دۆزی زانکۆکانی ڕۆژئاوا و ڕۆلی لە دروستکردنی دەسەلات و ئەو کێشانەی لە زانکۆکانا دێنە ڕێی بێگانەکان، ئەوەبوو بۆ ڕۆژی دوای و دواتریش کەس ڕووکردنەوەی لەسەر ئەم تێزەی درێدا نەدا و مێدیای سوید تاپێیکرا خۆی لە ماهیەتی سمینارەکە بێدەنگ کرد. بۆیە ئاساییە کە بلێین کە ئەوە تەنێ هونەرمەند و سیاسیەکان نییە کە سەرکەوتن و شوهرەتیان بە مێدیاکانەوە بەستراوەتەوە بەلکو بیریار و ڕۆشنفکرانیش دەگرێتەوە. ڕەنگە دۆزی کاستێلس شتێ جیاتربێ. چونکە کاستێلس، کە بەڕەچەلەك ئیسپانییە و خەلکی کاتالانیایە و دوای هەلاتنی لە ولاتی خۆی زۆربەی کاتەکانی لە شوێنێ وەك فەرەنسا بەسەر بردووە، وەك ئەورووپاییەك و هەروەها وەك پرۆفیسۆرێ

لە کۆمەڵناسی بەرەو ئەمەریکا کۆچیکردووە و بەگەیشتنیشی لەو شوێنە گیرساوەتەوە کە هەناوی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێیە و هەر دەموو دەستیش کەوتۆتە پەرەدان بەو توێژینەوانەی کە پێشتر لە ئەوروپا کاری لەسەر کردووە. گیرسانەوەی ئەم کۆمەڵناسە ئیسپانیەش بەمجۆرە و لەشوێنێ وادا دواتر بۆ بەئەنجامگەیاندنی توێژینەوەکانی و کارکردنی لەسەر ئەوەی کە لەو کاتەدا و لەو دەوروبەرە لە نەشوونمادا بووە مەسەلەێ بەسوود بووە. ڕاستە پێشهاتنی و بەتایبەت ئەو کاتەی لە فەرەنسا لەتەك ئالان تۆرێن کاریکردووە توێژینەوەێ کۆمەلایەتی زۆری لەسەر کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان کردووە بەلام دواتر ئەم توێژینەوانە ئاڕاستەێ بەهێزتر وەردەگرێ و بەتایبەت کە ئەمەریکا لەو کاتەدا بە قۆناغی سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی ئابووری دەڕوا و ئەمەش بە پشت بەستن بە هێنانەکایەوەی شێوازێ نوێ لە بەرهەمهێنان کە ئەوەش شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە. کەواتە خودی ژینگەی سیاسی و زانینی زانستی و زانیاری و گەشەی ئابووری و کۆمەلایەتی و تەنانەت نەشونمای ئاستی توێژینەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری لە ئەمەریکا مانای خۆی بۆ شێوازی کارکردنی کاستێلس هەبووە. هەربۆیشە دواتر ئەوە ڕووندەکاتەوە کە چۆن ئەو گەشەیە لەلایەن ئەمەریکاوە کراوە و هەروەها گەشەکە ئامانج داربووە و مەبەست تیایا بەرەو پێشەوە بردنی سێستەمی ئابووری و سەربازی و زانستی بووە. کە ئەلبەتە گۆڕانە زانستیەکە و هەولدان لە هێنانەکایەوەی پاڕادیگمە نوێکەی زانیاری ماهیەتی گەشەکە بووە و دواتر ئەوەش کاریگەری خۆی بەسەر سێستەمی سەربازی و ئابووری و سیاسی بەجێهێشتووە. هەر ئەم گۆڕانەش بووە بەهۆی بوونی ئەمەریکا بە بنکەی دیگیتالی جیهانی و شوێنی کۆبوونەوەی دەسەلاتی ئابووری و سیاسی و کولتووری. ئەمانەش هەموو لە کۆتای 1970 کانا ڕوودەدا و پاشان دەبن بە فاکتە و بەلگە بەدەست کاستێلسەوە بۆ تیۆریزەکردن بەسەر ئابووری و کۆمەلگە و کولتووری ئەمەریکی و دواتر ڕۆژئاوا و ئەو زۆنە نوێیانەی دەکەونە ناو جوگرافیای نوێوە.

بۆئەوەی دەروازەیەك تایبەت بە بیری کۆمەڵناسی لای کاستێلس بەردەست خوێنەری ئەم کتێبە بخەین و لایەنێ لە توێژینەوە و وێناکردنەکانی نیشاندەین و پاشان بۆچوون و تەماشاکردنە ئابووری و کۆمەلایەتی- کولتووریەکانی نیشاندەین لەڕووی مێتۆدییەوە پەنامان بۆ ئەوە بردووە کە بەرگی یەکەمی کتێبەکەی کاستێلس(واتە گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك) بۆ خوێنەری ئەم کتێبەی

بەردەستمان کورتکەینەوە. بۆ ئەمەش بە پێویستمان زانیووە پەنا بۆ ئەوەبەرین کە پووختەیەك Resume لەبارەی ئەم بەرگەوە پێشکەش خوێنەر بکەین و دواتر بێینەسەر سازدانی گفتووگۆیێ فرە ئاراستە و جۆربەجۆر تا بەهۆیەوە ئەو رەخنە و گومانانە بەردەستبخەین کە لەکاتی خوێندنەوەی ئەم بەرگەدا لامان کۆبووەتەوە. بەبێگومان پووختەکردنی کاریێ 500 لاپەڕەیی لەو جۆرە نووسینەی کاستێلس لە چەند لاپەڕەیەك (نزدیکەی 40 لاپەڕەیA4) کاریێ ئاسان نییە. بەلام ئەمە مەرجیێ سەرەکییە بۆ ڕانانی ئەم کتێبە و سازکردنی دەروازەیەك تایبەت بە تێگەیشتنی کۆمەڵناسی لای کاستێلس لەبارەی ئەو بابەتانەی توێژینەوەی لەبارەوە کردوون. بۆیە هاتووین لەسەرەتادا کورتەیێکمان سەبارەت بە بەشی یەکەمی کارەکەی کاستێلس بەردەست خستووە دواتریش هاتووینەتە سەر گفتووگۆکردن لەسەر توێژینەوەکەی کاستێلس و ئاستی تەماشاکردنی بۆ کێشە و گرفتەکان و ئەو فاکتە و دەرئەنجامانەش کە پێیگەیشتووە. وەکیتریش دەشیێ ئاماژە بەوە بکەین کە پووختەکردنی ئەو بەرگەی کە لێرەدا لەبەردەستدایە لەلایەك وێنەیێ پانۆڕامای هەمەلایەنمان لەبارەی تەماشاکردن و جیهانبینیەکانی کاستێلس لەبارەی چاخی زانیاری، کە بەخۆی بەسیێ بەرگ نووسراوە، دەداتیێ و هەروەها زەمینەیەکیش بۆ تێگەیشتن لە کاری گفتووگۆکردنەکە ئاساندەکا. ئەگەرنا ئەوە گفتووگۆکانمان لەسەر توێژینەوەکانی کاستێلس بیێ پالپشت و بیێ فاکتە دەبن. بۆیە ئامادەبوونی ئەو پووختەیە، وەك دەروازەیەك بۆ بیری کاستێلس لەبارەی کۆمەڵگەی نێتۆرك، وەك بەشیێ لە کارە سیێ کوچکەیەکەی چاخی زانیاری مانایێ زۆری بۆ دروستکردنی کۆمەڵیێ وێنە و نیگا لەسەر شێوازی کترکردن و جۆریێ داڕشتنی ڕاڤەکردنەکانی کاستێلس هەیە. بۆئەوەی هەڵوێستەش لەسەر تێکڕای تەماشاکردن و شیکردنەوەکانی ئەم کۆمەڵناسە گلوبالە بکریێ بوونی ئەو پووحتەیە، لەسەر خودی شێوە کارکردن و تێڕوانینەکانی کاستێلس، دەروازەیێ گرینگە. دواتریش کە دێین و چەند دێیاتیێ(گفتووگۆ) لەسەر بۆچوون و لێکدانەوەکانی کاستێلس دادەمەزرێنین ئامانجی سەرەکی نووسینەکەمان پتر دیاریدەکەین و، ئەمەو هەر سازکردنی ئەم گفتووگۆیەش کۆششێکیشە لەلایەن ئێمەوە بۆ هێنانە گۆڕیێ دێیات و قسەکردن لەسەر دیاردە هەنووکەییەکانی چاخی ئەمڕۆمان کە زۆرجار بە شارستانی دیگیتال و کۆمەڵگەی نێتۆرك و کولتووری ئەلەکترۆنی ناوزەددەکریێ، کە ئەوانە (واتە ئەو دیاردە هەنووکەییانە) بۆ لەمەولا باسهایەکی زۆر چارەنووسین و مرۆڤ بەهۆیانەوە

دەکارێ لە ناواخن و ئامانجی نەك تەنیا کردەی سیاسی و ڕووناکبیری سەردەم بکا بەڵکو لە مەبەست و مانای خودی ژیانی نوێ و ئایندەی گۆڕانکاریەکان بکا.
ئەوی کاستێلسیش لە دووتۆی کارەکەیدا دەیکا، بە پشت بەستن بە کۆمەڵناسی، تێزێکە تایبەت بە چاخی زانیاری. بەدڵنیاییشەوە دەبێ لێرەدا پێ لەسەر ئەوەداگرین کە گشت تێزێك ئارگومێنتی لە پشتەوەیە و ئەو ئارگومێنتەش دەشێ دژی یان لەتەك ئەو تێزەدا بێ کە پێشکەشدەکرێ. لەڕووی مێتۆدیشەوە باسەکەی کاستێلس هەڵگەری تێزێکە تایبەت بە چاخی زانیاری کە بۆ ئەو مەبەستەش چەندین ئارگومێنتی جیا بەردەست خوێنەری خۆی دەخا کە ئێمەش دواتر و لە دووتۆی گفتووگۆکانا کۆششمان بۆ ئەوە کردووە ئارگومێنتەکان بەرباسبخەین و ڕەخنە ئاڕاستەی هەندێ دید و بینینی بکەین. هەولیشمانداوە ئەمە لەسەر ئەوە بناغەیە بکەین کە ئارگومێنت هەمیشە دەبێ ڕاست و ڕێژەیی بێ.
بۆئەوەی ئەو پووختەکردنەش کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد ئەنجامبدرێ تەقەلامانکردووە بۆچوون و سێرکردنی خۆمان بە کارەکە تێکەڵ نەکەین و بەو واژە و واتایانە تێکستەکە داڕێژین کە لەلایەك هی خۆمان بێ و لەلایەکی تریش هەمان سێرکردن و ڕوانینی خودی نووسەری تێکستەکە بێ. بۆیە هەولی سەرەکیمان لەکاتی پووختەکردنی کارەکەی کاستێلس بۆ ئەوەبووە کە سێرکردن و شیکردنەوەکان وەك خۆی و بەبێ دەستکاری بەردەست بخەین. دواتر ئەوی پێمانوایە دەکرێ ڕەخنەی لێبگیرێ و یان گومانی لێبکرێ و، تەنانەت پتر بخرێتە ژێرپرسیار و تێڕامانەوە ئەوا لە چەند گفتووگۆیەکی(دێیاتێکی) ئاڕاستە جۆراوجۆر ئەنجامدراوە. بۆیە بەشێ لە کتێبەکەمان بە گفتووگۆکردن لەسەر شێوازی شیکردنەوە و ڕاڤەکردنەکانی کاستێلس تایبەتکردووە و لەم حالەتەیشدا تەنێ دەمی ئاخافتنەکانمان ئاڕاستەی ئەو دید و بینینانە کردووە کە لە بەرگی یەکەمی کتێبی چاخی زانیاری ڕێکەوتمانکردووە (واتە گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك). ئەوی کاستێلس لەبارەی دۆزی سیاسی و کۆمەلایەتی و ئابووری و کولتووری جیهان بەگشتی و ئەو ناوچانەی بەمەبەستەوە کەوتوومەتە باسیان بەتایبەتی پتر لەوە هەڵدەگرێ کە ئێمە بەوشێوەیە بەر گفتووگۆ و خوێندنەوەمان خستووە. کارێ کۆمەڵناسی لەم جۆرە و بەو شێوازە تیۆریی و مێتۆدییەی ئەم کۆمەڵناسە بەرباسی خستووە دەکرێ بەگەلێ تێگەیشتن و سێرکردنی ترەوە لێکدانەوەی لەبارەوە بکرێ و ئەو لایەنانە زۆرتر

ڕوونکرێتەوە کە جێی باسن. ئەوی ئێمە ئامانجمان بووە بەهۆی ئەو گفتووگۆیانەوە بەر باسیبخەین ئەو ناتەبایی و گشتیکردن و شادبینی و پشتگوێخستنانەیە(پێمانوابێ!) کە لەکارەکەی کاستێلس بەدیمان کردووە. واتە هەولمانداوە گفتووگۆ لەسەر ئەوە بکەین کە بۆچی ئەم کۆمەلناسە لەگەل گشت ڕەخنەیەکی لە سێستەمی سەرمایەداری گلوبال و دامەزراوە نێودەولەتیەکان، کە لەکۆتایدا هەر ئەمانیشن خاوەنی نێتۆرک، هەر وەك تاکە دەسەلاتێ تەماشای نێتۆرك دەکا و دواتر هیوایێ زۆر لەسەر ئەم دەسەلاتە دادەنێ و، هەروەها وەك توانایێ تایبەتیش دەیبینێ و بە چەند ولاتێکیشەوە تایبەتیدەکا و ئومێدێ زۆریش لەسەر ئەم توانا نوێیە دادەنێ و بە بەناغەێ بۆ چارەسەرکردنی کێشە ناسیۆنالی، ئیتنی و ئاینیەکان و هەروەها دەروازەیەك بۆ نەهێشتنی کەلێنە کۆمەلایەتی و ئابووریەکان لەقەلەمی دەدا. ئەمەش کە بەخۆی شتێ مەحالە و ڕۆژئاوا کە بەخۆی میراتگری زانینێ زانستێ و زانیاریێ بالایە ناتوانێ ئەم میراتە لەگەل کەسانێ تر دابەشبکا و مێژوو و ڕابردووی خۆی بەدرۆخاتەوە. مەبەستم ئابووریخوازی و زانستگەری هەموو بەرهەمی ڕاستەوخۆی تازەگەریەکانی ڕۆژئاوان و هەر ئەو تازەگەریانەش لە دروستکردنی ئەو مرۆڤە بەپرسیارن کە، لێرەوە تا دوا پەیڤی دووتۆی ئەم کتێبە، بە"مرۆڤی تازە" ناویدەبەین. ئای لەم مرۆڤە چەند بەئارەزووەوە ژیانێ نوێ و فۆرمێ تازەی کولتووری و ئابووری و سیاسی بۆخۆی دروستکردووە.
وێرای ئەوی لەسەرەوە لەسەر ڕەوتی توێژینەوەکەی کاستێلس ووترا، دەکرێ ئەوەش بووترێ کە ئەمەریکا کە بۆ کاستێلس، وەك توێژەرەوەیەك لەسەر کۆمەلگەی نوێی سەردەم، شوێنی هاتنە کایەوەی شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە و ڕۆژئاواش کە لە پاش ئەوەوە بووە بە جەمسەرێ بەرچاوی لە ژیانی سیاسی و ئابووری و کولتووریی سەردەم مەرجە خوێنەری ئەم توێژینەوەیە تێڕامانی لەبارەوە بکا و، ئەوەش بەرباسخا ئەمەریکا و دواتر ولاتانی ڕۆژئاوا تا چ ئەندازەیەك دەتوانن بەشداری لە چارەسەرکردنی ئەو کێشانە بکەن کە پاڕادیگمە زانیاری و مۆدێلە سیاسی و ئابووریەکانیان لە ناوخۆ و لە دەرەوەی خۆیان دروستیانکردووە و/ دروستیدەکەن. بۆیە پشت بەستنی کاستێلس بە نێتۆرك و هیواشی پێی بۆ هەموو ئەوانەی توێژینەوەکەی دەخوێننەوە دەبێ شوێنی باس بێ. چونکە نێتۆرك بێلایەن نییە و مولکی هەموانیش نییە. دروستکردنی نێتۆرك تەنێ مەبەست تیایا ئاسان کردنی گەیاندن و گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنان و ڕێکخستن و بردنەڕێوە نییە.

نێتۆرك وەك بەرهەمی شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری ڕێگای ترە بۆ دروستکردنی هەندێ شوێنی بەقوودرەت و زۆرترین شوێنی بێدەرامەت و پاشکۆ لە جیهانا. هاتنی گەیاندنی نوێ ئاسانکردنی کاری گوازتنەوە و ڕێکخستنە بەلام فۆرمێ نوێشە بۆ دروستکردنی دەولەمەندی و سانسۆڕ کە ئەمەش هەر بە بەرژەوەندی ئەو شوێننانە دەگەڕێتەوە کە بەرهەمهێنەری پاڕادیگمی زانیارین. هەروەها زۆر پێویستە خوێنەری کاستێلس خۆی لەسەر ڕەخنە گرتن لە بۆچوون و لێکدانەوە نوێکان ڕاهێنێ، ئەو بۆچوون و لێکدانەوانەی بەری بیر و ئەندێشەی ڕووناکبیر و بیریارانی ولاتانی نێتۆرکن. ئەوەتا کاستێلس وەك کۆمەلناس و تیۆریزەکەرێ سیاسی و کولتووری دەیەوێ لەناو ئەو هەموو کاوس (بێ سەروبەری) ە زانستیەی بواری زانستە مرۆیەکان زامستێ یان کۆمەلناسیێ تایبەت بە چاخی ئەمڕۆمان دروستکا، یاخود لەناو ئەو هەموو داڕمانانەی بەسەر ڕاستیدا هاتووە دەخوازێ ڕاستیێ بەناوی ڕاستی ڤیجوال (Virtual Reality) تایبەت بە سەردەمی تازەمان بهێنێتەکایەوە، یان لەناو ئەو ڕەخنانەی لە عەقل و هیۆمانیتێی ڕۆژئاوا دەگیرێ کار بۆ ئەوەدەکا کە چۆن عەقلگەرایی هیۆمانی دامەزرێنێ، هەروەها لەناو ئەو جەمسەرگەری و پراگماتیستیەی(بەرژەوەندیگەری) سیاسەتی نێودەولەتی بەدوای دروستکردنی سیاسەتێ هاوبەش دا دەگەڕێ یاخود لەناو ئەو هەموو ڕەوانبێژییانەی جەنگ و تیرۆریستستانەی ئەمڕۆ باس لە ئاسایشێ نێودەولەتی و یەکانگیر دەکا.

بەدلنیایشەوە لە میانەی گفتووگۆکان هەولدەدەین ئەو لایەنانە بەجۆرێ تر باسکەین لەوەی کاستێلس باسیلێوەدەکا و ئەو کێشە و کەموکوڕیانە یادخەینەوە کە کاستێلس گوێنەداوەتێ(پێمانوایە کە کاستێلس ئەمەی کردووە!) و شوێنی سەرنجی نەبووە. هەروەها هەولمان داوە لەسەر چەند ئاستێ جیا و لە چەند زۆنێکەوە بکەوینە ناو باسەکانی کاستێلس و ڕەخنە ئاڕاستەی ئەو لایەن و ئاڕاستانەی باسەکەی بکەین کە لە هەندێ بوار و شوێندا گیرساوەتەوە و نایەوێ ڕەوەو شوێن و بواری دی بڕوا. بۆئەوەی ئەمەش بکەین هەرجارەی چەند گرفت و ئاقارێکمان وەرگرتووە و کردوومانن بە تەوەری گفتووگۆکەمان و بەپێی توانا و لە چوارچێوەی گفتووگۆکان چارەسەرمان بۆ دروستکردوون.

سێپتەمبەری 2002

ستۆکهۆلم

* لە سەردانێکمان بۆ کوردستان لە ئایاری سالی 2001 چەند سمینارێکمان لە هەردوو شاری سلێمانی و هەولێر سازکرد کە وا لای خوارەوە ئاماژە بەناونیشانی سمینارەکان و شوێنی سازکردنیان دەکەین.
1-جیهانگیری و دۆزی مرۆڤایەتی نوێ (هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی و هۆلی میدیا لە هەولێر)
2- بۆچی مۆدێرنیتێ دێیاتێ نێودەولەتی لەسەرە ؟(هۆلی دیالۆگ لە سلێمانی)
3-خستنەرووی بیری پۆست مۆدێرن(هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی و هۆلی میدیا لە هەولێر)
4-فێمینیزم وەك وتارێ رۆژئاوایی(هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی)
5-فێمینیزم و پۆست مۆدێرنیزم(هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی)
6-جیهانگیری و پۆست مۆدێرنیتێ(هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی)
7-خوێندنەوەی دیوانی ئێتۆس لە دوورگەکانی شیعر و دوان لەسەر واتای شیعر و بەمەعریفەکردنی شیعر (هۆلی رۆشنبیری لە سلێمانی)
بڕیاروابوو سمیناری ژمارە 3 و 4 لە زانکۆی سلێمانی سازکرێ بەلام چەند کەسێ لە زانکۆ بوون بە ڕێگر لەبەردەم سازکردنیان.
ئامانج لە سازکردنی ئەو سمینارانە ڕوونکردنەوەی ناواخن و ڕەوتی هەندێ تەوژمی فکری و رووناکبیری بوون کە لەنێوەندی مێدیا و رۆشبیری کوردی ئاراستەێ تری وەرگرتبوو و لە ئاستێ دی باس و خواس لە سەریان دەهێنرایە پێشێ. بۆیە ئێمە بەپێویستمان زانی کە لەو سمینارانەدا لەرووی تیۆرییەوە باس بهێنینە پێشێ لەسەر دیاردەهایەکی وەك مۆدێرنە، پۆست مۆدێرنە، رۆژهەلاتناسی، فێمینیزم، جیهانگیری، پاش بنەماخوازی، و چەندین دیاردەی تر کە لەمیانەی باسەکاندا ڕێیەدیماندەکرد. چونکە هەر یەك لەو دیاردانە دەکرێ زۆرترین کێشە و هەلە فرێدەنە ناو تێگەیشتنمان کاتێ کە پێش هەموو شتێك بناغەیەك لەئارادا نەبێ بۆ تێگەیشتن لێیان و دواتر ڕوونکردنەوەیان. هەروەها ڕوونکردنەوەی هەریەك لەو ئاراستە و شەپۆلانە ڕێگا لەبەردەم ئەوەشدەگرێ کە ئەو چەمك و واتایانەی بەهۆی ئەم شەپۆل و ئاراستانەوە دروستدەبن جێی باس و دێیات بن. هاتنی ئەو تەوژمە فکری و رۆشنفکریانە بۆناو رۆشنبیریمان و بوونیان بە جێی باس و ئاوڕدانەوەمان دەبێ لەوە بەدووربێ کە بمانەوێ لە میانەی سمینارێ یان سەروتارێ و

تەنانەت کتێبێکیش پووختیان کەینەوە و، هەولی ئەوەشبدەین دوابڕیار لەسەر باشی و خراپیان بدەین و، پێمانوابێ کە ئێمە بەوە(واتە بە سازکردنی سمینارێ یان بە نووسینی سەروتارێ) ئەرکی خۆمان بەجێهێناوە و بە بەرپرسیاریەتی خۆشمان هەستاوین. هەروەها کاتێ تەماشاکردنی ئێمە بۆ ئەو تەوژمە فکری و گفتووگۆئامێزانە لەسەر بناغەی ئەوە دروستبووبێ کە ئەمانە مۆدەهایەکی ڕۆشنفکری ڕۆژانەن و دێن و دەڕۆن بەمە ئێمە وادیارە بڕیاری ئەوەماندا‌وە نامانەوێ بەدووی هیچشتێکدا بگەڕێین و لە هیچ شتێکیش بکۆلینەوە. ئەگەرنا ئەی چۆن؟!. چونکە هەریەك لەو تەوژم و قووتابخانە فکری و ڕووناکبیریانە لە ژیانی مرۆڤایەتی بەسەرهاتێکن و کۆششێکیشن / کۆششێکیشبوونە بۆ وەلامدانەوەی هەندێ پرسیار و بەشداریکردن لە دروستکردنی چارەسەر. ئێمە لێرەدا ئەو تەوژمە فکریانەی کە زیانێ زۆریان بەمرۆڤایەتی داوە لە قسەکردنەکەمان ڕیزپەڕدەکەین و تاپێمانبکرێ خۆمانی لێبەدوور دەگرین و هەروەها نامانەوێ ئەو فکرانە بە شایستەی ئاوڕدانەوە بزانین کە مرۆڤیان دووچاری بێ ئاییندەی و سەرەڕۆی کردووە و مرۆڤیان کردووە بە مۆدە. بۆیە ئێمە پێمانوایە و پێمانوابووە کە شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەوژمە فکری و ڕوناکبیریەکانی ڕۆژئاوا کارێ ئاسان نییە و بەنووسینی چەند سەروتارێ یان سازکردنی چەند سمینارێ ناشێ بەو باوەڕە بگەین کە ئێمە تێگەیشتنمان لەسەریان دروستکردووە و توانیوومانە ئەوە ڕوونکەینەوە کە چەند ئەم تەوژمانە بەسوودی یان بەزیانی مرۆڤایەتی دەگەڕێنەوە/گەڕاونەتەوە.

# ڕۆشنـــایـی

مانوێل کاستێلس، کە کۆمەڵناسێ ئەمەریکی بەڕەچەڵەك ئیسپانییە، نووسەری کتێبی چاخی زانیارییە. چاخی زانیاریش ئەو بەرهەمە جیهانیەیە کە زۆرترین نێوبانگی ئەکادیمی دەرکردووە و نووسەرەکەشی بەهۆیەوە بووە بە نووسەرێ کۆمەڵناسی گلوبال و ڕوناکبیرێ نێودەولەتی. ئەم کارە، چاخی زانیاری، بەیەکێ لە بەرهەمە گرنگ و ناودارەکانی سالانی کۆتای- نەوەتەکانی- سەدەی بیست دادەنرێ و لە سێ بەرگ- ڤۆلیم- پێکدێ و خۆی لە 1500 لاپەڕەیەك دەدا و بەری توێژینەوە و شیکردنەوەی ئەکادیمی پتر لە سی سالێکی ناو زانکۆ و ئینستیتوت و دامەزراوە نێودەولەتیەکانە. کارەکە بە سێ بەرگ (گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك، دەسەلاتی ناسنامە و کۆتای هەزارینە) و لە سێ ماوەی جیا (1998-1996) لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا بە چاپگەیەندراوە و دواتر زۆربەی زمانەکانی دونیا پێیئاشنابووە. نووسەری ئەم کارە، بەهۆی تیۆریزەکانی بەسەر کۆمەڵگەی زانیاری نوێوە لە نێوەندی ئەکادیمی ولاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا، زۆرترین دێیاتی لەبارەوە دەکرێ و، هەروەها لە لاپەڕە کولتووری و سمینارە زانکۆیی و کۆنفرانسە کۆمەڵناسیەکانی سالانی کۆتای 1990کان کە باس دێتە سەر بابەتی ئینتەرنێت و دیموکراسیەت، دۆزی ئابووری نوێی جیهان و دیاردەی ئابووریگەری، یان لەهەمووی گرنگتر کۆمەڵگەی نێتۆرك و شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری، مەسەلەی گەڕانەوەی بایەخ بۆ ناسنامە سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتیەکان (فۆندەمینتالیستی ئاینی: ئیسلامی، مەسیحی، یەهودی، هیندۆسی، کۆنفۆشیستی و تەنانەت بوودیش، یان ناسنامەکان:ناسیۆنالی، ئیتنی، ناوچەیی، ئاینی، یاخود بزوتنەوەی ئاشتی، ژینگە، ئافرەتان) خوێندنەوە و ئاوڕدانەوەیێ زۆر بۆ ئەم کارەی کاستێلس-واتە چاخی زانیاری- لەئارادا دەبێ.

پاشان زۆربەی خوێنەرانی چاخی زانیاری ئەم کارە بە کارە ناودارەکەی مارکس(سەرمایە) دەشوبهێنن و بە شێکیش بە کارە کرمەڵناسیەکەی ماکس فیبەر(ئابووری و کۆمەڵگا) بەراوردی دەکەن. بەکورتی ئەم کارە بەپێی ئەوەی قسە لەسەر سەردەمێ دەکا کە تێکڕای دانیشتوانی سەر زەوی پەیوەندیدارە

پێوەی توانیویەتی ناوێ جیهانی بۆ خۆی دروستبکا. لەوە گرنگتریش نووسەر بە هۆی ئەم کارەوە وایکردووە کە پتر لە گشت کۆمەڵناسێ تر زانستی کۆمەڵناسی لە بابەتی زانیاریگەری و جیهانگیری نزدیککاتەوە و، پێوەندیەکیش لە ئاستێ کۆمەڵناسیدا لەنێوان زانیاریگەری و جیهانگیری دروستبکا.
چاخی زانیاری ناونیشانی سەرەکی کارەکەیە و لایەنی ئابووری، کۆمەڵگا و کولتوور دەگرێتەوە و لە سێ بەرگی سەربەخۆ پێکدێ، کە هەریەك لەم سێبەرگە هەولی چوونە ناو چاخەکە بە جۆرێ بەرین و بەربلاو و هەمەلایەن دەدا. لەڕووی سێستەمی شیکردنەوەوە ئەم کارە سێ بەرگییە یەیەکەوە گرێدراوە و بەلام هەر بەرگێکیش بەجۆرێ ئەوتۆ نووسراوە کە دەکرێ بەشێوەیەکی سەربەخۆ و ناوابەستە بە تێگەیشتنەکانی بەرگەکانی دی بخوێنرێتەوە. نووسەر بەهۆی سێ سەرە ناونیشانەوە (گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك، دەسەلاتی ناسنامە و پایانی ملینیۆم) خاسلەت و ڕووخسارەکانی ئەو چاخەی بە چاخی زانیاری ناوزەدیکردووە، ڕووندەکاتەوە. هەریەکێکیش لەو ناونیشانانە بوونە بە ناو بۆ بەرگێ لە بەرگەکان. بەرگی یەکەم ناوی گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك (تۆڕی کار) لەخۆ دەگرێ و، باسە سەرەکییەکانی لەبارەی بۆ نموونە ئەم تەوەرانەوەیە: پێوەندی نێوان نێت و حود/شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاریی/ئابووری زانیاری و پرۆسەی جیهانگیری/کارگەی نێتۆرك: کولتوور، دامەزراو و ڕێکخراوەکانی ئابووری زانیاری/گۆڕانی کار و کارکردن/کولتووری ڤێژوالیتێی ڕاستی: یەکخستن Integration ی کەیاندنی ئەلەکترۆنی/کۆتای ماس پۆبلیك/گەشەی نێتۆرکی ئینتراکتیڤ /تەوژمی شوێن/لە کەناری هەمیشەیی: کاتی بێ کات. هەرچی، بەرگی دووەمە کە ناوی دەسەلاتی ئیدێنتیتێ (ناسنامە) لەخۆدەگرێ ئەم تەوەرانە دەکا بەشوێنی باسی:جیهانمان و ژیانمان/ئاسمانی هاوبەش:ناسنامە و مانا لە کۆمەلگەی نێتۆرك دا/ڕووی تری زەوی:بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان دژ بە سێستەمی گلوبالی نوێ/سەوزکردنی خود(خودێ سەوز) :بزووتنەوەی ژینگە/ پایانی باوکسالاری:بزووتنەوەی کۆمەلایەتی، خێزان و سێکسوالیتێ لە چاخی زانیاریدا/دەولەتی بێ دەسەلات؟/سیاسەتی زانیاری و گرفتی دیموکراسی/گۆڕانی کۆمەلایەتی لە کۆمەلگەی نێتۆرك دا. ئەلبەتە بەرگی سێهەم کە بەناوی کۆتای میلێنیۆم (هەزارینە)وە یە لەم بابەتانە پێکدێ:کاتی گۆڕین/ قەیرانی ئێتەتیزم Etatism ی پیشەسازی و داڕمانی یەکیەتی سۆڤیەت/هاتنی جیهانی چوارەم: سەرمایەداری زانیاری/هەژاری و مەحرومبوونی کۆمەلایەتی /فەساد:ئابووری گلوبالی کریمینالیتێ/، پەرەپێدان

و گرفت له ناوچەی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی:جیهانگیری و دەولەت/ یەکیەتی ئەورووپا: جیهانگیری، ناسنامە و دەولەتی نێتۆرك/بەرجەستەکردنی جیهانمان.

ئەم بەرهەمە سەفەرێ ڕوناکبیری دووروودرێژە و پێکدادانە لەگەل گەلێ دامەزراو و کولتووری جودا و بواری جۆراوجۆر. لەهەمان کاتدا هەولێکە لە شیکردنەوە بۆ جیهانی ئەوڕۆمان لەسەر بناغەی ئەو تیۆر و ڕونکردنەوانەی هەن. پێداچوونەوەیەکە بە کۆمەلگە کولتووری و کۆمەلایەتیە جۆراوجۆرەکان و خوێندنەوەی دۆزی ئابووری ناهاوشێوەی جیهان و پێشچاوخستنی ناوچە ئابووریە تازە و کۆنەکان و ڕۆلی ئەمڕۆیان لە یەکخستن و بردنەڕێوەی ئابووری نێودەولەتی.

ئەلبەتە ئەوی دەمانەوێ پێش هەموو شتێ بیکەین بریتیە لە خستنەڕووی ناوەڕۆك و کاکلی بەرگی یەکەمی چاخی زانیاری و ئەمجار خوێندنەوەی تێکڕای ڕوانین و تەماشاکردنەکانی ئەم کۆمەلناسە جیهانی و ئەکادیمیکەرە نێودەولەتییە لە دووتۆی بەرگی یەکەمدا. ئەگەر بەمجۆرە وەسەرەتا نەیێین ئەوا زەحمەتێ زۆر دێنینە پێش تێگەیشتنەکانی خوێنەری کورد لە سەرجەم توێژینەوە و شیکردنەوە ئۆرێژینالەکانی نووسەری چاخی زانیاری. ئەمە و بەتایبەت تا کاتی نووسینی ئەم باسە هیچ شتێ لەبارەی ئەم کارە جیهانیەی ئەم کۆمەلناسە بە زمانی کوردی لەبەردەستدا نییە و خودی کۆمەلگەکانی ئەم چاخە کە بەشێوەی جۆراوجۆر ناوزەدەکرێ(کۆمەلگەی زانیاری نوێ، کۆمەلگەی ئەلەکترۆنی، کۆمەلگەی پاش تازەگەریی، کۆمەلگەی پاش پیشەسازی، کۆمەلگەی تەکنەلۆژیای زانیاری و. . . ) هیچ شتێکی بەزمانی کوردی لەسەر نە نووسراوە. بۆیە بە پێویستمان زانی پێشتر پووختەی کارەکە لە خودی نووسیەکەوە بەردەست خوێنەری کورد بخەین و دواتر بێینە سەر بۆچوونمان بۆ شێوەکارکردنی نووسەری چاخی زانیاری و ئەو دید و سێرکردنانەش یەکلاکەینەوە کە لە بارەی ئەم کارە ئەکادیمیە گلوبالەوە لە نێوزەندی مێدیا و ڕوناکبیریی و ئەکادیمی سویدی دا بەرباسخراوە.

چاخی زانیاری بەری بیرکردنەوە و شیکردنەوە و توێژینەوەی مانوێل کاستێلسە، کە کۆمەلناسێ ئەمەریکی بەڕەچەلەك ئیسپانی (کاتالاتی) یە، بەوە ناسراوە کە خاوەنی ڕابردوویەکی چەپانە و ڕزگاریخوازانەیە و لەسەرەتای شەستەکانەوە یەکێ بووە لە دامەزرێنەرانی بەرەی کرێکارانی کاتالانی لە بەرشەلۆنە، کە بزووتنەوەیەکی یاساغ بووە لەو کاتەدا. ناوبراو لە سالی

1962 دا وەك لاوێكی تەمەن بیست سالان لەژێر زەبری ڕژێمی فرانكۆFranco ناچاردەبێ ئیسپانیا جێبێلێ و بۆ پەناهەندەیەتی ڕوو لە ولاتی فەڕەنسا بكا و لە پاریس بنیشێتەوە. لەماوەی شۆڕشی قوتابیانی 68 دا لە زانكۆیreNanter مامۆستای كۆمەلناسی بووە و یەك لەو مامۆستایانە بووە كە شانبەشانی قوتابیان بەشداری لە ڕووداوەكان كردووە. هەرئەوەش وادەكا كە ئەم كۆمەلناسە زۆرتر وەك ڕیفۆرمیستێ پراگماتیسك دەركەوێ وەك لە شۆڕشگێرێ تووڕە. دوابەدوای ئەم ڕووداوانە كاستێلس مافی مانەوەی لە فەڕەنسا نامێنێ و لەو ماوەیەدا لە چەند ولاتێ دەژی تا لە سالی1979. لەو سالەدا بەرەو ئەمەریكا كۆچدەكا لەوێ لە زانكۆی كالیفۆرنیا لە بێركلی، دەبێ بە پرۆفیسۆر لە كۆمەلناسی. كاستێلس پێش هاتنی بۆ ولاتەیەككرنووەكانی ئەمەریكا سالانێ زۆر لە ئینستیتوتی ئالێن تۆرێنlainA Touraine بۆ توێژینەوەی بزووتنەوەی كۆمەلایەتی كاریكردووە و بەلام دوای گەیشتنی بۆ ئەمەریكا بەشێ زۆر لەو سەرمایە ماركسیە كۆنەی خۆی لە ئەورووپا جێهێشتووە. كاتێ كە هاتووشەتە ئەمەریكا لە ناوچەیەك گیرساوەتەوە(بۆ نموونە لە كالیفۆرنیا لە بێركلی و لە بەری ئەو بەریشەوەSilicon leyVal بەجوانی دیارە) نێوەندی دیگیتالی جیهانی و بڕبڕەی پشتی ئابووری نوێ و مندالدانی نێتۆركی گلوبالە. ئەلبەتە كاستێلس هەر لەسەرەتای گەیشتنی بۆ ئەمەریكا و بەو ڕابردووە ڕوناكبیرییە ئەكادیمیە ئەورووپاییەوە هەولیداوە خۆی بە توێژینەوەی ئەو چاخە نوێیە سەرقالكا كە لەو دەوروبەرەی خۆی لە نەشونماكردندابووە.

لەم بەرهەمە سێ كوچكەییەدا تیۆرێ تازە و تێگەیشتنێ پڕ لەواتای نوێ بەرهەمدێنێ. وریایی و ژیری كاستێلس لەوەدایە كە توانیوویەتی ئەو تیۆر و واتایانەی كاری لەسەردەكا بگۆڕێتە زانینێ ئیمپیری كە ئەمەش بۆ كەسانێ زۆر و لە نێوەندی ئەكادیمی ڕۆژئاوا مانا و بەهای خۆی هەیە. توێژینەوەی ئاوا لەو ئاستە تیۆرییە(تەنانەت ئایدیۆلۆژییەش) بۆ كەلێ لە كۆمەلناس و ڕۆشنفكرانی ڕۆژئاوا جێی باسە و ئەمەش كارێ وایكردووە كاستێلس لەڕیزی كۆمەلناسە هاوچەرخەكان بژمێردرێ. بۆ زۆربەی ئەو نووسەر و توێژەرەوانەی كارەكەی كاستێلسیان خوێندوەتەوە پێیانوایە ناوبراو بەرچاویترین كەسیشە كە لەئاستێ بالا دا كاری لەسەر چاخی ئەمڕۆمان، چاخی زانیاری، كردووە. ئەمەو كاستێلس بەهۆی ئەم بەرهەمەوە توانیوویەتی شوێنێك لە دونیای ئەكادیمی وەك كلاسیكێ مۆدێرن بۆ خۆی دابینبكا.

دەشێ خوێنەری ئەم بەرهەمە نێودەولەتیە هەر لەسەرەتاوە دەرك بەوەبكا كە چۆن مەسەلەی تەكنیك لەلایەن نووسەرەوە زۆر بە جدی وەرگیراوە و چ جۆرە كۆششێكییش بۆ ئەوەكراوە ئەو گەشەیەی لەو تەكنیكەدا ڕوویداوە وەك دەروازەیەك بۆگەیشتن لە ئەم ئێستامان تەماشاكرێ. هەر ئەو جۆرە كاركردنەش دواتر وای لەم كۆمەڵناسە كردووە ئەو گۆڕانە تەكنیكیە شۆڕشگێڕانەیەی ئەوڕۆ-كە بە بەردەوام باسیلێوەدەكا- لە پەیوەندی كۆمەلایەتی دا شیبكاتەوە. ئەمە باوەڕی ئەم ئەكادیمیكەرەیە و، پێشیوایە گەر بمانەوێ لە مێژووی نوێ بگەین پێویستە لە گۆڕانكارییە ئابوورییە- تەكنیكیەكانی ئەوڕۆ بگەین. بەلام مەسەلەی گەیشتن لە ناسنامە هەرگیز لەم گۆڕانكارییە بەدوورناگرێ و هەر لە چوارچێوەی ئەو گۆڕانكارییە دا دەیبینێتەوە. كاستێلس بەئاشكرا جەغت لەوەدەكا كە گەیشتن لە هەلاوگۆڕانی گلوبالی ئەم كاتەمان پێویستی بە دیدێ گلوبال هەیە. ئەلبەتە توانا و زانین و ئەزموونی ئەمیش لەم بوارەدا بناغەیە بۆ ئەوەی بكارێ تێگەیشتنهایەكی گشتیمان لەبارەی شۆڕشی تەكنەلۆژیای زانیاریی بۆ بەرهەمدێنێ و، واش لەو تێگەیشتنانە بكا لەنێوەندی ئەكادیمی و ڕوناكبیری نێودەولەتیدا- بەلەبەرچاوگرتنی ئەو سەرنج و ڕەخنە و ڕوانینە جودایانەی سەبارەت بەم كارەی لە ولاتە جۆراوجۆرەكانی جیهان لەئارادایە- باوەڕپێكراوبن. لەگەلێ شوێن لە كارەكەی ئەوەمان نیشان دەدا كە لە توانایدایە تیۆریزە بەسەر دیاردەی جیهانگیری زانیاری بكا و ئەوەش بەرچاوبخا كە چۆن مەسەلەی زانیاریگەریی توانیوویەتی مانا لە بووندا بخولقێنێ. هێندەی ئاگاشمان لێبێ كەس تا ئەمڕۆ هێندەی كاستێلس ئاوا لەئاستێ گلوبالی زانستی و پانۆڕامایدا ئەم جۆرە چاخەی بەر توێژینەوە نەخستووە.

هەر لەسەرەتاوە ئەوەمان پێڕادەگەێنێ پڕۆژەی ئەم بەرهەمەی ڕوو لە هەلوەشانەوە و لە پشتكردن لەگەلێ جۆر لە فۆڕمی هیچگەرای (نیهلیزم) ی ڕوناكبیری، گومانخوازی كۆمەلایەتی و سینیزمی سیاسی دەكا. سەرباری ئەوە ڕەخنە لە تیۆر و كولتووری پۆست مۆدێرنیش دەگرێ كە ڕوو لە كۆتای مێژوو و عەقل دەكا و، دەشخوازێ، بە باوەڕی كاستێلس، كۆتای بە توانامان لە خولقانی مانا بهێنێ. لەڕاستیدا ئەم كۆمەڵناسە گلوبالە باوەڕی بە ڕاسیۆنالیتێ و شیاوی بەكاربردنی عەقلە، بەلام بەبێ ئەوەی كە ڕاسیۆنالیتێ بكرێ بە خواوەندێ. هەروەها باوەڕی بە كردەی كۆمەلایەتی پڕ لە مانا و، بە سیاسەتێكە كە بتوانێ گۆڕان دروستبكا بەبێ ئەوەی لەمیانەیاندا خودی خۆی

دخاتە ناو یوتۆپیا ڕەهاکانەوە. ئەمەو لە کشت شتێ گرنگتر ناوبراو باوەڕێ زۆری بە هێزی ڕزگاریخوازانەی ناسنامە هەیە. بەلام دژی ئەوەیە کە ئەمە لەلایەن بزووتنەوە فۆندەمینتالیستەکانەوە ئیندڤیدوالیزمکرێ (لە ئیندڤیدوالیزمەوە وەرگراوە) یاخود دەستیبەسەردا بگیرێ و بەکارببرێ. گومانی ناوێ کە ئەم کۆمەلناسە باوەڕی بەوەشە کە سەرنج، شیکردنەوە و خولقانی تیۆر شێوازێکە بۆ دروستکردنی جیهانێ تر و گەردونێ باشتر. ئەمەش دەکرێ بەهۆی خستنەڕووی پرسیاری ڕێژەی نەك وەلام بەدەستەوەدان ئەنجامبدرێ. لەم کارەدا ڕێگاێ تایبەت لە فۆرمولێرەکردنی تیۆر و شێواز گیراوەتەبەر. هەروەها نوێژینەوەکەی پڕن لە فاکتە و ئاکامی بەرچاوی گرنگ. پاشان سەرچاوەێ زۆریش لەبارەی جیهانگیری ئابووری و سەرهەلدانی زۆنی نوێی ئابووری لە دونیا و مانای گەشەی خێرای تەکنەلۆژیای زانیاری دەخاتەڕوو. بەکورتی تێماتیزەی(لە بەتێماکردنەوە وەرگیراوە) ئەو گۆڕانکاریانە دەکا کە لە کۆمەلگەی ئەوڕۆماندا ڕوویانداوە و لە ڕووی کۆمەلناسییەوە تیۆریزە بەسەر ئایندەشمانەوە دەکا. ئەمەو ناوبراو پێ لەسەر ئەوەش دادەگرێ کە شیکردنەوەکانی لەسەر بناغەی بەدواچوونی ئیمپری نەك تێڕامانی فەلسەفی یان ئایندەناسیFuturilogy ئەنجامداوە.

# ئـامـاژە

ئەمەی بەناوی گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك لە چەند لاپەڕەی دوای بەردەستدەخرێ بەرگی یەکەمی کارەکەی کاستێلسە. نووسینی ئەم بەرگە دوانزە ساڵێکی خایاندووە. لەسەرەتا وەك دەستورێ ئەکادیمی سوپاسی گەلێ شوێن و کەس دەکا کە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی ئەم توێژینەوەیە کەلکی لێوەرگرتوون. وەکی تریش بەخۆی کارەکە سەرچاوەێ باش بووە بۆ گەلێ نێوەدی ئەکادیمی و دامەزراوی کۆمەلایەتی، سیاسی، ئابووری و کولتووریش. خودی ناواخن و ناوەڕۆکی چاخی زانیاری دەبێ بە کارێ سەرتاسەری بۆ کاستێلس و هەولدەدا بەهۆی خستنە بەرباسی دۆزی نوێی کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان خەسلەت و نیشانەکانی ئەم چاخە تازەیە دیاریبکا. بۆ ئەنجامدانی کارەکەی بەجۆرێ تیۆری و ئیمپیری تەنیا لە بەرگی یەکەمدا پتر لە 80 هێلکاری و خشتە و زۆرتر لە 800 سەرچاوەی بەکاردەبا.

هەروەك لەمەوبەریش ئاماژەمان پێکرد ئەم کارەی کاستێلس لە گەلێ لە بەشەکانی ئابووری، کۆمەلناسی، یاسا و تیۆری سیاسی لە زانکۆکانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا دەخوێندرێ. وەك دیسپلینێکی ئەکادیمیش لە گەلێ لەو ئینستیتووتانەی بایەخ بە سیاسەتی جیهان و ئابووری لۆکال و گلوبال، ئابووری نەتەوە و نێودەولەتی، هەرێم و کەرت، ژینگە و سروشت، و. . . دەدەن کراوە بە مەنهەج.

بۆ ئەوەی کارەکەی کاستێلس بەر باس و توێژینەوە نخەین بەلامانەوە گرنگە سەرەتا خودی کارەکەی کاستێلس پووخت و کوورتکەینەوە، کە بۆ ئەم مەبەستەش بەرگی یەکەمی چاخی زانیاری واتە گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك دەکەین بە ئامانج بۆ نووسینی کتێبێ لەسەر کاستێلس وەك کۆمەلناسێکی سەردەمی جیهانگیری ئابووری و زانیاری. شێوازی کارکردنەکەشمان لەسەر ئەم بەرگە بەمێتۆد و ڕێگایەك نووسیووە کە ببێ بە دەروازەیەك لەسەر بیری کۆمەلناسی کاستێلس و ئەو شێوازی ئیشکردنەی کە ڕوناکبیر و نووسەرانی نێومندە ئەکادیمیەکان لەسەری دەڕۆن. هەولیشمانداوە کارەکەی کاستێلس (واتە بەرگی یەکەمی چاخی زانیاری) بەجۆرێ پووخت و چڕکەینەوە کە لە

تێگەیشتنەکانی کاستێلسمان نزدیککاتەوە و، ئەمەش دواتر یارمەتیماندەدا بە ئاسانی بکارین ڕوانینەکانی کاستێلس شیکەینەوە و پشکنینی جۆراوجۆر سەبارەت بە تێگەیشتنەکانی، بەردەست خوێنەری ئەم پرۆژەی خوێندنەوە و خستنەڕووەی ئەو کارە زەبەلاحە ئەکادیمیە هەمەلایەن و جۆراوجۆرە دخەین.
بۆ ئەم مەبەستەش هەولدەدەین خۆمان لە زمانی توێژینەوە و لێکدانەوەی ئابووری، کۆمەلایەتی، سیاسی و کولتووریی کاستێلس نزدیکبخەینەوە و ئەمەش دەکەین تا ئەو شوێنەی پێمانوایە کە ناوەڕۆکی کارەکەی کاستێلس لەبەردەستدایە و ئیدی ئەوکاتە دەکەوینە خوێندنەوە و پێداچوونەوە بە لایەنە زۆر زەق و گرینگەکانی ئەم بەرگی یەکەمە و، هەروەها لەڕێگای گفتوگۆکردن لەتەك کاستێلس هەولی ئەوەش دەدەین ڕوانین و تێگەیشتنە لێکنەچوو و ناتەباکانمان سەبارەت بەم کارەی ئەم کۆمەلناسە ئەمەریکی بەڕەچەلەك ئیسپانییە بەردەست خوێنەری ئەم کتێبە دخەین.

تێگەیشتنەکانی کاستێلسمان نزدیککاتەوە و، ئەمەش دواتر یارمەتیماندەدا بە ئاسانی بکارین ڕوانینەکانی کاستێلس شیبکەینەوە و پشکنینی جۆراوجۆر سەبارەت بە تێگەیشتنەکانی، بەردەست خوێنەری ئەم پڕۆژەی خوێندنەوە و خستنەڕووەی ئەو کارە زەبەلاحە ئەکادیمیە هەمەلایەن و جۆراوجۆرە بخەین. بۆ ئەم مەبەستەش هەولدەدەین خۆمان لە زمانی توێژینەوە و لێکدانەوەی ئابووری، کۆمەلایەتی، سیاسی و کولتووریی کاستێلس نزدیکبخەینەوە و ئەمەش دەکەین تا ئەو شوێنەی پێمانوایە کە ناوەڕۆکی کارەکەی کاستێلس لەبەردەستدایە و ئیدی ئەوکاتە دەکەوینە خوێندنەوە و پێداچوونەوە بە لایەنە زۆر زەق و گرینگەکانی ئەم بەرگی یەکەمە و، هەروەها لەڕێگای گفتوگۆکردن لەتەك کاستێلس هەولی ئەوەش دەدەین ڕوانین و تێگەیشتنە لێکنەچوو و ناتەباکانمان سەبارەت بەم کارەی ئەم کۆمەلناسە ئەمەریکی بەڕەچەلەك ئیسپانییە بەردەست خوێنەری ئەم کتێبە بخەین.

# گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك (1)

**دەروازە:**

## نێت و خود

لە پێشەکی بەرگی یەکەمدا بۆ ڕوونکردنەوەی پێوەندی نێوان خود و نێت جەخت لەوەدەکرێ کە لەگەڵ کۆتای هاتنی چاخی مەسیحیەت ڕووداوێ مێژوویی زۆر سەقامگیر دەبێ و دیمەنی کۆمەڵایەتی مرۆکان دەگۆڕێ. دوای ئەوەی شۆڕشی تەکنیکی، تەکنەلۆژیای زانیاری، ڕوودەدا بناغەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگە بەپێی ئەم شۆڕشە چوارچێوە وەردەگرێ. ئەمەش وادەکا ئابووریەکان لەگشت جیهاندا بەیەکەوە وابەستە ببن و پێوەندی نوێ لەنێو ئابوورییەکان و دواتر ئەم ئابوورایانە و دەولەت و کۆمەڵگەکان لە سیستەمێ یەکبگرنەوە. ئەلبەتە نابوودی دەولەتگەرایی(ئێتەتیزم) سۆڤیەتی و بەدواهاتنتی داڕمانی بزووتنەوەی کۆمۆنیزمی نێودەولەتیش توانی هەرەشەی مێژوویی دژ بە سەرمایەداری( کاپیتالیزم) بنێژێ و چەپی سیاسی(و تیۆری مارکسیش) لە سیحری بکوژانەی مارکسیزم- لینینیزم ڕزگاربکا و کۆتای بە جەنگی سارد بهێنێ و جیۆسیاسی گلوبال سەرلەبەر بگۆڕێ. بەلام خودی سەرمایەداری گۆڕانی بوونیادی بەخۆ وە دی ئەمەش لەگەڵێ شتدا بەدیدەکرێ، وەك: دەستبەجێ بوونی کارگەی بەتوانا، هەلوەشانەوەی نێوەندگەرایی و پێکەوەکارکردنی نێتۆرك چ لە ناو کارگەکان و چش لە دەرەوەی کارگەکاندا، زیادبوونێ گەورە لە دەسەلاتی سەرمایە لەسەر حسێبی کار، بەرزبوونەوەی ئیندقیدوالیزەیشن و جۆراوجۆرکردنی مەرجەکانی کار، دەستکێشێ گەورەی ئافرەتان لە موچەی کار، ئەمەش بەزۆری لەژێر زەبری ئیحتیقار(دیسکرمینێرینگ)، وەبەرهێنانی دەولەتی بۆئەوەی بەشێوەیێ هەلبژێرەیی بازاڕەکان بێ ڕێساکرێ و دەولەتی ڕەفاش هەلوەشێنرێتەوە و، هەروەها بەرزبوونەوەی پێشبڕکێی ئابووری گلوبال دژ بە باگروندی کەلەکەبوونی سەرمایە. بەلام سێستەمی سەرمایەداری گۆڕاتکاریەکی بەخۆوە دی کە بریتیبوو لە گەلێ دیاردە: ئینتگرەیشنێ(یەکخستنی) گلوبالی بازاڕەکانی

نەخت (فینانس)، سەرلەنوێ گەشەی زۆنەکانی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی، بوونی هەندێ نێوەندی بەرهەمهێنان بە قودرەتێ بۆ گشت جیهان، یەکخستنێ ئابووری سەخت لەلایەن ئەورووپاوە، گەشەی ئابووری هەرێم لە ئەمەریکای باکوور، یەکەم جیابوونەوە و دواتر هەلوەشانەوەی جیهانە سێیە کۆنەکە، هەنگاوی هێدی هێدی ڕوسیا و سۆڤیەتێ کۆن بەرەو ئابووری بازاڕ، گەیشتن بە ئابووریێ یەکانگیر لە گشت جیهان. گومانیشی ناوێ بووترێ، کە بەهۆی ئەم ئاڕاستانەوە گەشەکردنێ ناجۆر بەڕێوەڕۆشتووە ئەمەش بەخۆی شایانی باسە و توێژینەوەێ گەورەیە. جیاوازیەکەش تەنێ لەنێوان باکوور و باشوور نییە و بەلکو ئەم جیاوازییە لەگشت شوێنێدایە. چونکە جیاوازیەکە لەنێوان سنووری دینامیکی کۆمەلگەکان و ناوچەکاندا ئامادەیە. سەرباری ئەوە، ڕێکخراوەکانی مافیا و چالاکییە کریمینالی (ئیجرامی)ەکانیش لە گشت جیهاندا گلوبال و بەزانیارییبووە. ئەمانە دەستێ گەورەیان لە ڕێکخستنێ بازرگانی ترسناك هەر لە بازرگانی ئەلماس و کانزای بەنرخ تا دەگاتە چەك و ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ هەیە. هیچ سلبوونەوەیەکیشی ناوێ کە بلێین، ئەمانەش لەلایەن سیستەمێ گەیاندنی جیا و پەرەسەندوو، کە خاوەنی زمانێ دیگیتالە، دەبرێنە ڕێووە. ئەم زمانە تواناێ باشی لە یەکخستنی (ئینتگرێرەی) بەرهەمهێنان و دابەشکردنی پەیف، دەنگ و وێنەی کولتووریمان هەیە. ئەم بەکۆمپیوتەرکردنە لە پەرەسەندنێ زۆردایە و ڕووخسار و کەنالی تازە بە پرۆسەی گەیاندن دەدا و فۆرمیش بۆ ژیان دادەنێ. واتە، گۆڕانکارییە کۆمەلایەتییەکان دراماتین (ماساوی) هەروەك پرۆسەکانی گۆڕینە تەکنیکی و ئابوورییەکان. لە گەلێ لەو شوێنانەش کە هەلاوگۆڕانێ لە دۆزی ئافرەتان ڕوویداوە سیستەمی پاتریارکالی (باوکسالاری) خستۆتە ژێر هەڕەشەوە و، هەروەها لە بەشێ زۆر لە جیهاندا ژیندەر بووە بە زۆنی پێکدادان و باسی کولتووریشی خستۆتەوە. ئەلبەتە ئاکامی ئەمەش بووە بە دەروازەێ بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنێ بناغەیی پێوەندی نێوان ئافرەت، پیاو و منال و لەهەمانکاتیشدا ڕوونکردنەوەی پێوەندی لە بواری خێزان، ژیانی سێکسی و شەخسیشدا. ئاگایی ژینگەش دامەزراوەکانی کۆمەلگەی بردۆتەڕێوە و ورپایێ سیاسیشی دروستکردووە. ئەم بزوتنەوە کۆمەلایەتیە و بزووتنەوەکانی تریش مانای خۆیان لە ژیانی سیاسی ڕۆژانە، کە لە قەیرانێ ناسنامەی بوونیادیدا دەژی، وەرگرتووە و لە دامەزراوی مێدیادا بوونە بە سیمبۆلیش. هەروەها لەم جۆرە جیهانەدا، کە پڕە لە گۆڕانی بێ کۆنتڕۆل، خەلکێ زۆر بە مەسەلەی

ناسنامەوە (ناسنامەی ئاینی، ئیتنی، تێریتۆریال-ناوچەیی-، نەتەوەیی) سەرقالن. ئەلبەتە لەم چرکە سەختەدا فۆندەمینتالیستی(ئوسولی) ئاینی(مەسیحی، ئیسلامی، یەهودی، هیندۆسی و تەنانەت بوودیستیش) بووە بە بەهێزترین بناغە بۆ دلنیایێ شەخسی و بۆ موبلیزمیشن(تەعبیئە) ێ کۆلێکتیڤ (جەماعی).

لە جیهانێکدا کە دەولەمەندی، دەسەلات زۆرترین قودرەتیان هەیە و بەئاسانی دەگوێزرێنەوە گەڕان بەدووی ناسنامە- کۆلێکتیڤ یان ئیندڤیدوال، دانپیاهێنراو یان دامەزراو- بووە بە سەرچاوەێ سەرەکی بۆ مانای کۆمەلایەتی. ئەمە لە خودی خۆیا شتێ تازە نییە و، ناسنامە (بەتایبەت ناستامەی ئاینی و ئیتنی) هەر لەسەرەتای دروستبوونی کۆمەلەوە ڕۆلی لە مانادان بە ژیان دیووە. هەروەها ناسنامە لە توانایدایە کە وەك گرنگترین و تاکە سەرچاوەیەك بۆ مانابێدان بە ژیان لە چرکەیەکی مێژوویدا خۆی دەرخا، کە ئەمەش لە ئاکامی تێکشکانی ڕێکخراوەی و یان ئەو دامەزراوانەی ڕەوایەتیان لەدەست دەدەن، یاخود لاوازبوونی بزووتنەوەی کۆمەلایەتی گەورە و دەربڕینی کولتووری بەسەرچوو سەرهەلدەدەن. مرۆڤی سەردەمی ئەمڕۆش خۆیان ئۆرگەنیزەدەکەن (ڕێکدەخەن) نەك لەسەر بناغەی چی دەکەن بەلکو لەسەر بناغەی ئەوەی ئەوان چین و یان دەبن بە چی.

نێتۆرکی گلوبال توانییەتی بچێتەناو ژیانی ئیندڤید، گرووپ، هەرێم و ولاتانەوە و، ئەمەش ڕۆلی خۆی لە دروستکردنی کەلێنێ سەرەکی لەنێوان ئامرازگەریێ گەردووناوی، ئەبستراکت و ناسنامەی پارتیکولاریست ی(جیاوازیخوازی)، مێژوو‌ییدا دیووە. لەم حالەتەدا شیاوە جەغتێ زۆر لەوەکرێ کە کۆمەلگەی ئەمڕۆمان لە دەوری دوو جەمسەری دژدا کە ئەوەش من و نێتە بوونیاددەگرێ. ئەو هەلانەش کە دووچاری پرۆسەی دروستکردنی ئەو مانایە دەبن دژواری لەبەردەم گەیاندنی کۆمەلایەتی دروستدەکەن. کاتێکیش ئەو گەیاندنە لێکدادەبڕێ ئیندڤید و گرووپە کۆمەلایەتیەکان بەیەکتر نامۆدەبن. لەم حالەتەشدا دابەشبوونی کۆمەلایەتی نەشونمادەکا و ناسنامەکانیش پتر تایبەتی دەبن. کۆمەلگەی زانیاری لە حالەتی گلوبالی خۆیدا جیهانێکە لە دیاردەی وەك: Aum Shinrikyo (ئەوانەی لە میترۆکانی تۆکیۆ گازی ژەهراویان بلاودە کردەوە)، میلیشیای ڕاستڕەوی ئەمەریکی، تەقەلای تیۆکراتی(لاهوتی) مەسیحی/ئیسلامی. بەکورتی ئەم جیهانە گۆڕانێ پان و قوولی مێژوویی تیا بەدیدەکرێ و، ئەوەشی پێیدەوترێ بیر و کولتووری

ئەمڕۆمان بەزۆری لە ئێسکاتۆلۆژیێ نوێ پێکدێ. پێغەمبەرەکانی تەکنەلۆژیش بەهۆی زیادلەپێویست خستنەگەڕی کۆمپیوتەر و ئەنجامدانی تاقیکرد نەوەکانی DNA چاخێ نوێ دێننەکایەوە.
ڕوونکردنەوەکان بۆ تەکنیك و شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری سەردەم هەمیشە بە شیکردنەوەکان بۆ مەسەلە کۆمەلایەتی و کولتووری و ئابووریەکانەوە گرێدراوە. هەروەها ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییە، کە گشت چالاکییەکان دەباتە رێوە، دەبێ بە دەروازە بۆ شیکردنەوەی ئالۆزگەراییەکانی ئەو ئابووری و کولتوور و کۆمەلگەیانەی لە حالەتی بەرجەستەبوون و ئامادەبووندان. چونکە فۆرم و پرۆسە کۆمەلایەتیە نوێکان بە گۆرانەکانی تەکنیکەوە وابەستەن. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە تەکنیك، گۆرانی تەکنیکی، کۆمەلگا دیاریدەکا. بەلکو تەکنیك دەتوانێ کۆمەلگا بەرجەستەبکا. بۆئەوەی پتر لەم بارەیەوە بەئاگابین و لە یاریی دیالیکتیکی نێوان تەکنیك و کۆمەلگا بگەین دەکرێ بۆ مێژووکردی فەرەنسی فرناند برۆدێل Fernand elBraud بگەڕێینەوە. هەروەها بە پشتبەستن بە ڕوانینی مێلقین کرانسبێری Melvin Kranzberg، کە مێژووکردێ تەکنیکیە، لەوەدەگەین کە دیلێمە ( سەلمێنە یان بورهانی دوولا) ی جەبری(دێتێرمینیزم) تەکنیکی کێشەێ ڕووکەشە. ئەمەش لەسەر ئەو بناغەیەی کە تەکنیك کۆمەلگایە و کۆمەلگاش ناکرێ بەبێ ئامرازە تەکنیکیەکانی لێیبگەین. لەم حالەتەدا شیاوە بۆ سەر تێگەیشتنەکانی ڤیبەر بێیکەر Wieber Bijker بگەڕێینەوە.
کاتێ لە هەفتاکانا پاڕادیگمێ تەکنەلۆژی نوێ لە دەوری تەکنەلۆژیای زانیاری دروستکرا، ئەمەش بەتایبەت لە ولاتە یەکگرتووەکان، بوو بە بەشێ دیاری کۆمەلگەی ئەمەریکی. ئەم پاڕادیگمە بە هاریکاری لەگەل جیۆپۆلیتیکی گلوبال و ئابووری جیهان گۆڕانی سەیری دروستکرد. ئەمەش لەئاکامدا بوو بە ڕێگایەك بۆ بەرهەمهێنان، گەیاندن، ڕێکخستنی کارگە و ژیان. واتە گرنگە پێ لەسەر ئەوەداگیرێ کە ئەم پاڕادیگمە بەزۆری لە ولاتە یەکگرتووەکان دا چڕبۆوە و بەتایبەتیش لە کالیفۆڕنیا و لەماوەی سالانی هەفتاکانیشا. ئەمەش مانای خۆی بۆ گەشە و فۆرمی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ هەبووە. لێرەدا ڕەوتی سەربازی و ڕۆلی فیعلی بازاڕ لەماوەی سالانی چل و شەستەکان بۆ سەرهەلدانی پیشەسازی ئەلەکترۆنی لەم ئالوگۆڕە تەکنیکیە بەدوورناگیرێ. هەروەها ئەو شۆڕشە تەکنەلۆژیەش کە سەرەتای هەفتاکان دەستپێکرد لەگەلێ ڕووەوە بە کولتووری سالانی شەستەکانی زانکۆ ئەمەریکیەکانەوە دەبەسترێ کە ئازادی

کولتوور، نویێ بوونەوەی ئیندڤیدوالی و چالاکی بازرگانی لێوەبەرهات. ئەوەش ناشاردرێتەوە کە شوێنێ وەك سیلیکۆن ڤالی لە ولاتە یەککرتووەکانا کرا بە نێوەندی دیگیتالی گلوبال و شوێنی کۆبوونەوەی تەکنیکی کۆمپیوتەر. هەر دوابەدوای ئەمە بوو کە تەکنەلۆژیای زانیاری دەستی بە بلاوبوونەوە لەگەلێ شوێن لە جیهاندا کرد. ئەمەش بەشداریکرد لە دروستکردنی گۆڕانکاری و خولقانی فۆرم و پرۆسەی نوێ. لێرەدا گرنگە دانبەوەدابنرێ کە کەسێ وەك کلۆد فیشەر Claude Fischer بەباشی مەسەلەی ئاکامە کۆمەلایەتیەکانی بلاوبوونەوەی تەکنیکی ڕوونکردۆتەوە. ئەلبەتە دەشێ جەغت لەوەشکرێ کە ئینتەرنێت لەو جەنگەی نێوان ئەمەریکا و سۆڤیەت پێداویستیێ گەورە بوو. واتە، ئەو سیستەمی بەرگرییەی ئەمەریکایەکان دایانمەزران، هەولی وەزارەتی بەرگری ئەمەریکی بۆ دروستکردنی مێتۆدێ بالا، ڕۆلێ سەرەکی لە گەشەدان بە دروستکردنی تەکنیکی کۆمپیوتەری نوێ و خستنەگەڕی نێتۆرك دی. بەلام کاتێ باس لە گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری لە ئەوروپا دەکرێ، دەشێ بە چین بەراوردی کرێ و ئاماژە بەوەکرێ کە گەشەی زانیاری لە چین لەچاو ئەوروپا کۆنترە و ئەمەش بە ڕۆلی چین لە دۆزینەوەی کاغەز و چاپی کتێب پێش ئەوروپا.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەشکرێ کە بۆ ئەوانەی پتر لەمبارەیەوە دەیانەوێ بەئاگابن واتە، ئەوی بە ڕۆلی چین یان ئەوروپا لە گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری تایبەتە، جۆرە خوێندنەوەیەك بۆ هەندێ لە نوێژینەوە و شیکردنەوەی هەندێ لە تیۆریزەکەرانی مێژوو (وەك موکیر Mokyr، جۆنزJones، کیان Qian، نێدهام Needham) گرینگە، ئەمەش لەبەرئەوەی تا بکرێ مرۆڤ ڕۆشنایێ زۆرتر بخاتە سەر دێیاتی پێوەندی هاریکاریانەی نێوان کۆمەلگا، تەکنیك و مێژوو.

لەبواری قسەکردن لەسەر تەکنەلۆژیای زانیاری و ئەوەی پێوەندی بە چینەوە هەبێ بە گەلێ شێوە دواتر دێینەوە سەری بەلام ئەوەی پێوەندی بە یەکیەتی سۆڤیەتەوە بێ بەرگی سێهەمی چاخی زانیاری بۆ تەرخاندەکرێ (واتە ئەو بەرگەی بەنێوی کۆتای هەزارینە لەلایەن کاستێلسەوە نووسراوە) و، لەوێڕا باسێ زۆر لەمەڕ بێتواناى دەولەتگەڕای(ئێتەتیزم) سۆڤیەت دێتەپێشەوە کە ئەم دەولەتە چۆن نەیتوانی شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری پەسەندبکا و خۆی لەتەك شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری ئەمەریکی هاوڕێگا بکا و ئەمەش- واتە ئەم دواکەوتن و فریانەکەوتنە- کارێ ئەوتۆی کرد کە ئەم دەولەتە دەسەلاتی

سەربازی خۆی بنێژێ و، هەر ئەم لایەنەش ڕۆل لە هەلومشانەوەی ئەم ئیمپراتۆڕیەتە ببینێ. هەرچی یابانە ئەوا باسێ جوداوازە و نموونەیەکە کە دەکرێ بەچاوێ ترەوە و جیا لەو چاوەی کە تەماشای چین یان سۆڤیەتی پێدەکەین، تەماشاکرێ.
گومان لەوەناکرێ کە تەکنەلۆژیای زانیاری هەر لە هەشتاکانەوە بووە بە نێوەندێ بۆ بە واقیعیکردنی پرۆسەی گۆڕان بوونیادنان لە بناعەی سێستەمی سەرمایەداری. ئەم گەشە و فۆڕم وەرگرتنەی سەرمایەداریش پێوەندی بە لۆژیکی پێشکەوتنی سەرمایەداری خۆیەوە هەیە. هەمە هەمان هەولی داوە، بۆ نموونە ئێتەیزمی سۆڤیەتی، بەلام نەیتوانیووە ئەو سەرکەوتنە بەدەستبهێنێ کە سەرمایەداری بەدەستیهێناوە. کەچی ئێتەیزمی چینی توانی ئەو سەرکەوتنە بەدەستبهێنێ، ئەمەش بە گوازتنەوە لە ئێتەیزمەوە بۆ سەرمایەداریێ دەولەتی و خۆ خستنە ناو نێتۆرکی گلوبال، هەروەها لە پراکتیکدا زۆرتر لە مۆدێلی گەشەی دەولەتی سەرمایەداریێ ئاسیایی ڕۆژهەلاتیەوە نزدیکدەبێتەوە وەك لە سۆسیالیزمێ شێوە چینی(دواتر کاسێتلس وردتر دێتەوە سەر ئەمانە لە بەرگی سێهەمی کارەکەی- واتە کۆتای هەزارینە کە دول بەرگی چاخی زانیارییە).
سەرباری ئەوە، ئابوودی ئێتەتیزم ( لەگەل ڕیزێ ڕیزپەڕدا، بۆ نموونە ڤێتنام، کۆریای باکوور وکوبا کە هەولدەدەن خۆیان بخەنە ناو سەرمایەداری گلوبالەوە) پەیوەندیێ نزدیکی لەنێوان سێستەمی تازەی سەرمایەداری گلوبال و هاتنی زانیاریگەریی خولقاندووە، کە خودی ئەوە لەلایەن ئەو سەرکەوتنە ڕێژمییەی سەرلەنوێ بوونیادنان (کە کاستێلس ناوی پێرۆسترۆیکاشی لێدەنێ) و هاتنی زانیاریگەریی، وەك بناغەێ تەکنیکی و ماتریالی نوێی ڕێکخستنی کۆمەلگە و چالاکی ئابووری، فۆڕمداردەکرێ. ئەلبەتە بەپێی ئەو مێتۆدەی کاری لەسەر دەکرێ پرۆسەکان(سەرلەنوێ بوونیادنانی سەرمایەداری، زانیاریگەریێ نەشونماکراو) لەیەکدی جوداوازن. نەك هەر ئەوە بەلکو شیاوە ئاماژە بەوەش کرێ کە لەڕووی تیۆریەوە مەرجە جیاوازی لەنێوان سەرمایەداری، ئێتەیزم، پیشەسازیگەری Industrialism و زانیارگەریی Informationalism داکرێ. ئەمەش دەشێ بە ترادیسۆنێ ناسراو لەبواری تیۆرییەکان لەمەڕ پاش پیشەسازیگەریی Postindustrialism و زانیاریگەریی لەقەلەمدرێ، کە دەستپێکی ئەم جۆرە کارەش بۆ کارە کلاسیکیەکانی کۆمەلناسی فەڕەنسی ئالێن تورێن (لێرەدا مەبەست کتێبی کۆمەلگەی پاش پیشەسازییەکەی ئالان تۆرێنە) و کۆمەلناسی ئەمەریکی دانیال بێل Bell

Daniel (لێرەدا مەبەست کتێبی هاتنی کۆمەڵگەی پاش پیشەسازییەکەی دانیال بێلە) دەگەڕێتەوە، ئەمەش بە جوداکردنەوە لەنێوان پێش پیشەسازیگەریی Preindustrialism، پیشەسازیگەریی و زانیارگەریی (یاخود پاش پیشەسازیگەریی) دا. ئەم جیاکردنەوەیەش پەسەندترە دەکرێ لەو جوداکردنەوەیەی لەنێوان سەرمایەداری و ئێتەیزم (یان کۆلێکتڤیزم، ئەوی کە بێل ناویدەبا) دا دەکرێ. ئەلبەتە گەر هەردوو لاکە بۆ دەستنیشانکردنی (کارەکتێریزەکردنی) کۆمەڵگا بەکارببرێ (ئەو کات ئێتەیزمێ پیشەسازی، سەرمایەدارییێ پیشەسازی، . . . هتد مان دەستدەکەوێ)، واتە گەر مرۆڤ بیەوێ لە دینامیکی کۆمەلایەتی بگا گرنگە مەودای شیکردنەوە و وابەستەی دولایەنی ئیمپیری لەنێوان شێوازی بەرهەمهێنان (سەرمایەداری، ئێتەتیزم) و شێوازی گەشەکردن(پیشەسازیگەریی، زانیاریگەریی) لەبەرچاوبگرێ.

لەڕاستیدا ئەو شیکردنەوەیەی لە بەشی یەکەمی کتێبی چاخی زانیاری (واتە گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك) دا پیادەدەکرێ شیکردنەوەێ تایبەتە (سپێسفیکە) و، کتێبەکە دیراسەی بوونیادێ کۆمەلایەتی نوێ دەکا کە گشت سەرزەوی گرتۆتەوە و، هەروەها ئەم جۆرە بوونیادە لە فۆڕمی جۆراوجۆر دا گوزارە لە خۆی دەکا و لە ڕەهەندی جیاجیای کولتووری و دامەزراوی دا دەردەکەوێ. ئەم بوونیادە کۆمەلایەتیە نوێیەش بە هاتنی فۆڕمێ تازە لە گەشە، و بە زانیاریگەرییەوە گرێدراوە کە لەڕووی مێژوویەوە لە کۆتای سەدەی نۆزدە بەولاوە بەهۆی گۆڕانی بوونیادی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەدارییەوە فۆڕمی بەخۆوە گرتووە.

بەبێ گومان ئەو دیدە تێۆریەی لەپشت ئەم هەولەوەیە ئەوەیە کە، کۆمەڵگەکان لەدەوری پرۆسەیەکی مرۆڤایەتی ئەوتۆوەڕێکدەخرێن (ئۆرگەنیزەدەکرێن) کە لەلایەن پێوەندی مێژووی دیاریکراوی بەرهەمهێنان، ئەزموون و دەسەلاتەوە بوونیاددەنرێن. نابێ ئەوەش لەیادکەین کە هەریەك لەوانەش (بەرهەمهێنان، ئەزموون و دەسەلات) پێناسەی تایبەتی خۆی هەیە. بۆنموونە، بەرهەمهێنان کردەی ناسیاوی مرۆڤایەتیە بەرامبەر بە سروشت و هەولێکە لەلایەن مرۆڤەوە بۆ گۆڕین و بەکاربردنی شتە ماتریالیەکان و وەبەرهێنانی بەپێی ئامانجی دیاریکراو. بەرهەمهێنان بەپێی پێوەندی چینایەتی ڕێکدەخرێ و هەر ئەو پێوەندیەش ئەوە دیاریدەکا کە چ سوبژێکتێ مرۆڤایەتی دەکارێ بەرهەمهێنان دابەشبکا و یان بەکاربەرێ. ئەم سوبژێکتەش بەپێی شوێنی لە پرۆسەی بەرهەمهێناندا ئەوە دەکا. بەلام ئەزموون کردەی سوبژێکتی مرۆڤایەتیە

بەرامبەر بە خودی خۆ، کە لەلایەن پێوەندی هاوبەشی نێوان ناسنامەی کولتووری و بیۆلۆگیانەوە و، لە پەیوەندی بە ژینگەی سروشتی و کۆمەلایەتیانەوە دیاریکراوە. ئەزموون لە دەوری پێوەندی نێوان ژیندەر/ سێکسی جۆراوجۆر بوونیاددەنرێ. لەڕووی مێژوویشەوە لە خێزاندا ڕێکدەخرێ و بە دەسەلاتی پیاو بەسەر ئافرەتەوە دەناسرێتەوە. ئەوە پێوەندی نێوان خێزان و سێکسوالیتێشە کەسێتی و ئەو هاریکارییە سیمبۆلییە بوونیاددەنێ کە لەسەرەوە باسکرا. کەچی دەسەلات پێوەندیە لەنێوان سوبژێکتی مرۆڤایەتی کە، لەسەر بناغەی بەرهەمهێنان و ئەزموون، بەهۆی بەکاربردنی زەبری سمبۆلی یان فیزیکییەوە هەندێ سوبژێکت مەجبوور دەکا ویستی سوبژێکتی دی پەسەندبکا. چونکە دەسەلات لە دەولەت و دامەزراوە زەبروزەنگاویەکانی دا دروستدەبێ. ئەمەش فوکۆ بە میکرۆفیزیای دەسەلات ناویدەبا. گەیاندنی سیمبۆلی نێوان ئیندڤیدەکان و، نێوان مرۆڤ و سروشت لەسەر بناغەی بەرهەمهێنان، ئەزموون و دەسەلات دروستدەبێ و ئەمەش کولتوور و ناسنامەی کۆلێکتیڤی بەرهەمدێنێ.

ئاشکراشە کە لە 1900 ەکاندا دوو شێوازی بەرهەمهێنان لەئارادابوونە. سەرمایەداری و ئێتەتیزم. ئەوی یەکەم بایەخ بە زیادکردنی قازانج دەدا و بەلام ئەوی دووەم هەولی بەرزکردنەوەی دەسەلات دەدا. ئەمەش بەهۆی زیادکردنی توانای ئایدیۆلۆژی و سەربازی دەزگای سیاسی دێتەدی. ئەلبەتە پەیوەندی بەرهەمهێنانی کۆمەلایەتی، و شێوازی بەرهەمهێنانیش بەوەوە پێوەندی هەیە کە قازانج چۆن بەکاردەبرێ. مەسەلەی بەکاربردنی ئەو قازانجەش لە ژیانی بەرهەمهێناندا پرسیارێ گەورەیە. ئاستی بەرهەمهێنانیش لەخودی خۆیدا بە پیوەندی نێوان کار و مادە و چۆنیەتی بەکاربردنی ئامرازی بەرهەمهێنان بە یارمەتی وزە و زانینەوە وابەستەیە. ئەم پرۆسەیەش لەلایەن پێوەندی بەرهەمهێنانی تەکنیکەوە دەستنیشاندەکرێ کە خودی گەشەکردن دیاریدەکا. شێوازی گەشەی زانیاری نوێ بۆ توانای خولقانی تەکنیکی بەرهەمهێنانی زانین، تەکنیکی کردەی-ڕەفتاری- زانیاری و تەکنیکی گەیاندنی سمبۆلی سەرچاوەیە. بەبێگومان زانین و زانیاری لە گشت فۆڕمەکانی گەشەکردندا ئامرازی سەرەکین. چونکە پرۆسەی بەرهەمهێنان هەمیشە لەسەر ئاستی زانینی دیاریکراو و چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەتەك زانیاریدا دادەمەزرێ.

بۆ بەهێزکردنی شیکردنەوەکان لەبارەی زانیاریەوە دەکرێ جیاوازی لەنێوان زانین Knowledge و زانیاری Information بکرێ و. بۆ ئەو مەبەستەش

شیاوە پشت بەو پێناسەیە ببەسترێ کە دانیال بێل بۆ" زانین"ی کردووە. بەپێی پێناسەکەی بێل بێ بۆ زانین دەشێ بەزمانی ئەوەوە بووترێ کە زانین تێکەڵێکە (کۆمپلێکسێکە) لە وتنی ڕێکخراو لەبارەی فاکتە یان دید کە نوێنەرایەتی بڕیارێ بیرلێکراو یان ئاکامێ بەئەزموون دەکا و لەمیانەی میدیۆمی گەیاندنەوە لە فۆرمێ سیستەماتیکدا بەوانیتر دەگەیێندرێ. بەلام سەبارەت بە زانیاری ئەوا هەندێ نووسەر هەیە کە پێناسەیان بۆ کردووە، بۆ نموونە پێناسەکەی ماشیلوپ Machilup کە زانیاری بریتیە لە گەیاندنی زانین، بەلام پێمانوایە ئەمە - کە ئەمە دیدی بێلە- پێناسەیەکی زێدەڕۆتیاکراوە. بۆیە بەپێویستی دەزانین بۆ ئەم مەبەستە، بۆ پێناسەکردنی زانیاری بگەڕێتەوە بۆ ئەو پێناسەیەی مارك پۆڕات Marc Porat لەم بارەیەوە لە کارێ کلاسیکی خۆیدا کردوویەتی. پۆڕات پێیوایە کە زانیاری کۆمپیوتەرە کە ڕێکدەخرێ (ئۆرگەنیزەدەکرێ) و دەشگەیێنرێ.
لەبەرئەوەی شێوازی گەشەی زانیاری بەهەمان شێوە کردەی زانینە دژ بە خودی زانین کە ئەوەش سەرچاوەێ سەرەکییە بۆ توانای بەرهەمهێنان بۆیە بەبێگومان دەکرێ ئەوە بووترێ کە گشت فۆڕمێ یان شێوازێکی گەشە بوونیادێکی خۆی هەیە کە خۆی لەسەر دروستدەکا یان ڕێکدەخا. کەوابێ بەرهەمهێنان پێوەندیەکی زۆری بە تەکنیکی زانیاریەوە هەیە. ئەو شێوازە گەشەکردنە نوێیەش ئەوڕۆ لە دونیادا لەگەڕدایە بە شێوازی زانیاریاوی ناودەبەین و، هەروەها ئەم شێوازە تەکنەلۆژیایەکی زانیاری دامەزراندووە کە لەسەر بناغەی پاڕادیگمێ تەکنیکی نوێ بوونیادنراوە. هەموو شێوازێکی گەشەش بوونیادێ دیاریکراوی هەیە کە دواتر خۆی لە دەوری پرۆسەی شێوازێکی تەکنیکیدا بوونیاددەنێ. بۆ نموونە پیشەسازیگەریی بایەخی بە نەشونمای ئابووری دا، واتە بەرزکردنەوەی ڕادەی بەرهەمهێنان. وەلی زانیارییگەریی خولیای پەرەدان بە تەکنیکی کەوتەسەر، واتە کەڵەکەبوونی زانین و ئاڵۆزگەرایێ بالا لە کرداری زانیاریدا. بەمجۆرە، لە قۆناغی زانیاریگەریدا گەڕان بەدووی زانین و زانیاری لە لوتکەدا دەبێ و ئەمەش وەزیفەی (فونکشونی) بەرهەمهێنانی تەکنیکی دیاریدەکا.
هەروەها تەکنەلۆژیا و پەیوەندی بەرهەمهێنانی تەکنیکی لە پاڕادیگمدا ئۆرگەنیزەدەکرێ کە ڕیشەی لە کۆمەڵگەدا هەیە. شێوازەکانی پەرەپێدانیش فۆڕم بۆ گشت ڕوخسارە کرمەلایەتیەکان دادەڕێژن. ئەمەو دەکرێ بووترێ کە زانیاریگەریی بەپشتبەستن بە تەکنەلۆژیای زانین و زانیاری بوونیاددەنرێ.

واتە دەبێ ئێمە بۆلەمەولا چاوەڕوانی ئەوەبین کە فۆڕمی نوێی مێژوویی لە گۆڕانی کۆمەڵایەتی، لە کاریگەریی هاوبەشی کۆمەڵایەتی و لە کۆنترۆلی کۆمەلایەتیەوە نەشونمابکا. لێرەوە دەکرێ ئەو مەرجە هەنووکە و مێژووییەی گەشەی ئابووری و تەکنیکی ئەیخولقێنێ لەبەرچاوگیرێ. ئەوەش کە دەکرێ وەك فاکتەیەکی مێژوویی تەماشاکرێ ئەوەیە کە پرۆسەی سەرلەنوێ بوونیادنانی سەرمایەداری پاراديگمی تەکنەلۆژیای زانیاریی فۆرمدارکردووە و، ئەمەش لە 1980 کانەوە وەگەڕکەوتووە. ئەمەش وایکردووە سیستەمی تەکنۆ-ئابووری نوێ بە سەرمایەداری زانیاری ناوببرێ. ئەلبەتە ئەو هەلاوسانەش Inflation کە لە سەرەتای هەفتاکاندا بەبۆنەی بەرزبوونەوەی نرخی نەوتەوە ڕویدا بوو بە بناغەێ بۆ پێگەوەکارکردنی هەندێ لە حکومەت و کارگەکان بۆ دروستکردنی سەرلەنوێ بوونیادنان لە پرۆسەیەکی پراگماتی، کە خودی ئەم پرۆسەیە تا ئەمڕۆش لەئارادایە. ئەمەش توانرا بەهۆی هەولێ زۆر دیاریکراو بۆ تیبەتکردن و هەلوەشانەوەی کۆنتراکتی نێوان سەرمایە و کار بێتەدی. ئەم کۆنتراکتەش بۆ جێگیری (ستابلیتێی) مۆدێلی گەشەی پێش تەکنەلۆژیای زانیاری بناغەیێ گرنگ بوو. واتە نوێکردنەوەی تەکنیك و گۆڕانی ڕێکخراوەیی مانایێ زۆر گەورەی بە خێرایی و کاریگەریی ئەو سەرلەنوێ بوونیادنانە بەخشی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا. ئەمە مانای ئەوەیە کە بەبێ تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ دەکرا سەرمایەداری گلوبال ببایە بە واقعێ (ڕیالیتێیێ) سنووورداری بەهێز. زانیاریگەریی هەمیشە خۆی بە فراوانی سەرمایەداری و خۆلاوترکردنەوەوە بەستۆتەوە کەچی پیشەسازیگەری خۆی بە پێکهاتەی خۆی وەك شێوازی بەرهەمهێنان گرێدەدا. هەرلەبەرئەوەش دەکرێ بووترێ کە کۆمەلگە زانیاریەکان کۆمەلگەهایەکی سەرمایەدارین و بەلام کۆمەلگە پیشەسازیەکان دەولەتی بوون. هەروەها لە کۆمەلگە زانیاریەکاندا فرە ڕەهەندیێ کولتووری و دامەزراوەی بەدیدەکرێ کە لە کۆمەلگەکانی پێشووتر بەدینەدەکرا. کە باسیش لە کۆمەلگە زانیارییەکان دەکرێ گرنگە دانبەوەدابنرێ کە، ولاتاهایەکی وەك ئیسپانیا، چین یان بەرازیل لە گۆڕەپانی گلوبالی سەرمایەداری زانیاری دا ون نیین و، بەهۆی ئەو خێرای گەشە و دۆزی بەکۆمپیوتەرکردنەی لەوێرا لەگەڕدایە ئەم ولاتانە (چین، ئیسپانیا، بەرازیل و ئەلبەتە یابانیش) لە ئایندەدا دەبن بە کۆمەلگەهایکی زانیاری هەروەك ولاتە یەکگرتووەکان. لێرەوە دەکرێ دەرك بەوەکرێ کە کلیلی پرۆسەی بەرهەمهێنانی زانین، بەرهەمهێنانی ئابووری، دەسەلاتی سیاسی- سەربازی و گەیاندنی

میدیا لەلایەن پاراديگمی نێودەولەتیەوە بەقوولی گۆڕاوە و ئەمەش بە نێتۆرکی گلوبالی دەولەمەندی، دەسەلات و سمبۆلیەوە بەستراوەتەوە و، ئەمە لۆژیکێکیشە کە تێکڕای شتەکان دەباتەڕێووە. سەرباری ئەوە دەشێ بووترێ کە گشت کۆمەلگەکان لەژێر کاریگەریی سەرمایەداری و زانیاریگەریدایە و گەلێ لە کۆمەلگەکانیش، لەگەل لەبەرچاوگرتنی جیاوازی ژینگەی کولتووری و دامەزراوەیی نێو کۆمەلگەکان، بەزانیاریکراوە. بەواتایەکی دی، تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ دەخوازێ جیهان لە نێتۆرکێ گلوبالیدا بەکخا. بەتەماشا کردنێکی کاراکتێری ئاراستەی سیاسی و کۆمەلایەتی سالانی نەوەتەکانیش ئەوە ڕووندەبێتەوە کە کردەی کۆمەلایەتی و سیاسەت لە دەوری ناسنامەی بناغەیی دروستکراوە، کە هەولی ئەم ناسنامانە بۆ ئەوەیە کە مانایەك لەڕووی مێژوویی و جوگرافیەوە دابینبکەن. یەکەم هەنگاوی کۆمەلگە زانیارییەکانیش ئەوەبوو کە ناسنامەکان لە دەرەوەی ڕۆلی بەرجەستەی ناسنامە دەستنیشان بکەن. بەلام ناسنامە بەخۆی پرۆسەیەکە بریتییە لە ئاکتۆری کۆمەلایەتی کە لەسەر بناغەی ڕوخساری کولتووری مانا بۆخۆی دروستدەکا. گەواهی ناسنامەش بەو مانایە نایێ کە خۆ بەناسنامەیەکی ترەوە گرێدەدا- هەروەك ئەوەی تائێستاش ئافرەت خۆی بە پیاوەوە دەبەستێ- یان لێگەڕێی کە ناسنامە دەست بەسەر کۆمەلگەدا بگرێ - هەروەك کۆششی فۆندەمینتالیستی ئاینی بۆ گۆڕینی هەموو شتێ-. بەلام پێوەندییە کۆمەلایەتیەکان کە ناسنامە دیاریدەکا لەدەرەوەی ڕوخسارە کولتووریەکان پێناسەدەکرێن. گرنگیشە دیاردەی کاراکتێرە نوێیە مێژوویەکان لەبیرنەکرێن. سەبارەت بە شوێنێ وەك ئەمەریکاش گرنگە ڕۆلی گەورەی ناسنامە لە ناساندنی سیاسەت لە کۆمەلگەی ئەمڕۆی ئەمەریکی-لە دیاریکردنی بزووتنەوەی ئافرەتان، بزووتنەوەیGay (واتە بزووتنەوەی هۆمۆسێکسوێلی) و بزووتنەوەی مافی هاولاتیان- لەبەرچاوبگیرێ. ئەوەی کە ئەمڕۆش لە گشت جیهاندا بەدیدەکرێ ئەوەیە کە ئاراستەیەکی دژ و مەودایەك لەنێوان جیهانگیری و ناسنامە، لەنێوان نێت و خود دا لەگەشەکردندایە. ئەمەش بەخۆی شایانی لێخوردبوونەوەیە. لێرەدا ئاماژەبە ئالێن تورێن دەکەین کە هەرزوو لە لێکولینەوەکانی سەبارەت بە کۆمەلگەی پاش پیشەسازی ئەوەی بۆ دەستنیشانکردوین کە لە کۆمەلگەی پاش پیشەسازیدا مەسەلەی کولتوور شوێنی شمەکی ماتریالی دەگرێتەوە.

بەجۆرێ تر، بە چوونە ناو تەکنەلۆژیای زانیارییەوە بایەخدان بە ناسنامە لە گەشەکردندا دەبێ. نەك هەر ئەوە بەلکو لە ولاتانی ئەوروپای ڕۆژهەلاتدا،

یان لە کۆمەڵگەکانی پۆست کۆمۆنیزم دا، گەڕان بەدووی ناسنامەی تازە و بەتەنگەوەهاتنی دروستکردنی خودێ جەماعی (کۆلێکتیڤ) و نەشونمای ناسیۆنالیزم هاتۆتە ئارا و لە ولاتانی رۆژئاواش مەسەلەی رق لەبێگانەبوون لە گەشەکردندایە. تەنانەت سەرهەڵدانێ باشی بزوونەوەی فۆندەمینتالیستشی لەئارادایە کە پێوەندی بە جۆرێ لە فەیرانی دامەزراوەی و ئاقاری گلوبالەوە هەیە. ئەم بزووتنەوە فۆندەمینتالیستییەش لە قۆناغێکدا بەجۆرێ ئەوتۆ بلاودەبێتەوە کە گشت شوێنێ دەگرێتەوە.
مەرجە هەر لەسەرەتاوە ئەوە روونکەینەوە کە ئەم کتێبە (گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك) -کە بەشی یەکەمی کتێبە سێ کوچکەیە کەمانە لەسەر چاخی زانیاری - لەبارەی کتێبی ترەوە نییە. هەروەها گفتووگۆ لەسەر دیدە ئامادەبووەکان لەبارەی پاش پیشەسازیکەریی یاخود کۆمەڵگەی زانیاری ناکا. دەکرێ مرۆڤ لەم بارەیەوە، بۆ نموونە سەبارەت بە تیۆریە سۆسیۆلۆژیەکان لەمەڕ پاش پیشەسازیکەریی و کۆمەڵگەی زانیاریی بۆ داڤید لیۆنDavid Lyon (کتێبی کۆمەڵگەی زانیاریی) بگەڕێتەوە و، لەبارەی سەرچاوە زاراوەیی و روناکبیرییەکان بۆ واتای جۆراوجۆری کۆمەڵگەی زانیاریی بۆ یویکی ئیتۆIto Youichi و چەند کەسێ تر بگەڕێتەوە. بەلام سەبارەت بە دیدی رەخنەیی بۆ پاش پیشەسازیکەریی دەکرێ بۆ داڤید لیۆن، تۆرین و کەسانێ دی بگەڕێتەوە. بەلام هەرچی بە رەخنەی کولتووری کۆمەڵگەی ئەمرۆمان لە تەکنەلۆژیای زانیاری تایبەتە دەشێ بۆ نیل پۆستمان N. Postman بگەڕێتەوە. هەر لەرووی مێتۆدیشەوە بەباشی دەزانین ئاماژە بەوە کرێ کە لەم کارەدا هیچ ئاوڕدانەوەیێ بۆ پۆست مۆدێرنیتێ لەئارادا نییە و ئەوی داڤید هارڤی David Harvey لەم بارەیەوە، بۆ رەخنەگرتن لە گروندی ئیدیۆلۆژی و کۆمەلایەتی پۆست مۆدێرنیتێ، کردوویەتی سەرچاوەیێ باشە و، لەهەمانکاتدا بەگرنگی دەزانین ئاماژەبەوەکرێ کە لەم بەرهەمەدا کەڵکێ زۆر لە روانینەکانی ئالان تۆرین و دانیال بێل، لە بارەی زانیاریکەرییەوە، وەرگیراوە. جگەلەوە لە گەلێ شوێندا بۆ تیۆریزەکەرێ مارکسیستی (نیکۆس پۆلانتزاکی)، کە پێش مەرگی دیدی شایستە و نوێی هەبوو، گەڕاوینەتەوە.

بەشی یەکەم:

# شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری

لە کۆتای سەدەی نۆزدەوە خۆمان لەنێو گۆڕانێ مێژوویدا دەبینینەوە و بە تێپەڕاندی قۆناغی تەکنیکی میکانیزمی پێدەنێینە نێو قۆناغێ تازەوە و، ڕووەو قۆناغی تەکنەلۆژیای زانیاریITدەڕۆین. ئەوەی پێشیدەوترێ کولتووری ماتریالیمان لەژێر زەبری پاڕادیکمی تەکنیکی نوێدا لە هەلاوگۆڕاندا دەبێ و وردە وردە خۆی لەدەوری تەکنەلۆژیای زانیاریدا ڕێکدەخا. بەبێگومان تێگەیشتنەکانی دانیال بێل و هارڤی برۆکس Harvey Brooks، لەبارەی ئەوەی پێیدەوترێ تەکنیکی نوێ، دەتوانن ڕێنومایێ زۆرمان بکەن. ئەمەش کە پێیدەوترێ تەکنەلۆژیای زانیاریی گشت ئالۆزییە تەکنیکیەکانی ناو میکرۆ ئەلەکترۆنی، کۆمپیوتەر، گەیاندنی تەلەفۆنیی نوێ، ئۆپتۆOpto ئەلەکترۆنی دەگرێتەوە. هەروەها لە سالانی 1990کاندا بیۆلۆگی (زیندەوەرزانی)، ئەلەکترۆنیك و زانستی زانیاری (ئینفۆرمەتیك) لەتەك دەوروبەریاندا لە گەشە و یەکخستنێ (ئینتگرەیشن) زۆردان. هەر لەمبارەیەشەوە و بەپشتبەستن بە دەربڕینێکی نیکۆلاس نیگرۆپۆنت Nicholas Negroponte، دەشێ بووترێ ئێمە ئەمڕۆ لە جیهانێکدا دەژین دیگیتالکراوە. ئەم جیهانەش جارێ ئەمە سەرەتاکەیەتی.

بەخۆی ئەوە شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیارییە کە ئێمە باسیدەکەین و، لەبارەی ئەم شۆڕشەشەوە گفتوگۆێ ئایدیۆلۆژی و پڕوپاگەندەێ زۆر لەئارادەیە کە ناکرێ وامانلێکەن کە مانای بناغەیی ئەم شۆڕشە لەیادکەین. ئەم شۆڕشە کە لەسەر بناغەی زانین و زانیاری دروستکراوە مەرجەکانی کار و شێوەکانی بەکاربردنی گۆڕیووە. کاتێ باس لە یەکەم شۆڕشی پیشەسازیشدەکرێ دەبێ لەوە بەئاگابین کە زانینی زانستی لە پشتیەوە بووە. ئەلبەتە سەرەتاکانی گەشەی تەکنیکی و بەشداری لە خولقانی ئەو شۆڕشە تەکنیکیەی هەمیشە باسدەکرێ بەریتانیا وەك یەکەم شوێنی دەستپێکی ئەم شۆڕشە ناوزەددەکرێ. بەلام دواتر نێوەندی تەکنەلۆژی تر لە دونیادا، وەك بۆستون، بەرلین و نیویۆرك، سەرهەلدەدا. بەخۆی مێژووکردان ئاماژە بەوەدەکەن کە دووجۆرە شۆڕشی پیشەسازی هەبووە. یەکەمیان ئەوەبووە کە لەژێرسایەی سەدەی هەژدە ڕوویداوە و ئەویتریش ئەوەیە کە سەد سال لەمەوبەرێك دەستیپێکردووە.

بەدڵنیاییەوە دەکرێ بووترێ کە ئەمی دووەم پتر سەرنج ڕاکێشترە و بەهاتنەکایەوەی پەرەپێدانی ئەلەکترۆنی، دەرکەوتنی زانستی پشتبەستوو بە کیمیاسازی و وەگەڕکەوتنی تەکنیکی گەیاندن (تەلەگراف و تەلەفۆن) بلاودەبێتەوە. لەنێوان ئەم دوو شۆڕشەشدا دەکرێ باس لە جۆرە بەردەوامگەرییێ یان جیاوازیێ بناغەیی بکرێ کە خالی هاوبەشی ئەو زانینیە زانستیە بووە کە ڕۆلی سەرەکی لە گەشەی تەکنیکدا دیووە. لەکاتی باسی ئەم دوو شۆڕشەدا، کە پاشان بناغەی بۆ گەشەی تەکنیك دانا، ئەوەی پێیدەوترێ ولاتانی ڕۆژئاوا سەرییاسن. هیچ شتێکیش لە مێژووی جیهانی کولتووری، زانستی، سیاسی یاخود سەربازی پێش شۆڕشی زانستی ناتوانێ بالادەستی بەرچاوی ڕۆژئاوایی (ئەگلۆسیکسۆنی-ئەلمانی و فەرەنسی) لەماوەی 1750 و 1940ڕوونکاتەوە. لێرەدا گومانێ لە ڕۆلی چین لەم دەمووەختەدا-واتە لەماوەی سەدەی هەڤدە و سەدەی نۆزدەدا- لە خولقانی تەکنیك لەئارادانییە. هەرچی شارستانی ئیسلامییە (لێرەدا کاستێلس ئاماژە بەوەدەکا کە ئەگەر بکرێ ئەم گوزارەیە بەکارببرێ) لەم قۆناغەدا قەڕالسنانی خۆی لە گەلێ شوێندا بوونیادناوە(بەشێ گەورە لە دەریای ناوەڕاست، جگەلە هەندێ شوێن لە ئاسیا و ئەفەریقا). ئێمە کە بمانەوێ باس لەو ولاتانە بکەین کە زۆرتر و زووتر ڕۆلیان لە بەشداربوون لە بردنەپێشەوەی زانینی زانستی، ڕۆلی ئەو زانینە زانستیەش لە دروستکردنی تەکنیك دا، دیووە دەبینین هەمیشە بایەخێ گەورە بە بەریتانیای مەزن دەدرێ. ئەم دێیاتەش لەبارەی مێژووی تەکنەلۆژیا پێشتر بۆ گەلێ لە مێژووکردانی زانستی تەکنیك و زانینی زانستی بابەتی باس بوونە (بۆ نموونە: موکیر Mokyr، سینگەر Singer، ڕۆسینبێرگ Rosenberg، نیوهکۆمن Newcomen). کەچی دەبینین شۆڕشی دووەمی پیشەسازی بەزۆری بە زانینی زانستی نوێیوە وابەستە بووە و سەرچاوەکەشی پتر بۆ ئەلەمانیا و ولاتە یەککرتووەکان دەگەڕێتەوە. گومانی ناوێ گەر بووترێ گەشەی زانست لەڕووی جوگرافیەوە زۆرجار مەسەلەیەکە پێوەندی بە باری کۆمەلایەتی نەشونمای زانین و سێستەمی زانستیەوە هەیە. بەم جۆرە گرنگە داننان بە بوونی زنجیرەگەرییەك لە مێژووی شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری. چونکە ئەو جۆرە مێژووە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە تەکنیك و زانست بە چ جۆرێ و لە چ شوێنهابەکی ئەم دونیایەوە دەستی بەگەشەکردووە.

دەکرێ گۆڕانی ماکرۆی میکرۆتەکنیکی یان ئەو تەکنەلۆژیای زانیاریەی بناغەیێ ئەلەکترۆنی هەیە بۆ سالانی پێش 1940 (دۆزینەوەی ڕادیۆ و دواتر

تەلەفۆن) بگەڕێن ترێتەوە. دەشكرێ گرنگی بدرێ بە قۆناغی ماوەی جەنگی جیهانی دووەم و یان سەردەمی پاش جەنگ كە ئیدی ئەوەبوو كە تەكنەلۆژیای زانیاریی لەسەر بناغەی میكرۆ ئەلەكترۆنی دامەزرا. بەلام ئەوەی پێیدەوترێ تەكنەلۆژیای زانیاری نوێ و پاڕادیگمی تەكنیكی تازە بۆ یەكەمجار لەماوەی سالانی هەفتاكانا-1970- هاتەدی. بەمجۆرە لێرەوە مێژووی ئەو تەكنیكە دەستپێدەكا كە لەسەر بناغەی ئەلەكترۆنی گەشەدەكا (میكرۆتەكنیك، كۆمپیوتەر و گەیاندی تەلەفۆن). هەر دوابەدوای ئەم گەشە تەكنیكیە ئەلەكترۆنیە توانرا ئەم گۆڕانكاریانە بگوێزرێتەوە بواری زیندەوەرناسیش (گۆڕینی زیندەر و تادەگاتە تاقیكردنەوەكانی DNA).

كاتێ باس لە دۆزینەوە و داهێنانەكانی تەكنەلۆژیای زانیاری لەماوەی سالانی1970 دەكرێ مەرجە ئەوە لەیادنەكرێ كە ولاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا دەبێ بە شوێنگەی ئەم دۆزینەوە و داهێنانانە و، بەتاكیدیش هۆكاری سەرەكیش هەن كە ڕۆلیان لەم ڕووەوە دیووە. بۆیە دەكرێ بووترێ كە ئابووری ولاتە یەككرتووەكان و سێستەمی سەرمایەداری جیهانی لەماوەی سالانی 1970 كانا، بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، دوچاری خورپەێكی گەورە بوو و ئەمەش وایكرد هەردوو (ولاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا و سێستەمی سەرمایەداری جیهانی ) هەولی ئەوەبەن كە دژ بەو خورپەیە و وەك پەرچەكرداریەكیش سەرلەنوێ بوونیادنان (گۆڕانی بوونیادی) بەرهەمبهێنن. ئەم پەرچەكرداریەش بەبێگومان خۆی لە دروستكردنی پاڕادیگمێ تەكنیكی نوێدا دییەوە یان جۆرە وەلامێ بوو بۆ ڕەتدانەوەی دەسەلاتی سۆڤیەتی و بردنەوەی گرەوی جەنگی ئاسمانی. ئەلبەتە ئاستی تەكنیكی سالانی 1970 كان گرنگی خۆی لە بەكاربردنی پرۆگرام لە بواری تەكنیكی نوێی سەربازی ئەمەریكیش دا دی (لەماوەی جەنگی ئەسێرەكان). هەمیشەش كە باس لەم شۆڕشە تازەیەی تەكنەلۆژیای زانیاری دەكرێ و ولاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا دەكرێ بە بنكەی، ئەوا بایەخێ زۆر دەخرێتە سەر كالیفۆڕنیا و بەتایبەت ناوچەی سیلیكۆن ڤالی Silicon Valley و ڕۆلی ئەم ناوچەیە لەبەرەوپێشەوە بردنی دۆزینەوە و داهێنان و توێژینەوە.

شیاوبیاسە، لەدوای سالانی هەشتاكان بەولاوە سەرمایەداری بەتایبەت كارگە گەورە وG7 (حەوت ولاتە پیشەسازیە گەورەكە) گۆڕانی بوونیادی و ڕێكخراوەی و ئابووری چاكیان بەخۆوە دی. ئەمەش كاریگەرێ زۆری تەكنەلۆژیای زانیاری بەسەرەوە بوو. واتە چوونە ناو سیستەمی زانیاری و

بەدلنیاییەوە دەکرێ بووترێ کە ئەمی دووەم پتر سەرنج ڕاکێشترە و بەهاتنەکایەوەی پەرەپێدانی ئەلەکترۆنی، دەرکەوتنی زانستی پشتبەستوو بە کیمیاسازی و وەگەڕکەوتنی تەکنیکی گەیاندن (تەلەگراف و تەلەفۆن) بلاودەبێتەوە. لەنێوان ئەم دوو شۆڕشەشدا دەکرێ باس لە جۆرە بەردەوامگەرێ یان جیاوازیێ بناغەیی بکرێ کە خالی هاوبەشی ئەو زانینیە زانستیە بووە کە ڕۆلی سەرەکی لە گەشەی تەکنیکدا دیووە. لەکاتی باسی ئەم دوو شۆڕشەدا، کە پاشان بناغەی بۆ گەشەی تەکنیك دانا، ئەوەی پێیدەوترێ ولاتانی ڕۆژئاوا سەرییاسن. هیچ شتێکیش لە مێژووی جیهانی کولتووری، زانستی، سیاسی یاخود سەربازی پێش شۆڕشی زانستی ناتوانێ بالادەستی بەرچاوی ڕۆژئاوایی (ئەنگلۆسیکسۆنی-ئەلمانی و فەرەنسی) لەماوەی 1750 و 1940ڕوونکاتەوە. لێرەدا گومانێ لە ڕۆلی چین لەم دەمووەختەدا-واتە لەماوەی سەدەی هەقدە و سەدەی نۆزدەدا- لە خولقانی تەکنیك لەئارادانییە. هەرچی شارستانی ئیسلامییە (لێرەدا کاستێلس ئاماژە بەوەدەکا کە ئەگەر بکرێ ئەم گوزارەیە بەکارببرێ) لەم قۆناغەدا قەڕالسنانی خۆی لە گەلێ شوێندا بوونیادناوە(بەشێ گەورە لە دەریای ناوەڕاست، جگەلە هەندێ شوێن لە ئاسیا و ئەفەریقا). ئێمە کە بمانەوێ باس لەو ولاتانە بکەین کە زۆرتر و زووتر ڕۆلیان لە بەشداربوون لە بردنەپێشەوەی زانینی زانستی، ڕۆلی ئەو زانینە زانستیەش لە دروستکردنی تەکنیك دا، دیووە دەبینین هەمیشە بایەخێ گەورە بە بەریتانیای مەزن دەدرێ. ئەم دێیاتەش لەبارەی مێژووی تەکنەلۆژیا پێشتر بۆ گەلێ لە مێژووکردانی زانستی تەکنیك و زانینی زانستی بابەتی باس بوونە (بۆ نموونە: موکیر Mokyr، سینگەر Singer، ڕۆسینبێرگ Rosenberg، نیوهکۆمن Newcomen). کەچی دەبینین شۆڕشی دووەمی پیشەسازی بەزۆری بە زانینی زانستی نوێوە وابەستە بووە و سەرچاوەکەشی پتر بۆ ئەلەمانیا و ولاتە یەکگرتووەکان دەگەڕێتەوە. گومانی ناوێ گەر بووترێ گەشەی زانست لەڕووی جوگرافیەوە زۆرجار مەسەلەیەکە پێوەندی بە باری کۆمەلایەتی نەشونمای زانین و سێستەمی زانستیەوە هەیە. بەم جۆرە گرنگە داننان بە بوونی زنجیرەگەرییەك لە مێژووی شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری. چونکە ئەو جۆرە مێژووە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە تەکنیك و زانست بە چ جۆرێ و لە چ شوێنهابەکی ئەم دونیایەوە دەستی بەگەشەکردووە.

دەکرێ گۆڕانی ماکرۆی میکرۆتەکنیکی یان ئەو تەکنەلۆژیای زانیاریەی بناغەیێ ئەلەکترۆنی هەیە بۆ سالانی پێش 1940 (دۆزینەوەی ڕادیۆ و دواتر

تەلەفۆن) بگەڕێن ترێتەوە. دەشکرێ گرنگی بدرێ بە قۆناغی ماوەی جەنگی جیهانی دووەم و یان سەردەمی پاش جەنگ کە ئیدی ئەوەبوو کە تەکنەلۆژیای زانیاریی لەسەر بناغەی میکرۆ ئەلەکترۆنی دامەزرا. بەلام ئەوەی پێیدەوترێ تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ و پاڕادیگمی تەکنیکی تازە بۆ یەکەمجار لەماوەی سالانی هەفتاکانا-1970- هاتەدی. بەمجۆرە لێرەوە مێژووی ئەو تەکنیکە دەستپێدەکا کە لەسەر بناغەی ئەلەکترۆنی گەشەدەکا (میکرۆتەکنیك، کۆمپیوتەر و گەیاندی تەلەفۆن). هەر دوابەدوای ئەم گەشە تەکنیکیە ئەلەکترۆنیە توانرا ئەم گۆڕانکاریانە بگوێزرێتەوە بواری زیندەوەرناسیش (گۆڕینی ژیندەر و تادەگاتە تاقیکردنەوەکانی DNA).

کاتێ باس لە دۆزینەوە و داهێنانەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری لەماوەی سالانی1970 دەکرێ مەرجە ئەوە لەیادنەکرێ کە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا دەبێ بە شوێنگەی ئەم دۆزینەوە و داهێنانانە و، بەتاکیدیش هۆکاری سەرەکیش هەن کە ڕۆلیان لەم ڕووەوە دیووە. بۆیە دەکرێ بووترێ کە ئابووری ولاتە یەککگرتووەکان و سێستەمی سەرمایەداری جیهانی لەماوەی سالانی 1970 کانا، بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، دوچاری خورپەیێکی گەورە بوو و ئەمەش وایکرد هەردوو (ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا و سێستەمی سەرمایەداری جیهانی ) هەولی ئەوەبەن کە دژ بەو خورپەیە و وەك پەرچەکرداریەکیش سەرلەنوێ بوونیادنان (گۆڕانی بوونیادی) بەرهەمبهێنن. ئەم پەرچەکرداریەش بەبێگومان خۆی لە دروستکردنی پاڕادیگمێ تەکنیکی نوێدا دییەوە یان جۆرە وەلامێ بوو بۆ ڕەتدانەوەی دەسەلاتی سۆڤیەتی و بردنەوەی گرەوی جەنگی ئاسمانی. ئەلبەتە ئاستی تەکنیکی سالانی 1970 کان گرنگی خۆی لە بەکاربردنی پرۆگرام لە بواری تەکنیکی نوێی سەربازی ئەمەریکیش دا دی (لەماوەی جەنگی ئەسێرەکان). هەمیشەش کە باس لەم شۆڕشە تازەیەی تەکنەلۆژیای زانیاری دەکرێ و ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا دەکرێ بە بنکەی، ئەوا بایەخێ زۆر دەخرێتە سەر کالیفۆڕنیا و بەتایبەت ناوچەی سیلیکۆن ڤالی Silicon Valley و ڕۆلی ئەم ناوچەیە لەبەرەوپێشەوە بردنی دۆزینەوە و داهێنان ، توێژینەوە.

شیاوپیاسە، لەدوای سالانی هەشتاکان بەولاوە سەرمایەداری بەتایبەت کارگە گەورە وG7 (حەوت ولاتە پیشەسازیە گەورەکە) گۆڕانی بوونیادی و ڕێکخراوەی و ئابووری چاکیان بەخۆوە دی. ئەمەش کاریگەرێ زۆری تەکنەلۆژیای زانیاری بەسەرەوە بوو. واتە چوونە ناو سیستەمی زانیاری و

گەیاندنی تەلەفۆنی تازە زەمینەی باشی بۆ یەکخستنی گلۆبالی بازاڕی مالی و دابەشکردنی کار و بازرگانی لە گشت جیهانا خۆشکرد و، بوو بە بناغەش بۆ پرۆسەی گۆڕانی بوونیادی سۆسیۆ-ئابووری. ئەو گەشەکردنە زۆرەی سالانی دواتریش(واتە سالانی نەوەتەکان)هەر بۆ ئەم چوونە ناو سیستەمی تەکنیکیە نوێیە دەگەڕێتەوە. ئەوی پاشان بەنێوی نێتۆرکیش دروستدەبێ بەری ئەم هەلاوگۆڕان و نەشونمایەیە کە دوچاری تەکنیك بوو. ئەم نێتۆرکەش نەدەهاتەدی گەر گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ و کۆششی کۆمەلگەی کۆن بۆ خۆ سەرلەنوێ چاککردنەوە لەمیانەی بەکاربردنی دەسەلاتی تەکنیك لەئارادا نەبایە.

کاتێ کە باس لە شۆڕشی یەکەمی پیشەسازی دەکرێ شانبەشانی بەریتانیا دەکرێ باس لە گرنگی ئەلەمانیا و فەڕەنساش بکرێ. هەروەها ئەو دۆزینەوە زانستیانەش کە لە بواری تەکنیکی نوێدا (ئەلەکترۆنی و بیۆلۆگی) دیسانەوە هەر بەریتانیا ناگرێتەوە بەلکو ئەلەمانیا، ئیتالیا و فەڕەنساش دەگرێتەوە. هەرچی ولاتی یابانە بەزۆری دەکرێ لە بواری نزدیکبوونەوەی تەکنیکی ئەلەکترۆنی نوێ لە ژیانەوە (فاکس، تەلەفۆن، کۆمپیوتەر، ڤیدیۆ. . . و) بەرباسخرێ. خودی ئەم تەکنەلۆژیای زانیاریەش کە سەرەتاکەی بۆ ئەمەریکا و شوێنێ وەك سیلیکۆن ڤالی دەگەڕێتەوە دواتر ڕووی لە ولاتانی تری ئەورووپای و ئاسیای نا بۆ بلاوبوونەوە. پاش چەند سالێکیش نەك هەر لە ئەمەریکا گۆڕانهاتە سەر شوێنی نێوەندی تەکنیکی نوێ و سەرهەلدانی هەندێ شوێنی دی (بۆنموونە باشووری کالیفۆرنیا، Boston، Austin،Seatlle) بگرە لە ولاتانی تریشدا گۆڕان هاتە سەر نێوەندەکانی تەکنیك و هەروەها سەرهەلدانی هەندێ ولاتی تر و شوێنی نوێ تر(چین، تایلاند، کۆریا، بەرازیل، ئەرجەنتین). واتە گۆڕان و گەشەکە تەنێ لەسەر ئاستی دەرەکی نەبوو بەلکو لەسەر ئاستی ناوخۆیش بوو. کەواتە جگەلە سەرهەلدانی هەرێم و ناوچەیتر لە دونیا لەناو خودی ئەو ناوچە و هەرێمانەدا شوێنی دی سەریهەلدا.

ئاشکراشە، ئەم بلاوبوونەوەیەی تەکنیك کاریگەری خۆی بەسەر گۆڕانی کۆمەلایەتی و ئابووریەوە بەجێهێشت و فۆڕمی کۆمەلایەتی نوێ خوولقاند و، ئەو پاڕادیگمی تەکنیکە نوێیەش بوو بە گروندی ماتریالی کۆمەلگەی زانیاری و، ڕەهەندێ کۆمەلایەتی نوێش لەئاکامی شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاریەوە هاتەکایەوە. زۆربەی ئەو ڕوونکردنەوانەش کە بۆ واتای پاڕادیگمی تەکنەلۆژی کراوە سەرچاوە لە کارەکانی چەند کەسانێکەوە هەلدەگرن کە ئەوانیش پشت بە کارە کلاسیکەکەی تۆماس کۆهن Kuhn دەبەستن.

# ئابووری زانیاری و پرۆسەی جیهانگیری

لەم دوو دەیەیەی دوایدا، واتە دوای هاتنەکایەوەی پاراديگمی تەکنەلۆژیای زانیاری، ئابووریێ تازە لە جیهانا هاتەکایەوە. ئەم ئابوورییە تازەیە ئابووریێ زانیاری و گلوبالە. ئەم ئابوورییە گلوبالە ئابووریەکی پێشبرکێ ئامێز و بەرهەمهێنەرە. زانیارگەری و سەرمایەداری بەپێی دروستبوونی ئەم ئابوورییە تازەیە
یەکانگیری یەکن و سیستەمێ بەرهەمهێنانی تایبەت بە خۆیانیان دروستکردووە. تاڕادەیەکی زۆریش بەرهەمهێنان سەرچاوەی بووژانەوەی ئابووری(Prosperity) نەتەوەکانە و تەکنیکیش گەورەترین فاکتەی بەرهەمهێنانە. لەم حالەتەشدا تەکنیك و بەرهەمهێنان دەکرێ وەك دوو ئامرازی گرنگ تەماشاکرێ بەلام نەك وەك تاکە ئامرازێ. هەردوای ئەو گەشە گەورەیەی تەکنیك کە کاریگەریی بەسەر گەشەی سەرمایەداریشەوە بەجێهێشت ئەوەبوو لە ناوەندی هەشتاکانەوە زۆربەی دەولەتەکانی جیهان ڕوویان لە ئازادکرنی بازاڕ و تایبەتکردنی (پریڤاتیسێرەکردنی) کارگە ڕەسمییەکان و و بەتایبەت کارگە ستراتیژەکان، لەوانە کەرتە سوودبەخشەکان (وەك وزە، گەیاندنی تەلەفۆن، مێدیا و مالی) کردەوە. ڕەنگە ئەم لیبرالیزەکردن و پریڤاتیزەکردنە بۆ هەندێ لە ئابووریەکان و بەتایبەت ئابووری ولاتانی ئەمەریکای لاتین (ئەرجەنتین، بەرازیل، شیلی، پێرۆ) بووبێتە هۆی شیاویی و وەبەرهێنان و مۆدێرنیزەکردنی بەرهەمهێنان و گەشەدان بە تەکنیك. بەلام ئەم پریڤاتیزەکردنە لەخودی خۆیدا میکانیزمی پەرەسەندن نیە. لە ئابووریەکی سەرمایەداری گلوبالکراودا ئەوە- واتە پریڤاتیزەکردنەکە- هەمیشە بناغەیە بۆ گەشەێ ئابووری.
ئەلبەت ناکرێ ئەوە لەیادکرێ کە ئابووری گلوبالی زانیاری ئابووریەکی بەسیاسەتکراوە. واتە ئەوی ناوبرا ئابووری تازە (کە خۆی ئەو ئابوورییە گلوبالە زانیارییە یە کە هەمیشە باسدەکرێ) لەسەر بناغەی گۆڕانی بوونیادی سۆسیۆ-ئابووری و شۆڕشی تەکنیکی دروستدەکرێ. هەر ئەم ئابووریەش

لەهەندێ حالەتدا لەلایەن پرۆسەی سیاسیەوە و لەلایەن دەولەتەوە فۆرمداردەکرێ.
گرنگە باس لەوەکرێ کە، کاتێ هەچ وێنەیەك لەبارەی پرۆسەی پەرەسەندنی مێژوویی ئابووری زانیاری نوێ دەدرێ بەدلنیاییەوە ئەو وێنەیە شێوەیەکی ئالۆز وەردەگرێ. هەر لەوێشدا هەست بەوەدەکەین کە ئابووری زانیاری سیستەمێ سۆسیۆ-ئابووری تایبەتی هەیە کە لە ئابووریەکانی تر( بۆنموونە لە ئابووری پیشەسازی کە نە ئابوریێ گلوبال و نەش ئابووریێ زانیاریاوی بووە) جوداوازە. لەناو ئەم ئابووریە نوێیەدا سێستەمی بەرهەمهێنان لەسەر بناغەی زانیاری و زانینێ زانستی بوونیاددەنرێ. ئەمەش بەپێیئەوەی کە زانین و زانیاری لە گەشەی ئابووری ئەمڕۆدا - لێرەدا لەم وشەی ئەمڕۆیە مەبەست ئابووری تازەیە- مەسەلەیەکی سەرەکییە. واتە، ئەو پاڕادیگمە تەکنیکیە نوێیەی لە سالانی هەفتاکانا هاتەکایەوە بووە هۆی گۆڕینی ئەندازە و دینامیکی ئابووری پیشەسازی و، بەهۆی هاتنە دونیای ئابووری گلوبالیشەوە ڕێگایەکی نوێی بۆ پێشبڕکێ لەدایکبوو. ئەم پێشبڕکێ نوێیەش، کە لەنێو کارگەکاندایە و لەلایەن دەولەتەوە چوارچێوەدارکراوە، بووە هۆی گۆڕانی کردەی تەکنیکی پرۆسێس و بەرهەم کە دواتر وای لە هەندێ کارگە و هەندێ کەرت و بەرهەم کرد کە پتر بەرهەمهێنەربن. ئەوی لێرەدا مەبەستە بووترێ ئەوەیە کە، گوازتنەوە لە پیشەسازییگەرییەوە بۆ زانیاریگەریی بەراوردکاریێ مێژوویی نییە بۆ گوازتنەوە لە ئابووری کشتوکالیەوە بۆ ئابووری پیشەسازی و ناشکرێ ئەمە بەهاتنی ئابووریێ خزمەتگوزاری هاوجێگاکرێ. چونکە کشتوکالی زانیاری، پیشەسازی دروستکردنی زانیاری و چالاکی خزمەتگوزاری زانیاری کە ئەمانە بەرهەمدێنن و دابەشدەکەن لەسەر بناغەی زانین و زانیاری دروستبوونە. ئەمەش بەهۆی گەشەی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە لە پرۆسەی کاردا بەرجەستەبووە.
هەروەك لەسەرەوە ئاماژەکرا ئابووری زانیاری ئابووریێ گلوبالە. ئابووری گلوبالیش ڕاستیێ نوێی مێژوویيە و شتێکیشە خۆی لە ئابووری جیهان جیادەکاتەوە. ئابووری جیهان، بەپێی ئەوەی فرناند برۆدێل و ئیمانوێل والشتاین Immanuel Wallstein فێرماندەکەن، ئەو ئابووریەیە کە کەلەکەبوونی سەرمایە تیایا خۆی ڕوەو گشت جیهان بلاودەکاتەوە. ئەمەش لە ولاتانی ڕۆژئاوادا بۆ سەدەی شانزە دەگەڕێتەوە. هەرچی ئابووری گلوبالە ئابووریێ جیایە و بەتوانای کارکردن وەك یەکەیەك لەکاتێ ڕیال دا لەگەڕدایە.

بەخۆی ئابووری جیهان لە کۆتای سەدەی نۆزدەوە بەهۆی گەشەی تەکنیکی و پابەندبوونی بە زانیارییەوە هەنگاوی بەرەو ئابووریێ گلوبال ناوە. ئەم گلوبالیتێیە پێوەندی بە پرۆسە و ئامرازی توانای سێستەمی ئابوورییەوە هەیە. بۆ یەکەمجاریشە لە مێژوودا سەرمایە لە بازاڕێ مالی (نەخت) یەکخراوی گلوبالدا کاردەکا کە شەو و ڕۆش کراوەیە. بازاڕی مالی گلوبالی ئەلەکترۆنی ئەو بازاڕەیە کە کاری خۆی بێوچاندەکا. گەر ئێمە بین و تەماشای ئەم بازاڕە گلوبالە بکەین، کە لە گەل ئابووری گلوبالدا بەرباسکەوتووە، دەبینین بازاڕی کار تیایدا گلوبال نییە بەلام دەستی کار تیایدا گلوبالە. هەروەها هێزی کار دەتوانێ بێتە ناو گشت بازاڕێ کار و ئەو کەسەی کاریش دەکا بکارێ بەهۆیەوە ژیانی خۆی بگۆڕێ. ئەمەش بۆ ئەوانەی کە لە ولاتهایەکەوە دێن کە جەنگ یان هەژاری تیابە دەتوانن لەم بازاڕی کارەدا وەك هێزی کار خۆیان نخەنەڕوو. بەلام ئەم هێزی کارە جاری واهەیە لەگەل بزووتنەوەی دژ بەبێگانە بەرامبەر بەیەکدەبنەوە. ئەوەی کە بازاڕێ گلوبالی هەیە تەنیا سەرمایە و کار نییە بەلکو زانست و زانین و تەکنیکیشە و، ئەمانەش هەروەك کار و سەرمایە لە ئاستێ گلوبالدا ئۆرگەنیزەدەکرێن (ڕێکدەخرێن). بەلام خۆبەستنەوە بە بازاڕی گلوبال مانای ئەوە نییە کە ئەو کارگەیە دەتوانێ هەمیشە شمەکەکانی بەسەر هەموو دونیادا بلاوکاتەوە. چونکە ئەوە لەسەر بایەخی بازاڕ دەوەستێ بۆ ئەم شمەکانە. شیاوی وتنە، پاش ئەو گۆڕانە دراماتیکیەش کە لە تەکنیکدا ڕووی دا کرا گۆڕانێ گەورە بێتە سەر گوازتنەوە و گەیاندنی زانیاری، شمەك، کەس و خزمەتگوزارییش.

ئەمانە بەزۆری باسی جیهانگیری دێننە پێشەوە. ئەم جیهانگیریەش فونکشونی پرۆسەی هەنووکەی ئابوورییە. ئەو ئابوورییە نوێیەی بەپشت بەستن بە زانیاری نوێ لە ئاستێ گلوبالدا کاردەکا. بەلام خودی جیهانگیریەکە وەك واتایەك لەگشت لایەکەوە هێرشی دەکرێتە سەر (بەتایبەت لەلایەن ستێفن کۆهنەوە Stephen Cohen). ئاشکراشە زۆربەی ئەو ناتەبایەش لەنێو توێژەرەوەکاندایە لەبارەی واتای جیهانگیرییەوەیە و، بەشێکیشی لە بارەی ئەوەوەیە کە دەولەتی ناسیۆنال ڕۆلی سەرەکی لە کارکردنە سەر بوونیاد و دینامیکی ئابووری نوێ هەیە.

گەر تەماشای هەرێمەکانی ئابووری گلوبال بکەین دەرك بەوەدەکەین کە هەرێمەکان جودان لەیەك و لە سێ هەرێمی ئابووریش پێکدێن: هەرێمی باکووری ئەمەریکا، هەرێمی یەکیەتی ئەوروپا و هەرێمی ناوچەی ئۆقیانووسی

ئارامی ئاسیایی (بەپلەی یەکەم یابان و دواتر کۆریای باشوور، ئێندۆنیسیا، تایوان، سەنگافورا، چینیەکانی هەندەران). ئەو جیاوازیەش لە هەرێمی ئابووری دا مانای خۆی بۆ پرۆسەی سیاسیش هەیە. لەهەمووی سەیرتر سێستەمی ئابووری گلوبالی نوێ دینامیکێ نادلنیای بەرزتری هەیە و سەرچاوەی هێزی پێشبڕکێش تیایا قوولترە.

گەر تەماشای ئابووری گلوبال بکەین هەست بە بوونی تازەترین دابەشکردنی کاری نێودەولەتیدەکەین. ئەم ئابوورییە گلوبالە کە لە بەرهەمهێنان و پێشبڕکێی زانیاریانەوە دێتەدەرێ بە وابەستەیەتیە دوولایەنیەکەی، بە ناجۆریەکەی، بە هەرێمگەریەکەی، بە نەشونما جیاکەی لە بواری گشت هەرێمێکدا، بە ئاڕاستە هەلبژێرمیەکەی، بە دابەشکردنە کەنارگیرەکەی و وەك ئاکامێکی گشت ئەمانە و بە هەندەسە ناجێگیرەکەی، کە ڕوو لە هەلوەشانەوەی جوگرافیای مێژوویی و ئابووریی دەکەن، دەناسرێتەوە. هەروەها وێنەی ئەم دابەشکردنی کارە نێودەولەتییە لە گۆڕاندایە و زۆنی نوێ کەوتۆتە ناویەوە. کاتێ دەڕوانینە بازرگانی نێوان ئەمەریکا و ولاتانی ڕۆژئاوا لەدوای سالانی هەفتاوە تا ئێستا(تاکاتی نووسینی ئەم کارە) دەبینین لەگەشە کردندایە. بەلام وەك پێشبینی لە سالانی دووهەزارەکانا دەکرێ دەرك بەوەبکەین کە کارگەکانی ولاتانی ڕۆژئاوا دەستدەگرن بەسەر 14٪ی بەرهەمی پیشەسازی ئەمەریکی و کارگە ئەمەریکیەکانیش دەستدەگرن بەسەر 16٪ی بەرهەمی پیشەسازی ولاتانی ڕۆژئاوا. هەرچی یابانە ڕۆلی خۆی لە بازرگانی لە هەردوولادا و وەبەرهێنان لەهەردوولا هەبووە. ئەو دابەشکردنە نوێیەی کاری نێودەولەتی ئاماژە بەوەدەکا کە بازرگانی نێودەولەتی لە بزوتنەوەیەکی ئالوگۆڕی گەورەدایە و ئەمەش بەزۆری کەوتۆتە نێوان ئەو ئابووریانەی کە پایگاێ باشی ئابووری گلوبالن وەك:ئەمەریکا، ولاتانی یەکیەتی ئەورووپا و زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی. بۆنموونە لە سالی 1992 داEU (ولاتانی یەکیەتی ئەوروپا) نزدیکەی بای 95 ملیار دۆلار شمەك و خزمەتی بۆ ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا ناردووە بەلام بای 111 ملیار دۆلاری هێناوە. هەرEU بای 96 ملیار دۆلار شمەك و خزمەتی بۆ زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی ناردووە و بای 128 ملیار دۆلاری لێوەهاوردووە. کەچی ئەمەریکا بای 128 ملیار دۆلاری بۆ زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی ناردووە و بای 215 ملیار دۆلاری لێوەهاوردووە. بەمجۆرە دەشێ بووترێ کە ئابووری گلوبال بریتیە لە نێت هۆرکێ وابەستەی نێوان USA وEU و یابان. گەلێ لە سەرچاوەکان ئاماژە

بەوەدەکەن کە یابان دەرگای لە وەبەرهێنان لە ولاتانی ئاسیا و ناردن بەرەو ئاسیا و هێنانیش لەوێوە کردۆتەوە. لەهەمانکاتدا یابان دەستی کردووە بە وەبەرهێنان لە ولاتانی ئەمەریکای لاتینیش (بەتایبەت لە مەکسیکۆ). بەلام هەندێ سەرچاوە ئاماژە بەوەدەکەن کە ناردنی ئەمەریکای باشوور لەماوەی سالانی 1990کانا بەزۆری ڕووەو ولاتانیEU و زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی بووە وەك لەUSA. ئەمانە بەئاسانی ئاماژە بەوەدەکەن کە ئابووری گلوبال لە قوولایدا ناجۆر و ناهاوشێوەیەو، هەروەها ئەم ئابووریە گلوبالە کە بناغەی زانیاریاوی هەیە ئەو شێوە پێشبڕکێ ئابوورییەی کاری لەسەر دەکا وابەستەێتی دوولایەنی بەرزدەکاتەوە.
ئەلبەتە کە دەڕوانینە ئابووری گلوبال هەستدەکەین ئابووری ئاسیا لە گەشەکردنێ زۆر دایە و بەرهەمهێنانی پیشەسازی لەم شوێنەدا مانای گەورەی بۆ کەرتی ئەلەکترۆنی، کە بەخۆی کەرتێ سەرەکی ناو ئابووری زانیارییە، و بەتایبەت ئەوەی پێیدەوترێ بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبیل، هەیە. گۆڕانی زۆنەکانی بەرهەمهێنان و وەبەرهێنان لە ئابووری گلوبال دا شتێ دیارە. بۆ نموونە چین لەدوای ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکاوە بە پلەی دوو دێ بۆ پێشوازیکردن لە وەبەرهێنان. وەبەرهێنانی دەرەکی لە چین لە گەشەکردندایە و لە یەك ملیارد دولارەوە لە سالی 1983 وە بۆ 26 ملیارد دۆلار لە سالی 1993 گەشەی کردووە. شایانی باسە کە لە 70٪ ی ئەم وەبەرهێنانە دەرەکییە لە تایوان و هۆنکۆنگەوە هاتووە. ئەمەش بەخۆی بەلگەیە لەسەر گەشەی سەرمایەداری لە چین. گەر تەماشایەکی ئەو پێشبینییە بکەین کە بۆ بەرهەمهێنانی پیشەسازی بۆ سالانی 2000 کراوە دەبین ئەم شێوەیە وەردەگرێ: ئەو بەرهەمهێنانە پیشەسازییە لە2، 15٪ ی دەکەوێتە ئەوروپای ڕۆژهەلاتەوە، لە7، 2 ٪ی دەکەوێتە ئەفەریقا و ناوەڕاستی ڕۆژهەلات، لە0، 8٪ ی دەکەوێتە ولاتانی تری ئاسیای، لە9، 26 ٪ ی دەکەوێتە ولاتانی ئاسیای گەشەکردووەوە، لە6، 4٪ ی دەکەوێتە ولاتانی ئەمەریکای لاتین، لە0، 18٪ ی دەکەوێتە ئەمەریکای باکوور، لە6، 24 ٪ ی دەکەوێتە ولاتانی ئەوروپای ڕۆژئاواوە. ئەمە بەخۆی نیشانەیە لەسەر سەرهەلدانی ناوچە و هەرێمی نوێ و کاریگەرییان لە ئابووری گلوبالدا. هەج باسێکیش کە لەم حالەتانەدا لەبارەی ئابووری گلوبالەوە دەکرێ مەسەلەیەکی گرنگە کە باس لە گرنگی چین، یابان و ولاتانی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا(وەك ئێندۆنیسیا، تایلاند و فێتنام) بۆ ئابووری گلوبال بکرێ. ئەلبەتە گەشەی ئابووری زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای و نەشونمای

سەرمایەداری لێرە لەگەڵ کۆتای هاتنی یەکیەتی سۆڤیەت و پرۆسەی یەکەی یەکیەتی ئەوروپای هاوکاتبووە. بەدڵنیایشەوە دەکرێ ئەوە بووترێ کە بەهۆی سەرهەڵدانی هەرێمی ئابووری نوێ و کەرتی ئابووری تازە و سەرهەڵدانی ناوچەی ئابووری تر لە هەندێ ولات وەك چین، هیندستان و ئەمەریکای لاتین دەکرێ باس لە شێوەی نوێی دابەشکردنی کاری نێودەوڵەتی بکرێ.
دەبێ ئەوە لەبەرچاوبگیرێ کە ئەم ئابووریانە لەڕووی سیستەمی گەشە و پەرەپێدانیانەوە ناجۆرن. ئەوەی بە ئابووری ئەمەریکای لاتینەوە تایبەتە ئەوەیە ئەم ئابوورییە لەماوەی هەشتاکانا دوچاری قەرزاری و هاتنەخوارەوەیەکی زۆری مەرجەکانی کار بوو. هەر لەوماوەیەشدا پێشبڕکێیەکی نێودەوڵەتی و شۆڕشێ تەکنەلۆژی لەئارادابوو کە ئەمە داوای جۆرە مۆدێرنیزەکردنێکی بونیادی بەرهەمهێنانی دەکرد.
سەبارەت بە ئابووری ئەمەریکای لاتین گەر دووربینتر بین دەرك بەوەدەکەین کە ئەم ئابوورییە لەپاش جەنگی جیهانی دووەوە بەپێی سێ جۆرە مۆدێلی پەرەپێدان هەوڵی جۆرە هەلاوگۆڕانێکی داوە. مۆدێلی یەکەم لەسەر بناغەی ناردنی بەرهەمی کشتوکاڵی و مەوادیخام دامەزرا. ئەم مۆدێلە لە سالانی شەستەکانا لە کارکەوت. مۆدێلی دووەم لەسەر بناغەی بایەخدان بە هێنانی ئەو بەرهەمانەی گەشەی پیشەسازی دروستدەکەن بونیادنرا. ئەم مۆدێلە کاریگەری لە کۆتای هەفتاکانا بەتالبوەوە. مۆدێلی سێهەم لەسەر بناغەی ستراتیژی ڕوەودەرەوە دروستبوو. ئەم مۆدێلە لە هەشتاکانا سەرکەوتنی خۆی ناشت. ئەمانە وایکرد ئابووری ئەمەریکای لاتین نەتوانێ خۆی لەتەك هەلاوگۆڕانەکانی ئابووری گلوبال/ زانیاریدا بگونجێنێ.
گەر 30 سالێ بچینەدواوە و چاوێ بە پرۆسەی پاشکۆیەتی و پەرەپێدانی ولاتانی ئەمەریکای لاتین بخشێنین ڕەنگە وێنەیەکی دیارترمان لەبارەی ئابووری ئەم ولاتانەوە بەردەستکەوێ. چونکە مەوادی خام لەماوەی هەفتاکانا لە 26٪ ی بازرگانی جیهان پێکدێنێ کەچی بۆ ولاتانی ئەمەریکای لاتین لە 48٪ ی بازرگانیان پێکدێنێ. ئەمەو لەماوەی سالانی هەشتاکانا ئەوە بەرزبۆتەوە ولە 50٪ ی نێردراوی ولاتانی ئەمەریکای لاتینی پێکهێناوە. بەلام ئەو گۆڕانکاریانەی لەم ماوەیەدا بەهۆی تەکنیکەوە هاتۆسەر بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کشتوکاڵی کاریگەریێ گەورەی کردۆتە سەر ئابووری ئەو ولاتانەی (کە ئەمەریکای لاتین بەشێکە لەو ولاتانە) پشت بە بەرهەمهێنانی تەقلیدی دەبەستن. بۆیە لەئاکامی کێشە ئابووریەکان ولاتانی ئەمەریکای لاتین

کەوتنە ناو قەیرانی قەرزێ زۆر و لەم بارەیەشەوە نووسراوێ زۆر لەبارەی ئەو فاکتە و پرۆسانەی کە لەپال ئەم قەرزانەوە بوون بەردەستخران. گومانیشی ناوێ کە بلێین بەشێ زۆری ئەو فاکتە و پرۆسانەش، کە لەلایەن ڕەخنەگرە چەپە دۆگما و ئابوریناسە نیوکلاسیکیەکانەوە نووسرابوون، ئایدۆلۆژی بوون. ئەو قەرزانەش بەشێ زۆری لەلایەن بانقە نێودەولەتیە پریڤاتەکانەوە، بەتایبەت لە ئەمەریکا، بە حکومەتەکانی ئەم ولاتانە دران. قەرزەکان بەزۆری بەو ولاتانە دران کە نەوتین و ئەمانیش بەشێوەی جیا خستیانە بەکاربردنەوە. بۆ نموونە دەخرانە بواری کەرتی بەرهەمهێنان یان بۆ مەبەستی خۆچەککردن و ئامانجی سەربازی بەکاردەبرا. ئەلبەتە ئەرجەنتین یەکێ بوو لەو ولاتانەی ئەم قەرزەی بۆ مەبەستی سەربازی بەکاربرد. یان ڤێنزرێلا کە خستیە بواری کەرتی ناسوودبەخشەوە.
ئەم ئابووریانە بۆئەوەی بتوانن لەناو ئابووری گلوبالدا کاریگەربن پێویستیان بەوەدەبێ کە توانای پێشبرکێیان لە ناردنی شمەکی پیشەسازی هەبێ. بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ هەلسن بە مۆدێرنیزەکردنی بناغەی بەرهەمهێنان. لەهەمانکاتیشدا ئەوە دەلێین کە ئابووریەکانی ولاتانی ئەمەریکای لاتین ناهاوشێوەن و، هەروەها دەشێ بووترێ کە ئابوورهایەکی وەك ئەرجەنتین، مەکسیکۆ و بەرازیل زۆر لەوانی دی جوداوازترن. ئەو سەرلەنوێ بوونیادنانە ئابووریەش لە سالانی 1990 کانا لە ولاتانی ئەمەریکای لاتین دا بەڕێووە چوو دەتونێ چارەنووسی سالانی دواتر دیاریبکا. ئابوورهایەکی وەك بەرازیل(کە بەهێزترین نێوەندی ئابووری ئەمەریکای لاتین و دەیەم گەورەترین ئابووری جیهانیشە) و ئەرجەنتین توانیویانە بەباشی بچنەناو ئابوری گلوبال/زانیاریەوە و کاریگەری خۆشیان لە زۆنی خۆیان هەبێ.
بەشێ زۆر لە دانیشتوانی سەر زەوی بەپێی ئەو فۆرمە تازەیەی لە جیهاندا لەگەڕدایە دۆزی کۆمەلایەتی لەدەستدەدەن. کەوتنە دەرەوەی دۆزی کۆمەلایەتی هەنووکەش کەوتنە دەرەوەی پرۆسەی بەرهەمهێنان، دابەشکردن و بەکاربردنییش دەگەێنێ. ڕەنگە ئابووری ئەفەریقا نموونەیەك بێ لەسەر ئەو جۆرە ئابووریەی کە هەنووکە لەدەرەوەی ئابووری گلوبال دایە. هاتنە پێشەوەی سەرلەنوێ بوونیادنان (گۆڕانی بوونیادی) لە ئابووریدا و دروستبوونی ئابوورێ گلوبال و زانیاری کێشەی هێناوەتە بەردەم ئابووری ولاتانی ئەفەریقی. چونکە بازرگانی زۆربەی ئەم ولاتانە ترادیسیۆنالییە- تەقلیدییە- (سالی 1970 مەوادی خام لە 50٪ ی نێراوەکانی ولاتانی باشوری

بیابان ئەفەریقی پێکهێناوە). بەلام هەندێ لە حکومەتەکانی ئەفەریقا هەولیان داوە بچنە قۆناغی بەپیشەسازیکردن و بازرگانیکردنی بواری کشتوکالی. بۆ ئەم مەبەستەش قەرزێ زۆریان لە بانقە نێودەولەتیەکان وەرگرتووە. بەلام مەرجە لەوە بەئاگابین کە باری ئابووری ولاتانی ئەفەریقی وەکیەك نییە و بۆنموونە ئابووری ولاتانی باکووری ئەفەریقا، کە بەپێی نزدیکی دیمۆگراقی و جوگرافی و ئابووریان لە ولاتانی ئەوروپاییەوە، توانیویەتی شێوازی تر بگرێتەبەر. هەچ گەشەیەکیش کە لە ئابووری هەندێ لە ولاتانی ئەفەریقی (تونس، میسر، جەزائیر، مەغریب) لەماوەی سالانی هەفتاکانا کراوە ماناێ ئەوتۆی بۆ بازاڕی کار و بەرهەمهێنانی نێودەولەتی نییە. جگەلەوەی زۆربەی ولاتانی ئەفەریقی نێرراوەکانیان لە مەوادیخام پێکدێ و ئەمەش جگەلەوەی نرخیان نزمە بێکەلکیشن. سەرباریئەوە، ئەم ولاتانە بازاڕی کاریان نزمە و بێکاریێ زۆری تیا بەدیدەکرێ و دەستی کاری ناشارەزاشی زۆرە و دواتر بیرۆکراتیەتی دەولەتیش تیایا بەهێزە. بۆیە شەپۆلی چوونە دەرەوە لەزۆربووندایە و زۆربەشیان شارەزای و خوێندەواریێ بەرزیان نییە. هەروەك لەمەوبەر ئامازەی پێکرا ئابووری گلوبال ئەو ڕۆلەی بۆ ولاتانی ئەفەریقی نیە. بەکورتی ئەم ولاتانە نەبوونە بە یەکێ لە هەرێمەکانی ئابووری گلوبال.

هەرچی دوا سەرکەوتنی ئابووری گلوبالە دەکرێ بە هاتنەناوەوەی کۆمارەکانی سۆڤیەتی جاران و ڕوسیا بۆ ناو بازاڕی گلوبال بەسترێتەوە. ئەلبەتە گۆڕانی بوونیادی ئابووری نێودەولەتی بە هەلوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت و هاتنە ناوەوەی ولاتاتەکانی دوای هەلوەشانەوەکە بۆ ناو ئابووری گلوبال دوچاری ئالۆزیبوو. بەلام خودی داڕمانەکەی یەکیەتی سۆڤیەت و کۆمۆنیزم ڕوداوێ سیاسی گەورەبوو و، ئەم داڕمانە ڕاستەوخۆش پێوەندی بە سەختی بوونیادی شێوازی بەرهەمهێنانی دەولەتیەوە هەبوو. و بەتایبەت کاتێ کە بەرەو شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری ملی ڕێگایگرتەبەر. ئەم چوونەناو ئابووری گلوبالەی کۆمارەکانی سۆڤیەتی پێشوو کە بەیارمەتی وەرگرتن -بەلام نەك یارمەتیێ زۆر گەورە-، لە ولاتانی سەرمایەداری زۆر گەشەکردووەکان و دامەزراوە مالییە جیهانییەکان، ئەنجامدەرێ ڕێگا بۆ گەلێ ئابووری تر دەکاتەوە کە لەگەل یەکدیدا لەچوونە نێویەکدیدا بن. واتە ئابووریەکانی دوای هەلوەشانەوەی سۆڤیەت بۆ وەبەرهێنان بوارێ باشن. دەشتوانن بەبێ خۆبەستنەوە بە دەورانی گلوبالی سەرمایە، تەکنیك و شمەك بتوانن خۆیان بەڕێوەبەرن. بەدلنیایشەوە توانای ئەم ئابووریانە (وزەو و سروشت، ڕێسۆرشێ-ئیحتیاتی- باش،

بناغەیَ زانستی و دانیشتوانیَ خوێنەوار) وادەکەن مرۆڤ بەچاویَ ئەوتۆوە سێریان بکا کە دەتوانن کاریگەرییان بەسەر سێستەمی ئابووری جیهانەوە گەورەبیَ. ئەمانە نەك هەر لە ئایندەیەکی دووردا ئابووریهایەکی بەتوانایان لێدەردەچیَ بەلکو هەر لەئێستاوە ئابووریێ باشن بۆ یەکخستن و بوون بە بازاڕ بۆ تەکنەلۆژیای بالای ولاتانی ڕۆژئاوا (ئەو دانیشتوانە زۆرەی ڕوسیا و کۆمارەکانی سۆڤیەتی جاران و ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات دەکریَ وەك بەکاربریَ چاکی شمەك و خزمەت و تەکنیکی ڕۆژئاوا لەقەلەمدرێن). وەکیتریش ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات ڕۆژبەڕۆژ لە هەولیَ زۆردان بۆ هاتنەناو گۆڕەپانی یەکیەتی ئەورووپایی. ئەمەش بەتایبەت لەڕێگای وەبەرهێنانەکانی ولاتی ئەلمانیا لەو ولاتانە یان لەڕێگای پێوەندیەکانی نێوان ولاتانی بالتییك (واتە لاتفیا، لیتوانیا، ئیستۆنیا،) و ولاتانی سکەندەناڤی.

لەهەمانکاتدا ئەم هەلوەشانەوەیەی یەکیەتی سۆڤیەت و سەرهەلدانی ڕوسیایەکی ئازاد خۆی لەبەردەم چەندین کێشە دیوەتەوە. لەوانە حەزی هاتنە دەرەوەی ملیۆنەها ڕووس بۆ ڕۆژئاوا، بەلام ئەم حەزە نەهاتەدی و تەنیا مافی هاتنە دەرەوەی جوولەکان و لە سالی 1996 یشەوە چەند سەد هەزاریَ لە خەلکی خاوەن کار و پیشەی بالا مسۆگەرکرا.

گەر تەماشای باری ئابووری بکەین دەبینین وەبەرهێنانی دەرەکی لەماوەی 90-94 بەرەو 5 یان 3 ملیار دۆلار ڕۆشتووە. دەکریَ ئەم ژمارەیە لەگەل 26 ملیار دۆلاری وەبەرهێنانی دەرەکی لە چین لەماوەی سالی 93 دا یاخود لەگەل 63 ملیار دۆلاری وەبەرهێنانی دەرەکی لە مەکسیکۆ لەماوەی 90-92 بەراوردکریَ. بەگشتیش گەر بڕوانینە باری ناردن و هێنانی ڕووسی لەدوای 91 تا 94 دەرك بە بەرزبوونەوە و نزمبوونەوەیەکی زۆردەکریَ. ئەمەش تەنیا کەرتی ناردنە دەرەوەی نەگرتەوە بەلکو بواری بەرهەمهێنانی پیشەسازی و وەبەرهێنانیشی گرتەوە. بەلام لەدوای ئەوەوە، واتە پاش سالی 94، دۆخی بازرگانی دەرەکی ڕووسی گۆڕانیَ باشی هاتەسەر و، ئەمەش ڕۆلی لە بەرزبوونەوەیBNP (داهاتی گشتی نەتەوە) ی ڕووسی دی. زۆرترین کەرتیَ ئەم بوژانەوەی بەخۆوەدی کەرتی وزە و سوتەمەنی بوو کە بەخۆی 50٪ ی ناردنی دەرەکی ڕووسی پێکدێنیَ. شیاوی باسە یەکیَ لە خالە گرنگەکانی نێوان ئابووری ڕووسی و ئابووری گلوبال مەسەلەی وەبەرهێنانی دەرەکییە. ئەمەش بەزۆری هەولدرا ڕوو لە کەرتە سەرەکییەکان وەك کەرتی گاز و نەوت بەرهەمهێنان بنیَ. لەم حالەتەشدا کۆنتڕۆلی دەولەتی گرنگی خۆی هەیە. چونکە

ئەم کەرتانە گرنگیی زۆریان بۆ گۆڕینی BNP ی ڕووسی هەیە و بۆ بەرهەمهێنانیش بوارێ باشن.
وێرای ئەوی لەبارەی ئابووری ڕووسیەوە وترا گرنگە ئاماژەکردن بەوەش کە دوای ئەوەی ڕووسیا هاتەناو ئابووری بازاڕەوە جۆرە تاقمێ نوێ سەریانهەلدا کە پێوەندیان بە نێت هۆرکی ئابووری کرمینال (تاوان) موە هەیە و، ئەمەش زۆرترین کەرتی ئابووری ڕووسیا پێکدێنێ کە بەنێودەولەتی کراوە.
بەپێی هەندێ سەرچاوەش بزنزی کریمینال (تاوان) سالی 92 لە 5، 14ی ئابووری نوێی ڕووسیا بریتیبووە. هەر ئەو سەرچاوانە ئاماژە بەوەدەکەن کە دواتریش ئەم جۆرە بزنزە لەبەردەوامیدابووە و ناکۆکیێ زۆریش کەوتۆتە نێوان کەس و گرووپەکانەوە لەسەر مەسەلەی زیادکردنی سنووری دەسەلات و قەڕالستانیان.
ئەوە ئاشکرایە کە بوونیاد و دینامیکی ئابووری گلوبالی نوێ پەیوەندی بەو هاوکارییە مێژوویەی نێوان کەشەی زانیاریگەریی و سەرلەنوێ بوونیادنانی سەرمایەداریەوە هەیە. بوونیادی ئەم ئابووریەش بەهۆی پێوەندی نێوان ئارکتیکتورێ (بیناسازی) بەردەوام و هەندەسەێ گۆڕاو دەناسرێتەوە. وەکیتریش ئارکتیکتوری ئابووری گلوبال دەستنیشانی جیهانێکی وابەستەی ناهاوشێوەدەکا کە لە دەوروبەری سێ هەرێمی ئابووری سەرەکیدا ڕێکخراوە.
ئەو سێ هەرێمە ئابوورییە سەرەکیەش بریتیە لە: ئەورووپا، ئەمەریکای باکوور و زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی. هەریەك لەم هەرێمانەش لەدەوروبەری جوگرافی خۆیدا پێوەندیێ ئابووری پێکهێناوە و ئەمەش گرنگی خۆی بۆ ئابووری گلوبال هەیە. بۆنموونە: پێوەندی نێوان ئەمەریکای باکوور لەگەل ئەمەریکای لاتین، پێوەندیEU و ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات، ڕووسیا و ناوچەی باشووری دەریای ناوەڕاست، پێوەندی یابان و زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی و باقی ولاتانی ئاسیا و ئوستراليا و نیوزیلەندە. هەروەها تاڕادەیەك کەناری ئۆقیانووسی ئارامی ڕووسی، سێبیریا و کازاخستان. ئەم شێوەدابەشکردنە جارێ ئەفەریقا ناگرێتەوە و، هەروەها ولاتانی ئەفەریقی هێشتا وابەستەی نیتۆرکی ئابووری پێش کۆلۆنیالی پێشوون و لە ئابووری گلوبال دا شوێنێ ئەوتۆیان نییە و بگرە پەراوێزیشکراون. هەرچی ولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستە بەزۆری کەوتوونەتە ناو نێتی مالییەوە و پتر ڕوەو ئەوەدەچن کە وابەستەی پەرەپێدانی جیۆسیاسی گلوبال بن. بەلام ئەم سێستەمە ئابوورییە جیهانییە هەروەك خۆی نامێنێتەوە. بۆنموونە: ڕووسیا کەشەدەکا

بەرمو ئەوەی کە دەسەلاتی خۆی هەبێ. یان کازاخستان زۆرتر پەیوەندی بە کۆمپانیا نەوتییە ئەمەریکیەکانەوە دەبەستێ. Mercosur و Chaebal ی کۆریای باشوور زۆرتر بۆ ئەورووپا دەڕوا وەك لە ئەمەریکای باکوور. بازاڕی شیلی پتر بۆ ولاتانی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای بازاڕێ باشە. چین پێوەندی خۆی لەگەل نێتۆرکی ئیتنی چینیدا، لەناوچەی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای، بەهێزدەکا وەك لە یابان. دەشێ بیرلەوەکرێتەوە کە کۆریای باشوور دەبێ بە ئاکتۆرێ گلوبال لەبواری پیشەسازی تەکنەلۆژیای بالا یان ئێندۆنیسیا بەهۆی وەبەرهێنانی یابانی و چینیەوە دەتوانێ ببێ بە بەشێ لە بازاڕێ گلوبالی زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای.

ئەوی پێشتر لەسەرەوە بە تازەترین دابەشکردنی کاری نێودەولەتی ناونرا بەدەوری چوار حالەت لە ئابووری گلوبال/زانیاری نێودەولەتی کۆبووەتەوە کە ئەمانەن، یەکەم: بەرهەمهێنانی بە بەها، کەلەسەر بناغەی هێزی کاری زانیاری دروستدەبێ، دووەم: بەرهەمهێنانی قەبارە بەرز، کەلەسەر بناغەی هێزێ کار دروستدەبێ کە هەرزانە، سێهەم: بەرهەمهێنانی مەوادیخام و دواتر بەرهەمهێنەرە زیادەکان کە دەچنەخانەی مەرجی کاری کەمبەها. ئەوەی گرنگە لێرەدا ئاماژەی پێکرێ ئەوەیە کە ئەم حالەتە جۆراوجۆرانە لەگەل ولاتە جۆراو جۆرەکان ناگونجێ. هەروەها ئەمانە بەیارمەتی ژێرخانی تەکنیکی، ئابووری و زانیاری لە نێت هۆرکیشدا ڕێکدەخرێن. پاشان ئەوەی پێیدەوترێ ئابووری گلوبال لەڕووی جوگرافییەوە ناهاوشێوەیە و، ئەوی ناونرا دابەشکردنی کاری نێودەولەتی لەنێو ولاتەکاندا نییە بەلکو لەنێوان ئەگێنتە ئابووریەکاندایە، بەلەبەرچاوگرتنی شوێنی هەریەك لەو ئابووریانە لە ناو ئەو چوار حالەتەی لەسەرەوە باسکرا. ئەوەش هەروەك ئاماژەی پێکرا لە چوارچێوەی بوونیادێ گلوبالی نێتۆرك دا وەگەڕدەخرێ. واتە بەپێی ئەو چوار حالەتە ئەو ئابووریانە دەتوانن سەرلەنوێ بوونیادی خۆیان پێکبهێنن و بەپێی بوونیشیان لەناو نێتۆرکێ گلوبال دا دەکارن مەبەستەکانیان ئەنجامبدەن. دواتر ئەوەش دەکرێ بووترێ کە، حالەتەکان لەبناغەدا لە دابەشکردنی کاری نێودەولەتی پەیوەندی بە تایبەتیەکانی ولاتەکەوە نیە بەلکو پێوەندی بە تایبەتیەکانی هێزی کاری ولاتەکەوە و باری ئەم ولاتە لە ئابووری گلوبالدا هەیە. ئەمەو مەسەلەی تازەترین دابەشکردنی کاری نێودەولەتی لەسەر بناغەی هێزی کار و تەکنیك ڕێکدەخرێ و ئەمەش لەلایەن دەولەتەوە تەنێ دەگونجێنرێ و بەڕێوەدەبرێ.

بەشی سێهەم:

## كارگەی نێتۆرك: كولتوور، دامەزراو و ڕێكخراوەكانی ئابووری زانیاری

ئابووری زانیاریی وەك گشت فۆڕمە جیاوازئامێزە مێژووییەكان بە كولتوورە تایبەت و دامەزراوە تایبەتەكانی دەناسرێتەوە. ئەوەی كە دەستیشانی پەرەپێدانی ئابووری گلوبال/زانیاری دەكا گەشەی ئەم ئابوورییە لەناو هەمئاهەنگی كولتووری و ناسیۆنالی دا. بۆنموونە :باكووری ئەمەریكا، ئەورووپای ڕۆژئاوا، یابان، چین، ڕووسیا، ئەمەریكای لاتین ئەمانە لەژێركاریگەری ئەو پەرەپێدانە دەبن و دواتر دەكەونە ناو پیشەی ئەزموونێ مولتی كولتووراڵییەوە. كەواتە ئەم ئابووریانە ئەمڕۆ ئەو ئابوورییە پێكدێنن كە بە ئابووری زانیاری و گلوبال ناونرا. ئاساییە لەم بوارەدا دانبەوەدا بنرێ كە كولتوورەكان لەبناغەدا بە دامەزراو و ڕێكخراوەكانەوە یەكانگیربوونە. ڕێكخستنی ڕێكخراوەیش مانای خۆی بۆ پرۆسەی سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی سەرمایەداری هەبووە. چونكە سەرلەنوێ خۆبوونیادنانی ئابووری سالانی 1980 كان وای لە كارگەكان كرد كە ڕیزێ سەرلەنوێ خۆ ڕێكخستنی ستراتیژی جۆراوجۆر دەستپێبكەن. هەندێ لە شیكەرەوەكانیش، بەتایبەت Piorte & Sabel، جەغت لەوەدەكەن كە قەیرانی ئابووری سالانی 1970 پەیوەندی بە سیستەمی فرە(زۆر) بەرهەمهێنانەوە هەبووە كە ئەمەش بووە هۆی دابەشكردنی پیشەسازی لە مێژووی سەرمایەداریدا. واتە ئەم دوو شیكەرەوەیە كاریان لەسەر تیۆری گوازتنەوە لە بەرهەمهێنانی زۆرەوە بۆ بەرهەمهێنانی مەرن (فلێكسیبل) كردووە. بۆ هەندێ كەسی تر، وەك Stortper & Harrison، خۆ ئامادەكردن بۆ فۆڕمە ڕێكخراوەییە نوێكان پەرچەكردارێك بوو دژ بە قەیرانی پرۆسەی كەڵەكەبوونی سەرمایە. كەچی هەندێ كەسانی تر، وەكCoriat، باس لە گەشەێ درێژخایەنتر دەكەن وەك لە فۆردیزم Fordism وە بۆ پۆست فۆردیزم. ئەمانە تاڕادەیەك ئەو ئاڕاستە گەشەكردنە ڕێكخراوەییە گشتیانەن كە گرنگیان هەیە لەكاتێ كە باس لەو گۆڕانكارییە ڕێكخراوەییانە دەكرێ كە بە شێوازی بەرهەمهێنانەوە تایبەتن. لەم حالەتەدا دەكرێ ئامارە بەچەند لێكدانەوەیەكی گشتی بكرێ كە تایبەتە بە

گۆڕانکارییە ڕێکخراوەییە گەورەکانی ئەم بیست ساڵەی دواییەوە (واتە ساڵانی 1970-1980):
- لە ناوەڕاستی هەفتاکاناوە هێڵی جیاکاری گرنگ لە ڕێکخستنی بەرهەمهێنان و بازاڕ لە بواری ئابووری گلوبال دەرکەوت.
-گۆڕانی ڕێکخراوەیی لەگەڵ ئامادەکردنی تەکنەلۆژیای زانیاریدا پێکەوەکاریانکرد.
-ئامانجی بناغەیی گۆڕانکارییە ڕێکخراوەییە جۆراوجۆرەکان ئەوەبوو کە ئەو نادلنیاییەی لەلایەن گۆڕانکارییە پەلەکانەوە خولقا، بەهۆی بەرزکردنەوەی مرونەت لە بەرهەمهێنان، ئیدارەی کارگەکان و بردنەڕێوەی بازاڕ، چارەسەربکا و هەولبدا بەسەرگرفتەکانا سەرکەوێ.
-گەلێ گۆڕانی ڕێکخراوەیی ئامانجی ئەوەبوو کە پرۆسەی کار و ڕۆتینی ئیشکردن سەرلەنوێ دەستنیشانبکا و مۆدێلی بەرهەمهێنانی سست پیادەبکا. ئەمەش بەئامانجی ئەوەی کە لەمیانەی ئۆتۆماتیزەکردنی کار ئیدخاری هێزی کار بکا هەروەها کۆتای بە ئەرکەکان بهێنێ.
زۆر بەرهەمهێنان (واتە ئەو شێوازەی لەسەر بناغەی زۆر بەرهەمهێنان دروستبووە) لەسەر بناغەی سوودی بەرهەمهێنان دادەمەزرێ نەك شتێ تر، کە ئەوەش لەمیانەی پرۆسەیەکی میکانیزەکراوەوە بەڕێوەدەچێ کە ئەم بەرهەمهێنانە لەسەر بەرهەم ستاندارتدەکرێ، کە لەم حالەتەدا ئەم شێوازە یان زۆر بەرهەمهێنان بازاڕی گەورە دەخوازێ یان بوونی بازاڕی گەورە بۆ ئەم شێوازە ماناداردەبێ و لەلایەن فۆڕمێ ڕێکخستنی دیاریکراویشەوە کۆنتڕۆل دەکرێ. کارگە گەورەکان بەپێی پرنسیپەکانی ڕێکخستنی عەمودی (فێرتیکال) بوونیاددەنرێنەوە و هەروەها لەگەڵ بەدامەزراوکردنی دابەشکردنی کاری تەکنیکی و کۆمەلایەتی خۆ دەگونجێنن. ئەم جۆرە پرنسیپانەش لەپشت ئەو مێتۆدی بردنەڕێوانە بوون، وەك "تایلۆریزم" و "ڕێکخراوی کاری زانستی" کە لەلایەن هینری فۆند Henry Found و لینین Lenin هوە وەك ڕێبازهایەك پەسەندکراون.
بەپێی ئەوەی ئەم جۆرە شێوازە لە بەرهەمهێنان نەیتوانی لەتەك خاسلەتەکانی ئابووری نوێ ڕێکا بۆیە ئەمجۆرە شێوازە گۆڕانێ ئەوتۆی هێنرایە سەر کە بکارێ لەگەڵ ئەم ئابوورییە دا بگونجێ. ئەمەش بەهۆی بەلەجیاتیکردنی شێوازی زۆر بەرهەمهێنان بە سیستەمی بەرهەمهێنانی مەرن. ئەمەش لە دوو فۆڕمدا پراکتیزە و تیۆریزەدەکرێ. یەکەم وەك پسپۆریکردنێ مەرن و ئەویتر

که لەم دوادوایەدا بەناوی مرونەتی دینامیکی، یان وەك ئەوەی کە Coriat ناوی دەبابە" بەرهەمهێنانی ئەندازە گەورە "-واتە بەرهەمهێنانی ئەو شمەکانەی کە قەبارەیان زلە- سەریهەلدا. کەوابێ دەکرێ باس لە چەند جۆرە ئاڕاستەیەکی ڕێکخراوەیی بکرێ کە یەکەمیان لەسەرەوەدا ئاماژەی پێکرا ئەویش بەناوی گوازتنەوە لە زۆر بەرهەمهێنانەوە بۆ بەرهەمهێنانی مەرن یان گوازتنەوە لە شێوازی فۆردیزمەوە بۆ پۆست فۆردیزم و ئەوانیتریش بریتین لە چەند شێوازێ تر وەك:

-یەك لەو ئاڕاستانە کە لەم دواوایەدا لەلایەن هەندێ شیکەرەوە جەغتی لەسەردەکرێ(کە دەکرێ بەدووەم ئاڕاستە تەماشاکرێ پاش ئاڕاستەی یەکەم کە لەسەرەوە ئاماژەپێکرا) بریتییە لە قەیرانی کارگەی گەورە و توانای بەرگری کارگەی بچووك و نیمچە گەورە وەك خولقێنەری کار و دیدی نوێ. ئەوەی ڕاستیبێ کارگە گەورەکان کە لەسەر پرنسیپی زۆر بەرهەمهێنان بوونیادنرابوون لەچاو کارگە بچووك و نیمچەگەورەکان کە لەبواری بەرهەمهێنانی مەرندا پسپۆڕبوون دووچاری قەیران بوون. ئەو شێوازی بەرهەمهێنەش کە لەلایەن ئەم جۆرە کارگانەوە پیادە دەکرا پتر لەو شێوازەوە نزدیکبوو کە کارگە گەورەکان پیادەیان دەکرد و لەگەل ئابووری زانیاریی دا دەگونجێ.

-سێهەم ئاڕاستە دەکرێ بە ئاڕاستەی تویۆتیزم Toyotism ناوببرێ. ئەم ئاڕاستەیە هەر بەناوەکەی دیارە کە مۆدێلێ یابانییە. لە خاسلەتە سەرەکییەکانی ئەم ئاڕاستەیە ئەوەیە کە هێزی کار تیایدا فرە ئاقارە و کەمکردنەوەی نادلنیاییش یەکێکە لە گرنگییەکانی و هەروەها مرونەت لە پرۆسەکەیدایە نەك لە بەرهەمەکەیدا. ئەم ئاڕاستەیە یەکێکە لە مێتۆدە نوێکان بۆ بردنەڕێوەی کارگە. گومانیشی ناوێ گەر بووترێ کولتوور ڕۆلی لە هاتنی تویۆتیزمدا دیووە. ئەم جۆرە مۆدێلە لە کارگە یابانییەکانی ئەورووپا یان ئەمەریکا کاری لەسەرکراوە و سەرکەوتنی خۆشی بەدەستهێناوە.

ئەوەی کە تویۆتیزم یەتایبەت لە فۆڕدیزم جیادەکاتەوە پەیوەندییەکانی نێوان کارگەکان نییە بەلکو لەنێوان بردنەڕێووە و خستنەگەڕ دایە. ئەم لایەنەش Coriat لە سیمینارێ نێودەولەتیدا ئاماژەی پێکردووە سەبارەت بەو پرسیارەی کە ئایا بردنەڕێوەی کارگەی یابانی پۆست فۆردیزمە Postfordism یان نا؟ لە وەلامی ئەم پرسیارەدا ناوبراو جەغتی لەوەکردووە کە تویۆتیزم نە پێش و نەش پاش فۆردیزمە بەلکو شێوازێ ئۆرژینالی نوێیە.

-هەر لەم بوارەدا دەكرێ باس لە دوو فۆڕمی نێودەولەتی بكرێ(كە ئاڕاستەی پێنجەم و شەشەم پێكدێنن) كە دەچنە خانەی مرونەی ڕێكخراوەییەوە، ئەوی لەمەوبەر ئاماژەی بۆكرا، كە یەكێكیان مۆدێلی نێت هۆركی فرە ئاراستەی كارگە بچووك و نیمچە گەورەكانە. ئەویتریان مۆدێلی ئیجازەی manufacture Contract (واتە ئەو كارگەیەی كە هەندێ شت بەرهەمدێنێ كە دەچێتە ناو بەرهەمی كارگەێ ترەوە) یە كە لەژێرسایەی كارگەیەكی تردا بەرهەمەكانی بەرهەمدێنێ. ئەم دوو مۆدێلەش لەماوەی ئەم بیست سالەی دواییدا لەگەلێ لە ولاتانا گرنگی خۆی هەبووە.
بەخۆی كارگە بچووك و نێمچە گەورەكان بەهۆی پەیمانی كار لەگەل یان لەلایەن دەسەلاتی مالی /تەكنیكی كارگە گەورەكانەوە دەبرێنەڕێوە. جاریواش هەیە دەكەونە ناو نێتۆركی پەیوەندی ترەوە لەگەل كارگە بچووك و ناوەنجییەكانی تر بۆ بە ئەنجامدانی پڕۆژەی پێكەوەكاركردنی تر. لەم ڕووەشەوە دەكرێ نموونە لەسەر هەندێ لە كارگە بچووك و ناوەنجیەكانی هۆنكۆنگ بهێنرێتەوە. ڕەنگە دۆزی كارگە تایوەنیەكان ئالۆزتربووبێ گەر لەگەل كارگە هۆنكۆنگیەكان بەراوردكرێ.
-شەشەم ئاڕاستەی ڕێكخراوەیی ئەم سالانەی دوایی بریتییە لە فیدراسیۆنی كارگەی ستراتیژی. ئەوەی كە لەم بوارەدا سەرنجڕاكێشە ئەوەیە كە پێكەوەكاركردنی كارگە گەورەكان لەناو ولاتانیEU باروردۆخێكە لەئاكامی گەشەی تەكنەلۆژیای زانیاری و بەگلوبالبوونی بازاڕ هاتۆتە پێشێ. چونكە ئەو بازاڕە گلوبالییەی كەوا هاتۆتە كاركردن بارێ وای لەتەك خۆدا هێناوەتە ئارا كە دۆست و دوژمن پێكەوەكاركەن و هەموولایەك لەیەكتر دەكڕن و بەیەكتر دەفرۆشن. بەگشتی دەكرێ باس لەوەكرێ كە كارگەكان مۆدێلی ڕێكخراوەیی خۆیان گۆڕیووە ئەمەشیان كردووە تا بتوانن خۆیان لەتەك ئەو گۆڕنكارییە تەكنیكی و ئابوورییە بگونجێنن كە هاتۆتە دونیا. بۆیە لەگەل داهاتنی ئابووری زانیاری هەندێ فۆڕمی نوێی ڕێكخستن دێنە دونیا كە گرنگی خۆیانیان هەیە.
هەموو ئەوانەی لەسەرەوە بەرباسخران پێوەندیان بەو گۆڕانكاریانەوە هەیە كە لەسالانی 1970 كانەوە وەگەڕكەوتوون و بوونەتە هۆی گۆڕانی بوونیادی لە كارگەكان و ڕەنگدانەوەی ئەوەش بەسەر شێوازی بەرهەمهێنان و ڕێكخستن و بردنەڕێوەوە. لەوەگرنگتریش دەشێ بووترێ ئەوەیە كە ئەو باروردۆخەی لە سالی 1970 هاتە پێش بووە هۆی دروستبوونی گەشەێ تەكنیكی و ئابووری و ئەمەش مەسەلەیەكی دی هێنایە ئارا كە بریتی بوو لە سەپاندنی پێشبڕكێیێ

گەورە. پاش هاتنەکایەوەی ئەم دیاردەیەش ئەوەبوو کە کارگە گەورەکان پێش کارگەکانی تر کەوتنە ناو ئەمەوە (واتە مەسەلەی پێشبڕکێ). هەروەها گەلێ لە جێبەجێکردنە ڕێکخراوەییە جۆراوجۆرەکان لەگەڵ جیاوازی گوزارەی کولتووریان لەسەر بناغەی نێتۆرك دامەزراون. بەمجۆرە نێتۆرك ئەو گروندەیە کە ڕێکخراوەکان پێکەوە گرێدەدا یان کاری لەسەردەکەن.
ئەو پەرەپێدانە ڕێکخراوەییە نوێیانەی کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا ئاکامی میکانیزمی گۆڕانی تەکنیکی نین بەڵکو بەشێ لەوانە پێش هاتنی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ ڕوویاندابوو. واتە ئەو گۆڕانکارییە ڕێکخراوەییانە بەبێ وابەستەبوون بە گۆڕانکارییە تەکنیکیەکانەوە کەوتنەگەڕ. بەلام تەوژمی تەکنەلۆژیای زانیاری کە لە هەشتاکانی سەدەی بیستەوە وەگەڕکەوت گۆڕانکاریێ زۆر هێنایە سەر کارگەکان و ئەمەش داوای گۆڕین و سەرلەنوێ فۆڕمدارکردنی کارگە پیشەسازییەکانی کرد. ئەوەی لێرەدا جێی دەرکپێکردنە ئەوەیە کە لەگەڵ هاتنی تەوژمی تەکنیکی نوێ لە هەشتاکانەوە کارگە بچووك و نیمچەگەورەکان پێش کارگە گەورەکان هەولیاندا خۆیان بە نێتۆرکەوە گرێدەن.
لەم ڕوەشەوە دەکرێ کارگە بچووك و نیمچە گەورەکانی چین و هۆنکۆنگ و سەنگافورە بەنموونە بهێنرێتەوە. ئەم خۆ گرێدانەش بە نێتۆرکەوە بەهۆی پەرەپێدانی نێتی کۆمپیوتەرەوە ئەنجامدرا. هەروەها ئەو گۆڕانکارییە ڕێکخراوەییانەش کە لە کارگە بچووك و نیمچەگەورەکان وەگەڕکەوت کاریگەریی خۆی بەسەر نەشونمای تەکنیکیشەوە بەجێهێشت و وای لە کارگە گەورەکانیشکرد کە بەبێ جیاوازی پێویستیان بە کۆمپیوتەری شەخسی PC و نێتی کۆمپیوتەر ببێ. ئەم نێتۆرکە گرنگیێ زۆری بۆ ئەوەی پێیدەلێن مرونەتی ڕێکخراوەیی هەبوو و هەروەها ئەو سەرکەوتنەی لە ژیانی بزنزدا ڕوویدا.
بەپێی ڕاپۆرتی توێژینەوەیەکی Bar & Borrus بێ تەکنیکی نێتی زانیاری لەماوەی سەرەتای سالانی 1990 کان مانایێ گەورەی وەرگرتووە، کە ئەوەش بەهۆی لێکدی نزدیکبوونەوەی سێ ئاراستەی جیاوە هاتۆتەدی: دیگیتالیزەکردنی نێتی تەلەفۆن، پەرەپێدانی گوازتنەوەی برێدباند و بەرزبوونەوەی دراماتیکی وەزیفەی کۆمپیوتەر. نەشونمای چۆنایەتی تەکنەلۆژیای زانیاری کە پێش 1990 کان کەوتەکار هاتنی پرۆسەی ـەرن و بەکۆمپیوتەرکردنێ فیعلی لەبواری بردنەڕێوەی کارگە، بەرهەمهێنان و دابەشکردن و هەروەها پێوەندی نێوان کارگە جۆراوجۆرەکانی شیاوکرد. لە توێژینەوەیەکی تردا Dieter Ernst ئەوە نیشاندەدا کە لێکدی نزدیکبوونەوە

لەنێوان داوای ڕێکخراوەیی و گۆڕانی تەکنیکی کاری نێتۆرك وەك فۆڕمێ پێشبڕکێی بناغەیی لە ئابووری نوێی گلۆبالدا دەستپێکردووە. نێتۆرکی کارگەکان هەمیشە کەڵکێ زۆری لە نوێکاری زانیاری وەردەگرن و ئەمەش کاردەکاتە سەر تێچوونەکانیان. هەروەها بەهۆی نەشونمای خێرای تەکنیکەوە نێتۆرك بووە بە یەکەی ئۆپێرەتیڤی فیعلی نەك کارگەکان.

هەروەك لەمەوبەریش جەغتمان لێکرد ئەو گۆڕانکاریانەی بەهۆی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێووە هاتەکایەوە فۆڕمێ ڕێکخستنی تازەی لەگەڵ خۆدا هێنا کە ئەم جۆرە فۆڕمەش لەتەك ئابووری زانیاری گلۆبال دا هاوکۆککرا. چونکە ئەو ڕێکخراوانەی لەمەوبەر هەبوونە لەگەڵ ئابووری گلۆبال دا ناگونجێن و فۆڕمی ڕێکخستنەکانیشیان لەگەڵ ئەو شێوازی بەرهەمهێنانە ڕێناکا کە ئابووری زانیاری پێڕەوی دەکا. ئەمەش ئەو خەسلەتەیە کە کارگەی نێتۆرك لەسەری دامەزراوە و خاوەنی شێوازێ بەرهەمهێنان و ڕێکخستنێ نوێیە. هەروەها ئەم کارگەی نێ‌ۆرکە ماتریالیزەی کولتووری ئابووری زانیاری گلۆبالیش دەکا و لەمیانەی بەکاربردنی زانینیشدا سیگناڵەکان بۆ شمەك دەگۆڕێ.

ئەوەی ڕاستیبێ فۆڕمەکانی ڕکخراوی ئابووری لە بۆشایێ کۆمەلایەتیدا گەشەناکا و ڕیشەشیان لە کولتوور و دامەزراوەکاندایە. بەهۆی هەندێ فۆڕمی ڕێکخراوەیی جۆراوجۆرەوە میکانیزمی بازاڕ لەهەندێ قۆناغی مێژوویدا گۆڕانی دێتەسەر و زۆرجار هەندێ لە ولاتەکان، نەك کارگەکان، و لەبەرهۆکاری ئایدیۆلۆژی، جۆرە لۆژیکێکی بازاڕ هەلدەبژێرن کە بۆخۆیان گونجاوبێ. بۆنموونە ئەمە لە ئەمەریکا و لە ماوەی حوکمی ڕێگان Reagan لە سەرەتای هەشتاکاندا کراوە. بۆ ئەوەی مرۆڤ لەم دیاردەیە بگا کە بۆچی بازاڕەکان ئەم جۆرە ڕەوتە دەگرنەبەر ڕەنگە هەر ئەوە بکرێ بەشتێ گونجاو لەقەلەمبدرێ کە هەولی ئەوەبدرێ دیراسەی ڕێکخستنی ئابووری لەبەرچاوبگیرێ. چونکە بەهۆی ئەوەوە لەو چالاکییە ئابووریانەش دەگەین کە ئەنجامدەدرێن و مانایان بۆ فۆڕمی ڕێکخستنی ئابووری هەیە. گەر ئەم لایەنە، واتە ڕێکخستنی ئابووری و فۆڕمی ڕێکخراوەیی جۆراوجۆر، لەگەڵ باری ئاسیای ڕۆژهەلات دا بەراوردکەین دەبینین کە ئەم لایەنە لە یاریێ دەستەجەمعی نێوان کولتوور، مێژوو و دامەزراو دا ئەخولقێ و، ئەم لایەنە لە ئابوورییەکانی ئاسیای ڕۆژهەلات دا جیاوازە لە چاو ئابووریەکانی تر. ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تر ئاڕاستەی گروندی سیستەمی بزنزی ئاسیای ڕۆژهەلات لەسەر بناغەی نێتۆرك بوونیادنراوە. هەروەها بەردی بناغە لەم

سێستەمانەدا کارگە نییە بەڵکو نێتۆرك یان گرووپی بازرگانییە. ئەم جۆرەش زۆر لەو فۆڕمی ڕێکخستنەی کە لە کارگەکانی نێتۆرك دا هەیە نزدیکە. واتە لەم شوێنانەدا، لە ولاتانی ئاسیای ڕۆژهەلات، ئەو فۆڕمی ڕێکخستنەی پیادەدەکرێ لەنێوان خەڵکدایە (لە کولتوور، مێژوو و دامەزراو دایە) نەوەك لە کارگەکان. گەر ئابووری زانیاری/ گلوبال خۆی باشتر لەتەك فۆڕمی نێتۆرکی ڕێکحستنی بازرگانی )کۆمێرسیال ) بگونجێنێ ئەوا ئابووری ئاسیای ڕۆژهەلات دەکارێ لە پێشبڕکێی ئابووری گلوبال دا ئابووریێ چالاك بێ. ئەم جۆرە مۆدێلانە، واتە ئابووریەکانی ئاسیای ڕۆژهەلات، جۆرە ڕێکخستنێکی تیابەدیدەکرێ کە لەتەك ئەو کولتوور و دامەزراوانەدا کۆکە کە لەم ولاتانەدا هەن. هەروەها ئەم ئابووریانە توانای ئەوەیان هەیە کە لە گشت ئابوورییەکانی جیهان زێتر بتوانن خۆیان لەتەك فۆڕمە نوێکانی تەکنیك و پێشبڕکێی گلوبال دا بگونجێنن. کاتێ کە باسیش لە ژیانی بزنزی یان تیپۆلۆژیای بزنزی ئاسیای ڕۆژهەلات دەکرێ دەبێ جیاوازی لەنێوان سێ جۆرە نێتۆرکی سەرەکی بکرێ کە ئەوەش بریتییە لە: ژیانی بزنزی یابانی، دواتر کۆری و هەروەها چینیش. فۆڕمی دەرەکی دینامیکی ژیانی بزنزی ئاسیای ڕۆژهەلات لەگەل توانای ئەم ولاتانە بۆ چوونە ناو ئابووری گلوبال دەکەوێتە ناو نیوەی دووەمی سالانی 1900 کانەوە. ئەمەو نێتۆرکی بزنزی ئاسیای ڕۆژهەلات ڕێکخراوێ ئابووری پیادەیکردووە کە لەگەل پێشبڕکێی ئابووری گلوبال دا هاوکاتبووە و سەرباری ئەوە ئەم نێتە لەماوەی ئەم سی سالەی دوایی سەرکەوتنێ باشیشی بەدەستهێناوە و ئەوەی سەلماندووە کە خاوەنی کولتوورێ ڕێکخراوەیی خۆیەتی. بۆشە دەلێین کولتوورێ ڕێکخراوەیی چونکە لەم ولاتانەدا یان لە ئاسیای ڕۆژهەلات کولتوور کاریگەری بەسەر ڕێکخراوەوە هەیە. بەلام هەریەك لە نێتۆرکەکانی ئاسیای ڕۆژهەلات لەسەر بناغەی لۆژیکێ بوونیادنراوە کە تاڕادەیەکی زۆر لەیەکتر جیاوازن و، ئەم جیاوازیەش باس لە بوونی سێ ناوچەی کولتووری دەکا کە بریتیە لە ناوچەی یابانی وکۆری و چینی. ئەم سێ کولتوورەش (کە سێ لۆژیکی تەکنەلۆژی لەخۆدەگرێ) زۆر لەیەکەوە دوور نین و بەها ئاینی و فەلسەفییەکانیش(بوودیزم و کۆنفۆشیزم) ڕۆلییان لە بردنە ڕێوەیان دیووە. ئەو توێژینەوانەش Hamilton & Biggart لەم بارەیەوە ئەنجامیانداوە باس لەوەدەکەن کە باگروندی دامەزراوەیی مانای خۆی بۆ ڕونکردنەوەی کولتوور هەیە. ئەوەی کە گرینگە سەبارەت بەم کولتوورانە بەرباسخرێ ئەوەیە کە یەکەی کۆمەلایەتی ئەم کولتوورانە خێزانە نەك تاك

(ئیندڤید). لەهەمان کاتدا جیاوازی سەرەکی نێوان ئەم کولتوورانە لەوەدایە کە دەولەت لەلایەك ڕۆڵێ مێژووی دیووە و لەلایەکی تر ڕۆڵی لە پرۆسەی پیشەسازیکردندا دیووە. دەولەت بۆ ئەم کەلتوورانە مانای خۆی هەیە (بۆ نموونە ڕۆڵی دەولەتی قەیسەری یابانی لە دروستکردنی یابانێ تەکنۆکراتی مۆدێرن) بەلام ڕۆڵی ئەم دەولەتە لە مێژووی نوێدا نە لەم ولاتانەدا وەك یەکە و نەش وەك ئەو ڕۆڵەیە کە لەمەوبەردیوویەتی. چونکە دەولەتی نوێی چین لە دەولەتی نوێی یابان جیاوازە. چونکە ئەم دەولەتە یابانییە تەنیا خۆی دروستنەکردووە بەلکو لەژێر سایەی دەسەلاتی کۆلۆنیالی خۆیدا دەستی لە دروستکردنی کۆریا و تایوانیش هەبووە. ئەگەرچی ئەم ولاتانەی ئاسیای ڕۆژهەلات لەڕووی مەسەلەی ڕێکخراوەییەوە لەیەکتر ناکەن وەلی هەمیشە جۆرە هاوشێوەییێك لەنێویاندا بەدیدەکرێ. بۆ نموونە ئەوەی پێوەندی بە ڕۆڵی دەولەتەوە هەیە لە بابان وەك چین نییە. چونکە لە چین ئەوکاتەی کە دەولەت کاری بۆئەوەنەکردووە کە بازاڕێ دروستکا لەبڕی ئەوە خێزان ئەم کارەی کردووە. بەلام سەبارەت بە گەشەی دەولەت لە یابان دەکرێ سەرەتا باس لە ڕۆڵیMitis کرێ کە مانای مەزنی بۆ ئابووری یابانی هەبووە. لە یابان مۆدێلێ کاریکردووە کە دەولەت زۆر گرنگی تیاهەبووە. هەرچی مۆدێلی کۆری بووە، کە ئەمەش یەکێکە لە مۆدێلە ئابوورییەکانی ئاسیای ڕۆژهەلات، لەچاو مۆدێلی یابانی کە دەکرێ بووترێ مۆدێلی کۆری زۆر سەنتەری بووە. دەسەلاتی دەولەتیش لەناو ئەم مۆدێلەدا پتر بۆ ڕێکخستنی کەرتە ئابوورییە سەرەکییەکان (کەرتی بانق، پیشەسازی، بازرگانی) بووە. دەشێ ئەوەش بووترێ کە دیراسەی نێتۆرکی کارگەی ولاتانی ئاسیای ڕۆژهەلات سەرچاوەێ باشە بۆ ناسینەوەی ئەو فۆڕمە ڕێکخراوەییانەی دامەزراو و کولتوورەکانی ئەم ولاتانە کاریان لەسەرکردووە، کە بەخۆی لە کارگەی نێتۆرکی ولاتانی ڕۆژئاوا جوداوازن.

بەباوەڕی Dieter Ernst نێتۆرکی کارگە لە بواری ئابووری گلوبال دا لەدەوری پێنج جۆر نێت هۆرکدا ڕێکدەخرێ (ئۆرگەنیزەدەکرێ):

1- نێتۆرکی فرۆشیار کە بریتییە لە دروستکردنی تەجهیزاتی ئۆرژینال.

2- نێتۆرکی بەرهەمهێنەر کە بریتییە لە شیاوکردنی پێوەندی نێوان بەرهەمهێنەران و ڕووخستنی توانای بەرهەمهێنان و هەروەها قوودرەتی مالی و ئەزموونی ئەم بەرهەمهێنەرانە.

3- نێتۆرکی کڕیار کە برتییە لە پێوەندی کارگەی دروستکردن لەگەل دابەشکەران (موەزعەکان) و فرۆشیار و بەکاربران.
4- ئیئتلافی چوارچێوە کە لەلایەن چوارچێوەدانەرە گلۆبالەکانەوە ئاگاداردەکرێتەوە.
5- نێتۆرکی پێکەوەکارکردنی تەکنیکی کە دەستکەوتنی دیزاینی بەرهەم و تەکنیکی بەرهەمهێنان ئاساندەکا و پەرەپێدانی پرۆسەی بەرهەمهێنانی هاوبەشیش شیاودەکا.

هاتنی ئەم نێتۆرکانە بەمانای داڕمانی کارگەی مولتی ناسیۆنالی نایێ بەلکو نێتۆرك بۆ کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان مانایێ خۆی هەیە. لەهەمان کاتدا دەکرێ ئاماژە بەوەشکرێ کە فۆرمە ڕێکخراوەیەکان شانبەشانی پرۆسەی جیهانگیری سەرکەوتووانە لە کارگەی فرە نەتەوەییەوە بۆ نێتۆرکی نێودەولەتی پەرەی سەندووە. لەهەمانکاتدا کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان(کۆمپانیا ترانس ناسیۆنالییەکان) تەنیا بەشداری لە کاری نێتۆرك دا ناکەن بەلکو ئۆرگەنیزەی خۆشیان لە نێتۆرکی مەرکەزیشدا دەکەن. هەروەها کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان تەکنیکیان بەدەستەوە هەیە و دەسەلاتێ ڕاستەقینەشیان لە ئابووری گلوبال دا هەیە. ئەم نێتۆرکەش کە باسکرا لە ئابووری نوێ، کە ئابووریێ گلوبال و پێشبڕکێیاوییە، مەسەلەیێ سەرەکی و بناغەییە. ئەو سوودەش کە کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان لەم نێتۆرکە وەریدەگرن هەر لەسەر بناغەی ئەو گرنگیەیەتی.

هەر ئەوی لەسەرەوە ناوی هات (واتە دێیتر ئێرنست) سەبارەت بە نێتۆرك و فۆرمی ڕێکخستن ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە دوو فاکتە لەئارادان کە دەکرێ وەك هۆکاری سەرەکی تەماشاکرێن کە گرنگیان لە پرۆسەی هەلاوگۆڕانی ڕێکخراوەیدا هەیە. ئەو دوو فاکتەیەش یەکەمیان لە جیهانگیری بازاڕ پێکهاتووە و ئەویدیان لە گۆڕانی دراماتیکی تەکنیك بریتییە. ئەوەی کە زۆر گرنگە ئاماژەی پێکرێ سەبارەت بە خالی یەکەم ئەوەیە کە جیهانگیری و بەزانیاریکردن پێوەندیێ بوونیادی لەتەك نێتۆرك و مرونەت(فلێکسبلیتێ) دا هەیە.

بۆ زێتر ڕوونکردنەوەی ئەوی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا دەشێ لێرەدا باس لەوەشکرێ کە ئەم زانیاریگەرییە ئەوەیە کە پیادەی ئەمڕۆماندەکا. ئەلبەتە سەروتارە ناودارەکەی ماکس فیبەرMax Weber لەبارەی ڕەوشتی پرۆتستانتیزم و ڕۆحی سەرمایەداری بووە بە بەردی بناغەیێ مێتۆدۆلۆژی

لەگشت هەولێ تیۆری کە هەولبدا لەو هەلاوگۆڕانە کولتووری و دامەزراویانە بگا کە لەفۆڕمی تازە لە ڕێکخستنی ئابووری دا دەردەکەوێ. بەخۆی ئەم ڕوونکردنەوەی فێبەر گرنگی خۆی بۆ ڕوونکردنەوەی پێکهاتەی کولتووری و دامەزراوی نوێ هەیە کە لەپال فۆڕمی ڕێکخراوەیی ژیانی ئابوورییەوەن. ئەمە دەکرێ ناوێ تری بۆ بدۆزرێتەوە کە ئەوەش ڕۆحی زانیاریگەرییە. هەر لەم ڕووەشەوە ئاساییە بپرسین بناغەی ڕەوشتی زانیاریگەریی چییە؟ و ئایا زانیاریگەریی پێویستی بە بناغەێ ئیتیکی هەیە؟ و هەروەها کامەن باگرووندی ڕەوشتی کارگەی نێتۆرك؟. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەش باس لەوەدەکەین کە کولتووری پێشبڕکێی سەرمایەداری نوێ گۆڕانکاری بەسەرداهاتووە و لەگەل داهاتنی زانیاریگەرییدا بووە بە فۆڕمێ ئابووری و هەروەها فۆڕمێ ڕێکخستنی بەتوانا. لەگەل ئەو گۆڕانانەی هاتۆتەسەر پێشبڕکێی سەرمایەداری دەکرێ باس لە کارگەی نێتۆرکیش بکرێ. بۆ یەکەمجاریشە لە مێژوودا یەکەی گروندی ڕێکخستنی ئابووری سوبژێکتی و ئیندڤیدوال (وەك خاوەن کارگە یان کارگەی خێزان) یان کۆلێکتیڤ( وەك چینێ سەرمایەداری، کارگە یان دەولەت) نییە بەلکو لەبڕی ئەوە نێتۆرکە. واتە نێتۆرك جێی ڕێکخستنی دەستەجەمعی و تاکی گرتۆتەوە و بووە بە کارگە. ئەمەش ئەوەدەگەیێنێ کە کارگەی نێتۆرك بۆ لەمەولا شوێنی باسە. ئاسایشە بووترێ کە ئەم کارگەی نێتۆرکە لە چەند جۆرە سوبژێکت و ڕێکخراوێ پێکدێ. هەروەها ڕێکخستنی فۆڕمی نێتۆرك پێویستە ڕەهەندی کولتووری خۆی هەبێ و ئاسایشە شتێ هەبێ کە ئەم نێتۆرکانە بەیەکەوە ببەستێ. ئەمە و ئەوەشدەلێین کە کارگەی نێتۆرك بریتییە لە کولتوورێ فیعلی (ڤێژوال) و توانیوشیەتی خۆی وا ڕابهێنێ کە لەناو ئەم جۆرە کولتوورەدا کاربکا. وێرای ئەوەش دەکرێ بووترێ کە ڕووحی زانیاریگەریی کولتوورێکە لە تێگەیشتنێ خولقێنەر پێکهاتووە.

بەشی چوارەم:

# گۆڕانی کار و کارکردن

لە هەموو قۆناغێ مێژوویی دا هەلاوگۆڕانی کارکردن و بوونیادی پیشە(مبهنە) یەکێکە لە دەربڕینە ڕاستەوخۆکانی سێستەمی گۆڕان. ئەم لایەنەش گرنگی بۆ تیۆرییەکان لەبارەی پاش پیشەسازی و زانیاریگەریی هەیە و بۆ دەستنیشانکردنی گۆڕانە مێژووییەکان و چۆنیەتی داهاتنی بوونیادی کۆمەلایەتی نوێش بەکاردەبرێ. بۆئەوەی بوونیادی کارکردنی پاڕادیگمی زانیاری دەستنیشانکرێ دەبێ ئەو دامەزراو، کولتوور و ژینگە سیاسیە تایبەتانە دیارکرێن کە پەیوەندیان بەم کارکردنەوە هەیە. ئەمەو دیاریکردنی پەیوەندی نێوان تەکنیك، ئابووری و دامەزراوەکان مەرجە بۆ گەیشتن لە بوونیادی پیشە و کارکردن. بۆ ئەوەی لەم لایەنەش بگەین دەبێ تەماشای ئاماری پەرەپێدانی ئەو ولاتە سەرمایەداریانە بکەین کە ئابووری گلوبال پێکدێنن و پێیاندەوترێG7 (واتە ولاتە پیشەسازییە گەورەکان وەك ئیتالیا، بەریتانیا، کەنەدا، ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، فەڕەنسا، ئەلمانیا و یابان، هەروەها پاش بوونی ڕووسیا بە ئەندام لەم گرووپە ژمارەکە بوو بەG8).

دیاریکردنی هەلاوگۆڕانە تەکنیکی و ڕێکخراوەییەکانی کار و بەرهەمهێنان هەروەها دەستنیشانکردنی ئەوەی کە چۆن ئەم هەلاوگۆڕانانە کاردەکەنە سەر کار و کارکردن گرنگن. چونکە لەم دوو دەیەی دوایدا گۆڕانێ زۆر بەهۆی هاتنەکایەوەی تەکنیکی نوێ هاتۆتەسەر بوونیادی کار و کارکردن. بۆ ئەو مەبەستەش دەکرێ باری کار و کارکردن لە ولاتە پیشەسازییە گەورەکان G7، ولاتانیOECD بەنموونە وەرگیرێ.

هەر لەم بوارەشدا دەکرێ ئەوە بووترێ کە ئەو تیۆریە کلاسیکەی لەبارەی پاش پیشەسازیگەرییەوە لەئارادایە دەکرێ لەتەك سێ پێشبینیدا یەکخرێ کە ئەوەش بەم شێوەیەی لا یخوارەوە و لەسێ خالدا شیدەکرێتەوە:

1- سەرچاوەی بەرهەمهێنان و گەشە لەلایەن بەرهەمهێنانی زانینەوە دەکرێ بەهۆی ئامرازی زانیارییەوە بگۆڕدرێتە چالاکی ئابووری.

2- چالاكی ئابووری له بەرهەمهێنانی شمەكەوە بەرەو كاری خەدمات دەچێ. داڕمانی كاركردنی كشتوكالی ئاوابوونی كاری پیشەسازی بەدووهات.
3- ئابووری نوێ كێشی كار بەزدەكاتەوە بەلام ئەم بەرزكردنەوەیە بەدوور نییە له بەرزكردنەوەكانی ڕۆلی زانیاریی و زانینیش. هەر لەم حەلەتەشدا پیشەی تەكنیكی و ئیداری ئازاد زیاد لەپێویست و زۆر بەخێرا گەشەدەكا و ناوك لەناو بوونیادی كۆمەلایەتی نوێ دروستدەكا.
لەمەوبەریش ئەوە دەستنیشانكرا كە زانین و زانیاری له كۆمەلگە گەشەكردووەكانا بۆ بەرهەمهێنان و نەشونما گرنگترین سەرچاوەن و، هەروەها تیۆرییەكان لەبارەی پاش پیشەسازی لەسەر بناغەی توێژینەوەكانی Solow & Kendrick دامەزراوە كە هەردووش له ڕوونكردنەوەكانیانا دەگەڕێنەوە سەر بایەخدان بە پەرەپێدان لە ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا و بەتایبەت لەماوەی نیوەی یەكەمی سالانی 1900 كان، واتە لەو ماوەیەی كە ئیپۆكی پیشەسازی لە لوتكەدا دەبێ. ئەمە مانای ئەوەیە كە نەشونمای بەرهەمهێنان نیشانەیە لەسەر ئابووری پیشەسازی و ئەمەش بەتایبەت دوای ئەوەی كە كاركردنی پیشەسازی لە زۆربەی ولاتانی گەشەكردوودا گەیشتە لوتكە. لەم حالەتەشدا دەكرێ بووترێ كە هێلی جیكارە ناكرێ بخرێتە نێوان شێوازی ئابووری پیشەسازی و ئابووری پاش پیشەسازییەوە بەلكو ئەم هێلی جیاكارەیە دەكەوێتە نێوان دوو فۆڕم لە پیشەسازی كە یەكێكیان بەرهەمهێنانی كشتووكالییە و ئەوی تر خەدماتە. چونكە بوونیادە ئابوورییەكان لەماوەی نیوەی یەكەمی سالانی 1900 كان بەهۆی ئەو شۆڕشەی لەبواری تەكنەلۆژیای زانیاری دا ڕوویداوە و، هەروەها بەهۆی بلاوبوونەوەی ئەم شۆڕشە و ئەو گۆڕانكارییە ئابووری و كۆمەلایەتیانەی ڕوودەدەن لەیەك جیادەكرێنەوە.
بەلام دەكرێ باس لە تیۆرێ تر لەبواری پاش پیشەسازی كرێ كە ئەوەش بریتییە لە چوونە قۆناغی چالاكی خەدماتەوە(كە ئەوەش خالی دووەم دەگرێتەوە). گەر بەپێی ئەم تیۆرەش تەماشای ئابوورییە زۆر گەشە كردووەكان كرێ دەرك بەوەدەكرێ كە گەورەترین كاركردنیان لەبواری خەدمات دایە و ئەم كەرتەش گەورەترین یارمەتی داهاتی نەتەوەBNP دەدا. بەمجۆرە دینامیك و بوونیادی كەرتەكانی خەدمات مانای زۆری بۆ ئابووری خەدمات هەیە.
بەپێی توێژینەوەكانیZysman & Cohen بێ ئەو جۆرە ئابوورییە (ئابووری پاش پیشەسازی) ئەفسانەیە. چونكە بەپێی تەماشاكردنی ئەم دوو توێژەرەوەیە ئێمە بەهۆی وەگەڕكەوتنی ئەم كەرتەوە خۆمان لەناو فۆڕمێ نوێ لە ئابووری

پیشەسازی دەبینینەوە. هەروەها ئەم دوو توێژەرەوەیە جەغت لەوەدەکەن کە ئەم کەرتە تونیویەتی لە ئەمەریکادا 25٪ یBNP پێکبهێنن.
بۆ ئەو ئابووری و بوونیادە کۆمەلایەتیە نوێیەی ئەمڕۆ، کە لەژێرسایەی ئابووری زانیاری گەشەکردوودا سەرهەلدەدا، شیاونییە کە سنوور لەنێوان خەدەمات و شمەك دانرێ. هەروەها بۆئەوەی بکرێ لەم ئابووری و بوونیادە کۆمەلایەتییە نوێیە بگەین دەبێ دەست بەوەبکەین کە کارەکتێریزەی چەندین جۆر لە خەدەمات و بکەین و هەروەها جیاوازیش لەنێوان ئەم خەدەماتانەش دا بکەین. بەلام ئەوی پێوەندی بە خالی سێهەمەوە هەیە، واتە تیۆری سێهەم لەبارەی پاش پیشەسازییەوە، بە کارە(پیشە) زانیاریەکانەوە تایبەتە وەك ئیشی ئەکادیمی هەروەها ئیداری و تەکنیکی.
لێرەدا و بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو لایەنانەی سەرەوە (گوازتنەوە لە قۆناغی کشتوکالییەوە بۆ خەدەمات و تادەگاتە شێوە کارە نوێکان) مەرجە بچینەوە سەر ڕوونکردنەوەی هەلاوگۆڕانی بوونیادی کار لەماوەی سالانی 1970-1920 و 1990-1970. ئەم سالانەش دەکرێ بەدوو قۆناغ تەماشاکرێ. چونکە ئەو دابەشکردنە تێگەیشتنێ زۆر لەبارەی پەرەپێدانی بوونیادی کار لە ولاتانیG7 بەدەستەوەدەدا. پاشان ئاسایشە دابنەوەدابنرێ کە کۆمەلگە لەژێرسایەی ئەم دوو قۆناغەدا جیاواز بووە. ئەلبەتە ئەم دوو قۆناغەش بەمجۆرە بووە: قۆناغی یەکەم بریتی بووە لە پاش کشتووکالی(واتە کەوتنە ناو پیشەسازیگەرییەوە) و قۆناغی دووەمیش بریتی بووە لە قۆناغی پاش پیشەسازی(واتە تێپەڕاندنی پیشەسازیگەریی). کاتێکیش کە تەماشای ولاتانیG7 دەکەین دەبینین کارکردنی پیشەسازی لە قۆناغی 1970-1920 بەجۆرە پەرەپێدانێ جۆراوجۆر تێپەڕیووە و لە ولاتێکەوە-ئابووریەکەوە- بۆ ولاتێکی-ئابووریەکی- تر پەرەپێدانەکە جوداواز بووە. بۆنموونە لە ئینگلیستان(بە وێلزیشەوە) ئاستی کارکردنی پیشەسازی لە 36، 8٪سالی 1921 بۆ 34، 9٪سالی 1971 هاتۆتەخوارێ. کەچی لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکادا کارکردنی پیشەسازی لە 24، 5٪ سالی 1930 بۆ 25، 9٪ سالی 1970 بەرزبۆتەوە. لە کەنەدا بەهەمانشێوە کارکردنی پیشەسازی لە 17، 0٪ سالی 1921 بۆ 22، 0٪ سالی 1971 بەرزبۆتەوە. لە یابان کارکردنی پیشەسازی زۆرترین بەرزبوونەوەی بەخۆوەدیووە کە ئەوەش بریتی بووە لە 16، 6٪ سالی 1920 بۆ 26، 0٪ سالی 1970 کەچی ئەم بەرزبوونەوەیە لە

ئەڵمانیا لە 33، 0٪ بۆ 40، 2٪ بووە. لە فەڕەنسا لە 26، 4٪ بۆ 28، 1٪ زیادیکردووە و لە ئیتالیاش لە 19، 9٪ بۆ 27، 4٪ بەرزبۆتەوە.

بەلام پەرەپێدانەکە لەماوەی قۆناغی 1990-1970 جوداوازبووە. کەواتە سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی ئابووری و هەلاوگۆڕانی تەکنیکی لەماوەی ئەم دوو دەیەی دوای سالانی هەفتاکان نزمبوونەوەێ زۆر لە کارکردنی پیشەسازی لە زۆربەی ولاتانیG7 بەدیدەکرێ. بەمجۆرە بەریتانیای مەزن، ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا و ئیتالیا دەستیاندایە خۆ دوورخستنەوەێ پەلە لە پرۆسەی پیشەسازیگەریی و، هەروەها کارکردنی پیشەسازی لە ماوەی سالانی 1990-1970 لە هەریەك لەم ولاتانە زۆر ڕووی لە کەمبوونەوەکردووە. لە بەریتانیای مەزن لە 38، 7٪ بۆ 22، 5٪ هاتۆتەخوارێ. لە ولاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکادا لە 25، 9٪ بۆ 17، 5٪ و لە ئیتالیا لە 27، 3٪ بۆ 21، 8٪ کەمبۆتەوە. هەروەها یابان و ئەڵمانیاش هێزی کاریان زۆر خێرا لە بواری کاری پیشەسازی دا کەمکردۆتەوە. لە یابان لە 26، 0٪ بۆ23، 6٪ و لە ئەڵمانیا لە 38، 6٪ بۆ 32، 2٪(سالی 1987). هەمان شت لە فەڕەنسا و کەنەداشدا کرا. کەمکردنەوەی کارکردنی پیشەسازی لە کەنەدا لە 19، 7٪ بۆ 14، 9٪(1971) بوو و لە فەڕەنساش لە 27، 7٪ وە بۆ 21، 3٪ هاتەخوارێ.

دەکرێ بووترێ کە بەریتانیا، بە وێلزیشەوە، لەسالی 1921 وە بوو بە کۆمەلگەیەکی پاش کشتووکالی(واتە پیشەسازی) و تەنیا لە 7، 1٪ لە هێزی کار لە کەرتی کشتووکالیدا کاریانده‌کرد کەچی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەڵمانیا و کەنەدا لەوماوەیەدا(واتە سالانی 1920)خەلکێ زۆر لەبواری کەرتی ناوبراودا(کەرتی کشتووکالی) کاریانکردووە و هەرچی یابان، ئیتالیا و فەڕەنسایە ئەو کۆمەلگانە بوونە کە کشتووکال و کاری بازرگانی دەستیان بەسەرداگرتووە. دەشکرێ دەرك بەوەکرێ کە هەرلەم ماوەیەدا(1970-1920) کارکردنی پیشەسازی(دروستکردنی پیشەسازی) و کارکردنی خەدەمات لەسەر حسێبی هاتنەخوارەوەی کارکردنی کشتووکالی زۆر بەرزبۆتەوە. ئەمەش زۆربەی ولاتانیG7 ی گرتۆتەوە. ئەم بەرزبوونەوەیەش لە کاری خەدەمات بووە هۆی ئەوەی کە کۆمەلگەیەك بەناوی کۆمەلگەی پاش کشتووکالیPostagrar بێتەکایەوە. لەڕووەشەوە دەکرێ ولاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا لەسەر ئەمجۆرە کۆمەلگەیە و سەرهەلدانی ئابووریێ بەناوی ئابووری خەدەمات(یان کارکردنی خەدەمات) بەنموونەێ بەرچاوی بهێنرێتەوە

و ، لەگەل چوونە ناو قۆناغی پاش پیشەسازیشەوە ئەم ئابوورییە ڕۆلێ گرینگی نەك هەر لەو دوو ولاتە بەلکو لە ولاتانی تریG7 شدا دیووە بەلام بەڕێژەی جیاجیا. واتە ئەمەریکا و کەنەدا هەر زوو کەوتنەناو بازنەی ئابووری خەدەمات و دوورکەوتنەوە لە کارکردنی پیشەسازی. هەرچی ولاتانی تریG7 (فەڕەنسا، ئیتالیا، ئەلەمانیا، یابان) یە بەو جۆرە ڕوویان لە ئابووری خەدەمات نەکردووە و کارکردنی پیشەسازیشیان کەمنەکردۆتەوە. واتە کەلێنێ گەورە نەکەوتۆتە نێوان کارکردنی خەدەمات و کارکردنی پیشەسازیەوە. بەلام دواتر، واتە لەماوەی سالانی 1990 کان زۆربەی ولاتانیG7 کەوتنە ناو بایەخدان بە خەدەمات و گەشەکردنی ئەمجۆرە ئابوورییەوە. ئەوەی تایبەتیشە بە کاری زانیارییەوە لە ولاتانیG7 گەشەی خۆی بەباشی کردووە بەلام ئەم گەشەیە جۆراوجۆر بووە. بۆ نموونە لە هەردوو ولاتی ئیتالیا و ئەلەمانیا کاری زانیاری لەماوەی سالانی 1970-1920 ئەو گەشەیەی نەکردووە و بەلام لەماوەی ئەم دوو دەیەی دوایدا، واتە لەدوای 1970 بەولاوە، گەشەێ چاکی بەخۆوەدیووە. کەچی ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا لە نێو ولاتانیG7 دەکرێ وەك گەشەکردووترین ولات لەم بوارەدا تەماشاکرێ. هەرچی فەڕەنسا و کەنەدایە تاڕادەیەکی زۆر لەیەك ئاستدابوونە. بەلام یابان دەشێ وەك حالەتێ تایبەت لەم بوارەدا تەماشاکرێ. بۆ نموونە گەشەی کاری زانیاری لە یاباندا لەماوەی سالانی 1970-1920 گەشەێ باش بووە و لە 0، 3٪ وە بۆ 0، 4٪ بەرزبۆتەوە و پاشان لەماوەی سالانی دوای 1970 بەولاوە (بەگشتی کاستێلس توێژینەوەکانی لە گشت شوێنێکدا تا ناوەندی سالانی 1990 کان دەگرێتەوە) بەرزبوونەوەێ زۆری بەخۆوە دیووە کە بریتی بووە لە 0، 4٪ بۆ 0، 5٪.
لەڕاستیدا یابان و هەروەها ئەلەمانیاش لەماوەی سالانی 1980-1970 دا ناسراوترین ولات بوونە کە کارکردنی زانیاریان بەجۆری بەرز گەشەیکردووە و لەو ئابووریانەش بوونە کە توانایێ باشی پێشبڕکێیان تیابووە. چونکە ئاستی کارکردنی پیشەسازی تیایانا زۆر بەهێزبووە و کورترین کەلێنیش لەنێوان کارکردنی خەدەمات و کارکردنی پیشەسازی لەم دوو ولاتەدا بەدیکراوە. هەروەها کورترین کەلێنیش لەنێوان کارکردنی زانیاریی و شمەك بەرهەمهێنان دا هەبووە.
هەر لەم بوارەدا و تایبەت بە مەسەلەی کارکردنی زانیاری لە کارگەکان دەکرێ باس لە واتای خەدەماتی کارگە بکرێ کە گرینگیێ ستراتیژی بۆ ئابووری نوێ هەیە. ئەم لایەنە(واتە خەدەماتی کارگە) گرنگە بۆ بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنان

و کاریگەری لە کارگەکانا. جا ئەم لایەنە لە هەریەك لە ولاتانیG7 لەو دوو قۆناغە جیاوازەی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا(1970-1920 و 1990-1970) لەبواری کار و کارکردن گرینگی خۆی هەبووە و بۆنموونە لە شوێنێ وەك بەریتانیای مەزن کارکردن لەبواری خەدەماتی کارگە لە 5٪ سالی 1970 بۆ 12٪ سالی 1990 بەرزبۆتەوە. لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا لە هەمان قۆناغدا لە 8، 2٪ بۆ 14٪ زیادیکردووە هەروەها لە فەرەنسا لە 5٪ بۆ 10٪ گەشەیکردووە. بەلام یابان بەرزبوونەوەکەی لەم بوارەدا ئاسایی نەبووە. لە سالی 1921 بۆ 1970 لە 0، 8٪ بۆ 5، 1٪ بەرزبۆتەوە. ئەمەو لەبەرچاوگرتنی سەرکەوتنێ گەورە لە ئابووری یابانیدا لەماوەی سالانی 1960 کانا، واتە لەو ماوەیەی کە ئابووری یابان ئاراستەی خۆی بەنێودەولەتی کرد. هەرچی قۆناغی دواترە (واتە ماوەی سالانی 1990-1970) بەرزبوونەوەێ گەورە لە 4، 8٪ وە بۆ 9، 6٪ لە چالاکیەکانی خەدەماتی کارگە لە یابان دا بەدیدەکرێ. ئەمەش بەدلنیاییەوە ئەو قۆناغەیە کە ئابووری یابان لە گەشەکردنێ بالادا بووە. سەبارەت بە ئەلەمانیا دەکرێ بووترێ کە خەدەماتی کارگە لە ئاستێ بالادا بووە و بە تەماشاکردنی ئەم ڕێژەیەش ئەوەمان بەباشی بۆدەردەکەوێ. لە سالی 1920 بۆ 1987 لە 4، 5٪ وە بۆ 7، 3٪ بەرزبۆتەوە. دەشکرێ باس لەوەکرێ کە هەردوو ئابووری یابانی و ئەلەمانی ئەم جۆرە خەدەماتەیان لەناو ئابووری خۆیانا بەکاربردووە و لەم بوارەدا خاوەنی درێژخایەنترین کارکردنن( واتە کارگەی خەدەمات).

جگە لەو شێوە خەدەماتەی لەسەرەوە باسکرا دەکرێ بێینەسەر جۆرێ تر یان واتایێ تر کە ئەوەش خەدەماتی کۆمەلایەتیە کە بەقەولی ئەدەبیاتی پاش پیشەسازیگەریی دەکرێ ئەم واتایە بۆ دەستیشانکردنی (کارەکتێریزەکردنی) کۆمەلگەی نوێ بەکارببرێ. لەم حالەتەیشدا دەگەڕێینەوە سەر یابان وەك ولاتێ (ئابووریێ) تایبەت کەچەلاکی (یان کارکردنی) خەدەماتی کۆمەلایەتی تیایا بە بەراورد بە ولاتانی تریG7 ڕێژەی بەرزە. بەلام گرینگە لێرەدا ئاماژە بەوەبکرێ کە ئەم بەرزبوونەوەیە لە خەدەماتی کۆمەلایەتی لەم ولاتەدا لەماوەی سالانی 1960 کان ڕوویداوە. هەرچی ولاتانی ترە وەك ئەمەریکا، کەنەدا و فەرەنسا ئەم جۆرە خەدەماتە تیایانا لەماوەی سالانی 1990-1970 کانا گەشەێ زۆری بەخۆوە دیووە. کەچی لە ولاتانی وەك یابان، ئەلەمانیا و بەریتانیای مەزن بەرزبوونەوەکەی ئەم جۆرە خەدەماتە لەم ماوەیەدا(واتە سالانی 1990-1970) بەتەرتیب بووە. پاشان دەکرێ ئاماژە بەوەشکرێ کە

پەرەسەندنی کارکردن لەبواری خەدەماتی کۆمەلایەتی لە ولاتانیG7(یابانی لێدەرچێ) پتر خاسلەتی سالانی 1970-1950 بووە وەك لەوەی هی سالانی 1970-1990 بێ. ئەلبەتە ئەم سالانەی دواتریش دەکرێ وەك سالانی هاتنەکایەوەی کۆمەلگەی زانیاری تەماشاکرێ. وێرای ئەوە کاتێ کە باس دێتەسەر مەسەلەی خەدەماتی کۆمەلایەتی لە ولاتانیG7 ئاساییە باسی مەسەلەی دەولەتی ڕەفاهیەت بێتەپێشەوە کە ئەم مەسەلەیەش لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێ تر دەگۆڕدرێتەوە.

دەکرێ بچینەسەر واتایەکی تریش لەو واتایانەی پێوەندی بە ئابووری پاش پیشەسازییەوە هەیە کە ئەوەش واتای خەدەماتی دابەشکردنە. ئەمجۆرە خەدەماتە توانای ئەوەی هەیە کە هەریەك لە گوازتنەوە و گەیاندن یەکخا. ئەم شێوە خەدەماتە لەو ئابوورریانەی کە خاوەنی گەشەی بالان چالاکیەکانی بەرزە. لە شوێنێ وەك یابان، فەرەنسا و کەنەدا ئەم خەدەماتە لەماوەی سالانی 1970-1990 بەرزبووە و دەشکرێ بووترێ کە نیوەی خەدەماتی ناوبراو لە ولاتانیG7 بواری ووردە بازرگانی گرتۆتەوە. ئەم واتایە لەلایەك و لەلایەکیتر واتایەکی گرینگی تریش هەیە کە پێیدەوترێ خەدەماتی شەخسی دەکرێ ئەمەیان بۆ ناسینەوەی ئەو ئابوورریانەی کە بە ئابووری پاش پیشەسازی ناودەبرێ، بەکارببرێ. ئەم جۆرە خەدەماتە لە سالی 1990 بۆ بواری کارکردن لە زۆربەی ولاتانیG7 مانادار بووە (ئەلبەتە ئەلمانیای لێدەرچێ). وەکیتریش لە سالی 1970 وە بواری کارکردن لەم بوارەدا دەستی بە بەرزبوونەوەێ باش کردوە.

دەکرێ لێرەدا هەندێ سەرنج لەبارەی بەهای ئەو تێزانەوە(بۆ نموونە دانیال بێل، ئالن تۆرێن و کەسانێ تر) بدەین کە بە پاش پیشەسازیگەرییەوە تایبەتن. واتە دەمانەوێ بلێین کە خەدەماتی کارگە و خەدەماتی کۆمەلایەتی لە ئابووری پاش پیشەسازییەوە نزدیکبووە و هەردووش گرنگی خۆیان بۆ گۆڕینی بەهاکان و بایەخدان بەپێویستییە کۆمەلایەتیەکان هەبووە. گەر تەماشای زۆربەی ولاتانیG7 ش بکەین دەبینین کە ئەم دوو خەدەماتە لەناو ئەو ئابوورریانەی کە پێیدەلێن ئابووری پیشەسازیگەریی(لەماوەی 1990-1970) لە زیادبووندا بووە. گەر تەماشای ئەم ڕێژانەی لای خوارەوەش بکەین دەبینین کە واتای خەدەماتی پاش پیشەسازی بەرزبوونەوەێ زۆری بەخۆوەدیووە. لە بەریتانیای مەزن لە 22، 8٪ بۆ 39، 2٪. لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا لە 30، 2٪ بۆ 39، 5٪. لە کەنەدا لە 28، 6٪ بۆ 33، 7٪. بەلام لە یابان لە 15،

1٪ بۆ 24، 0٪. لە ئەلمانیا لە 20، 2٪ بۆ 31، 7٪ و لە فەڕەنسا لە 21، 1٪ بۆ 29، 5٪.

مەسەلەی زیادکردنی خەدەمات لە ولاتانیG7 وەك یەك نەبووە. چونکە کاتێ ولاتانی ئانگلۆسکسۆنی گەشەیان بە کارکردن لەبواری ئەم خەدەماتانە داوە، ولاتانێ تر وەك یابان و ئەلەمانیا و فەڕەنسا، جارێ لەژێرسایەی کارکردنی دروستکردنی پیشەسازی و کشتووکالی دا بوونە. لەم حالەتەشدا دەکرێ دوو ڕێگا لەبواری کارکردنی پاش پیشەسازی جوداکرێتەوە. یەکەم مۆدێلی ئانگلۆسکسۆنییە و ئەویتر مۆدێلی یابانی-ئەلەمانییە. ئەلبەتە مۆدێلی فەڕەنسی پتر لە مۆدێلی ئانگلۆسکسۆنییەوە نزدیکە وەك لە مۆدێلی یابانی-ئەلمانی.

مەرجە لێرەدا گرنگی بەو گۆڕانکاریانە بدەین کە لە بوونیادی پیشەی نوێدا ڕوودەدەن. چونکە ئەم لایەنەش یەکێکە لە پێشبینیە سەرەکیەکانی تیۆرییەکان لەبارەی پاش پیشەسازییەوە. کە بەخۆی ئەم مەسەلەیە بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە مرۆڤەکان دەکەونە ناو کارکردنی نوێوە و هەروەها شوێنی نوێ لە بوونیادی پیشەدا وەردەگرن. لەماوەی گوازتنەوەش بەرەو کۆمەلگەی زانیاری بایەخێ زۆر بۆ کاری ئیداری، هەروەها کاری ئازاد (سەربەخۆ) و تەکنیکی دێتەگۆڕێ. واتە بایەخ بە هەندێ کار و پیشەی نوێ دەدرێ لەوانە زیادبوونی کارکردن لە بواری کۆنتور(ئۆفیس) و تەنانەت بازرگانیش. بەدلنیایەوە بوونیادی ئەو پیشە تازانەش کە لە کۆمەلگەی زانیاریدا سەرهەلدەدەن وەك یەك نەبوونە. بۆ نموونە لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا و کەنەدا دا دەبینین ئەم پیشە نوێیانە زۆر گەشەی کردووە و لە سەرەتای 1990 کانا یەك لەسەر سێی هێزی کاری پێکهێناوە. بەلام لە یابان14، 91٪ ی هێزی کاری پێکهێناوە و لە فەڕەنسا و ئەلەمانیا دا لە 1989 یەك لەسەر چواری هێزی کاری پێکهێناوە. هەر لەوکاتەدا پیشەسازی لە باکووری ئەمەریکا ڕووی لە نەماننناوە کەچی لە یابان 31، 8٪ ی هێزی کاری پێکهێناوە و لە فەڕەنسا و ئەلەمانیا 27٪ ی هێزی کاری پکهێناوە. ئەلبەتە هەر لەم ماوەیەشدا دەستی کار لەبواری بازرگانی لە فەڕەنسا 3، 8٪ ی هێزی کاری پێکهێناوە. بەلام لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا 11، 9٪ و لە یابان 15، 1٪ بووە. شوێنێ وەك یابان دەستی کاری لە بواری ئیداری لەچاو ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا زۆر کەمبووە. لە یابان ئەم بوارە لە سالی 1990 3، 8٪ هێزی کاری پێکهێناوە و کەچی لە ئەمەریکادا 12، 8٪ بووە.

که باس دێتەسەر بوونیادی پیشەی نوێ لە ولاتانیG7 دەکرێ باس لە جۆرە پیشەێ تریش کرێ کە ئەوەش کاری خەدەماتی نیمچە نەوعییە. ئەم جۆرە کارە لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەلەمانیا و کەنەدا لەچاو ولاتانی وەك یابان، فەڕەنسا و ئیتالیا ماناێ زۆری بۆ ئابووریەکان هەبووە.
هەروەك لەمەوبەریش ئامازەی پێکرا بەچوونە ناو قۆناغی زانیاریگەریەوە هەندێ پیشەی نوێ دێتەکایەوە (کاری تەکنیکی و ئیداری سەربەخۆ و هەروەها باوبوونی کاری کۆنتوور یان ئۆفیس) کە بلاوبوونەوەی ئەم پیشانە لەناو ولاتانیG7 دا وەك یەك نییە و لە هەریەك لەم ولاتانە بەشێوەێ ئەم جۆرە کارانە بلاوبۆتەوە کە پێوەندی بە باری خودی پرۆسەی بەڕێوەچوونی زانیاریگەرییەوە هەبووە. بۆ نموونە گەشەی ئەم جۆرە کارانە لە شوێنێ وەك فەڕەنسا وەك ولاتانی هەمان گرووپ نەبووە یان خودی دەستی کاری پیشەسازی لە ولاتهایەکی وەك ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، بەریتانیای مەزن و کەنەدا لەچاو ولاتانی وەك یابان، ئەلەمانیا و فەڕەنسا زۆر بەخێرا ڕووی لە کزیناوە. ئەمەو بگرە لە ولاتانی وەك ئیتالیا، فەڕەنسا و یابان ترادیسیۆنی کشتووکالی، کە دەرامەتێ بووە بۆ کاروباری بازرگانی، زۆرتر درێژخایەنتر بووە لەچاو هەندێ ولاتی تر. بەلام دواتر لە هەموو ولاتانیG7 دا دەستی کاری پیشەسازی ڕووی لە کزینا و ئەمەش لەبەر بەرزبوونەوەی دەستی کار لە بواری پیشەسازی و دواتریش سەرهەلدانی هەندێ پیشە و کاری نوێ و بەرزبوونەوەی کارکردن لە کەرتە زانیاریەکانا.
کەواتە دەکرێ پێشبینی ئەوەبکرێ کە کارکردن لە دەیەکانی داهاتوودا لەبواری کشتووکالی بەرەو خوارەوە دەچێ و هەروەها کارکردن لە بواری دروستکردنی پیشەسازی (کاری پیشەسازی) ڕوو لە کزی دەنێ بەلکو لەبری ئەوە کاری پیشەدار و تەکنیکار لە گەشەکردندا دەبێ. هەروەها کارکردن لەبواری تەندروستی و خوێندنیش لە زیادبووندایە. پاشان کارکردن لەبواری وورده بازرگانی و خەدەمات کاردەکاتەسەر دەستی کار لە بواری ئەو کارانەی کە بەکاری نیمچە نەوعی دادەنرێ کە لە ئابووری نوێ دا لە بەرزبوونەوەدایە.
بەپێی ئەومێتۆدە ئیمپیریەش کە لەم باسەدا ئیشی لەسەر دەکرێ دەشێ هەندێ خالی هاوبەش سەبارەت بە پەرەپێدانی کارکردن لە ولاتانیG7، کە بناغەن لە بوونیادی کۆمەلگەی زانیاری، دەستنیشانکرێ:
- بەرەو دواوەچوونی کارکردن لەبواری کشتووکالیدا
- نزمبوونەوەی ڕێژەی کارکردن لەبواری پیشەسازی ترادیسۆنالیدا

- گەشەی هەریەك لە خەدەماتی کارگە و خەدەماتی کۆمەلایەتی. ئەلبەتە لەگەل جەغتکردن لە خەدەماتی کۆمێرسیال لە بواری خەدەماتی کارگە و هەروەها خەدەماتی تەندروستی لەبواری خەدەماتی کۆمەلایەتی
- گەشەێ زۆر لە خولقانی کار لەبواری کارکردنی خەدەماتیدا
- بەرزبوونەوەی ڕادەی کارکردن لەبواری ئیداری تەکنیکی و کاری سەربەخۆ(ئازاد)
- زیادبوونی کار لە بواری ئۆفیس و ستافی بازرگانی
- جێگیریێ ڕێژەی لە بواری کارکردنی بازرگانی ووردە دا
- زۆربوونی داوا لەسەر ئەو جۆرە کارانەی کە توانا و خوێندنێ بالای دەوێ هەرتایبەت بە بوونیادی پیشە و کارکردن لە ولاتانیG7 دەکرێ تیۆریزە بەسەر دوو مۆدێلی زانیاری جۆراوجۆردا بکرێ:
مۆدێلی یەکەم لە مۆدێلی ئابووری خەدەمات بریتیە. ئەم مۆدێلە بەزۆری لەلایەن ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا، بەریتانیای مەزن و کەنەدا نوێنەرایەتی دەکرێ. ئەمەش دوای هاتنەخوارەوەی ئاستی کارکردنی پیشەسازی و بەتایبەت دوای چوونە ناو قۆناغی زانیاریگەرییەوە. واتە دوای سالی 1970. بەپێی ئەم مۆدێلە کاری خەدەمات لە گەشەێ زۆردا دەبێ. هەروەها کارکردن لەبواری تەندروستی و خوێندن زیاددەکا و ئەمەش کاریگەریی بەسەر گەشەی دەستی کار لەبواری ئیداری دا بەجێدێلێ.
مۆدێلی دووەم لە بەرهەمهێنانی پیشەسازی پێکهاتووە. ئەم مۆدێلەش بەزۆری لەلایەن یابان و ئەلمانیا وە نوێنەرایەتی دەکرێ. بەلام لەهەمان کاتدا ئەم مۆدێلە گریگی بە کەمکردنەوەی کارکردنی پیشەسازیش دەدا. بەلام بەجۆرێ ئەوتۆ کە بتوانێ شیاویی لەبەردەم سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی کارکردن لە بواری دروستکردنی پیشەسازیدا بکاتەوە کە تایبەتە بە پاڕادیگمی سۆسیۆ تەکنیکی نوێووە.
لەم دوو ولاتەدا(واتە ئەلمانیا و یابان) خەدەماتی بەرهەمهێنان لە خەدەماتی مالی(نەختی) گرنگترە. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە خەدەماتی مالی بۆ ئەم دوو ولاتە گرینگی نییە. چونکە لە گەورەترین 10 بانقی جیهانی 8 ی یابانییە و لەهەمان کاتیشدا یابان یەکێکە لەو ولاتانەیG7 کە پتر لە ولاتەکانی تری زانیاری کاری خەدەماتی کۆمەلایەتی تیایا لە ئاستێ بەرزدایە. ئەمەش ڕەنگە هۆی خۆی هەبێ لەوانە ئەوەی کە تایبەتە بە بوونیادی خێزانی یابانی و

هەروەها ئینتەرنالیزەکردنی( لە ئینتەرنالیزمەوە وەرگیراوە) بەشێ لە خەدەماتی کۆمەلایەتی و هەروەها مەسەلەی ڕێکخستن لە کارگەدا.
هەرچی فەڕەنسایە وەك یەکێ لە ولاتانیG7 بەزۆری لە ژێر خانەی مۆدێلی ئابووری دادەنرێ. بەلام ئەم ولاتە گرینگی خۆشی لە بواری ئابووری خەدەمات و کارگەی خەدەماتی کۆمەلایەتیدا هەیە. هەروەها دەکرێ ئەوەش بووترێ کە جۆرە نزدیکبوونەوەیەك لەنێوان ئابووری ئەلەمنیا و فەڕەنسا دا بەدیدەکرێ. ئەوەی لەم بارەیەشەوە کە بە ئابووری ولاتی ئیتالیاوە تایبەتە ئەوەیە کە دەکرێ بخرێتە ژێر خانەی مۆدێلێ ترەوە- یان سێهەم مۆدێلەوە- کە ئەمەش دەشێ بووترێ ئەو مۆدێلەیە کە تایبەتە بە گەشەی نێتۆرکی کارگەی بچووك و نیمچەگەورە.
گرنگە ئاماژە بەوەکرێ کە ئەم مۆدێلانە کە لەلایەن هەریەك لە ولاتانیG7 وە پێڕەودەکرێن مانا بە ئابووری ئەو ولاتانە دەدا. هەمیشەش ئەم مانایە دۆزێ تر بۆ ئابووری دروستدەکا. کەواتە مۆدێلەکان کارێ وادەکەن دۆزی ئابووری ئەم ولاتانە بگۆڕدرێ و ئەم گۆڕانەش دواجار گرینگی لە دیاریکردنی شوێنیان لە ئابووری گلوبال دەبێ. بەلام دەبێ ئەوەش بووترێ کە چەند فۆڕمێ جوداواز هەیە کە تایبەتە بە چۆنیەتی چوونە ناو ئابووری گلوبالەوە. ئەم فۆڕمانەش تەنیا لەسەر جیاوازی ڕێگاکانی پەرەپێدانی ئابووری و ژینگەی دامەزراوەکان نەوەستاوە بەلکو لەسەر ستراتیژی کارگە و ڕەفتاری دەولەتەکانیش وەستاوە. چونکە بەشێ زۆر لە ستراتیژی کارگە و ڕەفتاری دەولەتەکان بەجۆرێ ئاڕاستە دەکرێ کە لەتوانایدایە جۆرە فۆڕمێ تێکەلاو لە خەدەمات و پیشەسازی دروستکا. بەخۆی جیاوازیێ گەورە لە بوونیادی کارکردنی ولاتانیG7 دا بەدیدەکرێ کە ئەمەش لەهەمانکاتدا جیاوازی دەخاتە نێوان سیستەمی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و بردنەڕێوەی کۆمەلگەکانی زانیارییەوە. کاتێکیش کە بازاڕەکانی ئەمەریکا بە ئۆتۆمۆبیلی یابانی یان ئەوروپا بە کۆمپیوتەری بەریتانی داکیردەکرێ ئەمە مانای پاشەکشەی دروستکردنی پیشەسازی ئەمەریکی یان بەریتانی ناگەێنێ بەلکو ئاماژەیە لەسەر جۆرە دابەشکردنێ لە جۆری کار و چۆنیەتی بەشداربوون لە پاڕادیگمی زانیاریی.
هەر ئەم لایەنەش داوامان لێدەکا ئاوڕدانەوەمان بۆ باری هێزی کار و ڕەنگدانەوەی ئەم لایەنە بەسەر بازاڕی کار هەبێ. کەوابێ پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا ئەوەی پێیدەلێن هێزی کار گلوبالە؟. لەڕاستیدا بۆ وەلامدانەوەی ئەم

پرسیارە دەشێ ئەوە بکرێ بە وەلام کە گەر ئابووریێ گلوبال هەبێ ئەوا ئەمە بەخۆی جەغت بوونە لە بوونی بازاڕێ کاری گلوبال و هێزێ کاری گلوبالیش. بەلام ئەم لایەنە ڕاستیەکی گومانئامێزە. گەر کاریش بە سەرمایە بەراوردکرێ دەکرێ بووترێ کە سەرمایە ئاسانترە گوازتنەوەی و ئەمەش بەخۆی بەلگەیە لەسەر سنووردرابوونی بزاڤی کار. ئەم سنووردرابوونەش لەژێرزەبری کولتوور، مەرز، پۆلیس، دامەزراوەکان و دوژمنایەتی بێگانە دا هاتۆتەدی. سالی 1993 تەنێ 1، 5٪(نزدیکەی 80 ملیۆن کەس) لەو هێزی کارە گلوبالە کاری لە دەرەوەی ولاتی خۆی کردووە. ئەلبەتە نیوەی ئەم ژمارەیە بیابانی غەربی (ئەفەریقا) و ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەگرێتەوە. لەنێو ولاتانیEU دا کە جوولەی هاولاتیان ئازادە تەنێ 2٪ ی ئەو هێزی کارە لە دەرەوەی ولاتێکی غەیرەEU دا کاریکردووە. بەلام بەهۆی شەپۆلی کۆچەوە لە ولاتانی ئەوروپادا گۆڕان هاتۆتە سەر هێزی کار. بۆ نموونە ڕێژەی هێزی کاری بێگانە لە کۆی هێزی کار لە بەرتانیادا 6، 5٪ بووە لە 1975 دا و 4، 5٪ یش بووە لە 1985-1987دا. لە فەڕەنسا ڕێژەی هێزی کاری بێگانە لە کۆی هێزیکار لە 8، 5٪ بۆ 6، 9٪ هاتۆتە خوارێ. هەروەها لەولاتانی تردا بەمجۆرە بووە:لە ئەلمانیا ئەم ڕێژەیە لە 8٪ بۆ 7، 9٪ و لە سویدلە 6٪ بۆ 4، 9٪ و لە سویسرا لە 22٪ بۆ 18، 2٪.

بەپێی ئەو بارودۆخەی لە ولاتانی ئەوروپای ڕۆژهەلات (بەتایبەت یۆگسلافیا) لە سالانی 1990 کان هاتە پێشەوە کارێ زۆری کردەسەر زیادبوونی ڕێژەی بێگانە و پەناهەندەی سیاسی و بەتایبەت لە ئەلمانیادا. دەکرێ بوترێ کە سەرجەمی ئەو بێگانانەی لە ولاتانی غەیرەEU وە هاتوون و لە ولاتانیEU دا نیشتەجێ بوونە خۆیان لە 13ملیۆن کەس دەدەن، کە چواریەکی ئەم ڕێژەیە نایاساییە. سالی 1990 بێگانە تاڕادەیەك 4، 5٪ی کۆی دانیشتوانی ولاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوای پێکهێناوە. ئەلبەتە لەڕیزی 5 ولاتە گەورەکەیEU دا تەنێ ئەلمانیا تا سالی 1994 ئەم ڕێژەیەی تیا گەیووەتە ئەو دیوو 5٪ (نزدیکەی 7٪). ئەم ڕێژەیەش زۆرتربووە لەو ڕێژەیەی کە فەڕەنسا و بەریتانیا لە سالی 1986 دا هەیانبووە (چونکە ڕێژەی بێگانە لەوماوەیەدا لەو دوو ولاتەدا بەرزبووە). هەرچی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکایە ئەوا دەکرێ بووترێ کە ولاتی کۆچ بووە و لەماوەی سالانی 1990-1980 کانا شەپۆلی کۆچ ڕوەو ئەوێ زیادیکردووە. هەروەها زیادبوونی لەدایکبوانی بێگانە یان دەستی کار و هەروەها ئەوانەی بۆ ماوەیەك لە ولاتێ لە ولاتانی ئەورووپا

دەژین بووە هۆی ئەوەی کە لە سالانی 1990 کانا دیاردەیەکی مولتی-ئیتنی لە ئەوروپا دروستکا. هەروەها ئەم دیاردەیە، ئیتنیسیتێ و مولتی کولتوور، لە سالانی 1990 کانا لە ئەوروپا بووە بە پرسیارێ کۆمەلایەتی و وا لەم دوایەش دا لە یابان بووە بە پرسیار و لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش بەکێکە لە پرسیارە سەرەکییەکان. وەلی گرینگە ئەوە بووترێ کە ئەوی لەسەرەوە باسمانکرد ئاماژە بەوەناکەن کە بازاڕی کار گلوبال بووە. چونکە ئەوەیان شتێ ترە و بەگلوبال بوونی بازاڕی کار شتێ ترە. دەشێ بووترێ کە بازارێ گلوبال بۆ هێزێ کاری بچووك هەیە، هەروەها نێتۆرکی گلوبال جۆرە ئینتگرەشونێکی(چوونەنێویەکدی) هاوردۆتەپێشەوە کە ئەوانەی پێیاندەوترێ دۆزەرەوە، تەکنیکەر، و کارمەندی بواری مالی بوونە بە بەشێ لە هێزیکار ج لە ولاتانی پەرەپێدراو و چش لە ولاتانی پەرەپێداندا.
بەخۆی دەشێ لەمیانەی سێ میکانیزمەوە باس لە هێزی کار لە ئاستی جیهان دا بکرێ: کارکردنی گلوبال لە کارگەی ترانس ناسیۆنال (سەرووی نەتەوەی) و بەو نێتۆرکە سەرووی دەولەتییانەی هەیانە، کاریگەریی بازرگانی نێودەولەتی لەسەر کارکردن و مەرجەکانی کار لە باکوور و باشوور هەروەها کاریگەریی پێشبرکێی گلوبال و فۆرمی بردنەرێوەی مەرنی نوێ لەسەر هێزی کاری گشت ولاتێ. لەهەمانکاتیشدا ناشێ ئەوە لەیادکرێ کە تەکنەلۆژیای زانیاری بۆچوونە نێویەکدی و تێپەراندنی سنووری دەولەت ئامرازێ گرینگە. ئاشکرایە کە وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆی دەرەکی بووە بە هێزێ کاریگەری جیهانگیری و خالێ زۆر گرنگر لە بازرگانی. ئەلبەتە بوونی کۆمپانیا ترانس ناسیۆنالییەکان و وابەستەبوونیشیان بە نێتۆرکەوە گرینگی خۆی بۆ گەشەدان بەم جۆرە وەبەرهێنانە هەبووە و کە پێکەوە ناوکی هێزیکاری ئابووری گلوبال ڕێکدەخەن (ئۆرگەنیزەدەکەن). بۆ نموونە ژمارەی کۆمپانیا ترانسناسیۆنالییەکان لە 7000 وە لە سالی 1970 بۆ 37000 لە سالی1993 بەرزبۆتەوە. گەر ئەم کۆمپانیایانە 70 ملیۆن نخەنە کارەوە ئەوا یەك لەسەر سێی بەرهەمهێنانی پریڤاتی جیهان لەخۆدەگرن و، توانیوویشیانە 5، 5 بلیۆن دۆلار لە سالی 1992 بفرۆشن کە 25٪ لەگشت بازرگانی جیهان بەرزترە. هەر سەبارەت بەم لایەنە گەر تەماشای ولاتێ وەك ئەمەریکا بکەین بۆنموونە لە سالی 1989دەبینین خاوەنی زۆرترین کۆمپانیای ترانسناسیۆنال بووە لە دەرەوەی ولاتی خۆی و کە ئەمەش گرینگی هەبووە بۆ خستنەکاری دەستی کار لەو ولاتانەی کاری تیاکردووە. لەدوای ئەمەریکاشەوە دەکرێ باس لە ولاتهایەکی

وەك ئەلمانیا، بەریتانیا و یابان کرێ. هەرچی پەیوەندی بە میکانیزمی دووەمەوە هەیە، واتە کاریگەریی بازرگانی بەسەر کارکردن لە باکوور و باشوور، ئەوا برتییە لە ناردنە دەرەوەکانی باکوور، وەبەرهێنانی دەرەکی و گەشەی بازاڕی خۆمالی لە باشوور. بەپێی دیراسەیەکی ئیمپریش بێ کە Adrian Wood ئەنجامیداوە بازرگانی ڕاستەوخۆ لەماوەی سالانی 1990- 1960 کان توانیوویەتی 20 ملیۆنێك کاری پیشەسازی لە ولاتانی باشووردا مسۆگەر بکا. ئەمەو شیاوە باس لە گرینگی کاریگەریی بازرگانی ڕاستەوخۆ لە ولاتانیOECD دا بەسەر کارکردن و مەرجەکانی کار بکرێ. هەر بەپێی ئەم دیراسەیە کرێکاری جۆری( نەوعی) لە باکوور کەلکێ زۆری لە بازرگانی گلوبال وەرگرتووە و ئەمەش لەبەر دوو هۆ: یەکەم لەبەرئەوەی بەرزبوونەوەی گەشەی ئابووری بەکاردەبا کە بەهۆی زیادبوونی بازرگانییەوە خولقاوە. دووەمیش لەبەرئەوەی دابەشکردنی کاری نێودەولەتی نوێ ئیمتیازاتێ زۆری بەو کرێکارانە و بە کارگەکانیشیان داوە. بۆیە کرێکاری غەیرە نەوعی لە باکوور بەهۆی ئەو پێشبڕکێی ئابووریەی لە ئارادایە زەرەرێ گەورەی لێکەتووە. واتە بێکاری لە ولاتانی OECD لەڕیزی کرێکارانی غەیرە نەوعی لەزیادبووندایە. هەروەها داوا لەسەر دەستی کاری نەوعی لەزیادبووندایە و لەهەمانکاتدا مەسەلەی جیاوازی لە مووچەشدا لە گەورەبووندایە.

هەرچیش پێوەندی بەو باسەوەیە کە لەبارەی دابەشکردنی کاری نێودەولەتی نوێ و پێوەندی ئەمەش بە کاریگەریی جۆراوجۆری بازرگانی و جیهانگیری و ڕەنگدانەوەی ئەم لایەنەش بەسەر هێزی کارەوەیە (ئەمەش بۆ خستنەژێرپرسیاری پرۆسێسی بەرهەمهێنان لە ولاتانی تازە گەشەکردوود) دەچینە سەر لێکدانەوەیەکی هارلی شایکن Harley Shaiken کە تیایدا ئەوە نیشان دەدا کە ئەم لایەنە گرینگی خۆی هەیە و ئەوەش بەنموونە هێنانەوە لەسەر کارگەکانی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبیل و کۆمپیوتەری ئەمەریکی و کارگەکانی بەرهەمی ئەلەکترۆنی ناومالی یابانی لە باکووری مەکسیك کە لە بەراوردکاریەکدا ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەم دوو شوێنە لەڕووی بەرهەمهێنان و ئاستی تەکنیکەوە لەیەکتر کەمتر نین. بەلام دەستی کاری مەکسیکی لەچاو ئەمەرکیەکەدا هەرزانترە. دەکرێ باس لە نموونەی تریشکرێ وەك بۆمبای کەبەهۆی ئەندازیاری تەکنیکی باشەوە سالانە زۆرترین بەرهەمی نەوعی بەرهەمدێ و بۆ زۆربەی بەشەکانی جیهان ڕەوانەدەکرێ کە ئەم دەستی کارانە ٪20 ی ئەو مووچەیە وەردەگرن کە هەمان دەستی کار لە ولاتە

یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا وەریدەگرن. ئەم جیوازیانەش لە مووچە لەگەڵ قوولبونەوەی پێشبڕکێی ئابووری و گەشەی پرۆسێسی جیهانگیری زیاتردەکا.
هەروەك ووترا گەر بازاڕێکی کاری گلوبال بوونی نەبێ ئەوا دەستێ کاری گلوبالیش بوونی نییە بەلام لەواقیعدا وابەسنەیێ دوولا بوونی هەیە لەناو دەستێ کار لە ئابووری زانیاریدا. ئەمەش بەو دابەشکردنە سێستەمییە دەناسرێتەوە کە دەستێ کار دابەشدەکا بەلام نەك لەنێوان ولاتان بەلکو لەدەرەوەی سنوورەکان. بۆیە دەکرێ بووترێ کە مۆدێلی تازەی بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەی گلوبال پێکدێ لە چوونەنێویەکدی پرۆسێسی کار و هەلوەشانەوەی هێزی کار. ئەم مۆدێلە ئاکامی پاڕادیگمی زانیاری نییە بەلکو ئەنجامی ئیختیاری سیاسی و ئابووری ڕژێم و کارگەکانە کە بکرێ لەتەك پرۆسێسی بەرهەمهێنانی ئابووری زانیاریدا بگونجێ.
ئەوەی بە پرۆسێسی کارەوە تایبەتە ئەوەیە کە لەژێرسایەی پاڕادیگمی زانیاریدا گۆڕانی بەسەرداهاتووە. هەروەها نەشونمای تەکنەلۆژیای زانیاری لە سالانی 1990 کان بەهۆی پیادەکردنی فۆڕمی نوێ لە دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی و تەکنیکی پرۆسەی کاری گۆڕیووە. بەدلنایشەوە پرۆسێسی سەرلەنوێ خۆ بوونیادنانەوەی سەرمایەداری گرنگیێ زۆری لە گۆڕانی ترادبسیۆنی هێزی کار و کولتووری سیاسی و توانای تەکنیکی ولاتەکان هەبووە. نەك هەرئەوە بەلکو بلاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای زانیاری بەڕادەیەکی زۆر کاریگەریێ جیاوازی خۆی بەسەر دۆزی کارگە و کۆنتوورو لایەنی ڕێکخستنی خەدەماتیشەوە بەجێهێشتووە. ئەوەش کە پرۆسێسی کاری زانیاری دیاریدەکا پرۆسێسی بەرهەمهێنانی زانیارییە نەك شتێ تر. هەروەها چارەنووسی پیشەسازی ئەلەکترۆنی بەزۆری بەهۆی دیزاینی چیپ Chip ی نوێ و پرۆگرامە نوێکانەوە دیاریدەکرێ. بەلام مەرجە ئاماژە بەوەبکرێ کە تەکنەلۆژیای زانیاری ڕۆلێ گەورەی بۆ پرۆسێسی کار هەیە و ئەمەش لەبەرئەوەی لەلایەك تەکنەلۆژیای زانیاری خولقان زیاددەکا و، لەلایەکی تر مڕونەت و توانای فریاکەوتن بە ژێرخان Infrastructure دەدا. واتە کاریگەری بەسەر گەیاندن، ژیانی ئابوورییەوە بەجێدێلێ. ئەو پرۆسێسی بەرهەمهێنانەش کە لەژێرسایەی تەکنەلۆژیای زانیاری دێتەدونیا جۆرە دابەشکردنێ کاری نوێ لەگەل خۆی بەرهەمدێنێ کە لەگەل گەشەی پاڕادیگمی زانیاریدا هاوکۆکە. ئەم دابەشکردنی کارەش دەکرێ تێگەیشتنی لەبارەوە

پەیداکرێ بەهۆی جۆرکارییێکەوە Typology کە لەدەوری سێ ڕەهەنددا کۆدەبێتەوە:
- ڕەهەندی یەکەم لەبارەی ئەو ئەرکە فیعلییانەوەیە کە لە پرۆسێسی کارێکدا بەڕێوە دەچن.
- ڕەهەندی دووەم پێوەندی بە پەیوەندی نێوان ڕێکخراوەکانەوە هەیە.
- ڕەهەندی سێهەم بریتییە لە پەیوەندی نێوان ئیدارەی کارگەێك و کارمەندەکان لە ڕێکخراوێ یان نێتۆرکێکدا. ئەلبەتە هەریەك لەم ڕەهەندانە بۆ مەبەستێکە و ئەو مەبەستەش ناوێکی هەیە. ئەوی یەکەم دەکرێ ناوی خولقانی بەهای لێبنرێ و ئەوی دووەم خولقانی پەیوەندی و هەروەها ئەوی سێهەم بەڕێوەبردن. بەمجۆرە وا دەردەکەوێ کە پاڕادیگمی زانیاری نوێ کاریگەریی بەسەر پرۆسێسی کار و ڕێکخستنی کارگە و کرێکاریش بەجێهێشتووە. چونکە فۆرمی ڕێکخستنی کار لە کارگە گەورەکانا لەژێرکاریگەریی پاڕادیگمی زانیاریی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. بۆ نموونە گەر تەماشای کارگەکانی بەرهەمهێنانی ئۆتۆمۆبیل بکەین دەبین کە بەشەکانی بەرهەمهێنان لەو جۆرە کارگانەدا زۆر بەکۆمپیوتەرکراوە. هەروەها ئەوەی شوێنی سەرنجە ئەوەیە کە پرۆسێسی کاری زانیاری لە کارگەکانا جۆرە چوونە نێویەکدیەکی دروستکردووە. هەندێ لایەنی ئەم چوونە نێویەکدییە لە درێژەی باسەکە دێینەوەسەری وەلی لێرەدا مەرجە بچینە سەر لایەنێتر کە ئەوەش مەسەلەی ئۆتۆماتیزەکردنی کاری ئۆفیسە (کۆنتوورە). بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم دیاردەیەش باس لە سێ قۆناغ دەکەین:
*قۆناغی یەکەم بریتییە لە ماوەی 1970-1960. لەم قۆناغەدا کۆمپیوتەر لەسنوورێ دیاریکراو بەکاربراوە، هەروەها کاری بەکاربردنی کۆمپیوتەر بەجۆرێ مەرکەزی بووە. واتە کارەکە لەلایەن کەسانێ پسپۆڕەوە سەرپەرشتیکراوە و براوەتەڕێوە. بەمجۆرە ئەرك یان کاری کۆمپیوتەر زۆر نێوەندی بووە و دەستبەسەریش بووە و بەجۆرێ ئەوتۆش پیادەکراوە کە ئامانجی لەلایەن شوێن و کەسانێکەوە دیاریکراوە و ئاڕاستەشی دەستنیشانکراوە. هەروەها کاریش لەم قۆناغەدا زۆر جێگیر و ستاندارت بووە و جگەلەوەش ڕۆتینی بووە. لەم کاتەدا کۆمپیوتەر ناتوانرێ بووترێ کە بەشێ سەرەکی بووە لە ژیانی کاری ئۆفیس دا. کەوابێ کارمەندی ئۆفیس ئەوەندە بە کۆمپیوتەرەوە نەبەستراوەتەوە.

*قۆناغی دووەم برتییە لە سەرەتای سالانی 1980 کان. لەگەل ئەم قۆناغەدا گرینگیێ زۆر بە بەکاربردنی کۆمپیوتەری شەخسی PC لەبواری کار درا و ئەم ئامێرەش بوو بە بەشێ لە پرۆسێسی کار. ئەمەو ئەم کۆمپیوتەرانە هەمیشە یارمەتیشیان لە شوێنە مەرکەزیی و پسپۆڕەکانی بواری کۆمپیوتەر وەرگرتووە. هەر لەم دەموو وەختەدا و بەتایبەت لە ناوەندی هەشتاکانا ئەو گەشەیەی لەبواری گەیاندن و گەیاندنی تەلەفۆنی دا ڕوویداوە بووەتەهۆی دروستبوونی فۆڕمێکی تر لە کاری نێتۆرکدار و سازدانی شۆڕشێ لەبواری کاری ئۆفیسدا. ئەمەش بەدلنیایەوە گۆڕانێ ڕێکخراوەیی زۆری لەبواری کار و بەرهەمهێنان شیاوکردووە. ئەم لایەنەش گەشەی خۆی بەردەوامی پێداوە تا سالانی 1990 کان و ڕۆلیشی لە دروستبوونی مۆدێلێکی ئۆتۆماتیزەکردنێ نوێ دادیووە.

*قۆناغی سێهەم بەوەدەناسرێتەوە کە مۆدێلی ئۆتۆماتیوەکردنێ نوێ دێتەکایەوە و سالانی نەوەتەکان داگیردەکا و سێستەمی ئۆفیس یەکدەخا و نێتۆرکێ دروستدەکا. لەگەل هاتنەکایەوەی ئەم قۆناغە کۆمپیوتەری شەخسی PC زۆر دێتەبەکاربردن و هەموو ئەمانەش بەپەیوەندی بە نێتێ کاریگەرەوە دەبەسترێتەوە و پێکەوەش کاردەکەن. بەهۆی ئەمەشەوە دەکرێ زانیاری فۆڕمولێرەکرێ، کردەی گەیاندن بەئەنجامبگەێنرێ و بڕیارەکانیش لە کاتێ فیعلی (ڕیال) دا بەجێبگەێنرێ. بەمە سیستەمی زانیاری لە بواری کاری ئۆفیسدا وابەستەی نێت دەبێ کە ئەم گۆڕانە لەم سالانەی دوایدا بووەتە هۆی گەشەی تر لە بواری کاری ئۆفیس دا ئەوەش بە بەکاربردنی تەلەفۆنی مۆبایل و هەروەها بەکاربردنی کۆمپیوتەری جانتا Portable. ئەمەش بەدلنیاییەوە وایکرد کە کارکردن لە ئۆفیس دا بکەوێتەژێر کاریگەریی ئەم گۆڕانە تەکنیکیە نوێیانە و هەروەها فۆڕمەکانی ڕێکخستن لەبوارە ئیداریەکان وەك خۆی نەمێنێتەوە. بەمشێوەیە شیاوە بووترێ کە لەگەل قۆناغی سێهەمدا شێوەی ئیشکردن لە ئۆفیس بەپێی ئەو هەلاوگۆڕانە زانیارییەی لە سالانی 1990 کان دێتەکایەوە گۆڕانێ زۆری دێتەسەر و دابەشکردنی کاری ئیداری و فۆڕمی ڕێکخستن لەتەك گەشەی تەکنیکی نوێ دا خۆ هاوکۆك دەکا و نێتیش دەبێ بە بەشێ سەرەکی لە ژیانی کاری ئیداری دا و ڕۆلێ زۆر لە بردنەڕێوەوە و دابەشکردنی زانیاریی و کارەکاندا دەبینێ. ئەم گۆڕانەش هەر لە کاری ئیداری ئۆفیسەکانەوە دەگرێتەوە تادەگاتە کارکردن لە بانق و دائیرەکانی بیمە و کۆگاکانی فرۆشتن. ئەمە لەلایەك وەلی لەلایەکیتر دەکرێ باس لەوەشکرێ کە

کارکردنی پاڕادیگمی زانیاری لەناو کارگە و هەروەها لەبوارە ئیدارییەکان ڕەنگدانەوەی خۆی بەسەر دۆزی کار و کرێکاران بە قوولی بەجێهێشتووە. بۆنموونە بەڕۆبۆتکردنی پرۆسێسی کارکردن لە کارگەکانی دروستکردنی ئۆتۆمۆبیل لە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریدا بووە هۆی ئەوەی کە بەشێ زۆر لە دەستی ئەو کارگانە بێکاربن. بەپێی دیراسەیەکی کلاسیکیش کەWatanabe. S ئەنجامی داوە دیاردەی ئەم بێکاریەش دەچێتە خانەی ئەو گۆڕانکاریە تەکنیکیانەی کە بەهۆی پرۆسێسی سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوەی سەرمایەداری لە سالانی 1980کان هاتەکایەوە. سەرباری ئەوی لەسەرەوە وترا، بەخۆی تەکنەلۆژیای زانیاری هەولێ ترە بۆ سەرلەنوێ پێناسەکردنی پرۆسێسی کار و کرێکار و هەروەها کارکردن و بوونیادی پیشەش. هەر ئەم تەکنەلۆژیا نوێیە ڕۆلیشی دەبێ لە گۆڕانهایەکی ئەوتۆ کە دواتر گرینگی لە پۆلکردنی دەستی کار(دەستی کاری کارەما یان شارەزا و دەستی کاری ناکارەما یان ناشارەزا) دەبینن و هەروەها یاخود لە پۆلکردنی بەشێ لە کەرتە ئابوورییەکان و یان پرسیارهێنانەکایەوە لەسەر مەسەلەی مووچە و مەرجی کار و کاتی کار. بەدلنیایشەوە ئەم گۆڕانکاریانە کارێ وادەکەن کە لە کۆمەلگەکانی زانیاریدا داوا لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندن بەتایبەت ئاستی خوێندنی ئافرەتان، بێگانەکان و کەمایەتییە ئێتنییەکان زۆربێ. چونکە ئەمانە لەژێرسایەی جەمسەرگەریی هێزی کاردا دووچاری بێکاریدەبن. بەمجۆرە بلاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای زانیاری گشت بوارەکان دەگرێتەوە هەر لە بواری کارکردن لە کارگەکان و ئۆفیس و بوارە خزمەتگوزاریی و گەیاندن و پەخشکردنەوە تادەگاتە واتای وەك خودی کارکردن و کاتی ئازادی کرێکاران و شێوەی بەرهەم و فۆڕمی ڕێکخستن لە بوارە بەرهەمهێنانیەکانا. مەرجیشە لەم حالەتەدا ئەوە دەستنیشانکرێ کە ئاکامی بەرچاوی پێوەندی نێوان تەکنەلۆژیای زانیاری و کارکردن لە ئاستێ بالادا بە فاکتەی ماکرۆ ئابووری، ستراتیژی ئابووری و یەکانگیری سۆسیۆ-سیاسیەوە وابەستەیە. چونکە هاتنی ئەم پاڕادیگمە نوێیە کاتێ کە سیستەمی بەرهەمهێنان دەگۆڕێ لەگەل ئەمەدا هێزی کاریش دەبێ لە ئاستی ئەو گۆڕانە بێ. بەمجۆرە چ سیستەمی بەرهەمهێنان و چش هێزی کار بەجۆری گۆڕانیان دێتەسەر کە لەتەك داواکانی ئەم پاڕادیگمە نوێیەدا دەبێ بگونجێن. هەروەها ئابووری زانیاریش کە لەگەل ئەم پاڕادیگمە دێتەکایەوە ئابووریێ گلوبالە و ناوەڕۆکێ پێشبڕکێیاویشی هەیە. بۆئەوەی ئەم ئابووریەش بکارێ گلوبال بێ دەبێ گۆڕان بهێنێتە سەر سیستەمی کار و

بەرهەمهێنان. ئەمەو پاڕادیگمی زانیاری لە دروستکردنی مۆدێلی مەرن لە بواری کارکردن و کاردا بەرپرسیاریشە و، یان توانیوویەتی کاری مەرن (فلێکسیبل) و جۆرە کرێکارێ نوێش یاخود ئەوەی پێیدەلێن کرێکاری مەرن بخولقێنێ. ئەم لایەنە لەلایەن تەکنەلۆژیای زانیارییەوە شیاودەکرێ و هەر ئەم تەکنەلۆژیا یەشە ڕۆلی لە ئیندڤیدوالیزەکردنی (لە ئیندڤیدوالیزمەوە) کار لەبواری کاردا هەیە. ئەمەش بەپێی ئەوەی ڕێکخراوە ئابووری و کۆمەلایەتییە نوێکان لەژێر کاریگەری ئەو پاڕادیگمە نوێیە دێتە دونیا و ئامانجیشی ئەوەیە کە ئیدارەی کارگەکان نامەرکەزیکاو تاپێشی دەکرێ خودی کار ئیندڤیدوالیزە بکا. هەر لەم بوارەشدا دەکرێ باس لەوەشکرێ کە تەکنەلۆژیای زانیاری بەهێنانەکایەوەی نێت ۆرك مەرجی کاری نامەرکەزی خولقاندووە و گەیاندنیشی لەئاستێ بالادا ئەلەکترۆنی کردووە. ئەم گەیاندنەش هەمیشە بەکاتێ فیعلییەوە وابەستەیە. بۆ زێتر ڕوونکردنەوە کاریگەری تەکنەلۆژیانی زانیاری دەکرێ بلێین کە بلاوبوونەوەی ئەم جۆرە تەکنەلۆژیایە لە ئابووریدا ڕاستەوخۆ نابێتە هۆی بێکاری و بگرە لەتواناشیدایە کارێ زۆر پەیدابکا. پاشان هێزی کار زۆرجار ناتوانێ ئەو مەرج وداوایانە پڕکاتەوە کە کاری زانیاری دروستیکردووە.

بەشی پێنجەم:

# کولتووری ڤێژوالیتێی ڕاستی

## یەکخستنی گەیاندنی ئەلەکترۆنی، کۆتای ماس گوویلیك، هاتنی نێتۆرکە کاریگەرەکان

بەدڵنیاییەوە دەتوانین جەغت لەوەبکەین کە ئەمڕۆ لەسەردەمێکدا دەژین کە فۆرمەکانی گەیاندن خۆ لەتەك نێتۆرکێ کاریگەردا یەکدەخەن. ئەمەش بەزۆری بۆ ئەو گۆڕانە دەگەڕێتەوە کە هاتۆتەسەر خودی گەیاندن. واتە مەسەلەی بەئەلەکترۆنی بوونی گەیاندن و کەوتنەژێر کاریگەری پاڕادیگمی زانیاری نوێوە. هەروەها ئەو سێستەمە ئەلەکترۆنییە تازەیەی کە بەرهەمی ڕاستەخۆی تەکنەلۆژیای زانیارییە توانیوویەتی نێتۆرکێ بتەو و لێهاتوو دروستکا کە کاری گەیاندن ئاسان و مسۆگەر بکا. کاریگەری ئەم لایەنەش بەسەر کولتووری کۆمەلایەتیەوە زۆر بەهێزە و گۆڕانێ زۆریشی هێناوەتە کایەوە. هەروەها گەشەی تەکنیکی نوێ لە سالانی 1990 کان توانی زەوی بۆ سیستەمێ ماس مێدیای تازە خۆشبکا.
لەڕاستیدا بلاوبوونەوەی TV لەماوەی ئەو سێ دەیەی دوای جەنگی جیهانی دووەم توانی مەجەڕەێ Galaxy گەیاندنی نوێ مخولقێنێ. دواتر TV بەجۆرێ گەشەی کردوو و باوبوو کە توانی فۆرمێ گەیاندنی زال دروستکا. ئەلبەتە ئەمTV یە لەسەرەتادا تەنێ دەولەتی بووە و دەسەلاتی دەولەت بەسەر گەیاندنەکانی ئەم ئامرازەوە سەرووی گشت دەسەلاتێ تر بوو و بەلام لەگەل گەشەی گەیاندن و کاریگەری ئەمەش بەسەر ماسمێدیاوە کارێ وایکرد کەTV بکەوێتە ژێرکاریگەری ئەم تەکنیکە نوێیە. کەوابێ دەکرێ بووترێ لە سالانی 1990 کان بەلاوە ئەم ئامرازە نەك هەر گەشەی کرد بەلکو مانایێ کۆمەلایەتی زۆریشی بۆخۆی دۆزییەوە. ئەوی مەبەستە لێرەدا ئاماژەی پێکرێ ئەوەیە کە ماسمێدیا سیستەمێکی گەیاندنی تاك جەمسەرە کەچی پرۆسێسی فیعلی گەیاندن ئەوە نییە بەلکو لەسەر بناغەی گەمەی نێوان نێرەر و وەرگری ئەو پەیامە دروستدەبێ کە بەهۆی ماسمێدیاوە بەرهەمدێ. لەو توێژینەوەیەش کە ئامبێرتۆ ئێکۆ Umberto Eco لە 1977 ئەنجامیداوە بەباشی کاریگەری مێدیای ڕوونکردۆتەوە.
ئاساییە گەر باس لەوەکرێ کە کاریگەری کۆمەلایەتی TV دوولایەنە و پەیامێکە کە ناوەڕۆکەکەی دەکرێ بەوە کوورتکرێتەوە کە هەبی یان نەبی.

ئەمەش کاریگەری خۆی بەسەر کولتووری کۆمەلایەتیمانەوە هەیە. بەتایبەت کاتێ کە کولتوورمان بەپلەی یەك لەتەك ماتریال دا کاردەکا و دواتر ئەوەش لەلایەن مێدیاکانەوە دەفرۆشرێ. وەلێ دەبێ لەوە بەئاگابین ئەم گۆڕانکاریانە هەموو بەگشتی دەچنە خانەی هاتنەکایەوەی تەکنیکی نوێوە. لەبەرئەوەی لەگەل هاتنی ئەم تەکنیکە لە ماوەی سالانی 1980 کان جۆرە سیستەمێکی گەیاندن هاتەدونیا کە بووە هۆی گۆڕینی تەواوەتی مێدیا. بەمجۆرە گەیاندن گەشەی کرد و مێدیایەکی نوێ هاتەکایەوە و ئەمەش وایکرد ماس پۆبلیك بلاوبێتەوە. لەژێرکاریگەریی ئەمە کارێ واکرا کە ڕۆژنامەکان لەیەك کاتدا لەچەند شوێنێ و لەهەمان کاتدا بلاوببنەوە، رادیۆ کەوتە ئەوەی کە زیاتر لەجاران خۆی بە جۆرێ لە مۆسیقا و گۆرانیبێژ و یان جۆرە تێمایەك تایبەتکا. هەرچی ڤیدیۆیە لەگەلێ لە ولاتانی گەشەکردوودا بووە جێگیری ئەو کەنالە تەلەفزیۆنیە دەولەتیانەی کە شتێ ئەوتۆ بە بینەران نابەخشن. ئەمەو جگەلەوەی بەشێ زۆر لە فۆرمەکانی بەکاربردنی ڤیدیۆ لەلایەن بەکاربرانەوە بەتەواوەتی بەکارنەهێنراوە. فلیمیش دوای ئەوەی لە فۆرمی کاسێتی ڤیدیۆ هاتەدەرێ خودی کاسێتی ڤیدیۆش گۆرانێ زۆری هاتەسەر. هەروەها مۆسیقا لە ژیانی ڤیدیۆ دا شوێنێ گەورەی داگیرکرد. لەهەمانکاتدا فرە ڕەهەندبوونی کەنالە تەلەفزیۆنیەکان بووە هۆی بەرینبوونی بلاوبوونەوە. ئەمانە هەموو بەسەریەکەوە ئێمەیان بەرەو گەشەیێ لە مێدیای گوێگرتن و بینین( ئاودیۆڤیژوال Audiovisual ) برد.

ئەلبەتە گەشەی تەکنیکی کابلیش کە لەماوەی سالانی 1990 کان بەرەوپێشەوەچوو بەهۆی دیگیتالیزەکردنەوە هاتەکایەوە. ئەمە و لەگەل ئەوەی پێیدەلێن گەشەی پەخشی سەتەلایت(پەرەبۆل) ە ڕاستە، خۆکان توانی کارێ واکرێ شیاوی لەبەردەم گەیاندن دا بکرێتەوە. ئەمەش وای لە حکومەتەکان کرد کە گەیاندنەکان بەگشتی وTV بەتایبەتی لە ڕێساکان ئازادکرێن. ئەمەش ڕۆلی لە گەشەدان بە پەخشی کابلدار هەبووە. جا ئەمەش لەلایەك لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا هاتۆتەدی و دواتر پەرەسەندنی سیستەمی سەتەلایت لە ولاتانی ئەوروپا، ئاسیا و ئەمەریکای لاتینی بەدواهاتووە. بەشێ زۆر لە حکومەتەکانی ولاتانی ئەوروپا ئەمڕۆ دەسەلاتیان بەسەر کۆنترۆلکردنی تەلەفریۆنەوە نەماوە. لەشوێنێ وەك ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکادا لەماوەی سالانی 1980 کان ژمارەی کەنالە تەلەفزیۆنیە گرێنەدراوەکان بە حکومەتەوە لە 60 وە بۆ 330 زیادیکردووە. سیستەمی کابل لەناوچەی شارە گەورەکانا

ئێستا لە توانایدایە تا 60 کەنال بەردەست خەڵك بخەن. ئەلبەتە بە تێکەڵاو لە کەناڵە گەورەکان و کەناڵە ناوابەستەکان ئادەگاتە کابل نێت و ئەو کەناڵە تەلەفزیۆنییانەی بە پارە دەستدەکەون. کەچی لە ولاتانیEU دا ژمارەی نێتی تەلەفزیۆن لە 40 وە سالی 1980 بۆ 150 لەناوەندی 1990 کان بەرزبۆتەوە. هەروەها لەسالی 1980 بۆ ناوەڕاستی 1990 کان ژمارەی ناردنی سەتەلایت لە سفرەوە بۆ 300 زیادیکردووە. بەپێی ڕاپۆرتێکی یۆنسکۆ نزدیکەی پتر لە یەك ملیارد ئامێری تەلەفزیۆن تا سالی 1992 لە جیهانا هەبووە کە لە 35٪ ی لە ئەوروپا دا بووە. بەلام لە شوێنەکانی تری جیهان بەمجۆرە بووە:32٪ ی لە ئاسیا، 20٪ ی لە ئەمەریکای باکوور، 8٪ ی لە لاتین ئەمەریکا هەروەها 4٪ ی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و 1٪ یشی لە ئەفەریقا. ئێستاش ژمارەی دروستکردن و کڕینیTV لە جیهانا هەر لەزیادبووندایە. هەرچی نێتەکانیشە بەزۆری لە ئەمەریکا دایە و ژمارەی لە سێ دانە تێناپەڕێ. ئەم نێتانە گرنگیێ زۆر لە کۆنترۆلکردنی پۆبلیك دا دەبینن. بۆنموونە CNN دەکرێ وەك ناودارترین کەنالی جیهانی تەماشاکرێ کە دەتوانێ هەوالەکان بەجۆرێ گلوبال پەخشکا و لە هەموو جیهانیشدا خەلك لەدەوری خۆی کۆکاتەوە. ئەمەو ئادەگاتە ئەو کەنالە ئیسپانییە-ئەمەریکییە گلوبالەی کە بە ئیسپانی پەخشدەکرێ دواتر ئەو کەنالانەی لە هۆنکۆنگەوە بۆ ناوچەی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای پەخشدەکرێن.

لە ڕوونکردنەوەیەکیش کە فرانسوا سابا Francoise Sabbah لە سالی 1984 ئەنجامیداوە بەچاکی مەسەلەی ئاڕاستەی مێدیای نوێی بەرباسخستووە. بەپێی ئەو ڕوونکردنەوەیە بێ مێدیای نوێ پۆبلیکێ بلاو و پەرتی دروستکرد کە فرە جەمسەرە. بەلام ئەمە ماس پۆبلیك نییە. مێدیای نوێ بەمانا تەقلیدیەکەی ماسمێدیا نییە کە ژمارەێ پەیامی دیاریکراو بۆ ماس پۆبلیکێ هۆمۆجین ڕەوانە بکا. بەلکو خودی پەیام و سەرچاوەکان وا لە وەرگر(پۆبلیك) دەکەن کە زۆرتر وەرگرێ هەلبژێرەی بێ وەك لەجۆرە وەرگرێ تر. لە توێژینەوەیەکیش کە یوشی ئیتۆYouichi Ito، لەسەر بەکاربردنی مێدیا لە یابان، کاری لەسەرکردووە ئەوە دەستنیشاندەکا کە چۆن یابان بەهۆی تەکنیکی گەیاندنی نوێوە لە کۆمەلگەی ماسMass وە بەرەو کۆمەلگەی بەشبەش ڕۆیووە، کۆمەلگەێ کە خاوەنی زنیاریێ بلاو و پسپۆرە و، پۆبلیکەکەشی بەدووی ئایدیۆلۆژیا، بەها، چێژ و شێوازی ژیان دا وێلە.

بۆیه دەکرێ باس لەوەکرێ کە لە مێدیای نوێ دا خودی مێدیاکه دەبێ بە پەیامەکە و خاسلەتەکانی پەیامەکەش خاسلەتەکانی مێدیاکە دیاریدەکا. گەر بخوازرێ هەوالێ گلوبال شەو و ڕۆژ بلاوکرێتەوە (بۆ نموونە مەسەلەی پێشبینیکردنی ئاو و هەوا بۆ گشت جیهان) ئەم کارە پێویستی بە ژینگەێ جیا، دانانی پرۆگرام و پەخشکردن دەبێ. کاتێکیش کە تەماشایTV ی ئەمڕۆ دەکەین لەوەدەگەین کە ئەمTV یە زۆر بلاو و نامەرکەزییە. بەلام دەبێ لەم بلاوی و نامەرکەزییەیTV بەهەلە نەگەین. واتە بلاوی و نامەرکەزیی پەیام و وێنەکانیTV مانای ئەوە نییە کە کارگە گەورەکان و حکومەتەکان دەسەلاتیان بەسەرTV وە نەماوە. بەپێچەوانەوە دەسەلاتەکە بەئاسانی هەست بەبوونی دەکرێ. لەم بارەیەشەوە گەر تەماشای ئەو سێTV نێتە ناودارەکرێ کە لە باکووری ئەمەریکادا هەیە دەبینین دوانیان دووجاران خاوەنەکەی گۆڕاوە. یانTV1 ی فەرەنسی هەر زوو هەنگاوی خۆینا بۆ خۆ پریڤات (تایبەت) کردن. یان هەولەکانیBerlusoni لە ئیتالیادا بۆ دەستگرتن بەسەر کەناله پریڤاتەکان و ئۆرگەنیزەکردنیان لە سێ نێتیTV دا. ئەمەو تادەگاتە هەولەکانی پریڤاتکردنی کەنالەکان لە ئیسپانیا دا یان هەولی تەلەفزیۆنی ڕووسی بۆ دەستگرتن بەسەر کەنالە سەربەخۆکان و یان پریڤاتکردنی کەنالەکان لە ئیتالیا یان لە ئەمەریکای لاتین. ئەمە لەلایەك لەلایەکی تر دەکرێ بووترێ کەTV لە جیهانا ڕۆژانە لە بەکاربردندایە و ئەم بەکاربردنەش هەر لەزیادبووندایە و لەماوەی سالانی 1995-1993 دا ولاتانی جیهان پتر لە 80 ملیارد دۆلاری لە سازکردنی پرۆگرام دا بەکاربردووە. هەرچەندە پۆبلیك دابەش و بلاوکراوە بەلامTV لەگشت شتێ زیاتر بەبازرگانیکراوە. هەر تایبەت بەمTV یەش دەکرێ باس ئەوەشکرێ کە هەموو بینەران هەموو شت لەیەك کات و وەك یەك نابینن و هەموو کولتوور و گرووپێ کۆمەلایەتی پەیوەندیان بە مێدیاوە وەك یەك نییە. ئەو سێستەمەی ئەمڕۆش پیادەکرێ هەمان ئەو سێستەمەی جاران نییە یان زۆر جودایە لەو سێستەمە ستاندرتەی مێدیاکان لەمەوبەر هەیان بووە. ئێمە ئەمڕۆ لەژێر ئەو سیستەمە تازەیەی مێدیادا دەتوانین لەیەك کاتدا چەندین پرۆگرام ببینین و بەشداریش لە پرۆگرامەکان ڕاستەخۆ بکەین.

دەکرێ باس لەوەبکەین کە ئەگەرەکو بە فیعلی مێدیاکان گلوبال بوونە و پرۆگرام و پەیامەکان لە نێتۆرکێ گلوبال دا دەخولێنەوە بەلام دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەم لایەنە ئەوەناگەێنێ کە ئێمە لە گوندێ گلوبال دا دەژین بەلکو لەCottage(خانووی ماوەی پشوو کە برتییە لەو خانوەی لەماوەی پشوودا بۆ

حەوانەوەبەکاردەبرێ و دەکەوێتە گوندەوە) ی بەرهەمهێنەری گلوبال دا دەژین.
هەموو ئەوەش باس لەوەناکا کە مێدیاکان هەرچەند بلاو و تەشەنەکراوبن بەلام ئەمە وادەکا کە لۆژیکی تاك ڕەهەندی مێدیاکان گۆڕانی هاتۆتەسەر.
بەپێی ئەو گۆڕانەیێ کە هاتۆتەسەر سیستەمی گەیاندن، واتە لەگەل بەکۆمپیوتەربوونی گەیاندن، و هاتنەکایەوەی بردنەڕێوەی دامەزراوەیی، نێتی کۆمەلایەتیش گۆڕاوە. بۆنموونەشMinitel لە ولاتی فەڕەنسادا ئامرازێ بووە بۆئەوەی ئەم ولاتە دخاتەناو کۆمەلگەی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە. بەلام لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا Arpanet دەروازەیەك بووە بۆ بە ئینتەرنێتکردنی ستراتیژی سەربازی. واتە کارێ واکرا کە نێتی گەیاندن بکارێ هێرشێکی چەکی کیمیاوی ئەنجامبدا. بەدلنیاییەوە دەشێ باس لەوەبکەین کە ئەم دوو ئەزموونە لەیەکتر جودان. ئەمەش بەزۆری بۆ جوداوازی ڕیشەی کولتووری و دامەزراوەی هەریەك لەو دوو ئەزموونە دەگەڕێتەوە. هەروەها جوداوازی سێستەمی لۆژیکی هەریەك لەو دوو کولتوورە کۆمەلایەتییەش مانای خۆی بۆ هەریەك لەو کولتوورە هەبووە. لەهەمووی گرنگتر دیاریکردنی خاسلەتەکانی ئەو دوو سیستەمەش کاریگەری خۆی بەسەر گەشەی گەیاندنەوە هەبووە.
بۆزێتر ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنەش ئەوە دەلێین کە هەرچیMinitel ێی فەڕەنسیە ئەوەیە کە ئەمە نێتێکە لە سالی 1978 وە وەك سیستەمێکی ڤیدیۆ هاتەکایەوە و لەلایەن کۆمپانیای تەلەفۆنی فەڕەنسییەوە لە سالی 1984 کەوتەکار. ئەم نێتەش دواتر بوو بە ناودارترین سێستەمی فەڕەنسی و جیهانی و لە سالانی نەوەتەکانا بەکاربرێ زۆری لەناوەوە و دەرەوەی فەڕەنسا هەبووە. سەرکەوتنی ئەم سێستەمەش بۆ دوو خالدەکرێتەوە. یەکەم: هەولی حکومەتی فەڕەنسی بۆ بەشداریکردن لە تاقیکردنەوە و بەزانیاریگەریکردنی کۆمەلگا. دووەم: بریتییە لە ئاسان بەکاربردنی. ئاشکرایشە ئەم جۆرە سیستێمە گرینگی خۆی لە پەرەدان بە نێتی گەیاندن هەبووە.
بۆزێتر ڕوونکردنەوەی ئەوی لەسەرەوە بەریاسخرا ئەوا دەلێین، گشت ئەو پەرەسەندنەی کە لە بواری گەیاندن باسدەکرێ پێوەندیەکی زۆری بە داهاتنی کۆمپیوتەری نێتەوە هەیە. ئەلبەتە لەمەوبەر و لەسەرەتادا تەنێ 25 لەوجۆرە کۆمپیوتەرە لە سالی 1975 دا هەبووە و دواتر و لەسالانی 1990 کانا نێتۆرکی ئینتەرنێت لە گەشەدا بووە و بۆ گلوبال کردنی گەیاندنیش یارمەتیدەرێ باش بووە. ئەم ئینتەرنێتە کە سالانە بەکاربرانی لە زیادبووندایە

ئەمڕۆ زۆرترین بەشداریکەرانی لە جیهانا هەیە. گەر بشخوازین باس لە مەسەلەی گەشەی ئینتەرنێت بکەین دەبێ ئەوە لەیادنەکەین کە بەسەربازی کردنی ئینتەرنێت زۆرترین گرینگی لەو باسەدا هەیە. ئەمەش بەزۆری بۆ وەزارەتی بەرگری ئەمەریکی دەگەڕێتەوە و بۆ سالانی 1960 کان. هەروەها ئەوەی لەپشت پەرەپێدانی ئینتەرنێتەوە بووە نێتۆرکی زانستی، دامەزراوەی و شەخسی بووە کە ئەوانەش بەدۆزینەوە و دۆزراوەکانیان کەلکێ زۆریان بە وەزارەتی بەرگری بەخشیووە. پاشان ئەمە بەردەوام بووە تا ئینتەرنێت بووە بە ئامرازێ گشتێ و هەروەها هەولێ زۆردراوە کە ئینتەرتێت بە بەبازرگانی بکرێ و بەتایبەت لە سالانی نەوەتەکانەوە. ئێستاش چوونە ناو ئینتەرنێتەوە لە جیهانا زۆر باوبووە و ژمارەی ئەوانەش کە بەکاریدەبەن هەر لەزیادبووندان.

لەگەل زیادبوونی بەکاربردنی نێتی ئینتەرنێت دا پرۆسەی گەیاندن گەشەی کردووە و، هەروەها توانای ئینتەرنێت لەگەل زۆربوونی پەیوەندی نێوان کەنالەکانی نێتی ئینتەرنێت لەنێوان بەکاربران دا بەرزبۆتەوە. پاشان نێتی ئینتەرنێت بەهۆی World WebWide (WWW) ـەوە دۆزێ وای هێنایەپێشەوە کە گشت کەس و کارگە و دامەزراو و ڕێکخراوەکان بکارن بێنە ناو نێتەوە و لاپەڕەی خۆیان سازبکەن و تێکست و وێنەی خۆیانی تیا بەخشبکەن. ڕیشەی نێتی زانستی، سەربازی، کە لە کارگەکانا بناغەی هەبوو، و کولتووری، کە دەکەوێتە ناو کۆمپیوتەری شەخسییەوە، هەموو ئەمانە خاوەنی یەك گرووندی هاوبەشی فیعلیین کە ئەوەش جیهانی زانکۆیە.

یەکەم گرێ دەشێ بووترێ کەArpanet بوو کە لەسالی 1969 لە UCLA دا دامەزرا و دوابەدوای ئەمە لە ماوەی سالانی 1971-197 شەش گرێی تری بەدواهات لە (SANTA BARBARA ؛SRI، UTAH، BBN، MIT، HARVARD). ئەمەو لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا گەیاندنی ئەلەکترۆنی لە زانکۆ و ئینستیووتەکانا زۆر گەشەیکرد. ئەمەش دۆزێ ئەوتۆی هێنایە پێشێ کە لە سالانی 1990 کانا خەلکێ زۆر لە مالەوە کۆمپیوتەریان هەبێ و بۆ ئەم مەبەستەش یابان کۆمپیوتەرێ زۆری بەرهەمهێنا. ئەم لایەنەش دەکرێ بە گەشەی خێرای تەکنیك لەقەلەم بدرێ کە لە دروستکردنی سیستەمی گەیاندنی نوێ و هێنانەکایەوەی گۆڕانکاری بەرپرسیارە. هەروەها ئەم قۆناغە بەوەش دەناسرێتەوە کە ماسمێدیایەکی گلوبال کەوتەگەڕ و هەروەها مێدیاکان چوونە نێویەکدی و ڕووبەری گەیاندنی ئەلەکترۆنی نوێ بەرینتربوو. هەر لەمدەمووەختەدا لەزۆربەی ولاتانیشدا و لەپێش هەمووشیانەوە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا دەستدرایە گەشەدان بە سێستەمی مێدیا و هاوهەنگاوبوونی ئەم سێستەمە لەگەل گەشەی سێستەمی گەیاندنی ئەلەکترۆنی و

هەولدان بۆ دروستکردنی سیستەمی مولتی میدیا. ئەم هەنگاوەی ئەمەریکاش دواتر لەلایەن ولاتانی تریG7 وە بەتایبەت یابان، فەرەنسا و تەنانەت بەرازیلیش پیادەکرا. ئەلبەتە دەکرێ ئەوەش یادخرێتەوە کە کۆنترۆلی کارگەکانیش بەسەر سیستەمی مولتی میدیاوە مانای زۆری بە کولتووری ئەلەکترۆنی بەخشی. لەهەمووی گرینگتر سیستەمی نوێی میدیا سیستەمێ نوێی ئەلەکترۆنی هێنایە پێشەوە کە زۆربەی بوارەکانی گەیاندنی ئەلەکترۆنی میدیای لەخۆگرت. هەر ئەم میدیا نوێیە ڕێگای زۆری لەبەردەم پەخشکردندا کردەوە و پێوەندییە ئەلەکترۆنیەکانی نێوان کۆمپیوتەر وTV و ئینتەرنێت و ڤیدیۆی بەباشی ڕێکخست.
ئەوەی ڕاستیبێ باسی گەشەی گەیاندنی ئەلەکترۆنی باسی جۆرە کولتوورێ دێنێتە پێشەوە بەناوی کولتووری ڤێژوالیتێی ڕاستی. ئاشکرایشە کولتوور لەبەرئەوەی لە پرۆسێسی گەیاندندایە پێوەندیێ ڕاستەخۆی بە گەیاندنەوە هەیە. گشت فۆرمەکانی گەیاندنیش، هەروەك لەمەوبەر ڕۆلان بارت و ئامبیرتۆ ئیکۆ فێریان کردووین، لەسەر بناغەی بەرهەمهێنان و بەکاربردنی نیشانە دروستدەبن. بەدڵنیاییشەوە کولتووری ئەمڕۆ بەرەو ئەوەماندەبا بڵێین جیاوازیێ ئەوتۆ لەنێوان ڕاستی نوێنەرایەتی سیمبۆلیدا نییە. ئەوەی لەڕووی مێژووییەوە بە سیستەمی گەیاندنی نوێوە تایبەتە، کە ئەم سیستەمە لەدەوری ڕێکخراوێ ئەلەکترۆنیدا خۆی ڕێکدەخا، ئەوەیە کە ئەم سیستەمە توانیوویەتی ڤێژوالیتێی ڕاستی دروستکا. ئەو سیستەمی گەیاندنەی ڤێژوالیتێی ڕاستی ئەخولقێنێ ئەو سیستەمەیە کە ڕاستی (بوونی سیمبۆلی/ماتریالی مرۆڤەکان) تیایدا بەندکراوە، یان ڕاستی لە پێوەندیەکی وێنەیی ڤێژوال دا بەرجەستەکراوە. ئەوەی شایانی باسە هەر ئەم سیستەمی گەیاندنە مەوداSpace و کاتTime هەروەها ڕەهەندی بناغەیی ژیانی مرۆڤەکانیش دەگۆڕێ. ئەم گۆڕانەی لە گەیاندندا ڕوویداوە کارێ وایکردووە کە شوێن لە مانای کولتووری، مێژوویی و جوگرافییەکەی دابڕێ و، لەتەك نێتۆرکی فونکشونال یان وێنەی کۆلاژ دا یەکخرێ و کە ئەوەش شەپۆلی مەودا Space of flows ئەخولقێنێ و جێگای مەودای شوێنSpace of place دەگرێتەوە. کات لە سیستەمی گەیاندنی نوێ لادەبرێ کاتێ کە ڕابردوو وئێستا و ئایندە دەتوانێ لەتەك یەكدا لەهەمان پەیامدا پرۆگرامکرێ. شەپۆلی مەودا بێکاتی کات بناغەێ ماتریالییە بۆ کولتوورێ نوێ کە کۆتای بە فرەڕەهەندی سیستەمی نوێنەرایەتی و بردنەرێوەی مێژوویی دەهێنێ.

فەسڵی شەشەم:

## شەپۆلی مەودا

بەپێچەوانەی گەلێ لە تیۆریزمەکەرە کۆمەلایەتیەکان کە پێیانوایە مەودا لەلایەن کاتەوە دەستی بەسەرداگیراوە ئێمە وایبۆدەچین کە مەودا لە کۆمەلگەی نێتۆرك دا ئۆرگەنیزەی کات دەکا. ئەمەو چ کات و چ مەوداش لەژێرسایەی پاڕادیگمی تەکنەلۆژیای زانیاری گۆڕانی دێتەسەر. هەروەها ئابووری زانیاری/ گلوبال بەدەوری چەقێ کۆنترۆل دا ئۆرگەنیزەکراوە کە دەتوانێ چالاکیەکانی نێتۆرکی کارگە ڕێکخا و هەروەها ئەم نێتە نوێکاتەوە و لەهەمانکاتدا بباتەڕێوەش.

لەگەل هاتنەکایەوەی شەپۆلی زانیاریدا جۆرە خەدەماتێ دێتەکایەوە کە بە خەدەماتی پێشکەوتوو دەناسرێ کە ئەوەش ئەمجۆرە خەدەماتانە دەگرێتەوە: مالی، بیمە، عەقارات، ڕیکلام، دیزاین، پێوەندی گشتی، ئیدارەی بازاڕ، ئاسایش، کۆکردنەوەی زانیاری و ئیدارەی سێستەمی زانیاری هەروەها توێژینەوە و پەرەپێدان و دۆزینەوەی زانستی کە هەریەك لەمانە ناوك لەگشت پرۆسێسێ ئابووریدا دروستدەکەن.

هەر لەگەل هاتنەکایەوەی ئەم شەپۆلە زانیارییە گەلێ شار و ناوچە سەرهەلدەدەن و دەبن بە نێوەندی مالی و بازرگانی. نموونەش لەسەر ئەوە شوێنهایەکی وەك لەندەن، نیویۆرك و تۆکیۆن کە دەبن بە شوێنهایەکی سەرنجڕاکێش و زۆربەی کارە مالی و بازرگانیەکانیان تیاکۆدەبێتەوە. گەشەی چالاکییەکانی ئەم شارە گلوبالانەش بووەتە هۆی دروستبوونی ناوچە و زۆنی تر وەك: هۆنکۆنگ، پاریس، میلانۆ، فرانکفۆرت، ئامستردام. یاخود بەهۆی گەشەی کاری مالی و بازرگانییەوە هەنێ شوێنی دی سەریانهەلداوە وەك: مۆسکۆ ومەدرید، ساوپالۆ وبۆینوس ئایرسBuenos Aires.

دەشێ ئەوەش بووترێ کە ئەمە پێوەندی بە دروستبوونی ئابووری گلوبالەوە هەیە. بەگەشەکردنی ئەم ئابوورییە بازاڕێ نوێ پەیدادەبێ و ئۆرگەنیزەی بەرهەمهێنانی خەدەماتەکانیش دەکرێ. واتە جیهانگیری لەزۆربوونی هەرێم دروستکردن زیاددەکا. هەروەها گەشەی چالاکییە ئابوورییەکان وایکردووە کە هەرێمەکان پتر بە چالاکییە ئابوورییەکانەوە ببەسترێتەوە. ئەمەو هەرێمەکان لەمیانەی نێتۆرکێ نێودەولەتیدا و هەروەها ئەم هەرێمانە بەهۆی ئەو گەشە

ئابوورییەوە دەچنە ناو پێشبڕکێیێ ئابووریی گلوبالەوە. بەبێگومانەوە دەکرێ بووترێ کە شەپۆلی ئەم گەشەیە ڕێگا لەبەردەم توێژینەوە و زیادبوونی نێوەندی بازرگانی دا کردەوە. لەپێش هەمووشەوە گەشەی گەیاندنی ئەلەکترۆنی و سێستەمی زانیاری هەلوەشانەوەی گەورەی لەنێوان مەوداکان و فونکشونەکانی ژیانی ڕۆژانەدا شیاوکرد، لەوانە: کار، کڕین، خۆشی، ویقایەی تەندروستی، خوێندن، خەدەماتی ڕەسمی، ئیدارە و. . هتد. دواتر لەو گۆڕانانەی کە دەکرێ لەئاستێ گەورەدا دەرکی پێبکرێ کاریگەری شەپۆلی زانیاری و گەیاندن بەسەر هەندەسەی شارەوە. بەتاماشاکردنێکی ژیانی ناو شار لە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریدا بۆماندەردەکەوێ کە گۆڕانێ زۆری هاتۆتەسەر. هەر لە نەخۆشخانە و بواری خوێندن و کارگەکانەوە تادەگاتە شوێنە ئیداری و ئۆفیسکان و ڕێگاوبانەکان وسەنتەرەکانی فرۆشتن، قوتابخانە و سینەما و دیسکۆتێك.

بۆیە دەکرێ بووترێ پێوەندی نێوان تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ و پرۆسێسی گۆڕانی کۆمەلایەتی هەنووکە کاریگەریێ زۆری بەسەر شار و شوێنەکانەوە بەجێهێشتووە. بەواتایەکی تر، فۆڕمی شار لەژێرکاریگەری تەکنیکی نوێ چوارچێوەی تری وەرگرتووە و ئەمەش وایکردووە کە فۆڕمێ نوێ لە شوێن (شەپۆلی شوێن) بێتەکایەوە و پەیوەندییێ زۆر لەنێوان ئەم شوێنە نوێیانە و شوێنەکانی تری دروستبێ. گۆڕانی فۆڕمی شار لەگەل هاتنەکایەوەی شەپۆلی زانیاری دێتەکایەوە و، ئەم شەپۆلە شار بۆخۆی دروستدەکا و شاریش گەلێ ناوچە و نێوەندی تازە چێدەکا. قۆناغی پیشەسازی لەمەوبەر شارێ وەك مانشستەر Manchester ی دروستکرد بەلام قۆناغی زانیاری شارێ وەك سیلیکۆن ڤالیSilicon Valley یان چەندین نێوەندی بازرگانی و زانیاریی دروستدەکا. پاشان دەبێ ئەوەش بزانین کە شاری زانیاری فۆڕم نییە بەلکو پرۆسەێکە کە بە شەپۆلی شوێن دەناسرێتەوە. بۆیە کاتێ کە باس لە کۆمەلگەی نوێ دەکرێ هەمیشە بایەخ بەوەدەدرێ کە ئەم کۆمەلگەیە بناغەێ زانیاری هەیە و بەدەوری نێتۆرکدا ڕێکدەخرێ(ئۆرگەنیزەدەکرێ). ئەم ئۆرگەنیزەکردنەش مانایێ زۆری بە شار داوە.

کاتێ کە سەیری شارە ئەوروپایەکان دەکەین دەبینین ئەم شارانە توانیویانە لەگەل گۆڕانکاریەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری خۆ بگونجێنن. لەڕووی مێژوویشەوە ئەوەی کە پێوەندی بە مەسەلەی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی شوێنەوە هەیە ڕەنگە ئەمەریکا لە ئەوروپا جوداوازبێ. بەلام ئەو کێشانەی

گەورەکان لەسەر بناغەی ئەم جۆرە ئارکتیکتوورە دروستدەکرێ. ئەم جۆرە قسانە هەموو دەمانبەنەوە سەر باسی ئەوەی کە مەودای شەپۆلەکان زالترین فۆرمی مەودان لە کۆمەڵگەی نێتۆرك دا. ئەم مەودایە، کە شێوە مەودای نوێیە، لەتوانایدایە پەیوەندی نێوان کۆمەڵگە و ئارکتیکتوور بسڕێتەوە. کەباسیش دێتە سەر ئارکتیکتووری پۆست مۆدێرن دەبێ ئەوە لەیادنەکەین کە ئەم جۆرە ئارکتیکتوورە باوەڕی بە گەشەی تەکنیك و ڕاسیۆنالیتێ نییە و هەولی کۆتایهێنان بە سیستەم و خولقانی شێوە شێوازێ سەرووی مێژوویی و هارمۆنی فۆرمال دەدا. وێرای ئەوانە ڕوخساری ئیرۆنی زۆرترین فۆرمی دەربڕینی ئارکتیکتووری پۆست مۆدێرنە. یەك لەو زاراوانەش کە ئەم جۆرە ئارکتیکتوورە باوەڕێ زۆری پێیەتی زاراوەی کۆتای مێژووە.
گەر بەپێی ئەو تیۆرەبێ کە ئێمە خۆمان لەناو کۆتای هاتنی مێژوو نزدیکدەخەینەوە ئەوا ناکرێ باس لە بوونی شوێن یان کولتوور بکرێ. هەچ شتێکیش لەوبارەیەوە باسکەم ئەوا هەمان ئەو شتانەیە کە لەمەوبەر داڤید هارڤیDavid Harvey سەبارەت پۆست مۆدێرنیزم و ئارکتیکتووری پۆست مۆدێرن باسی لێوە کردووە. وەکی تریش بۆزێتر گەیشتن لەم لایەنە دەشێ مرۆڤ بگەڕێتەوە سەر ئەو گفتووگۆ ڕوناکبیریانەی لەلایەن داڤید کولبKolb David ەوە لەبارەی ناواخنی کۆمەلایەتی و ئارکتیکتووری پۆست مۆدێرن ئەنجامدراوە. یان دەشێ بگرێینەوە سەر ولیام ساوندیرسSaunders William و گفتووگۆکانی لەبارەی پرۆسێسی بەزانیاریگەری و ئارکتیکتوور. ئەلبەتە ئەم گفتووگۆیانەش وامانلێدەکەن کە پۆست مۆدێرن وەك ئارکتیکتوری مەودای شەپۆل تەماشاکرێ.
نەك هەر ئارکتیکتوور بەلکو دیزاینیش دەکرێ وەك گرنگترین ئامرازی نوێکاری کولتووری ئۆتۆنۆمی کۆمەڵگەی زانیاری تەماشاکرێ. زۆربەی شارە گەورەکانیش لەگەل چوونە قۆناغی گلوبالەوە دەستیاندایە سەرلەنوێ بوونیادنانەوە تا ڕوخسارێ تر بە شاری گلوبال بدرێ. بەگلوبالبوونی شاریش بە گۆڕانی ئارکتیکتوور و دیزاینی شار دەستپێدەکا. شاری گلوبال ئەو شارەیە قەوارەی دەگۆڕێ و دەشبێ بە شارێ ئەبستراکتی لۆژیکی کە لەناوەڕۆکدا ئەم لۆژیکە پڕە لە هێما.

## لەکەناری ئەمریدا: کاتی بێکات

بۆئەوەی ڕوونکردنەوەێ لەبارەی کاتەوە بدەین ئەوا هەر لەم سەرەتایەوە ئاماژە بەوەدەکەین کە ئێمەی مرۆڤ کاتمان بەرجەستەکردووە و، کاتیش لەژێرسایەی پارادیگمی تەکنەلۆژیای زانیاریدا گۆڕانی بەسەرداهاتووە. کەسێ وەك G .J .Whitrow لە پەرتووکێ کلاسیکدا بەتووندی ئەوەی ڕوونکردۆتەوە کە چۆن کات بەدرێژای مێژوو، واتە هەر لەسەرەتای مێژووەوە تادەگاتە شۆڕشی نیوتن، گەشەیکردووە. هەروەها نیگل تریفتNigel Thrift ئەو فاکتەیمان یاددەخاتەوە کە کات لە کۆمەڵگەی سەدەی ناوەڕاستدا واتایەکی ونبووە. ئەمە دیاردەیەکی کۆمەڵگەکانی لەمەوبەرمانە. بەلام کاتێ دێینەسەر کۆمەڵگەی ئەمڕۆ، کۆمەڵگەی نێتۆرك، دەبینین کاتی بێکات فۆڕمێ گەشەکردووە لە کاتی کۆمەلایەتی. ئەم لایەنەش بۆ ئەوەدەگەڕێتەوە کە کات لەمجۆرە کۆمەڵگەیەدا سەرچاوەی بەهایە. بۆیەکەمجاریشە لە مێژوودا سەرمایە بەجۆرێ جیا کاری خۆی ئەنجامدەدا، بەجۆرێك کە هاوکاتە ئیشکردنی لەگەل کاتی نوێدا. ئەم لایەنەش لەلایەن داڤید هارڤی یەوە بەباشی ڕوونکراوەتەوە. ئەم ڕوونکردنەوانەش پێوەندیان بە مەسەلەی سەرهەلدانی تەکنەلۆژیای زانیاریی نوێ و ڕێکخراوی کارگەکانەوە هەیە کە لەدوای سالانی 1980 کانەوە هاتنەکایەوە و دۆزێ جیایان بۆ وەگەڕخستنی سەرمایە هێنایەکایەوە. ئەمەش وایکرد کە بازاڕێکی سەرمایەی مالی بێتەکایەوە کە لە کاتێ فیعلیReal دا کاردەکا کە پێشتر مێژوو بەخۆیەوە نەیدیووە. لەمەوبەریش ئەوە باسکرا کە چۆن ئەم بازاڕە مالییە بەهۆی گەیاندنێ گلوبالەوە دەچێتەڕێووە و نێتی تەلەفۆنیش گرنگیێ زۆر لەم بردنە ڕێووەدا دەبینێ. کاتێ کە تەماشای ئارکتیکتووری مالی گلوبالیش دەکەین دەبینین کە بەدەوری سێ زۆنی کاتدا کۆدەبێتەوە کە لە نیویۆرك، لەندەن و تۆکیۆ بریتین.

ئەمە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە سیستەمی بەرهەمهێنانی نوێ کاتێ جیای، کاتێ فیعلی، لەگەل خۆ هێنا کە لەگەل سیستەمی کارکردن لە کارگەکانی نێتۆرك دا دەگونجێ. فۆڕمی ڕێکخستنی نوێ لە کارگەکانا و چالاکیە ئابووریەکانی

کارگەکانی نێتۆرك گرنگی خۆی بۆ دروستکردنی کاتێ فیعلی هەبووە وکە ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ ئەو کاتەی کە ئابووری نوێ بەکاریدەبا. واتە ئابووری نوێ نەك هەر دەستی کارێ تازە و جیای دەوێ بەڵکو کاتێ تریشی دەوێ کە لەگەڵ بارودۆخی بەرهەمهێنان و دابەشکردن دەگونجێ. هەروەها ئەو شێوە رێکخستن و بردنەرێوەی لە کارگەکانا بەرێوەدەچێ پێویستی بەجۆرێ کاتی تایبەت هەیە کە ئەوەش ئەو کاتەیە کە ئابووری ئەمرۆ کارییێدەکا.
ئەوەی دەرکی پێدەکرێ سەبارەت بە کاتی کار لە کۆمەڵگەی نوێ دا ئەو کاتەیە کە کاتێ کۆمەلایەتی بوونیاددەنێ. کاتی کار لە ولاتانی پیشەسازیدا (لەماوەی ئەم 100 سالەی دوایدا) بەتەواوەتی رووی لە کەمبوونەوەکردووە. لەگەڵ کەمبوونەوەی کاتی کار (سنووردارکردنی کار بۆ 40 سەعات لە هەفتەیەکدا) مافی بێکاری و کات تەرخانکردن بۆ پشوو هاتەکایەوە و کاتی کاریش پتر لەجاران رێکترخرا. ئەو شێوە کارەی لە کۆمەڵگەی نوێدا هەیە بەجۆرێ مەیسەربووە کە زۆر جۆراوجۆرە و، بگرە ئەم کارانە بەجۆرێ بەرهەمهاتوون کە لەیەك کاتدا بۆ پیاو و ژنیش دەگونجێن. هەروەها کارەکان بەجۆرێ ئۆرگەنیزەدەکرێن کە لەگەڵ بارودۆخی کەسەکان بگونجێ. تەنانەت ئەو شێوە کارەی ئابووری نوێ مەیسەری دەکا لەرووی کاتەوە وەك یەك نین و یان دەکرێ بووترێ کە لە کارهایەکی جۆراجۆر، وەك کاری هەشت سەعاتی و کاری چوار سەعاتی، پێکهاتوون. لەوەگرنگتریش دەکرێ باس لەوەبکەین کە لەگەڵ هاتنی کاتی کاری نوێ گۆران هاتۆتە سەر ژیانی ئافرەت و کاری ئافرەتیش. پاشان ئەوەش دەڵێین کە ئەم گۆرانانە تەنێ کاریگەریی بەسەر مەرجە کۆمەلایەتیەکانەوە نییە بەڵکو بەسەر مەرجە بایۆلۆژیەکانیشەوە هەیە.
گەر بروانینە تەکنیکی نوێ بۆماندەردەکەوێ ئەم تەکنیکە بەدووی جۆرە نەمرێ لەناو ژیان دەگەرێ و هەروەها هەوڵ دەدا کە ژیان لە مەرگ جیاکاتەوە. گەر بروانینە رادەی بەرزبوونەوەی رێژەی تەمەن و مانەوە لە ولاتانی پیشەسازی بۆماندەردەکەوێ کە گۆرانێ لەئارادایە بەهۆی گەشەی زانستی پزیشکی، پیشەسازی تەندروستی و زانیاری مێدیاکان کە ئەمانە گرینگی خۆیان لەم رووەوە دیووە. گەشەی تەکنیکی نوێ رەنگدانەوەی خۆی بەسەر بواری سەربازیش بەجێهێشتووە و رۆلی خۆی لە کێشە نێودەولەتیەکانیشدا دیووە. ئەمەش پێوەندیێ زۆری بە خودی جەنگەوە هەیە کە ریشەی لە سروشتی مرۆڤایەتیماندا ئامادەیە. بەتایبەت لەرووی مێژوویشەوە ئەملایەنە (واتە ئەوەی کە جەنگ لە ریشەی مرۆڤایەتیماندا ئامادەیە) تیایژیاوین و لەمرووەشەوە

کارێکی زون تسوس Sun Tzus بەناوی (لەبارەی هونەری جەنگ) دەکرێ بەنموونە بهێنینەوە کە 500 ساڵ بەر لەزاین نووسراوە کە جەغت لەسەر ئەو لایەنە دەکا. بەڵام لەماوەی ساڵانی 1990-1980 کانا لە گەلێ لە کۆمەڵگە تەکنیکیە بالا و دیموکراتیەکانا، وەك ئەورووپای ڕۆژئاوا، ئەمەریکای باکوور، ژاپان و ئۆقیانووس، هەنگاویان بەرەو پووچکردنی جەنگ بردووە و ڕوویان لەوەشکردووە کە هاولاتیەکانی خۆیان لە هەڕەشەی جەنگ دوورخەنەوە (بۆنموونە: شەڕی جەزائیر لە فەڕەنسا، شەڕی ڤیێتنام لە ولاتە یەککرتووەکان، شەڕی ئەفغانستان لە ڕووسیا). ئەلبەتە گەشەی هەشتا و نەوەتەکانی سەدەی بیست لە هەندێ لە ولاتانی پێشکەوتوودا بووتەهۆی دروستبوونی تاقمێ زۆر لە پسپۆڕ و شارەزا لە چەکی نوێ. هەر ئەم تەکنیکە نوێیەش بووەتە هۆی ئەوەی ڕۆڵێ گەورە لە بەئەلەکترۆنیکردنی تەکنیکی سەربازی دا ببینێ و ئاستی تەکنەلۆژیای سەربازی گەلێ لە ولاتانیش بەرەو پێشەوە ببا و توانایێ ئەوتۆشیان بۆ دروستکا کە بکارن بەزووترین کات بەئامانجە سەربازیەکانیان بگەن. دیارترین نموونەش لەمبارەیەوە شەڕی کەنداو بوو کە چۆن توانرا لەشکری عێراق سەروژێرخرێ. بەلام ئەو بەرنامەیەی کە وەزارەتی بەرگری ئەمەریکی داپڕشتبوو دەکرا تەنیا لە ئاسمان و دەریا کاری خۆی بکا. هەرچی هێزی سەر زەوی بوو کە پتر لە نیو ملیۆن سەربازی ئەمەریکی پێکهاتبوو توانیان بگەنە ناو خاکی عێراق بەلام بەبێ ئەوەی بیانەوێ بگەنە بەغدا. ئەمەش دیارە لەبەرهۆی سیاسی بوو کە ویسترا عێراق هەر وەك هێزێ سەربازی بهێڵنەوە. ئەم جەنگەی کەنداو کە ڕوویدا دەکرێ وەك ئەو جەنگە کتوپڕ و خێرایانە تەماشاکرێ کە دەچنە خانەی چاخی زانیارییەوە. ئەگەرچی هاتنی تەکنەلۆژیای زانیاری کاریگەرێ زۆری بەسەر بواری سەربازی بەجێهێشتووە بەلام خودی جەنگ لە دونیادا لە ساڵانی 1970 کان بەولاوە و بەتایبەت لە 1980 کانەوە ڕووی لە کەمبوونەوە ناوە بەبەراورد بە ساڵانی 1920 کان و تا دەکاتە 1960 کان. هەر لەم ڕووەشەوە دەشێ باس لەوەکرێ کە ئەمڕۆ مردن بەهۆی جەنگەوە ڕووی لە کزیناوە لەچاو ساڵانی جەنگی جیهانی یەکەم و دووەم. بەمجۆرە گەر تەماشای ئەو ساڵانە بکەین کە جەنگ تیایا کراوە دەبینین جەنگ ئامرازێ سەرەکی بووە بۆ لەناوبردنی مرۆڤەکان. واتە بەپێی ئەوەی کە جەنگ لە بەشی یەکەمی سەدەی بیستدا فۆڕمێ بووە بۆ ژیان ئەمەش وایکردوە کە خەلکێ زۆر لەوماوەیەدا بمرێ. هەر بۆنموونە لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم پتر لە 10 ملیۆن کەس

مرد و دواتریش بەهۆی جەنگی جیهانی دووەمەوە زیاد لە 40 ملیۆن کەس مرد. مردنی ئەو ژمارە زۆرەش لە خەلك لەو سالانەدا نیشانەیە لەسەر ڕەوتی ژیانی ئەو کاتە کە بەپێی کات جەنگ و کوشتن بەهۆی جەنگەوە ڕووی لە کەمبوونەوەنا. واتە ئەو ڕەوتە ڕووی لە نەماننا. بەبێگومانیشەوە دەکرێ ئەوەبووترێ کە وونبوونی جەنگ لە ژیانی گەلێ لە کۆمەلگەکان کاریگەریی بەسەر کولتوور و رەفتاریانەوە بەجێهێشتووە. ئەمڕۆ لەبەشێ زۆر لە ولاتانی پیشەسازی و دیموکراسی دا وا نەوەیەك خەریکە گەورەدەبێ کە لەدوای جەنگی جیهانی دووەوە لەدایکبووە و هیچ ئەزموونێکی ژیانی جەنگیان نییە. لەمڕووەشەوە دەکرێ هەندێ ولات لەم یاسایەوە دوورخرێتەوە(وەك فەڕەنسا، پرتووگال و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا) یان هەندێ ولاتانی تر(وەك سویسرا و سوید) کە هەر مانای جەنگیان نەزانیووە. ئەم جەنگەش بەجۆرێ لە جۆرەکان کاریگەریی خۆی بەسەر پیاوانیشەوە هەبووە. چونکە ئەوی تایبەتە بە پیاوانی نەوەی یەکەمەوە، واتە ئەوانەی لە جەنگدا ژیاون، ئەوەیە کە لە کوشتن و کوژران دا بەشداربوونە. ئەم لایەنەش کاریگەری خۆی بەسەر خێزان و ئەوەی پێیدەلێن ئافرەت و کچ لە خێزانا بەجێهێشتووە. زۆرجار ئەمەش وای لە پیاوانکردووە کە شانازی بەم حالەتەی خۆشیانەوە بکەن. ئەو نەوەیەش کە ئەمڕۆ وا لە دەرەوەی بازنەی جەنگ گەورەدەبێ زۆر بەباشی ئەوەی دێتەوەیاد کە هاتۆتەسەر باوکانمان و دواتر منالیمان لەو قۆناغەدا. یان ئەوەی کە چۆن ژیانی خێزان و منالان پڕبووە لە برین و ئازار. ئەم خۆژیانەش لەتەك مەرگدا بەدرێژای مێژووی مرۆڤایەتی بوونی خۆی هەبووە و بەلام وا ئەم مێژووە ڕوولە نەمان دەنێ و بەشێ لە دانیشتوانی سەرزەوی جەنگ لەبیردەکەن. تەنیا لەماوەی 1992-1989 دا نەتەوە یەکگرتوەکان 82 دانە کۆنفلێکتی چەکدارانەی لە جیهانا تۆمارکردوو کە 79 دانە لەم کۆنفلیکتانە لەناو یەك نەتەوەدا ڕوویانداوە لەوانە:گریلە هیندە سوورەکانی گواتیمالا، شۆڕشی چەکدارانەی بێکۆتایی لە کۆلۆمبیا و پێرۆ، یاخیبوونی مەسیحی لە باشووری سوودان، شەڕی ڕزگاریخوازی کوردەکان، یاخیبوونی موسلمانەکان لەoMindana، شەڕی ناوخۆ و بازرگانی نارکۆتیکە لە تایلاند وMyammar، شەڕی ئایدیۆلۆژی لە ئانگۆلا، پێکدادانی توونده لەنێوان جەنگخوازان لە سۆمالیا یان لیبیریا، شەڕی ناوخۆی ئیتنی لە ڕەواندە و بوروندیBurundi بزووتنەوەی بەرەنگاری لە بیابانی غەربی دژبە ڕژێمی مەغریبی، شەڕی ناوخۆ لە ئەلجەزائیر، شەڕی ناوخۆ لە ئەفغانستان، شەڕی

ناوخۆ لە سریلانکا، شەڕی ناوخۆ لە بۆسنیە، شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان عەرەبەکان و ئیسرائیلیەکان، شەڕ لە قاوقاس و شوێنەکانی تر.
بەدڵنیاییشەوە پێوەندی ناجۆری وڵاتان بە دەسەڵات، دەوڵەمەندی و تەکنیکەوە فۆڕمە جۆراوجۆرەکانی کات و حەزەریشیان بە جەنگەوە دیاریدەکا. هەر سەبارەت بەم لایەنە ئەتوانین ئەوەش بڵێین کە دەشکرێ وڵاتێ جەنگەکەی لە جەنگی هێواشەوە بەرێتە قۆناغی جەنگی خێرا. ئەمەش دەشێ ئەنجامدرێ بەپێی پێوەندی ئەم وڵاتانە بەسیستەمی گلوبالەوە و بایەخی ئەو دەسەڵاتە سیاسیانەی کە لەو سیستەمەدا حاکمدارن. بۆنموونە هەردوو وڵاتی عێراق و ئێران بۆماوەی حەوت ساڵ توانیان بەیارمەتی هەندێ لە وڵاتانی جیهان بتوانن پەرە بەبەردەوامی جەنگەکەیان لەگەڵ یەکدا بدەن (ئەمەریکا و فەرەنسا یارمەتی عێراقیان دەدا کەچی ئیسرائیل یارمەتی ئێرانی دەدا و ئیسپانیاش بەهەردوولا چەکی کیمیاوی دەفرۆشت). هەر لەمڕووەشەوە دەکرێ باس لەو شەڕەشکەین کە لە بۆسنیەدا کرا کە لەلایەکەوە شەرمەزاریبوو بۆ ئەوروپا و لەلایەکیترەوە پرۆسەیەکی ئاشتییانە بوو لەلایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە بۆ وەستانی ئەم شەڕە. هەر لەم بوارەشدا شیاوە ئەوە باسکرێ کە لەماوەێ دیاریکراودا شەڕ ڕوو لە کۆتای بوون دەنێ یان شەڕ گۆڕانی دێتەسەر ئەوەش بە هەڵاوگۆڕانی شەڕ بۆ فۆڕمی نوێ لە کۆنفلیکتی زەبرووزەنگاوی، لەوانە تیرۆریزم کە وەك گرنگترین گوزارە لە دوای نەمانی شەڕ خۆی نیشان دەدا. هەر ئەم تیرۆریزمە هەوڵ دەدا بەتوانای جیاوە، وەك چەکی کیمیاوی و باکتریۆلۆژیەوە، بێتە گۆڕێ و گوزارە لە بوونی خۆی بکا.
هەر باسی کات دەمانباتەوە ناو بابەتێ تر کە ئەوەش بابەتی کاتی ڤێژواڵە. ئەم جۆرە کاتەش باسی کولتووری ڤێژوالیتێی ڕاستی دێنێتەپێشەوە. ئەم کولتوورەش بەستراوەتەوە بەو سێستەمی مولتی مێدیا ئەلەکترۆنیەی ئەمڕۆ لە دونیادایە. ئەم کولتوورە خۆی وادەردەخا کە کات لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆماندا دەگۆڕدرێتە دوو فۆڕم: یەکێکیان بێکاتییە و ئەوی تر هەنووکەیی. ئەوەش دەکرێ بووترێ کە ئەو مێدیا ئەلەکترۆنییەی کە لە کاتی فیعلیدا کاردەکا چرکە بە چرکە ڕووداوەکان موتابەعەدەکا(بۆ نموونە ئەمەکرا لەکاتی هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت لە 1991 دا). لەم حاڵەتەدا مرۆڤ دەکرێ لەوەبگا کە چۆن گەیاندنی نوێ، ئێپۆکێ نوێ لە گەیاندن لە دونیادا دێتەکایەوە و یان لەوە بگا کە چۆن مێژوو ئەخولقێ. ئەم شێوە گەیاندنە نوێیە تەنیا لەبواری مێدیادا نییە بەڵکو بواری کۆمپیوتەر و چات Chat یش دەگرێتەوە کە ئەمڕۆ وەك ڕێگایەك

بۆ پێوەندی پێوەکردن بەکاردەبرێن. واتە بێکاتی فۆڕمی ئەو کاتەیە کە لەگەڵ تەکنیکی گەیاندنی نوێدا کاردەکا. بێکاتی هیپەرتێکست Hypertext ی مولتی مێدیا بەشێ سەرەکییە لە کولتووری ئەمڕۆمان. نابێ ئەوە لەیادکەین کە ئەم جۆرە هیپەرتێکستەی مولتی مێدیای ئەمڕۆ ئاگایی و یادی ئەو منالانە دادەڕێژێ کە لە ژینگەی کولتووری نوێدا پەروەردەدەکرێن. بۆیە شیاوە باس لەوەکرێ کە ئەوەی مێژوو لە ئەمڕۆدا ئۆرگەنیزەدەکا ئەو ماتریالە ڤێژوالەیە کە هەیە و هەروەها ئەو شیاویانەی کە پرۆسەی بەکۆمپیوتەرکردن هێناویەتە پێش. لەم دەمووەختە مێژوویەشدا ئەوی کە ئۆرگەنیزەی فۆڕمەکانی کات دەکا ئەوا- ڕیکلام، گەیاندنی زانین، ڕاپۆرتی هەواڵەکانە. هەموو ئەوانەش باس لەوەدەکەن کە لەناو کولتووری هەمیشەیی و کاتیدایین. لەلایەکی دیش ئەمانە ئەوە نیشان دەدەن کە ئێمە خۆمان لەناو کولتووری بازنەییدا نابینینەوە بەڵکو لەناو کولتووری ئونیڤێرسوم.

ئاشکرایشە لەمیانەی باسەکاندا باسمان لە پەیوەندی نێوان ئایدیۆلۆژیا و کۆتای مێژوو کرد هەروەها ئەو مەرجە ماتریالیانەی کە بەپێی لۆژیکی مەودای شەپۆل ئەخولقێ ڕوونکردەوە. بۆیە بەهۆی داهاتنی ئارکتێکتووری پۆست مۆدێرنیستیەوە و لەژێرسایەی ئەو ئارکتیکتوورەدا دەکرێ جۆرە کولتوورێکمان دەستکەوێ کە بەبێ بایەخدانە کات و ڕێکخستن گشت کردە کولتوورییەکان تێکەڵ یەکدیدەکا. ئەمەش لەبەرئەوەی خۆمان لەناو کولتووری گوزارەی سنووردار دا دەبینینەوە. وێرای ئەوەی وترا دەبێ جەغت لەوەشکرێ کە ئەم فۆڕمە کولتوورە هاوشانە لەتەك ئەو جۆرە کولتوورە کاتی/هەمیشەییەی کە گوێنەدەرە بە کات و نەرێت. لەڕووەشەوە دەشێ باس لەوەکرێ کە داڤید هارڤی خوێندنەوەی باشی بۆ کولتووری پۆست مۆدێرن، یان ئەوی بە "دۆزی پۆست مۆدێرن" ناویدەبا، کردووە. ئاسایشە بوترێ کە داڤید هارڤی بەرپرسیاری زۆرتر دەخاتە سەر لۆژیکی کاپیتالیزم وەك لەوەی پێویست بێ.

کولتوور تەنێ لۆژیکی سێستەمی ئابووری سەرلەنوێ بەرهەمناهێنێتەوە. هەروەها پێوەندی مێژوویی نێوان نیشانەکانی ئابووری سیاسی و نیشانەی ئابووری سیاسی بەش ئەوەناکا لەبواری پۆست مۆدێرنیزم کە کارەکنێرێزەی داهاتنی کاتی بێکات بکرێ. ئەم گوزارە کولتوورییە نوێیە ئایدیۆلۆژیا و ئازادیێ تەکنیکی خۆشی هەیە کە لەتوانایدایە دەست بەسەر گشت پلانێت و مێژووی مرۆڤایەتی دا بگرێ. لەئەمڕۆشدا بەهۆی ئەم کولتوورەوە لە

تێهەڵکێشی سۆپەرتێکستدا دا دەژین کە گشت نیشانەکان لەگشت لایەکەوە بەیەکدی تێکەڵدەکرێن و تێهەڵکێشدەکرێن. ئەوەتا کولتووریRap(قسە) لە ئەمەریکاوە دەگاتە تایپیTaipei و لە تۆکیۆ بودیزم دەگۆڕدرێتە موزیکی ئەلەکترۆنی. وێڕای ئەوە دەشێ بووترێ کە کاتی هەمیشەیی/کاتی (موەقەت) کولتووری نوێی هاوکاتە لەگەڵ لۆژیکی سەرمایەداری مەرن(فلێکسێبل) و دینامیکی کۆمەڵگەی نێتۆرك. هەر ئەم کولتووره خەونە ئیندڤیدوالیەکان (تاکییەکان) و هەولە کۆلێکتیڤیەکان (جەماعیەکان) یش دەخاتە دیمەنێ مێنتالی بێکاتەوە. هەروەها دەشێ ئەوەش باسکرێ کە مۆسیقای چاخی نوێAge New، کە بووە بە دیاردەێ باو، لەگەڵ کولتووری نوێ و ئەو کاتەی ئەم کولتووره وابەستەیە پێوەی هاوکاتە. واتە کاتی بێکات. ئاشکرایشە کە کاتی بێکات تێمایەکی سەرەکییە لە ئێپۆکی ئەمڕۆمان. دەشکرێ لەمڕووەوە بپرسین: کات، ئەو کاتەی کە کەسانێ وەك ئۆگوستینAugustinus، نیوتنNewton، ئانیشتاینEinestein، هایدگر پێوەی سەرقالبوونە، چییە؟ هەروەها ئەم کاتە لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆماندا چۆن کاردەکا؟. لەم حالەتەیشدا بۆئەوەی مانای کات ڕوونکەینەوە مەرجە بگەڕێینەوە بۆلای لێبنزLeibniz چونکە گشت فەلسەفەی لیبنز بریتیە لە باس لەسەر کات. بۆ لێکدانەوەی کاتیش بەپێی ئەم فەلسەفەیە گرینگە بایەخدان بە شت(مادە). چونکە کات بەبێ مادە بوونی نییە.

کاتی بێکات ئەو تاکە کاتەیە کە لەگەڵ کۆمەڵگەی نێتۆرگ دا هاوکۆکە و دەشێ تێکڕای کارەکانی پێ ئەنجامبدرێ. واتە لەگەڵ کاتی کاری مەرن و کولتووری ڤێژوال دا ڕێدەکا و خۆی وەك فۆرمی کاتێ پەسەندکراودەردەخا. بەلام مەرجە لەوە بەئاگابین کە ئەو خالانەی کارەکتێریزەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان دەکەن، وەك کولتووری ڤێژوال، ئینکارکردنی مەرگ و جەنگی پەلە و کاری مەرن و کاتی بێکات، گشت کاتەکان ناگرێتەوە. چونکە مرۆڤهایەك هەن کە ئەمڕۆ لەبەشێ لەدونیا لە فۆرمێ کاتی تردەژین. هەر سەبارەت بە جیاوازی نێوان کارەکتێرەکانی کۆمەڵگەی نێتۆرك، کە خاوەنی کاتێ بێکاتن، لەگەڵ کۆمەڵگەکانی دی، کە بەمجۆرە کاتانە ئاشنانین، دەشێ بووترێ کە ڕێژەی نەخۆشی و مەرگ تیایدا لەکشانەوەدایە. بەلام جارێ جیاوازی لەنێوان ولاتانی گەشەکردوو و گەشەنەکردوودا هەر ئامادەیە. چونکە ڕێژەی نەخۆشی و مەرگ جارێ هەر بەرزەو و هۆی زۆریش لەپشت ئەم بەرزبوونەوەدایە.

هەروەها گەر کاتی مەرن و بەرهەمهێنانی ئۆرگەنیزەکراوی کۆمەڵگەی نێتۆرك یان کاتی ئۆرگەنیزەکراو لەشوێنێ وەك سیلیکۆن ڤالی یاخود باکووری ئیتالیا

نرخی هەبێ جارێ بۆ بەشێ زۆر لە کرێکارانی چین و باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا ئەو مانایەی نییە. دیاریشە کە بێکاری لە ئابووری نوێدا مانای جودایە لەچاو ئەو مانایەی بۆ هەندێ لە ئابووری تر هەیەتی. بەتایبەت ئەو ئابووریانەی کە خودی کارکردن تیایا لەنێوان کارکردن و مردن دا خۆی قەتیسکردووە. یان بۆنموونە مۆبیل تەلەفۆن لە شوێن و کاتدا بەرزدەکاتەوە بەلام بۆ هەندێ شوێن و هەندێ ئابووری ئەو مانایەی نییە. ئەم مەسەلەیە تەنانەت کولتووری ڤێژوالیتێش دەگرێتەوە کە هەمان مانای بۆ گشت دانیشتوانی سەر زەوی وەك یەك نییە.
لەڕاستیدا گرینگە ئەوەروونکرێتەوە کە کاتی بێکات بە مەودای شەپۆلەوە گرێدراوە و لەهەمان کاتدا کاتی بایۆلۆگی و ڕێکخستنی کاتی کۆمەلایەتیش بەشێ تر لەم جیهانەی تیای دەژین دەستنیشاندەکا. بەلام نابێ ئەوە لەیادکەین کە لە کۆمەلگەی ئەمڕۆمان ئەوەی مەودا(شوێن) دەباتە ڕێووە کاتە و شەپۆلیش کاتی بێ کات ئەخولقێنێ.

**پووختە:**

## کۆمەڵگەی نێتۆرك

ئەمە گەشتێکە بەنێو بوونیادە کۆمەلایەتییەکان کە لەنێو بواری ئەزموون و چالاکییە مرۆڤایەتییە جۆراوجۆرەکانەوە گەشەدەکەن. ئەمە ئاراستەی مێژووییە لە چاخی زانیاریدا کە وەزیفە و پرۆسێسە زاڵەکان وەك نێتۆرك ئۆرگەنیزەدەکرێن. نێتۆرك مۆرفۆلۆژیای کۆمەلایەتی نوێی کۆمەڵگەکانمانە و، هەروەها بلاوبوونەوەی لۆژیکی نێتۆرك کاردەکاتە سەر شێوازی وەزیفە و ئاکامی پرۆسێسەکانی بەرهەمهێنان، ئەزموون، دەسەلات و کولتوور لەئاستی بالادا. ئەم فۆرمە کۆمەلایەتیە نوێیەی کە ئەمڕۆش باوە فۆرمی نێتۆرکە و ئەم فۆرمەش بوونیادی کۆمەلایەتی نوێی لەتەك خۆدا هێناوە. کاتێ کە ئەم فۆرمە کۆمەلایەتیە لەهەج شوێن و لەهەج کاتێکیشدا سەرهەلدەدا هەمان گۆڕانی بوونیادی دروستدەکا و، هەروەها دەشبێ بە گروندی ماتریالی بۆ گۆڕانکاری. هەر لەمبارەیەوە دەشێ جەغت لەوەشکرێ کە لۆژیکی نێتۆرك بارێ کۆمەلایەتی دێنێتە پێشەوە کە لەمەوبەر بوونی نەبووە. بۆیە دینامیکی نێتۆرك لە کۆمەڵگەی ئەمڕۆماندا هۆکارێ گەزرەیە بۆ گۆڕان و ئەم کۆمەڵگایەش مۆرفۆلۆژیایەکی کۆمەلایەتی خۆی هەیە.

ئەم توێژینەوەیە تایبەتە بە کۆمەڵگەی نێتۆرك و بەشەکانی تری ئەو توێژینەوەیەی کاریتیاکراوە لە دوو بەشی تر پێکدێ(واتە بەشی دووەم- دەسەلاتی ناسنامە- و سێهەمی- کۆتای هەزارینە- چاخی زانیاری) کە لەبارەی ژیندەر/سێکس، پێکهاتەی ناسنامە، بزووتنەوەی کۆمەلایەتی، هەلاوگۆڕانی پرۆسێسی سیاسی، قەیرانی دەولەت لە چاخی زانیاریە. کەوابێ هەندێ لایەنی تیۆری هەن لە توێژینەوکانی دیدا بەرباس دەخرێن کە لێرەدا ئاوڕیان لێنەدراوەتەوە. هەرچی ئەم بەشەیە بۆ ئەوە بەکاربراوە کە گەلێ دید و زانیاری لەبارەی بوونیادە نوێکانەوە بخرێنەڕوو تا هەندێ دەرئەنجامی کاتی بۆ خوێنەری ئەم بەشە شیاوکرێ.

بۆ ئەوەی پێناسەی واتای نێتۆرك بکەین، ئەو نێتۆرکەی واتای سەرەکییە لە باس لەبارەی چاخی زانیاریی، ئەوا دەکرێ بووترێ نێتۆرك بریتییە لە چەند گرێی یەکخراو. گرێش بریتییە لە خالێ کە لەوێرا بەخودی خۆیدا تێدەپەڕێ.

دواتر گرێ بەزۆری لەسەر ئەوەدەوەستێ کە ئێمە قسە لەبارەی چ جۆرە نێتۆرکێ دەکەین چونکە ئەو گرێیانە جۆراوجۆرن. دەکرێ نموونە لەسەر گەلێ لەو گرێیە ئالۆزانە بهێنرێتەوە وەك: بۆرسەی ئاکسیەکان کە لە چەند نێوەندێ پێکدێ و بە شەپۆلی مالی گلوبالەوە بەستراوەتەوە، ئەو تێتە سیاسیەی EU دەباتەڕێوە. ئەم نێتە گەلێ بواری تری هەیە، هەر لە کارە مالیەکان و بازرگانی نارکۆتیکە تادەگاتە گرووپی هەوالەکان و بەرنامە تەرفیهیەکانی تەلەفزیۆن و نێتۆرکی هەوال وەرگرتن و ناردنی سیگنال لە نێتۆرکی گلوبالی مێدیا نوێکان کە ئەمە گروند بۆ دەربڕینی کولتووری و بۆچوون لە چاخی زانیاریدا دروستدەکا.

ئەوانە نیشانەن لەسەر ئەوەی ئێمە کەوتووینەتە ناو کۆمەلگەی نێتۆرك بەلام ئەم نێتۆرکە سێستەمێ کراوەیە لەگەل توانایێ بۆ بلاوونەوەمێ بێ سنوور. کۆمەلگەی بەنێتۆرککراو کۆمەلگەیەکی دینامیکی بەهێز و سێستەمێ ناداخراوە. هەروەها ئەم نێتۆرکە ئامرازێ گونجاوە بۆ ئابووری سەرمایەداری کە لەسەر بناغەی خۆنوێکردنەوە، جیهانگیری و چڕکردنەوەمێ نامەرکەزی دامەزراوە. ئەمەو ئەم سێستەمی نێتۆرکە گونجاویشە بۆ مەرجەکانی کار و کارکردن لە کارگە و مسۆگەرکردنی مرونەت لە بواری ئیش. گونجاویشە بۆ هەلوەشانەوە و سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی کولتوورێ هەمیشەی یان گونجاوە بۆ دەسەلاتی دەولەت بەئامانجی خستنەگەڕی بۆچوون و بەهای نوێ. بەلام ناکرێ ئەوە لەیادکرێ کە مۆرفۆلۆژیای نێتۆرك دەبێ بەهۆکاری سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی دراماتیکی دەسەلات. ئەم دەسەلاتەش پێوەندی نێوان نێتۆرکەکان ڕێکدەخا کە ئەمەش کارێ نوێیە. بۆنموونە شەپۆلی مالی کە دەسەلاتە ئەم دەسەلاتە وا دەسەلاتی بەسەر قەڕالستانی مێدیادا هەیە کە ئەم قەڕالستانەش کار لە پرۆسێسی سیاسیدەکا. کەواتە ئەوەی شوێنی دەسەلات دەگرێتەوە لەو ڕێکخستنەی لەسەرەوە باسکرا ئەوا نێتۆرکە. ئەم نێتۆرکە بەجۆرێ بوونیادنراوە کە زۆر سنووربەزێنە. ئەو بەیەککەیشتنەش کە لەنێوان گەشەی کۆمەلایەتی و تەکنەلۆژیای زانیاریدا دروستبوو گروندێ ماتریالی نوێی خولقاندووە.

هەولی ئەوەدرا کە ئەوەنیشاندرێ چۆن ئابووری نوێ بەدەوری نێتۆرکێ گلوبالی سەرمایە، بردنەڕێوەی کارگە و زانیاری خۆی ئۆرگەنیزەدەکا. ئەمانەش بەبێگومان دەبن بە دەروازە بۆ توانایێ تەکنەلۆژی کە بکارێ گروند بۆ بەرهەمهێنان و توانای پێشبڕکێ دابنێ. وێرائەوە کارگەکان هەروەك

دامەزراو و ڕێکخراوەکان خۆیان بە نێتۆرکەوە دەبەستن. ئەم خۆبەستنەوەیەش گرنگیێ زۆری بۆ ڕێکخستنی کارگەکان هەیە. وەکیتریش دەکرێ دەرك بەوەبکەین کە ئەم نێتۆرکە بەجۆرێ گەشە دەکا و بلاودەبێتەوە کە گشت یەکە ئابووریەکان و کارگە گەورە و بچوکەکانیش دەگرێتەوە. لەئاکامی ئەم بلاوبوونەوەیەی نێتۆرکیش پرۆسێسی کار زۆر ئیندڤیدوالیزەدەبێ. ئەمەش وادەکا کە بکەوینە ناو سێستەمێ کار بردنەڕێوەی نوێووە. ئەم پەرەپێدانەی فۆرمەکانی نێتۆرکی بردنەڕێوەی کارگە و بەرهەمهێنان مانای ئەوەنییە کە کاپیتالیزم داڕماوە. چونکە کۆمەلگەی نێتۆرك بەمانا دامەزراوەییە جۆراوجۆرەکەی جارێ کۆمەلگەێ کاپیتالیستییە.

دەبێ دانبەوەشدا بنێین کە ئەوە بۆیەکەمجارە لە مێژوودا بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لەسەر هەموو زەوی پەیوەندی کۆمەلایەتی ڕێکدەخا. ئەم جۆرە سەرمایەدارییە خۆی لەو سەرمایەدارییە لەمەوبەر هەبووە جیادەکاتەوە. ئەوەش کە سەرمایەداری ئەمڕۆ جودایە دوو ڕوخساری بناغەیی هەیە یەکەم ئەم سەرمایەدارییە گلوبالە و دووەمیش ئەم سەرمایەداریە خۆی بەدەوری نێتۆرکێ لە شەپۆلی سەرمایە ئۆرگەنیزەدەکا. ئەم سەرمایەش، وەك تاکە یەکەێ لە کاتێ ڕیال (فیعلی) دا، بەجۆرێ گلوبال کاردەکا. هەروەها ئەم سەرمایەیە بۆ یەکەمجارە شێوەی کارکردنێ یان جوولە و ئیشکردنی زۆرگلوبالە. ئاشکرایشە کە جوولەی ئەم سەرمایەیە بازاڕێ مالی گلوبالی زانیاری، کە لەبنەچەدا بە نێتۆرکەوە بەستراوەتەوە، دەبیاتەڕێووە. بەهۆی ئەم نێتۆرکەشەوە سەرمایەی ناوبراو لەگشت کەرتە یان یەکە ئابووریەکان(بواری زانیاری، کارگەی مێدیا، خەدەماتی بالا، بەرهەمهێنانی کشتووکالی، ویقایەی تەندروستی، خوێندن، ئاین، کولتوور، تەکنیك، بەرهەمهێنانی پیشەسازی کۆن و نوێ، گوازتنەوە، بازرگانی، گەشتوگوزار، ژینگە، عەقارات، تەرفیهی و وەرزش) بەجۆرێ گلوبال ڕەبەردەهێنرێ. واتە سەرمایەی مالی لە پرۆسێسێ گلوبالدا جوولەدەکا و کاری خۆی ئەنجامدەدا. ئەم سەرمایەیە هەر لەسەر ئاستی ئابووری نەتەوە، هەرێم کارناکا بەلکو لە دەرەوەی سنووری نەتەوەش کاردەکا و جوولەی کارکردنەکەشی لە هەچشوێنێبێ براوە و دۆڕاو دروستدەکا. ئەمەش لەناو ئەو ئابوورییە ڕوودەدا کە پێیدەوترێ" ئابووری ڕیال"-واقیعی- کە پێمانباشترە ناوی" ئابووری ناواقیعی" لێبنێین. هەر لەم بوارەشدا دەشێ ئەوە بلێین کە لە چاخی سەرمایەداری نێتۆرکدا ڕیالیتێی لەوشوێنە بناغەی هەیە کە پارە دەکرێ دروستکرێ یان وەبەرهێنرێ.

دەبێ ئەوەش یادخەینەوە کە سەرمایەی مالی بۆ مسۆگەرکردنی وەزیفە و پێشبڕکێکانی پێویستی بە زانین و زانیارییەوە هەیە کە ئەمەش لەلایەن تەکنەلۆژیای زانیارییەوە بەهێزدەکرێ. بەبێگومانیشەوە جەغت لەوەدەکەین کە ئەم لایەنە ئەوە بەرباسدەخاتەوە کە وابەستەیێ لەنێوان شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری و شێوازی پەرەسەندنی زانیاریدا هەیە. تەنانەت کارگە زۆر پێشکەوتووەکانیش لەڕووی تەکنەلۆژییەوە بە توانای مالییەوە وابەستەن کە ئەمەش بەهۆی هەولی ئەبەدی ئەم کارگانە بۆ خۆنوێکردنەوە و بەرهەمهێنان و توانای پێشبڕکێ دێتەدی. پاشان ئەوەی پێیدەوترێ تەکنیکی نوێ و زانیاری لە بازاڕ دا ئامرازی سەرەکین. هەروەها ئەو سەرمایە مالیەی باسمانکرد زۆر بە تەکنەلۆژیای بالا و سەرمایەی پیشەسازیەوە وابەستەیە وەك لە شتێ تر. چالاکیەکانی سەرمایەش وامانلێدەکەن بلێین سەرمایە گلوبالە و ئەم گلوبالیەش وایلێدەکا یتوانێ بێتەناو پرۆسێسی کەلەکەبوونی ئابووری نێتۆرکی ئەلەکترۆنیەوە. شەپۆلەکانی ئەم سەرمایەگلوبالە یان چالاکیەکانی ئەم شەپۆلانە مانایێ زۆری بۆ بردنەڕێووەی کارگە و بەرهەمهێنان و دابەشکردن هەیە. هەر لەژێر سایەی ئەم هەلاوگۆڕانە کۆمەلایەتی و بەرەوپێشەوەچوونە تەکنیکیە یان ئەم پێوەندیە ئابووری و ڕێکخراوەیی و تەکنیکیە نوێیە سەختە ئەوە دیارکرێ کە کێ سەرمایەدارە. چونکە سەرمایەدار دیراکتۆر (بەڕێوەبەری گشتی)ی کارگەکانی نییە. ئەوان تاڕادەیەك ئاڕاستەی کارگە گلوبالیەکان کۆنترۆلدەکەن و پێوەندیان بە بردنەڕێوە نییە یان شارەزای ئەوەنین کە نێتۆرکی شەپۆلەکانی سەرمایە یان شەپۆلەکانی زانیاری و نێتۆرکی زانین بەرەوکوێدەڕوا. بەلام لەسەر ئاستی هەندێ کارگە لە سێستەمی سەرمایەداری گلوبالدا، بۆنموونە دەکرێ باس لە حالەتی یابانی یان کارگە دەرەکیەچینیەکان بکرێ، دیراکتۆری کارگەکان جیاوازترن. تەنانەت هەر لەم بوارەدا دەکرێ باس لە باری ڕووسیای ئەمڕۆشکرێ. نەك ڕۆلی دیراکتۆرەکان بەلکو گەشەی سەرمایەداری ئەوێش. خۆی بەگشتی لۆژیك و بزووتنەوەی نێتۆرکی سەرمایەداری گلوبال ئابووریەکان دیاریدەکا و کاریشدەکاتە سەر کۆمەلگەکانی ئەم ئابووریانەش. بەدلنیایشەوە شەپۆلی ئەم سەرمایە گلوبالەش بە نێتۆرکی ئەلەکترۆنیەوە بەستراوەتەوە. نێتی سەرمایە هەم کەلەکەبوونی سەرمایەی سەرمایەداران یەکدەخا و هەم ئەم سەرمایەیە بەڕێوەشدەبا. هەروەها ڕەوتی سەرمایەدارەکانیش بەجۆرێ باش بەدەوری نێتێ گلوبالەوە گرێدەدا.

ئێمە گرینگە سەرنج بخەینە سەرئەوەی کە لەسەرەوە درکانمان کە سەرمایەداری ئەمڕۆ لەوی لەمەوبەر جوداوازە و ئەم سەرمایەداریەش لە کۆششێ ئەبەدیدایە بەدووی پارە. ئەم پارەیەش بەبێ یەك و دوو بە بەرهەمهێنانەوە وابەستەیە. بۆیەدەکرێ بپرسین کار و پێوەندی بەرهەمهێنان لەژێرسایەی زانیاریگەری، جیهانی نوێ و سەرمایەداری گلوبال چی بەسەردێ؟. ئەم پرسیارە دەشێ بەرەو جۆرە وەلامدانەوەیەکمان بەرێ کە ئەوەش بە باری کرێکاران لە چاخی زانیاری دا گرێدراوە. چونکە کرێکاران بەهاتنی مەودای شەپۆل وننابێ و نەك هەر ئەوە بەڵکو ژمارەی کرێکاران لە جیهانا لەزیادبونیشدا دەبێ. بەلام ناشێ ئەوە لەیادکەین کە ژمارەی بێکاران لەگەڵ بلاوبوونەوەی تەکنەلۆژیای زانیاری زیادەدەکا و هەروەها گەلێ جۆرە کاریش وندەبن. ئەلبەتە ئەو زۆربوونەی بێکاران لە ولاتانی ئەوروپای ڕۆژئاوا پێوەندی بە دامەزراوە کۆمەلایەتیەکانەوە هەیە نەك سیستەمی بەرهەمهێنانی نوێوە. وێرای ئەوە دەشێ بلێین کە کار، کرێکار و چینی کرێکار لە جیهانا ڕۆژانە لەگەشەکردندایە. ئەم گەشەکردنەش لە بناغەدا پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکانی نێوان کار و سەرمایە دەگۆڕێ. سەرمایە، کە لەچاو کار گلوبالە، لەژێرسایەی زانیاریگەریی دەبێتە هۆی چڕکردنەوە و بەجیهانیکردنی سەرمایە. هەرچی کارە ئەوا بوونێ پتر بلاو و پەرت و دابەشدابەشی هەیە. لەوەسەریتر ئەوەیە کە کار ووردە ووردە ناسنامەی کۆلێکتیڤی خۆی لەدەستدەدا و لەژێرکاریگەریی تەکنەلۆژیای زانیاریی ئیندڤیدوالیزەدەکرێ. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر زۆر ئاشکرا نییە کە لەگەڵ هانی شەپۆلی نێتۆرك کێ بەرهەمهێنەرە، کێ بڕیارەکانی لەدەستە، کێ خاوەنە و کێ بەڕێوەبەرە.

هەر تایبەت بە پرۆسێسی کار دەمانەوێ ئەوەش بلێین کە کار خۆی لەناو یەکەیەکی ئالۆزی گلوبالی نێتۆرك دا دەبینێتەوە. بەلام لەهەمان کاتدا کار لە حالەتێکیشدایە کە دابەشدەکرێتەوە و هەلیشدەوەشێنرێتەوە و، هەروەها ژیانی سەرمایەداری گلوبال کەمتر بە کاری تایبەتەوە وابەستەیە و زۆرتر بە کاری پێکەوە و گشتیەوە وابەستەیە. هێزی کاریش لەئاستێ گلوبالدا بلاودەکرێتەوە. ئاساییە جەغت لەوەشکەین کە بەرهەمهێنانی سەرمایەداری والە کار و سەرمایە دەکا کە لەهەموو کات و شوێن Place ێکدا ئامادەبێ. چونکە ئەوی ناومانناا مەودای شەپۆل دژی مەودای شوێنە. ئەمەش گۆڕانێکە پێوەندی بە هاتنی کۆمەلگەی نێت هۆرکەوە هەیە. ئەم جۆرە کۆمەلگەیە کاتی بەکۆمپیوتەرکردووە و کارێ واشیکردووە کە ئەم کاتە نوێیە دژبە کاتی ئاسایی

یان کاتی ژیانی ڕۆژانە بووەستێتەوە. ئەم دوو کاتە جوداوازە لەپەیوەندیدان لەتەك یەکدا. بەلام بەیەکەوە نەبەستراونەتەوەوە.
بەمجۆرە دەبێ ئەوە باسکەین کە سەرمایە لەژێرسایەی کۆمەلگەی نێتۆرك دا پتر گلوبالانە ئۆرگەنیزەدەکرێ و کاریش بەپێچەوانەی ئەوەوە ئیندڤیدوالیزەدەکرێ و لەهەمانکاتدا لۆکالیزەشدەکرێ (ناوخرییدەکرێ). جوولە و یان ئیشکردنی سەرمایەش کە بەهۆی نێتۆرکەوە ئەنجامدەدرێ کاریگەری بەسەر بوونیادی کۆمەلایەتیشەوە بەجێدێلێ. پرۆسێسی هەلاوگۆڕانی کۆمەلایەتیش کاریگەریی خۆی بەسەر کولتوور و دەسەلاتەوە دەبێ. کولتوور هەولی خۆ دەربازکردن لە مێژوو و جوگرافیا دەدا. پاشان ئەم کولتوورە بەهۆی نێتی گەیاندنی ئەلەکترۆنیەوە توانیوویەتی لەگەل خەلکدا ئینتگرێرەبکا (خۆیەککا). ئەمەش لەمیانەی هیپەرتێکستی ئودیۆڤێژوالێ دیگیتالیزەکراودا دێتەکایەوە. ئەوەشی پێیدەوترێ سیاسەت یان دەسەلات بەو سێستەمی گەیاندنە نوێیەوە بەستراوەتەوە کە خۆی دیگیتالیزەکردووە. ئەمە بەو واتایە دێ کە بمانەوێ بلێین کە دەسەلات لە نێتی ...یادا کۆدەبێتەوە. نەك هەر دەسەلات بەلکە خودی کات و مەوداش بەجۆرێ قووڵ و جدی بەدەوری مەودای شەپۆل و کاتی بێکات کۆدەبێتەوە یان لەمیانەی ئەوانەوە خۆی ڕێکدەخا. ئەوەی زۆر مەبەستە باسکردنی لێرەدا ئەوەیە کە پێکهاتەی کۆمەلایەتی فۆڕمی کات و شوێنی نوێ گەشە بە مێتانێت Metanet دەدا. بەلام نابێ ئەوە لەیادکەین کە کەلێنێ کۆمەلایەتی بێئەندازە لەنێوان ئەم مێتانێتە و چەندین ئیندڤید و چالاکی و ناوچەی جیاجیا لە جیهانا دا هەیە. واتە کارکردنی نێتۆرکە لەڕووی کۆمەلایەتیەوە لەگشت شوێنێ وەك یەك نیێ و کاریگەریەکانیشی لەشوێنێ بۆ شوێنێ تر گۆڕانیدێتەسەر.
ئەم نێتۆرکەش ئاماژەیە لەسەر ئەوەی کە ئێمە بەرەو کاتێ دەڕۆین کە کولتوور دەگەڕێندرێتەوە سەر سروشت نەك وەك چاخی لەمەوبەرمان کە سروشت لەهەولی دەستگرتن بووە بەسەر کولتووردا. ڕەنگە هەر ئەو لایەنەش وایکردبێ کە بزووتنەوەی ژینگە کار بۆئەوەبکا کە سروشت بکا بە فۆڕمێ لە بنەمایێ کولتووری. وێراری ئەوە ئێمە لە ئەمڕۆدا بەهۆی پێکەوە بەندبوونی پەرەسەندنی مێژوویی و گۆڕانی تەکنەلۆژی کەوتووینەتە ناو جۆرە کولتوورێ پووختەوە کە بەکاریگەریی کۆمەلایەتی و ڕێکخراوی کۆمەلایەتیەوە بەستراوەتەوە. بۆیە دەکرێ بەچاوێکی ئەوتۆوە تەماشای زانیاری بکرێ کە زانیاری لە کۆمەلگەی نوێماندا دەروازەیە بۆ ژیانی کۆمەلایەتی ڕۆژانەمان.

بەڵام ئەم جۆرە ژیانە مانای ئەوەنییە کە مێژوو کۆتای دێ. ئێمە لەناو بوونیادێ کۆمەلایەتی نوێداین کە ئەم بوونیادە نوێیە لەسەر بوونی کاتێ نوێ نیشانەیە، کە ئەمەش جەغتکردنە لەسەر دەستپێکردنەوەی مێژوو نەك کۆتای. واتە ئەم زانین و ڕێکخراوە کۆمەلایەتیەی تیای دەژین واماناێدەکا دانبەوەدابنێین کە لە جیهانێ کۆمەلایەتی هەلاوگۆڕاودا دەژین. ئەم جۆرە تیاژیانەی ئێمەش سەرەتایەکە بۆ بوونێ نوێ و چاخێ نوێ کە ئەوەش چاخی زانیارییە.

## پـێـشەکـی:

### بۆ گفتووگۆکردن؟

بۆ ئەوەی دەروازەیەك تایبەت بە کاستێلس بەردەست خوێنەری ئەم کتێبە بخەین کە بەخۆی دەروازەکە بۆ خوێندنەوەی بەرگی یەکەمی کتێبەکەی کاستێلسە (واتە گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك) بەپێویستمان زانیووە دەروازەکە برتیبێ لە گفتووگۆکردنێ ڕەخنەیی لەگەڵ کاستێلس و ئەم گفتووگۆیەش بۆ قسەکردن لەسەر ئەو توێژینەوەیە تەرخانکرێ کە کاستێلس لەو بەرگەدا سەبارەت بە چاخی زانیاری کاریتیاکردووە. لەبەرئەوەی کاستێلس لە تیۆریزەکردنەکانی بەسەر جیهانی نوێوە مێتۆدێ ئیمپیری بەکاربردووە و هەولیشیداوە ڕوخسارێ گلوبال بە ڕاڤەکردن و تێڕامانەکانی بدا و چاخێ بەناوی چاخی زانیاری قووتبکاتەوە و، کۆششیش بۆ ئەوەبکا کە ئەم چاخە بکا بە چاخێ گلوبال و دەستکەوتێ بۆ هەموان، لەهەر شوێنێکدابین، بۆیە ئەمە وای لە ئێمە کردووە وەك خوێنەری کاستێلس ئارەزووی ئەوەبکەین باس و لێکدانەوەکانی ئەم کۆمەڵناسە بەجۆرێ سەرپێی و هەڕەمەکی تەماشانەکەین و تەنانەت لەو بەگشتیکردن و داڕشتنانەش نەبوورین کە لە توێژینەوەکەدا پیادە کراوە. ئێمە لەوەش دلنیاین کە ئەم بەگشتیکردن و جۆرە فۆڕمولێرەکرنە تیۆرییە کارێ ئاسان نییە و دەرئەنجام و ئاکامی تایبەتی خۆی هەیە. هەروەها ئەوە تەنێ کاستێلس نییە ئەمەی کردووە و یان ڕۆژئاوا وەك مۆدێلێ نموونەیی و تایبەت دەزانێ و پێیوایە شوێن گۆڕان و سەرلەبەرگۆڕانکاریەکانە. بۆیە هەولدەدەین ئەو تایبەتێتییە بەرباسبخەین و لە چوارچێوەی بۆچوون و ڕوانینەکانی سەبارەت بە ئەمڕۆمان گەلێ تێگەیشتنی ناتەبا و ناکۆك هەلهێنجێنین. لە نامەیەکیش کە ئاڕاستەی کاستێلسمان کردووە ئەوەمان ڕوونکردۆتەوە کە دوای ئەوەی بەرگی یەکەمی کتێبەکەیمان لە سەروتارێکدا پووختکردۆتەوە هەولمانداوە هەندێ ڕوونکردنەوە و لێکدانەوەی ڕەخنەئامێز تایبەت بەم کارە کۆمەڵناسیە ئەکادیمییە نێودەولەتییە بەردەستی خوێنەری کورد بخەین. ئەمەش بۆ لەبەرچاوگرتنی ئەو دۆز و بارە جیاجیایانەی کۆمەلگە و ناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان تیای دەژین، کە بەشێ زۆر لەم کۆمەلگە و ناوچانە لەژێر کاریگەری ئەو گۆڕانکاریانەن کە زانین و زانیاری نوێ

دروستیکردوون و بەشێ تریش جارێ یەخسیری بەسەرهاتی مێژوویی و کولتووری خۆیانن و، نە بەرهەمهێنەری گۆڕانکاریەکانن و نەش لە گۆڕانکاریەکانی نێتۆرگ دەگەن. ئەمە تەنیا کێشەێ کۆمەلایەتی و کولتووریی نییە بەقەدئەوەی کە کێشەێ ئابووری و سیاسیە و دواتر ڕووداوێ مێژووی قوولیشە. بۆیە گفتووگۆکردن لەتەك کاستێلس بەهای خۆی هەیە و کاری گشت کۆمەلناس و ئابووریناسێکە. هەر بۆیشە دوای بەچاپگەیاندنی بەرگی یەکەم لە سالی 1996 لە گشت شوێنێکەوە دەستکراوە بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە و دواتریش سەرنج و ڕوانینێ زۆر لە هەموو بەشەکانی دونیاوە( ئەلبەتە لێرەدا مەبەست ئەو شوێنانەیە کە کتێبەکەی کاستێلسیان بە زمانی ئینگلیزی بەدەستگەیشت و یان دوای ئەوەی وەرگێڕدرا) بەنامەی ئاسایی و هەروەها بە نامەی ئەلەکترۆنی ئاراستەی کاستێلس کراوە. ئەمەش تەنیا بەختێ ڕوناکبیری نییە کە ئەم کۆمەلناسە بۆیهەلکەوت بەلکو قوولبوونەوەی بەرپرسیاریەتیشیەتی بەرامبەر بە دیاردە و ڕووداوەکانی جیهان و زیادکردنی بایەخیشیەتی بۆ داهێنانە نوێکان و ئاکامە کۆمەلایەتی و کولتووریەکانی ئەو داهێنانە نوێیانە. لەدوای ئەم ئەزموونی نووسینەشەوە (لێرەدا مەبەست لە توێژینەوەکانیەتی لە دووتۆی کتێبی چاخی زانیاری) گەیشت بە ئاکامی زۆرتر و پتریش خۆی بۆ خوریەکانی چاخی تازە تەرخانکرد(بۆ نموونە ئەو کتێبەی کە لەم دوایە نووسی لەبارەی ئینتەرنێت ). بەلام هەر جارێ گرفتاری تەکنەلۆژیای زانیاری نوێیە و دەخوازێ لەمیانەی گەشەی ئەم تەکنەلۆژیا نوێیەوە چارەسەر بۆ تەبایی و یەکسانی ئابووری و کۆمەلایەتی جیهان بدۆزێتەوە!

# پاڕادیگمی زانیاری
# گەشەی پەرت و پێکەوە ژیانی ناجۆر

ئەوی مانوێل کاستێلس لەمیانەی توێژینەوەکانی لەبارەی پاڕادیگمی زانیاری بەردەستی خوێنەرانی خۆی لە جیهانا دەخا گشت کەسێ ئەورووژێنێ و بەجۆرێ ئەوتۆش ڕوانینەکان داڕێژراون زۆربەی دیاردە نوێ، و تەنانەت کۆنەکانی شارستانی تازەشمان دەگرێتەوە و بەرپرسیارێ گەورەش دەخاتە ئەستۆی خوێنەرانی خۆی و کاریگەرێ زۆریش دەکاتە سەر تەماشاکردن و ڕاڤەکردنمان سەبارەت بە ناسنامەی سیاسی و کولتووری چاخی نوێمان. سێرکردنە تیۆرییە کۆمەڵناسیەکانی ئەم توێژەرەوەیە ئەوەندە خۆیان جیاواز دەردەخەن کە دەخوازن بناغەێ تر بۆ تێڕوانین و لێکدانەوەکانمان دانێن و، لەهەمان کاتدا ئارەزووی ئەوەشدەکەن نە هاوشێوە و تاك وێنە بیرکەینەوە و نەش کارێ وادەکەن ئەو گەشەکردنە کۆمەلایەتی و ئابووریەی لە ئەمڕۆدا شیاوکراوە تەنیا بەشتێ باش و پۆزەتیڤ لەقەلەمبدەین. بەلام لەبەرئەوەی دلێ زۆر بە تەکنیکی تازە دەبەستێ لە باشکردنی فۆرمی ژیانی ئابووری و دواتریش کۆمەلایەتی بۆیە ناکرێ بە هەموو جۆرێ پشت بە ڕاڤەکردنەکانی ببەسترێ. یان ئەوی ئەو باوەڕی پێیەتی تەنیا لە سنووری ڕۆژئاوا دەکرێ لە ئایندەدا بێتەدی و ئەمەش لەلایەك کارکردنێ سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی زۆرتری دەوێ، لەلایەکیتریش بەشە گەورەکەی جیهان لێیبێبەریدەبن. ئەزمونیش ئەوەی سەلماندووە کە هەموو بەرەو پێشەوە چوونێکی ئابووری و سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتی ڕۆژئاواش بەزیانی وڵاتانی دەرەوەی جوگرافیای ڕۆژئاوا دەکەوێتەوە و دواتر کەلێنی نێوان ئێرە و ئەوێ قوولتر و گومڕاتر دەکا. کاستێلس دەرگا لەسەر گەلێ باس وخواسدەکاتەوە بۆ دێیات و هەروەها بۆ جەغتکردن لەسەر ڕوونکردنەوەکان و بەهێزکردنی ئارگومێنتەکانیشی ڕوو لە توێژینەوەی گەلێ ناوچە و شوێنی جیاجیا لەنێو کیشوەرەکانی دونیادا دەنێ، بەلام هەندێ لایەن و ڕووداو و کێشە کە بە هەندێ جێ و کۆمەلگەوە تایبەتن بەرباسناخا و توێژینەوەی لەبارەوە ناکا.

ڕاسته ئەو جێ و کۆمەڵگانە ڕاستەوخۆ ناچنە ناو چاخی زانیاری و هەروەها
لە هێنانە دونیای پاڕادیگمی زانیاری بەشدارنین بەلام گیرۆدەی زۆر و
ڕاستەخۆی گۆڕانکاریەکانن و گرفتاری بێ سنووری دەستی دەسەلاتی سیاسی
و کولتووری چاخی زانیاری و زانینی نوێن. ئەو جیاوازیەش کە هەمیشە
کۆمەلناس و ئابووریناسان لەبارەی کۆمەلگە پێشکەوتوو و دواکەوتووەکانەوە
باسیانکردووە لەگەل داهاتنی پاڕادیگمی تەکنیکی تازە قوولتر و جۆراو جۆرتر
بووە. تەنانەت هەلاو گۆڕانەکان لە جیهانا هێندە پەلە و بێبەزەییانە
پەرمیانسەندووە توانیوویانە لە گشت شوێنی ناهاوتای و کەمووکوڕیی بچێنن.
ئەم ناجۆری و کەمووکوڕیانە گشت ئاست و لایەنەکانی ژیانی گرتۆتەوە و
چەندین ڕەهەندی جودا جودای خستۆتەوە. ئەمەش بەدلنیاییەوە گەشەی پەرت
و پێکەوە ژیانی ناجۆری خولقاندووە. ئەم گەشە پەرت و پێکەوە ژیانە
ناجۆرەش کە زۆر گلوبالی دەردەکەوی ناشی فەرامۆشکری و یان چارەسەری
لۆکالی و سەرپێی بۆ بدۆزرێتەوە. لەبەرئەوەش کە چاخی زانیاری خۆی وەك
چاخی گلوبال و گشتی دەردەخا دەبێ خستنەژێر پرسیاری چاخی ناوبراو و
گومانکردن لەم چاخە و، ڕاڤەکردن و توێژینەوەکان بۆ ئەم چاخە هەر لەو
ئاستەدابن. ئەو گۆڕانانەش کە لەئەمڕۆدا هاتوونەتە سەر بواری کۆمەلناسی
گەورەترین ئامێزیان بۆ ئەو گۆڕانکاریانە کردۆتەوە کە لەسەرەوە ئامازەی
پێکرا. بەلام دەبێ لەوێرا جوداوازی لەنێوان کارە کۆمەلناسی یەکانا بکرێ و
ئەو کۆمەلناسانەی پشتگیری لە زانیاریگەری دەکەن و داکۆکی لە ئابووری
جیهانگیری و دەسەلاتی تەکنیکی نوێی ڕۆژئاوا دەکەن لەو کۆمەلناسانە
جوداکرێنەوە کە لایەنە خراپەکانی بەدیگیتالبوونی ئابووری و هەروەها بوونی
زانیاری نوێ بەسەرچاوەیەك بۆ پەیداکردنی بازاڕ و دروستکردنی کەلێن و
دیوار لەنێوان کۆمەلگە و کولتوورە جوداکان نیشاندەدەن. وەلی لەسەردەستی
کاستێلسیش توێژینەوەی کۆمەلناسی ئاڕاستەی تر و شێوازی دی لە پشکنین و
ڕاڤەکردن لەخۆدەگرێ. ئەم ئاڕاستەیە تەنیا بریتی نییە لە پێشبینیی تایبەت بە
ئایندە و چارەنووسی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ و بەکاربردنی بەرهەمەکانی
پاڕادیگمی زانیاری بەلکو جۆرە گەشبینیەکیش لە ناواخنی ڕاڤەکردنەکانا
بەدیدەکرێ کە دەکرێ بەوە کورتکرێتەوە کە کاستێلس دەیەوێ ئەوەمان نیشاندا
کە ئێمە هەموو لەبەردەم ئینتەرنێت هەست بەبوونی خۆمان (وەك تاك و
هاولاتی و ئەمجار مرۆڤ) دەکەین.

بۆئەوەی دەروازەیەك لە گفتووگۆكانمان لەتەك كاستێلس دا بكەینەوە تایبەت بەم گەشە پەرت و پێكەوە ژیانە ناجۆرەی جیهان چاتر وایە لەوێوە وەسەرمتا بێین كە چۆن زانیاریگەریی لە جیهانا دەبێ بە پاڕادیگمێ نوێ و شێوازێ تازە لە بەرهەمهێنان و بردنەڕێوە و ڕێكخستن. بۆئەو مەبەستەش گرنگە جەغت لەوەبكەین كە سەدەی بیست چركەی چوونە ناو شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە. بەمە سێستەمی سەرمایەداری دەچێتە ناو قۆناغێ نوێوە و فۆڕمێ تازە لە پێشبڕكێی ئابووری دێتەكایەوە كە پتر لە جاران ژیان بەئابووریدەكرێ و ئەمەش دەبێتەهۆی گۆڕانی جەوهەری لە بوونیادی كۆمەلایەتی و وابەستەبوونی پەرەسەندنی ناسنامەی كولتووری بەم شێوازە تازەیەی بەرهەمهێنانەوە. لەگەل هاتنەكایەوەی ئەم چركەیە بەشێ لە دانیشتوانی سەر زەوی پێدەنێنە ناو ئێپۆكێ مێژوویی نوێ و خۆیان لە بەشە زۆرەكەی تری ناو مێژووە كۆنەكە یان ئەو بەشەی جارێ لە ناو شێوازێ بەرهەمهێنانی تر گیریخواردووە جیادەكەنەوە. ئەو بەشەی مێژووێ نوێ بۆ خۆیان دروستدەكەن ناسنامەی كوولتوریان فۆڕمی تر وەردەگرێ و بالاخوازی كولتووریش دەبێ بەیەكێ لە فۆڕمە دیارەكانی كولتووری ئەم مێژووە نوێیە.
ئەم مێژووە نوێیە كە لەگەل كۆتای مێژوو لەدایكدەبێ تەنێ بە چەند شوێن و ناوچەیەكەوە تایبەت دەبێ كە لە بواری بەرهەمهێنانی زانینێ دەگمەن و تایبەتدا پسپۆڕن. مێژووی نوێ بۆ ئەمان بریتیدەبێ لە شێوازێ تازە لە كاركردن و بەكاربردن و بەرهەمهێنان. هەموو ئەمانەش بەجۆرێ چەسپاو سێستەمی كۆمەلایەتی و سیاسی ئێپۆكی نوێ بەخۆیانەوە گرێدەدەن و بانگەشەكانی ئەم سێستەمە تازەیەش سنووری جوگرافی خۆی تێدەپەڕێنێ و، لەو شوێنانەش كە نە مێژووێ نوێ وەگەڕكەوتووە و نەش شێوازێ نوێ لە بەرهەمهێنان لە ئارادایە گومانی ناوێ گەر بووترێ ئەم سێستەمە كۆمەلایەتی و سیاسییە مانای خۆی تەنیا لەوەدا دەبینێتەوە كە ببێتە هۆی دروستكردنی پاشكۆیەتی و پەراوێزی. بەواتاێ تر ئەو ناوچانەی لە بوونیادنانی سێستەمی بەرهەمهێنان و بەكاربردنی خۆیان بەشدارنەبوونە ناتوانن كولتووری ماتریالی خۆیان كۆنترڕلبكەن و، هەروەها لەناوەوە و هەروەك لەدەرەوەی بوونیادی كۆمەلایەتی و سیاسی خۆیاشیان كاریگەرنابن و ڕۆژانەش هەموو مێژووی خۆشیان تێكەل بەمێژوویەك دەكەن كە دوا فۆڕمە لە مێژوو یان ئەو مێژوویە كە پاڕادیگمی تەكنیكی نوێ خولقاندوویەتی. ئەمە ئەوە دەگەێنێ بەشێ زۆر لە خەلك مێژوویێ دی و مێژووی شوێنێ تر هەلدەگرنەوە. هەلگرتنەوەی ئەم

مێژووەش یان بوونی گشت مێژووی مرۆڤایەتی بەیەك مێژوو ئاکامی سەیردەخاتەوە و ڕەنگدانەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری خۆی هەیە. چونکە مێژوویێ بەڕێوەدەبێ کە ئەویش تەکنیکی نوێ دەینووسێتەوە یان هەموو مێژوومان لە تەکنیك و زانیاری بریتیدەبێ.
سەرباری ئەوی ووترا، ئەم مێژووە لەناوەڕۆکدا بێ پێشڕکێ و پێکدادان ناژی و جەوهەری ئەم پاڕادیگمەش بەجۆرێ گەشەی کردووە هەمیشە لەتوانایدایە پەرە بەو ناتەباییە بدا کە بەرهەمی هێناوە. بەپێی ئەوەی کە هاتنەکایەوەی پاڕادیگمی زانیاری بەرهەمی ئەزموون و دەسەلاتێ دیاریکراو و سنووردارە جۆرە تەکنیك و زانینێکی بەرهەمهێناوە تەنێ ئەو کولتوورە کۆمەلایەتی و مێژوویانە لەتەکیا ڕێدەکەن کە گۆڕانکاریەکانیان فەراهەمکردووە. کاتێکیش تەماشای مێژووی سەرهەلدان و پەرەسەندنی زانینی تەکنیکی کلاسیك و پاڕادیگمی زانستی لەمەوبەر دەکەین دەبینین کە سەدەیەك لەمەوبەر ڕۆژئاوا جۆرە شێوازێکی لە بەرهەمهێنان و بردنەڕێوە خولقاندووە کە بوو بە بناغە بۆ ئەم پاڕادیگمە نوێیە و ئەو پرۆسێسەش تەواودەکا کە ڕۆژئاوا لە سەدەکانی پێشتر دەستیداوەتێ. ولاتانی ڕۆژئاواش بەشداریکردنەکانیان لە دروستکردنی ئەم ئەزموونانە وەك یەك نیە و هەر لەسەرەتاوە جیاوازی لەبارەیەوە لەئارادابووە و شوێنێك سەرەتا نێوەند بووە بۆ دروستکردنی داهێنانەکان و شوێنگەی دۆزینەوەکان و ئەوانیتریش تەواوکەری ئەم نێوەندە بوونە و ئەم لایەنەش کاریگەرێ زۆری بەسەر ستراتیژی فۆڕمی ڕێکخستنی سیاسی و کۆمەلایەتیانەوە هەبووە و بالادەستیێ زانستی و کولتووری و ئابووری بۆ مسۆگەرکردوون. زۆربەی ئەو باسانەش کە لەبارەی جیاوازی لە دەسەلات و زانین دەکرێ پێوەندی بەم خالەوە هەیە. چونکە پەرەسەندنی ڕیزپەڕانەی زانین لە ڕۆژئاوا لە پشت دروستبوونی ئەو فۆڕمە جوداوازەوە بووە لە دەسەلات کە دواتر ڕۆژئاوا پێی ناسراوە. کاتێ کە زانینی ڕۆژئاواش وایلێهاتووە ئەو جۆرە ئاڕاستەیە وەرگرێ کە لە دەرەوەی خواست و سەرووی پێداویستیەکانی ئەو چرکە کۆمەلایەتیە بێ، لەوە چووەتە دەرێ زانینێ مرۆی بێ و ئاڕاستەکانی ڕەهەندی ڕەوشتی وەرگرێ. ئەم زانینەش هەر لەدەرەوەی جوگرافیای خۆی قووربانیێ زۆری دروستنەکردووە و بەشداریشی لە خولقانی ناتەبایی و نایەکسانی نەکردووە بەلکو لە ناو مەرزی کارکردن و بردنەڕێوەی خۆشی هەمان شتی بەرهەمهێناوە. ئەمەش لەگەلێ ڕووەوە بۆ ئەو ئاستانە دەگەڕێتەوە کە زانینی ناوبراوی پێکهێناوە و هەروەها پێکهاتەی ئەو زانینانە

و تادەگاتە ئامانجی دۆزەرەوە و ڕەوتی کارکردنەکانیشیان. هەج قۆناغێکیش لە قۆناغەکانی گەشەی کۆمەلایەتی و ئابووری ڕۆژئاواش دەگری دەتوانی لەمبارەیەوە ئاماژە بە دەیاها نموونە بکەی کە هۆکاری سەرەکییوونە لە دروستکردنی ناجۆری کۆمەلایەتی و ئابووری. کەواتە گەشەی ڕۆژئاوا هەر لە سەرەتاوە لەسەر بناغەی ناجۆری و ناتەبایی دروستبووە و دۆزینەوە و داهێنانەکانیش بەشێوەێ نامرۆیی و ناڕەوشتی بەئەنجامگەێندراون و لەئاکامدا کەلێنێ زۆر کەوتۆتە نێوان نەك هەر شارستانیە جیاجیاکانەوە بەلکو لەناو خودی هەمان شارستانیەت و یان لەهەمان ئەو شوێنانەی بەمندالدانی داهێنانەکان ناسراون کەلێن بەرهەمهێنراوە و نادابەروەری کۆمەلایەتی و ناچووستی ئابووری بلاوبۆتەوە.
ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کە بەهۆی گفتووگۆکانمان لەتەك کاستێلس مەسەلەی گەشەی ڕۆژئاوا و جەمسەرگەریی ئەم گەشەیە بخەینە ژێرگومان و هەروەها نامانەوێ هەروا بەسادەیی لە ناوەڕۆکی گەشەی ڕۆژئاوا و هەلاوگۆڕانە بوونیادیەکان بگەین. ڕاستە کاستێلس بە ڕوناکبیرێ چەپگەڕاییانە و بوونیادێ ئەکادیمی ڕادیکالانەوە باس لە هەلاوگۆڕانەکانی چاخی ئەمڕۆمان دەکا بەلام لەگەلێ شوێن کاستێلس وەك توێژەرەوە و کۆمەلناسێ بەڕەچەلەك ڕۆژئاوای(خەلکی ئیسپانیایە) و دواتر ئەمەریکای باس لە بنەچەی کێشەکان دەکا و خوێندنەوەکانی بۆ هەندێ گرفت و ڕووداوی مێژوویی گومڕا و نادیارە. ڕەنگە خودی شێوەکارکردنەکەی و ئەمجار وابەستەبوونی بەمێتۆدێ دیاریکراو و دیاردەێ تایبەتەوە (بۆنموونە چاخی زانیاری) وایلێکردبێ بەری سێرکردنەکانی سنوورداربکا. وەلی ئەم لایەنە وا لە ئێمە ناکا ڕەهەندی تر بۆ دیتنەکانی کۆمەلناسی ناوبراو نەدۆزینەوە و ئاقاری ڕوونکردنەوەکانی بە ئاستی دی نەبەستینەوە. خۆشی زۆرجار دانبەوەدا دەنێ کە بەئەوروپابوونەکەی گرینگی خۆی لە بەئەنجامگەیاندنی ئەو توێژینەوە زەبەلاحە لەسەر چاخی زانیاری هەبووە و، تەنانەت کۆچکردنیشی لە هەفتاکان بە سەرمایەکی مارکسیستی بەرەو ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا لەلایەك و گیرسانەوەشی لە ناوچەی سیلیکۆن ڤالیSilicon Valley (ئەو شوێنەی کە پاڕادیگمی زانیاری لێدێتەدونیا) لەلایەکی دی مانای خۆیان لە ژیانی توێژینەکانی لەبارەی زانستی تەکنیکی نوێ دیووە. بۆیە هەموو ئەو لایەنانە و ئەمجار ئاڕاستەی گشتی لێکدانەوەکانی سەبارەت بە بارودۆخی گەشەی دیاردەی زانیارگەریی ئاساییە لەبەرچاوبگیرێ.

بۆ جەغت کردنیش لەوی لەسەرەوە باسمانکرد دەلێین تەکنیکی تازە شوێنی تری بۆ هاتنەدونیا و کارکردن دۆزییەوە و کاریگەریەکانیشی هەروەك تەکنیکی کۆن لە چوارچێوەی خۆیدا گیری نەخواردوو و ئاکامەکانیشی تەنێ لەئاستی زانستیدا نەمایەوە و بەلکو بوو بە پرۆسێس و کەوتنە ناو کۆمەلگەوە و هەر لە مرۆڤەوە تادەگاتە ئاژەل و ژینگەی گرتەوە و هەروەها بەبێ بایەخدان بە جیاوازی کولتووری و ئایدیۆلۆژی و ئیتنی و کۆمەلایەتی گشت ناوچە و جێیەکی لە جیهان گرتەوە. پاڕادیگمی تەکنیکی کۆن لە ئەورووپا و لەسەر بناغەی زانینێ کلاسیك هاتەکایەوە و گروندێ بتەویشی بۆ گەشەی ئابووری و سەربازی و کۆمەلایەتی دانا و درزێ زۆریشی خستە ناو کۆمەلگەکانەوە و بەرهەمهێنەر و بەکاربری، لەبواری داهێنانی زانین و زانست، هەر زوو لەیەکتر جیاکردەوە و چەند ناوچە و ولاتێکی کرد بە نێوەند و ئەوانیدیشی کرد بە پەراوێزی ئەم نێوەندانە و، هەروەها شوێنی ساغکردنەوەی بەرهەم و، یان ئەم ناوچە پەراوێزانەی دروستکرد تا بیکا بە مۆلگە بۆ وێنەدان بەخۆی و ڕەوایەتی دۆزینەوە بۆ دۆزینەوەکانی و بەهێژمانیکردنی ئەو پەرەسەندنانەی پێیگەیشتووە. کەواتە هەولی ڕۆژئاوا بۆ مانادان بە موغامەراتەکانی و بەردەوامبوون لەسەر دۆزینەوە زانستیەکانی فرێیدایە ناو پێشبرکێ و ململانێ لەتەك خۆی و دواتر لەتەك ئەوانی تر. ڕۆژئاوا لە سەدەکانی هەڤدە و هەژدە گەلێ هەنگاوی لەم جۆرە ناوە تا سەدەیێ تایبەت بەخۆی دروستکا و فۆڕمی جیا لە زانین بەرهەمبهێنێ کە دواتر ببێ بە خالی جیاکارەی شارستانی و هەروەها کۆمەلگە و مرۆڤەکان لەسەر بناغەی ئەمیان پێشکەوتوو و ئەویتریان دواکەوتوو دروستکا. ئەم جیاکردنەوانەش لەگەل هاتنی پاڕادیگمێ زانینی تر قوولتر و ئالۆزتر کرا و تا وایلێهات مرۆڤایەتی نەك لەسەر بناغەی پێست و ڕەگەز و یان ئاین لەیەکدی جیاکرایەوە بەلکو لەسەر بناغەی ئەمیان خولقێنەرەو و ئەویدیان بەکاربر لەیەکتر جیاکرایەوە، هەروەها کولتوور دەبێ بە هۆکاری بۆ جیاوازیخوازی و وەك ڤاکتەرێ ئەوتۆش تەماشادەکرێ کە لەتوانایدایە کەسێتی کەس و ناسنامەی کۆمەلگە دروستکا. پاڕادیگمی زانیاری نوێ کێشەکانی وشکترن و چارەسەرەکانیشی نادیار و خێراتریشن. نادیارن چونکە جەمسەری کێشەکان زۆر پەرتن و پەلەتریشن. لەبەرئەوەی ئەم پاڕادیگمەش ئامادەنییە ئەلتەرنەتیڤ قبوولکا و سلیش لە هەموو کۆششێ دەکاتەوە کاتێ لەدەرەوەی خۆی سەرهەلدەدا و و

بانگەشەی ئەوەش دەکا لەتوانایدایە مانا بۆ کێشەکانمان بدۆزێتەوە بۆیە ئەم پاراديگمە زۆرترین ڕاڤەکردن و شیکردنەوە دەخوازێ.
ئەمە بەو مانایەنایێ کە بخوازین بلێین شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی یان پاراديگمی تەکنیکی کلاسیك دەستی لە دروستکردنی نایەکسانی و دووبەرەکایەتی نەبووە. نەخێر. بەڵکو لە زۆر ڕووەوە پاراديگمی تەکنیکی نوێ میراتگری گەلێ ناکۆکی و ناتەبایی پاراديگمی لەمەوبەریەتی و بگرە شێوازی زانستی کلاسیك و زانینی تەکنیکی کۆن زۆر شیاوی تریشی خستۆتە بەردەست پاراديگمی نوێوە و گەلێ ئەرکیشی کەمکردۆتەوە. بۆنموونە پاراديگمی زانیاری نوێ لە ئەمڕۆدا ئەزموونێ گەورەی لە دروستکردن و بردنەڕێوەی بازاڕ و یان تێپەڕاندنی سنووری دەوڵەتی ناسیۆنال و بتەوکردنی بنەماکانی دەوڵەت و پێکەوەکارکردنی دەوڵەت و کارگە و تادەگاتە چۆنیەتی ڕەفتارکردن لەگەڵ کولتووری ئەویتر و چارەسەرکردنی گرفتە ئابووریەکان و ئەمجار دۆزینەوە یان سڕینەوەی ئایدیۆلۆژیاکان دا هەیە کە هەموو ئەوانەی لە ئەزموون و دەسەلاتەکانی لەمەوبەریەوە وەریگرتووە. بەلام ناشێ ئەوە لەیادکەین کە ئەم پاراديگمە زانیاریەی ئەمڕۆ دوا پاراديگمە کە ولاتانی ڕۆژئاوا پێیگەیشتوون و زۆربەی ئەزموون و دەسەلات و بەرهەمهێنانەکانی ڕۆژئاوای تیابەرجەستەبووە. ئەمەش شیاوی و توانایێ گەورە دەخاتە بەردەم ئەم ولاتانەوە کە هیچ فۆڕمێ تر لە پاراديگم و یان هیچ شێوەێ دی لە شێوازی بەرهەمهێنانی زانستی و زانین بە دروست نەزانن و تەنانەت بەکاریشینەبەن و، هەروەها بۆ ئەوان سەرنجراکێش و باوەڕپێکراونەبێ. گومانکردنی ئەم پاراديگمەش لە توانای زانینی و زانیاری ئەوانی تر تەنێ دیاردەێ زانستی نییە ، بگرە کولتووری و ئابووری و سیاسیشە. زۆرجاریش دەکرێ دەرك بەوەکرێ کە ئەو ئایدیۆلۆژیانەی لە ولاتانی دەرەوەی پاراديگمی زانیاری کاریان پێدەکرێ لەڕەچەلەکدا ڕۆژئاواین، یان ئەو مۆدێلە ئابووری و سیاسیانەی کە دەستیان لە دروستکردنی گۆڕاندا هەیە لە بناغەدا هەر دەگەڕێنەوە سەر هەمان ئەو سەرچاوانەی کە پاراديگمەکەی لێوەهەلقوولاوە. ئەمەش کاریگەری زۆر خراپی خستۆتەوە و ڕەنگە توند بوونەوەی دووبەرەکایەتی و پێکدادانەکانی ئەمدوایەی نێوان ولاتانی پاراديگمی زانیاری نوێ و ولاتانی بێ پاراديگم (گەر بشێ ئەم دەربڕینە بەکارببرێ)، کە 11/9 یەکێکن لەوانە، ئاماژەێ بێ لەسەر ئەو ناتەبابییەی لە تەماشاکردنەکانیان بۆ یەکتر بەدیدەکرێ. ئەم لایەنەش تادێ ڕەهەندی زۆر ناڕەوشتی و نامرۆیی تر

وەردەگرێ و یەکدی تیرۆرکردن تاکە چارەسەر دەبێ بۆ ڕوونکردنەوەی گرفتەکان و دۆزینەوەی ڕێگاچارە بۆ نایەکسانیەکان. پاڕادیگمی زانیاریش بەهۆی ئەوەی کە توانای بالای لە پاساودان و بەهانە هێناوە لەژێر ناوی مافی جیهانی و دادپەروەریێ گلوبال و پاراستنی بەها مرۆییەکان هەیە دەتوانێ دیاردەی تیرۆریزم بکا بە پیشەسازیێ بۆ پەیداکردنی بازاڕێ زۆر و دابەشکردنێ تازەی جیهان لەسەر نەك بناغەی ئایدیۆلۆژی یان ئابووری بەلکو لەسەر بناغەی تیرۆریست و ئەنتی-تیرۆریست. هەرچی کۆمەلگە یان شارستانیە بێ پاڕادیگمەکانە، یان ئەوانەی چاخێکیان تایبەت بەخۆیان بەرهەمنەهێناوە، تێکڕای بەدیەکانی جیهان لەوەدا دەبینینەوە کە ئەوی شارستانی یان ئێستای ئێمەی شێواندووە ئەوەیە کە هەموو لەلایەن ئابووری و زانست و کولتوورێکەوە قوورمیش دەکرێن کە دەستێکی مەسیحی-یەهوودی بەڕێوەیدەبا. ئەم کێشەیەش کە لەئەمڕۆدا لەنێوان پاڕادیگمی زانیاری نوێ و ئەوانی تائەمڕۆ نەیانتوانیوە پاڕادیگمێ دروستکەن تازە نییە و لە سەردەمێ کە شارستانیەکان لەژێرکاریگەری پاڕادیگمی زانستی کلاسیك بوونە هەرهەبووە و بەلام فۆڕمی پێکدادان و بەیەکاچوونەوەکان بەمجۆرەی ئێستا نەبووە. چونکە پێشتر نە پاڕادیگمەکان ئاوا بالا و گەشەکردوو بوونە و نەش ناتەبایی و، درزەکانی نێوان ئێرە و ئەوێ بەوجۆرە دراماتیکی و سەیر کەوتوونەتەوە. بەواتای تر لەگەل هاتنەکایەوەی ئەم پاڕادیگمە جۆرە پەرەسەندنێ ئەلەکترۆنی و گەیاندنێ زانیاری ئالۆز هاتەکایەوە و گشت بوارەکانی ژیانی ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووریشی گرتەوە و سنوورێ گەورە و دیوارێ دیگیتالی لەنێوان ئێرە و ئەوێ دروستکردووە و هەروەها ئەو پاڕادیگمە هەموو پەیوەندیەکی بە بەها مرۆیەکانەوە و هەروەها بە ئاین و پرنسیپە سەرەتایەکانی ئینسانی ڕاستەقینەوە بڕی و خۆی تەنێ سەرقالی دروستکردنی پارە کرد. دەرکەوتنی ئەم پاڕادیگمە نوێیەش کارێ ڕێکەوت نەبووە و بگرە هەموو شارستانی مرۆڤایەتیش بەرامبەر بە دیگیتالبوونی پیوەندیەکان و پێشکەوتنی ئەم پێوەندیانە بەجۆرێ ئەبستراکت و دابڕاو لە گشت بەهاێ مرۆیی بەرپرسیارە. زانینی زانستیش یان پاڕادیگمی نوێ لە شوێنێك(مەبەست ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە) و لە کاتێکدا (ماوەی سالانی هەفتاکان) سەریهەلدا کە گشت شێوازەکانی بەرهەمهێنان و بەکاربردن و بردنەڕێوەوە تابلێی پێویستیان بەم پاڕادیگمە هەبووە.

ئەم پاڕادیگمە نوێیە هەر لەگەڵ دەرکەوتنی هەولیدا خۆی زۆر جیاواز و تایبەت نیشانبدا و وەك پێداویستیِ کۆمەلایەتی و ئابووری خۆی بێنێتەپێشێ. ئەو قۆناغانەش کە شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و پاڕادیگمی کلاسیك بڕیبووی کارێ وایکرد کە پاڕادیگمی نوێ ئەرك و بەرپرسیاری دی بگرێتەبەر و بوار و شوێنی دی بۆ کارکردن و ڕێکخستن بگرێتەبەر. ئەوی لە قۆناغی سەرمایەداری کلاسیك لەڕووی سیاسی و ئابووریی و زانستی و تەنانەت کولتووریەوە ئەنجامدرابوو ڕێگایان لەبەردەم شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری کردەوە کە فۆڕمی تر بۆ ڕێکخستن و پیادەکردن لەسەر ئاستی لۆکال و هەروەها گلوبالیش بدۆزێتەوە. بۆنموونە ڕێگای سەربازی ئیدی بۆ دۆزینەوەی پەراوێز و یان بازاڕ بەکارنابرێ و، هەروەها ئەم شێوازە تازەیە لە بەرهەمهێنان ناخوازێ خۆی بخاتە ناو جەنگی درێژخایەن و، بەلکو پتر هەولدەدا بەجۆرێ کتوپڕ و خێرا کێشەکان چارەسەرکا و ڕێگاکانی بەرەوایی و بەرەوشتی بکا و یاخود کۆششدەکا مانای یاسای و ئینسانی بۆ فراوانخوازیەکانی بهێنێتەوە. بە یاسایکردن و بەزانستیکردنی پاساودان و بەهانەکانیش ئەو زانینە نوێیەیە کە پاڕادیگمی تازە لەتەك خۆیدا دەیهێنێ. ئەمەش کارێ ئیندڤیدوال نیە و بەلکە زۆر کۆلێکتیڤە. واتە ئەوە بەسەرچوو کە ولاتێ یان کۆمپانیایەك بێت و بەئارەزووی خۆی بیەوێ ئامانجێ سەربازی یان ئابووری ئەنجامدا و دواتر کێشەێ بەرچاوی بخولقێنێ. نەخێر ئەزموونی دەسەلات و ئیدارە بەجۆرێ گۆڕاوە کە کەم دیاردە و ڕووداو هەن بتوانن سەرووی ئەو یاسا و ڕێسا جیهانیانە بن کە خودی پاڕادیگمی زانیاری لە پشت دروستکردنیانەوەن. پاشان شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری جۆرە دەستوورێ لەگەل خۆیدا دەخاتە بەکاربردن کە لەسەر بناغەی شێوازی پێکەوەکارکردن و پێکەوە بەکاربردن دەوەستێ. بەلام ئەم شێوازە کۆلێکتیڤە مافی بەرهەمهێنان و سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە یان وەبەرهێنان هەر بۆ خۆی دەپارێزێ و تەنانەت مافی بردنەڕێوەش کە هەر دەچێتەخانەی بەرهەمهێنانەوە بەخۆی تایبەت دەکا. بەواتاێ تر مافی بردنەڕێووە تەنێ بەوەوە تایبەت دەبێ کە بەرهەمهێنەر و دۆزەرەوەیە (بەقەولی ئەمەریکایەکان مرۆڤی خولقێنەر. چونکە ئەمەریکایەکان وایان باوەکردووە کە ئەمەریکا نیشتیمانی ئەو کەسەیە کە خولقێنەرە ). واتە هەموو لە بەکاربردن و کڕین یەکسانین بەلام ئەوەی پێوەندی بە بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەوە هەبێ مافی دەستە بژێرێکە یان چەند ولاتێکە هەروەها هەندێ کارگەشە. بەرهەمهێنانیش ئەوەندە ئالۆز و تایبەت

بووه و هەروەها بردنەڕێومش ئەوەندە بەرپرسیاریەتی تێکەوتووه کە کەم کەس و شوێن ئەتوانن خۆیانی لێبدەن یان بکارن بێنە ناو بازاڕی بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەوە.
پاڕادیگمی زانینی زانستی نوێ فرێماندەداتە ناو بوونیادێ کۆمەلایەتی و سیاسی و ئابووریەوە کە ئارەزووی هاوشێوەکردنی گشت بونیادەکانی تر دەکا و، جۆرە ئیتیکێ کۆمەلایەتی و کولتوورێ سیاسی بەگشتیدەکا کە نابێ بە جێی ڕەزامەندی هەموو شێوازەکانی تری بەرهەمهێنان و ئەزموونەکانی دی دەسەلات. دابڕانی بەشێ زۆر لەم پاڕادیگمە و دروستبوونی دوورکەوتنەوەێ گەورەی مێژووی لەنێوان شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری و غەیرە زانیاری ناحەزی و دووبەرەکایەتیێ زۆر دێنێتەکایەوە و گەشەێ پەرت و پەرەسەندێ تاك ڕەهەند بەرهەمدێنێ. بۆئەوەی کە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاریش بتوانێ بەئاکامەکانی خۆی بگا ئەوەی ئارەزووی لێبووه و یان لەتوانایدا بووه بە بێ گوێدانە بەهاکان دۆزیوویەتەوە و دروستکردووه کە ئەمەش ڕێگاێ زۆری لەبەردەم بەرهەمهێنان و دروستکردندا کردۆتەوە. بۆ نموونە ئەوی گەیاندنی تەلەفۆنی و یان ئەو دەستکەوتانەی خودی سێستەمی گەیاندن لە ئەمڕۆدا پێگەیشتووه زۆرجیاوازە لە ڕووی هەم زانستی و هەم مەبەستی ئابوورییەوە لەوی شێوازی بەرهەمهێنانی پێشوو پێگەیووه. پاڕادیگمی نوێ کە ڕەوتی تەکنیکی گەیاندنی کلاسیك تێدەپەڕێنێ نایەوێ تەنێ بەو جۆرە فۆڕمە لە گەیاندن قایل بێ کە تەلەگراف و تەلەفۆن لەمەوبەر ئەنجامیدەدا. ئالۆزبوونی سیستەمی گەیاندن و دیگیتالیزەکردنی ئەم گەیاندنە، ئەمەش کە بەخۆی بەهۆی بەئەلەکترۆنیکردنی خودی گەیاندنەوە هاتۆتەکایەوە، مەبەستی سیاسی و بازرگانی لە پشتەوە بووه و ڕێگایەکیش بووه بۆ دروستکردنی قەڕالستانێ ئابووری و دەسەلاتێ بالای تاك جەمسەر. هەروەها بەهانە هێنانەوەی ڕەوشتی و سیاسی بۆ دروستکردنی گەشەێ تەکنیکی ئەلەکترۆنی ڕۆلێ زۆری لە بلاوکردنەوەی پەیامی پاڕادیگمی نوێ دی. چونکە پاڕادیگمی زانیاری تازە بەسەر گەلێ لەو کێشانە بازدەدا کە بە مەسەلە ڕەوشتیەکانەوە تایبەتن و هەروەها ئاینیەکانیش(بۆ نموونە گۆڕینی ژیندەر و دەستکارکردنی ئەندامی لەش و کۆپیکردنی ئاژەل). بەواتێ دی، پاڕادیگمی ئەمڕۆ توانیوویەتی گەلێ لە دیاردەکانی سەردەمی خۆی بەزانستی- مرۆیی بکا و بەجۆرێ ئەوتۆ دێیات لەبارمیەوە بهێنێتە پێشێ کە لەگەل ئەو ڕەوشتە هاوکۆك بێ کە زانیاریگەری بلاویدەکاتەوە و باوەڕییێیەتی. هەر لەمڕووەشەوە دەکرێ باس لەو موغامەرا

تانە بکرێ کە تەکنیکی تازە لە بواری فزیۆلۆژیا (کارئەندامزانی) و پزیشکیدا کردوویەتی و هەروەها ئەو گۆڕانە تەکنیکیە پەلەیەی هاتۆتە سەر بایۆ-کیمیا و یان بەگشتی زیندەوەرناسی. هەنگاوەکان لەم بوارەدا زۆر چاوەڕێنەکراوانە پەرەیانسەندووە و ئەمەش بۆ ئەو کۆمەلگە و کولتوورانەی خۆیان لەدەرەوەی ئەم پاڕادیگمە زانیاریە نوێیە دەبینن بوونەتە مایەی سلکردنەوە و بەدگومانی لە ڕەوتی گەشەی ڕۆژئاوا و ئەو چاخە تازەیەی خۆیانی تیادەبیننەوە. چونکە ئەو کۆمەلگانەی بەرهەمهێنەری ڕاستەقینەی ئەم چاخە زانیاریە نوێیە نین هەمیشە خۆیان بەمەسەلە ڕەوشتی و بەها مرۆیەکانەوە گرێدەدەن و مەسەلەی دۆزینەوە و داهێنانەکانیش هەر لە چوارچێوەی ئەم مەسەلەیەدا دەبینن و پێیان وایە تازەگەریەکان نابێ دەستکاری شتە پیرۆز و ئەبەدیەکان بکا. بەخۆی ڕۆژئاواش دەمێك نیە کەوتۆتە ناو ئەم پاڕادیگمەوەوە و گۆڕانکاریەکانی بەم بوونیادە کۆمەلایەتی و ئابووریەوە بەستراوەتەوە. بەلام ڕابردووی کۆمەلایەتی و کولتووری کۆمەلگەکانی ڕۆژئاوا بەجۆرێ گەشەی کردووە کە توانیوویەتی زووتر لەگەل پرۆسێسی دۆزینەوە و داهێنانە نوێکان بگونجێ. ڕەنگە لەگەلێ ڕووشەوە ئەم خۆ گونجانە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە زانست و زانین بە ئەزموونێ ئەوتۆ تێپەڕیووە کە توانیوویەتی دەسەلاتێ تایبەت بەخۆی دروستکا و ئەمەش یارمەتی بدا کە بناغەیێ ڕەها بۆ پشکنین و توێژینەوەکانی دابینبکا. هەر بۆنموونە پەنجا سال لەمەوبەر نە بەمجۆرەی ئەمڕۆ دۆزینەوە زانستیەکان و تاقیکردنەوە تەکنیکیەکان ئەو بناغە ڕاستیەیان لەناو خەلك دروستکردبوو نەش ئەوەی پێیدەوترێ مافی گلوبال و هاریکاری نێودەولەتی ئەو نرخەی هەبووە. کاتێ دەشگەڕێینەوە دواوە دەبینین ئەوەی مافی نەبووە مرۆڤ بووە یان ئیندڤید بووە. بۆنموونە جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانیی چەندی لەناونەبرد و هەروەها شەڕە ناوخۆکان و دووبەراکایەتیە ئیتنی و ئاینی و ناوچەییکان چ مالوێرانی و نابوودیێکیان وەدوی خۆ نەهێنا. بلاوبوونەوەی پەتا سامناك (سیل، ڕشانەوە، دیزانتری و. . . .) و نەخۆشیە زگماککان چییان بەسەر مرۆڤ لەهەموو شوێنێ نەهێنا. یان نەزۆکی نێر یان مێ هەروەها نەتوانینی لەباربردنی منال چ کێشیەکی کۆمەلایەتی و دەروونی دروستنەکرد. بەلام توێژینەوە سیاسی و کۆمەلایەتی و ئەمجار زانستیەکانیش دواتر بەجۆرێ تێکۆشان کە توانیان مانای ڕەوشتی و بەهای مرۆیی بۆ گشت دیاردەکان (هۆمۆسێکسوێلیتێ و یان مافی ئەمان لە منال هەلگرتنەوە یان مافی ئافرەتان لە لەباربردنی منال و. . .) یان گشت

گەشە و دواتر گۆڕانەکان بدۆزنەوە ئەمانە هەموو پێکەوە و بۆ یەك مەبەست کاریان کردوو و توانیان پێکەوە گەشە بکەن بەلام حەیفێ کە لەدواین باردا گەشەێ ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووری ناهاوشێوە و پەرت یاخود گەشەێ تایبەت و هەروەها گەشەێ ناتەبا هاتەدونیا. ئەوەتا لەبڕی ئەوەی جەنگ مرۆڤەکان لێرە و لەوێ لەناوبەرێ وا ئەمڕۆ خەلکێ زۆر بەهۆی دووچاری نەخۆشی ئایدزەوە سەردەنێتەوە و یان بەهۆی هەژارێ بەردەوام و بێدەرامەتیێ ڕۆژانە لە کەمخۆراکی و برسیەتیێ ئەبەدیدا دەژین و ئەمەش کارێ وادەکا مەرگ شتێکی زۆر نزدیك بێ لە ژیانیانەوە. هەروەها بلاوبوونەوەی نەخوێندەواری لەگەلێ شوێن لە جیهانا ئەو خوێندەواریە بالایە بێبەهادەکا کە پاڕادیگمی نوێ داوایدەکا. ئەمە و بەشێ زۆر لە دانیشتوانی سەرزەوی لەژێر زەبری کارکردنی دوو سێ جۆر لە پاڕادیگمن یان شێوازی بەرهەمهێنانن. ئەوەتا تائێستاش لە گەلێ ناوچە لە چاخی زانیاریدا شێوازی بەرهەمهێنانی دەرەبەگایەتی و کشتووکالی و ووردە پیشەسازی و هەروەها زانیاری بەیەکەوە کاردەکەن و ئەمانەش پێکەوە ناسنامەێ تێکەل و هەلبژێرمیان بە کەس و کولتوورەکان داوە و ناجۆری و ناهاوشێوەی خستۆتە شێوازی ژیانیانەوە. یان ئەمڕۆ لە گەلێ لە کۆمەلگەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوا خەلکی لەلایەك مۆدێرن و لە چەندین لایترەوە نامۆدێرن و، هەروەها هەلگرێ چەندین جۆرە خوورەوشتی تێکەل و پەرتیشن. ئەوەتا خەلکی ولاتانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی، ئەوانەی لەناوجەرگەی ولاتانی ڕۆژئاوا دەژین نارۆژئاوایەتیەکیان، لە ناو مال و شوێنی کار و ژیانیان دروستکردووە و بەهەمووجۆرێ خۆیان لە دەستکەوتەکانی پاڕادیگمی زانیاری بەدووردەگرن و تاپێشیاندەکرێ لەو حالەتەدا بەکاریدەبەن یان دەیکەن بە بەشێ لە ژیانی کۆمەلایەتی و کولتووریان کە بەرژەوەندی سیاسی و کولتووری و ئابووریان لەگەلیا بگونجێ. ئەوەتا لاوێکی موسلمانی پڕ لە باوەڕ و دەرچووێکی بەشی کیمیا کە لە ژیانیا دلۆپێ بیرەی نەخواردوەتەوە زۆر ئاساییە بەلایەوە لە تاقیگەێکی بیرەدروستکردن کاربکا یان ئەو باوکانەی کە موسلمانی سیاسین منالەکانیان ڕۆژانە دەستکەوتەکانی پاڕادیگمی تەکنیکی نوێ بەکاردەبەن و بووشنە بە باشترین بەکاربری بەرهەمەکانی ئەم پاڕادیگمە کەچی خۆیان ئەم پاڕادیگمە بە پاڕادیگمی کووفر لەقەلەم دەدەن. بەکورتی پاڕادیگمی زانیاری تازە دۆزێ هاوبەشی ئەوتۆی لە بەکاربردن و یان برایەتیێ وای لە کڕین

دروستکردووه که زۆر ئەستەمە کولتووره دژەکان بتوانن خۆیان لەم پاڕادیگمە بەدووربگرن.
کاتێکیش کاستێلس سەرهەڵدانی تەکنەلۆژیای زانیاری بۆ سالانی 1970 کان و بۆ شوێنێ وەك ئەمەریکا و بەتایبەت ناوچەی سیلیکۆن ڤالی دەگەڕێنێتەوە دەبێ لەوە بەئاگابین که سەرهەڵدانی ئەم تەکنەلۆژیایە ناوەڕۆکێ سیاسی و پراگماتی هەبووه و هەروەها به ناوچەیەك له جیهان تایبەتکراوه که پێشتر له بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەی سیاسی خاوەنی ئەزموونێکی دەسەلات و شێوازێ دیاریکراو بووه. کەس ناتوانێ نکولی لەوەبکا که ئەوکاته لەهەموو ڕوێکەوه ئەمەریکا پێویستی بەو جۆره پاڕادیگمە نوێیه نەبووه و هەر ئەم تەکنەلۆژیای زانیاریەش نەبووه که دواتر دۆزێ ئەوتۆی بۆ ئەمەریکا دروستکردووه که ببێ به حاکمی کولتووری و سیاسی جیهانی نوێ. ئەمەش بەزۆری لەبەرئەوەی ئەو پاڕادیگمە زانیارییه ئابووریێ نوێشی دروستکرد و ئەمەش بوو به بناغه بۆ ئەو جیهانگیریەی که بوو به گەورەترین وتاری سەردەم و هەروەها دیاردەیەکی ئەمەریکیش. واته هەنگاوەکان بۆ دروستکردنی سێستەمێ تەکنیکی نوێ زۆرتر ئەمەریکی بووه و سەرەتاش هۆکاری سیاسی و دواتر ئابووری لەپشتیەوه بووه. بەلام پاشان ئەم سێستەمه له زۆربەی ولاتانی ڕۆژئاوا پیادەکراوه و بۆ گۆڕینی سیتستەمی گەیاندن و بەرهەمهێنان و ئیداره کەلکێ زۆری لێوەرگیراوه و ئەم لایەنەش لەپال گۆڕانه ئابووری و کۆمەلایەتیەکانەوه بووه و بووەته خالی جیکارەش لەنێوان ئەو کۆمەلگانەی بەرهەمهێنەری ئەم پاڕادیگمە نوێیەن و ئەوانەی بەرهەمهێنەر نین و، هەروەها ئەم پاڕادیگمە کارێ واشیکردووه دەستکەوتەکانی ئەم پاڕادیگمە تەنێ لەسنووری کۆمەلایەتی و کولتووری ئەو ولاتانه بەبێسلکردنەوه کاریپێبکرێ که دالدەی بەرهەمهێنانی بووه. بەلام بەپێی ئەوەی که جەوهەری ئەم پاڕادیگمە زۆر گلوباله، و له بناغەشدا هەر لەسەر ئەو بناغەیه دروستبووه و یان بۆ ئەو مەبەسته پەیدابووه که گلوبال بێ، نەکرا له سنووری ولاتێ دیاریکراو قەتیسکرێ و بۆیه گەشەی ئەم پاڕادیگمە گەلێ له ئابووریەکانی دەرەوەی ناوەندی ڕۆژئاوای گرتەوه (چین، باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، بەرازیل و. . .) و هەرێم و ناوچەی جۆراوجۆریش له جیهانی نوێدا دروستبوو(هۆنکۆنگ، تایلاند، و. . .) که کەوتنەبەکاربردنی ئەم پاڕادیگمە تازەیه و گۆڕانخستنه شێوەی کارکردن له کارگه و گۆڕینی توانای بەرهەمهێنان. بەلام ئەو گۆڕانه کۆمەلایەتی و ئابووریانەی لەژێر زەبری زانینی تەکنیکی نوێ هاتەکایەوه گۆڕانهایەکی زۆر

خێرا و ناتەبا بوون و لەناو سنووری هەمان ناوچە و هەرێم و یان ولاتدا ناکۆك و ناجۆربوونە و ئاکامی جۆراوجۆریشیانخستەوە. بەبێگومانیشەوە دەکرێ ئەوە باسکرێ کە گلوبالیتێی ئەم پاڕادیگمە بارێ واشی ڕەخساند کە ئەم پاڕادیگمە بگاتە ئەو بوونیادە ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووریانەش کە لەئاستی ئەم پاڕادیگمە نین (سودان، ئێران، کوردستان، مەنگولستان و. . .) و لەوێش کاریگەری تر بخاتەوە و ئاکامی دی بەدەستبهێنێ. ئێمە هەر لەژێرسایەی ئەم بۆچوونە ئەوەش دەخەینە بەرباس کە شانبەشانی هاتنەدونیای پاڕادیگمی تەکنیکی نوێ ئابووری نوێش کەوتەکار و جەوهەری ئەم ئابووریەش ئەوەبووە کە لەلایەك لەسەربناغەی زانیاری دامەزراوە و لەلایەکیدیش گلوبالە. بەلام دەشێ لێرەدا ئەوەش بووترێ کە گەشەی ئابووریێ گلوبال بەمانای گەشەی کۆمەلگەیەکی گلوبال نایێ(2). چونکە ئابووری گلوبال بەس نییە بۆئەوەی بکەوینە ناو کۆمەلگەیەکی گلوبالەوە. بەواتایێ تر، دروستبوونی کۆمەلگەی گلوبال کارێ زۆرتری دەوێکە تەنیا بە دروستبوونی ئابووریێ گلوبال نایەتەدی.
نەك هەر ئەم پاڕادیگمە بەلکو خودی ئەو سیستەمە سیاسی و ئابووریەش کە ئەم پاڕادیگمەی بەرهەمهێنا پێویستی بەم ئابووریە گلوبال و زانیاریاویە هەیە. لەبەر ئەوەی کە سێستەمی سەرمایەداریش بووە بە سێستەمێ گلوبال و لەوەچووەتەدەرێ کار و جوولەی ئەم سێستەمە لە ولاتێ یان ناوچەێ دیاریکراو سنووردارکرێ پێویستیێ زۆری بە ئابووریێ ئاوا (واتە هەم گلوبال و هەم زانیاریاوی) هەیە و ئەو خاسلەتانەش کە ئەم ئابووریە ئەیهێنێتە ناو سێستەمی ئابووری سەرمایەداری گلوبالەوە لەگەل گەشەکانی ئەم سێستەمە و ئەو ئاڕاستانەی ئەم ئابووریە وەریگرتووە هاوکۆکە. هەروەها پاڕادیگمی زانیاری نوێ کارێ وادەکا ئابووری جیهان وەك خۆی نەمێنێتەوە و چالاکیەکانی زۆر ڕەهەندی جۆراوجۆر وەرگرێ و گرفتەکانیشی زۆر قوول و کاریگەربێ. ئەو ئابووریانەی ئەم پاڕادیگمە کاری تیادەکا وەك یەك نین و پرۆسێسی گەشە و کارکردنیان هاوشێوە نیە. بەلام زۆربەیان ئەو توانایەیان تیابەدیدەکرێ کە بکارن خۆیان فرێدەنە ناو سێستەمی ئابووری سەرمایەداری گلوبالەوە و ئەو گۆڕانکاریانە لە سێستەمی کارکردن و ڕێکخستنی خۆیان بکەن تا بەردەوامی بە چالاکیەکانیان بدەن. ئەم ئابووریە کاتێ پشت بە زانیاری دەبەستێ دەیەوێ بەمە نەك هەر خۆی لە ئابووری کلاسیك جیاکاتەوە بەلکو هەولدەدا بەتواناێترەوە بێتە بواری کارکردن و خۆشی بۆ پێشبڕکێیێ مەزن و

درێژخایەنتر ئامادەکا. سیستەمی ئابووری سەرمایەداریش کاتێ کە بە زانیاریگەریی پشتدەبەستێ ناتوانێ لە چوارچێوەی دەولەتێ دیاریکراو کاربکا و هەروەها زیادکردنی بەرهەمهێنان و دواتر دۆزینەوەی بازاڕ دەبێ بە ئامانجی سەرەکیی. بۆیە دەکرێ بووترێ کە پاڕادیگمی زانیاری بۆ سیستەمی ئابووری گلوبال پێداویستیێ گەورەیە و کۆششێکیشە بۆ بەجیهانیکردنی ئابووری سەرمایەداری و بەگشتیکردنی ڕۆحی ئابووریگەریی. کاتێ کە تەکنیکی نوێش دێتە ناو ئابوورییەوە شێوازێ تر لە بەرهەمهێنان بلاودەکاتەوە و فۆڕمی کۆمەلایەتی نوێش لەگەل خۆی دێنێ. دواتر ئەم فۆڕمە لە ولاتانی زانینی تەکنیکی نوێ زۆرتر جێگای خۆی دەکاتەوە وەك لەو ولاتانەی لە بەرهەمهێنانی ئەم زانینە تەکنیکیە نوێیە بەشدارە.

سەرباری ئەوی لەسەرەوە باسمانکرد ئەوەش دەلێین، پاڕادیگمی نوێ گەشەی ئابووری زیاددەکا و شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری دەکا بە مۆدێلێ پەسەندکراو و زۆربەی ئەو ئابووریانەش کە لە قۆناغێ دیاریکراو لە دەرەوەی سیستەمی ئابووری جیهانی بوونە هەولی هاتنە ناوەوە بۆ ناو ئەم سیستەمە دەدەن و لەناو خۆشیاندا چەندین ناوچە و هەرێمی جۆراوجۆر دروستدەکەن. بەبێگومانیشەوە دەشێ بووترێ کە هۆیەکەی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پەیوەندییە ئابووری و زانیاریەکان بەجۆرێ دروستبوونە کە لەسەر ئاستی نەك تەنیا گلوبال بگرە لۆکالیش کاریگەریی خۆیان بەجۆرێ پەرت و ناجۆر هەیە و ئەمەش تاڕادەیەکی زۆر پێویستیەکە بۆ بەردەوامبوونی ئەو ئابووریە تازەیەی بەهۆی پاڕادیگمی زانیاری نوێوە دێتەدونیا و داواشمان لێدەکا کە بۆ ئەوەی مانا بە بوونی کۆمەلایەتیمان بدەین دەبێ مانەوەمان لەناو بازاڕی گلوبالدا بپارێزین. لەڕووەشەوە دەکرێ نموونە لەسەر هەندێ لە ولاتانی ئەمەریکای لاتین (بەڕازیل، ئەرجەنتین، شیللی) بهێنرێتەوە و شوێنی ئەم ئابووریانە لەناو ولاتانی خۆیان و لەناو ئابووری ناوچەکە (واتە کیشوەری ئەمەریکای لاتین) و هەروەها لە ناو ئابووری گلوبالدا دیارکرێ.

جوولەی ئەم ئابووریە زانیاریە گلوبالە نائاساییە و لە گشت ئەو شوێنانەش کە گەشەی خۆولقاندووە جیاوازیێ زۆری خستۆتە نێوان ژیانی خەلکەوە و، ئەو گرفتانەش کە لەمەوبەر بەبێ چارەسەر ماونەتەوە زۆر نەمری کردوون و داهاتێ زۆیشی خستۆتە بەردەست دەستەبژێرێ(تاقم) و هەروەها چەند کارگە و ناوچەیەکیشی زیاد لەپێویست ناودارکردووە. بۆنموونە تەکنیکی تازە کارێوایکردووە کارگەکانی مۆبیل تەلەفۆن و بەرهەمهێنانی کۆمپیوتەر و

ئامرازەکانی لە جیهانا لەچاو کارگەکانی بەرهەمهێنانی خواردن یان جلوبەرگ زۆر ناسراوترین و، هەروەها پێوەندی ئەم تاقم و کارگانەش بە دەسەلاتی سیاسیەوە جۆرە سیاسەتێ ئابووری دروستکردووە کە تەنیا بەدووی دروستکردنی پارە، پارەێ زۆر و بەماوەێ کەم، دەگەڕێن. سیاسیش، بەتایبەت سیاسی موحتەرف، پتر لە بازرگانێ بەرژەوەندی بە بازارەوە بەستراوەتەوە و وابەستەیی ئەمیش بە کارگەکانەوە هەر لەسەر ئەو سیاسەتە ئابووریە نوێیە بەیەکەوە گرێدراوە کە سیاسی و بازرگانی هاوبەرژەوەندی کردووە. ئەم دیاردەیەش (واتە پێکەوە کارکردنی سیاسی و بازرگان و تێکەڵبوونی بەرژەوەندیەکانیان) یەکێکە لەو کولتووورە هەڵانەی ئابووری گلوبال بەدیاری بۆی هاوردووین. بەدلنیایشەوە ئەم مەسەلەیە لەو شوێنانەی دانیشتوانەکانی تەنێ بەکاربرێکی شمەکەکانی بازاڕی گلوبالن ( بۆ نموونە کوردستان ) زۆر ناشرینتر کەوتۆتەوە وەك لەشوێنێتر و، سیاسی هەمیشە پشتگیری لە بازرگان دەکا و بازرگانیش بە ڕەچەڵەك سیاسییێکی خانەنشینکراوە. ئەوانەی لە بەشێ زۆر لەو ناوچە و هەرێما نەی لە پەراوێزی بازاڕی ئابووری زانیاریی و گلوبالن (دەکرێ لێرەدا کوردستان وەك نموونە لەبەرچاوبگرین) دەبینین بەشێ زۆر لە سیاسیەکانی دوای ئەوەی واز لە سیاسەت دێنن (یان لە سیاسەت دوردەخرێنەوە) دەستدەدەنە کاری بازرگانی و پشتگیریش لە جۆرە بازرگانیێ دەکەن کە تیایا تەنێ مەبەست دروستکردنی پاریە و ئەلبەتە دروستکردنی ئەم پارەیەش لەماوەێ زۆرکەمدا. سیاسیەکانیش لەبەرئەوەی خاوەنی ئەو ئابوورییە زانیاریاویەی ئەمڕۆ نین بۆیە هەنگاوەکانیان پتر سیاسی دەبێ وەك لەوەی ئابووری بێ و دواتریش بۆ ئەمان بازرگانی یان بەواتایەکی تر مانای ئابووری تەنیا لە کڕین و فرۆشتنێ کلاسیك پێکدێ. زۆربەی ئەو کۆمپانیایانەش کە دروستدەبن بەزۆری بە بڕیاری سیاسی دروستدەبن و شمەکەکانیان نە مواسەفاتی جیهانی تێدایە و نەش لەناوچەکە ناسراون جا چ خوازە لەسەر ئاستی جیهان. لەهەمووی سەیرتر بەڕێوەبەری ئەم کۆمپانیایانەش هیچ ڕوناکبیریێ ئابووریی سەردەمیان نییە و شارەزایێ ئەوتۆشیان لەو شێوازی بەرهەمهێنان و فۆڕمی ڕێکخستنەی لە کۆمپانیاکانیاندا وەگەڕکەوتووە، نییە. بۆنموونە سیاسیێ دوورخراو لەکاری سیاسی یان خانەنشینکراو لە شوێنێ وەك کوردستان کە دەستدەداتە کاری بازرگانی و بەتایبەت کڕین و فرۆشتنی کۆمپیوتەر یان هاوردنی مۆبیلی تەلەفۆن و ئامرازی تری ئەلەکترۆنی نە ئەو ئاگاییەی لەسەر خێرای

بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە کالایانە هەیە و نەش ئاگایێ تەواوی لە جوولەی بازاڕی مالی گلۆبال هەیە. دواتر هێندەی بازرگانیکردن لەم جۆرە شوێنانە بۆ ئەم جۆرە کەسانە ئاسانە هیچ شتێتر ئاوا بۆیان شاسا نییە( ئەلبەتە سیاسەتکردنی لێدەرچێ). پاشان ئیدارەی سیاسیش هەمیشە زۆرترین ئمتیازات دەخاتە بەردەست ئەم جۆرە کەسانەوە و لە دەیەها ئەرك و بەرپرسیاریەتی و داواش دەپارێزرێن و یان چاوپۆشییان لێدەکرێ. لەم حالەتەدا ئەمە ناکرێ لەگەل ئەو ئابووریە نوێیە بەروردکرێ کە بە تەکنەلۆژیای زانیاری تێهەلکێشکراوە و بە نێتۆرکێ مالی ئالۆزی تەکنیکیەوە وابەستەکراوە. هەردوو ئەم شێوازە ئابووریە، چ ئەوی کوردستان و چ ئەوی لە ولاتانی پاڕادیگمی نوێدا هەیە، لەگەل هەموو ئەوجیاوازیانەی لەنێوانیان دا هەیە بەلام هەرووکیان بەپێی توانا و ڕەوتی کارکردنیان دەستیان لە دروستکردنی هەلە و نابوودی هەیە و زەرەرێ زۆریشیان لە ژیانی ئەو کەسانە داوە کە لە فرۆشتنی هێزی کاریان زیاتر شکنابەن.

ئەوی ئێمە ئەمڕۆ لەو نەختە شوێنەی کوردستان دەیبینین کەمترین شتە لەچاو ئەو شوێنانەی کە وەك چەقی ئابووری گلۆبال تەماشادەکرێن (بۆ نموونە نیویۆرك یان ناوچەێ نوێی وەك هۆنکۆنگ یاخود مۆسکۆ). بەلام ئەوی کوردستانیش بابەتی باسە و ناکرێ فەرامۆشکرێ مادام چەند کەسێ کەلك لەو جیاوازی و گۆڕانانە وەردەگرن و دواتر هەولیش دەدەن مانای سیاسی بدەنەپال ئەم ڕەفتارانەیان. بۆ نموونە گوایە ئەم جۆرە بازرگانییە نیوەچل و پەرت و نائابووریەی ئەمان دەیکەن بۆ ئابووری نەتەوە یان با بلێین بۆ بازرگانی ناوخۆ بەسوودە و هەنگاوێکیشە بۆ دروستکردنی ئابووریێ کوردستانی. ئەمە چ ئابووریەکە کاتێ خێلی سیاسی خێلی ئابووری دروستکا و بازرگان ئەو سیاسیە بێ کە سسیاسەتی پێناکرێ یان ئیدی ڕێینادرێ سیاسەتبکا و یاخود دلی ڕەنجێنراوە. لەم حالەتەدا بۆ ئەمان بازرگانیکردن یارێکە بۆ بردنەوە لە سیاسی. بەلام سیاسی لەم جۆرە ئابووریانەدا لەگەل بازرگان لە پێوەندیێ نەمردایە و هەردووش پێکەوە زۆرترین مانا و نەێنی بە واتای پارە دەدەن.

بۆئەوەی لەڕووی مێتۆدییەوە گرفتەکان، کە لە ئاکامی گەشەکردنە ناتەباکانی تەکنەلۆژیای زانیاریەوە دروستدەبن، وەك یەك تەماشانەکەین ئەوەش دەلێین کە، لە ئابووریەکی پێش Pre لۆکالی وەك ئابووری کوردستان ناکرێ بەدووی ئەو دیاردردانە بگەڕێین کە پاڕادیگمی زانیاری لە ئابووریێ وەك ئابووری

یابانی یاخود ئیسپانی یان ئەمەریکی دا دروستیکردوون(لێرەدا نموونەکان تەنێ بۆ ئاسانکردنی ڕوونکردنەوەکەیە). چونکە هەریەك لەو ئابووریانەی باسمانکردن بەجۆرێ لە جۆرەکان لەگەل ئابووری زانیاریدا ڕێدەکەن و یان بەگشتیش پاڕادیگمی زانیاری بەشێوەێ لەشێوەکان کاری تێکردوون. ئابووری یابانی بۆ نموونە بەوە ناسراوە کە لە بواری کارگە و دواتر مەسەلەی پێوەندی نێوان ئابووری، زانست و کولتوور( جوانترە بووترێ کەلەپوور) خاوەنی فۆرمێ لە ڕێکخستنی تایبەت بەخۆیەتی. سەبارەت بە ئیسپانیاش هەندێ مەرج و لایەنی تر هەن کە تایبەتن بە کۆمەلگەی ئیسپانی پێش چوونە ناو مالی گلوبالەوە. هەرچی ئابووری ئەمەریکییە دەشێ بووترێ کە زۆرتر گلوبال و زانیاریاوییە لەو ئابووریانەی ناویانهات. ئەمەش لەبەر گەلێ هۆ. لەلایەك ئەمەریکا ولاتێ گەورەیە و خاوەنی مەواردێ بەشەری و سروشتی زۆرترە و هەروەها ولاتێکە کە بوونیادێ تێکەلی ئیتنی و ناسیۆنالی و کولتووری هەیە یان ولاتێکە کە لەسەر بناغەی کۆچکردن دروستبووە و، هەرووەها بەپێی دۆزی سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکەشی بووە بە نێوەندی پاڕادیگمی زانیاری نوێ و شوێنگەی ململانێ سیاسییە گەورەکان و هەروەها کراویشە بە نیشتیمانی ئەوانەی بیانەوێ بە خولقێنەر ناوزەدکرێن هەروەها بووە بە لانەی ئەوانەش کە لە ولاتەکانیان دەردەپەڕێنرێن و یان ئارەزووی سەرهەلگرتن و خۆدۆزینەوە دەکەن (بۆنموونە جاران بۆ ڕووسەکان و ئێستاش بۆ چینی یان کوبیەکان). تەنیا ئەمەریکایەکان دەزانن کە چەند جووی ولاتانی ئەوروپای ڕۆژهەلاتیان لەخۆ گرتوو و دواجار ئەمانەش چۆن بوونە بە داهێنەر و دۆزەرەوەکانی ئەم ولاتە. هەروەها ناکۆکی ڕوناکبیران لەگەل ڕژێمەکانی ولاتانی خۆیان، دەکرێ باس لە چینیەکان یان یابانیەکان یاخود ڕووسەکان و تەنانەت هیندیەکانیش بکرێ، بووە بە هۆیەك کە ڕوو لە ئەمەریکا بکەن و ئەمە و جگەلەو شوهرەتە کلاسیکەی ئەمەریکا تا سالانێ(ڕەنگە ئێستاش) لە جیهان هەیبوو کە گوایە ولاتی ئازادی تاکە کەسە. ئەمانە هەمووی پێکەوە ئەو دەسنەبژێرە سیاسی و ئابووری و زانستیەی پێکهێنا کە کەم ولات بەخۆیەوەی دی. ئابووریەکیش ئەمە ڕەچەلەك و ڕابردووی بێ ناشێ بە شوێنێ وەك کوردستان یان مەنگۆلستان بۆنموونە بەراووردکرێ. بەلام دەشێ لەوێدا لەتەك یەکدا بەرباسخرێن کە هەردوو دروستکەر و بەرهەمهێنەری ناتەبای و ناچووستین و لە گێژاوێ دەژین کە پاڕادیگمی زانیاری بۆیهێناون. پاشان ئەو ئابووریە زانیارییە کە کەوتە گەڕ

هەرزوو لە جیهانا بوو بە مۆدێلێ پەسەندکراو و زۆربەی ئابووریە کانی دیش کەوتنە لاساییکردنەوەی. بەلام لاساییکردنەوەکانی بۆ گەلێ ولات و کارگە و هەرێم نەهامەتی و گرفتی ئابووری و کۆمەلایەتی هێنا. چونکە ئەم ئابووریە لەبناغەدا زانینی تەکنیکی تازە بەرهەمیهێناوە و لەو شوێنانەشدا کە ئەم زانینە تەکنیکیە نوێیە بوونی هەیە ئەم ئابووریە بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنان و دۆزینەوەی بازاڕ و جۆراوجۆرکردنی بەرهەم و گونجانی ئەم بەرهەمانەیە لەگەل بازاڕی کار و فرۆشتندا. بەلام ئەو ئابووری و ناوچانەی جارێ لە قۆناغێ دواکەوتووی تەکنیکین و پشتبە بەرهەمهێنانی کشتوکالی و وردە پیشەسازی و تەنانەت پیشەسازیش دەبەستن ناتوانن ئاوا بەئاسانی بێنە ناو بازاڕی بەرهەمهێنانی جیهانیەوە یان بیر لەوەبکەنەوە بکەونە پێشبڕکێ لەگەل بەرهەمی ئتبووری زانیاری گلوبال. هاتنی ئەم ئابوورییە ئالۆز و پێشکەوتووە فۆڕمێ ترە لە هەولدان بۆ بندەستکردنی ئابووری هەندێ لە ولات و هەرێمەکان و هێشتنەوەی ئەم ئابووریانە وەك ئابووریهایەکی بەکاربر و، هەروەها شوێنێکیش بۆ ساغکردنەوەی بەرهەمەکانی زانینی تەکنیکی نوێ. بۆنموونە ئەمڕۆ بەرهەمهێنانی کۆمپیوتەر ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە جیهانا لە زیادبووندایە و ئەمەش بەرهەمهێنانی ئامراز و بەرهەمی تریشی بەدوهاتووە کە هەموو ئەمانەش بە بەکاربردن و خستنەگەڕی کۆمپیوتەر لە ژیانی کار و شەخسیدا تایبەتن. لەم بوارەشدا چەند ولات و کۆمپانیایەکی نێودەولەتی (MIB، میکرۆسۆفت) مۆنۆپۆلی ئەم بوارەیان کردووە و لەم سالانەی دوایشدا هەندێ ناوچەی تر لە جیهانا سەریانهەلدا(وەك باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا)کە دەتوانن بەرهەمەکانیان لەبازاڕی تەکنەلۆژیای نوێدا داوای لەسەربێ. بەلام جارێ ولات و ناوچەهایەکی زۆر هەر بەکاربەرن و لە ئابووری گلوبالدا ناتوانن ببن بە دەسەلات. ئەمەش هەر تەنیا پەیوەندی بەوەوە نیە کە ئەم جۆرە ولات و ناوچانە لەسەرەتادا لەبواری بەرهەمهێنانی پاڕادیگمی نوێدا کاریگەر نەبوونە بەلکو پێوەندی بەوەشە کە کولتووری ئەم ولاتانە لەبەردەم گەشەی ئەم جۆرە پاڕادیگمانە ڕێگربووە و، ئەزموونی بەرهەمهێنان و دەسەلاتیشیان کاریگەربی خۆی بەسەر دروستنەبوونی ئەم شێوازە لە بەرهەمهێنان هەبووە. دواتر ئەم ولاتانە دانیشتوانێ زۆر و خەلکانێ نەخوێنەدەواری بێ ئەندازەی ئەوتۆیان هەیە کە ناتوانن لە بازاڕی ئابووری جیهاندا بەئاسانی کاریگەر بن. ئەمە و جگەلەوەی کە بێ دەرامەتی و بێکاری و دواکەوتن و ستەم بەهێزترین بناغەیان لەم ولاتانەدا داکوتیووە و ڕێگرێ گەورەشن لەبەردەم پەرەسەندنیانا.

هەروەها ئەم ولاتانە کە خاوەنی ئابووری کشتووکالی و پیشەسازین شێوازی بەرهەمهێنان و ڕێکخستنیان لە دەرەوەی بازنەی ئابووری گلوبالی زانیاریدان هەروەها جارێ هەر شێوازێ بەرهەمهێنانی کلاسیك بەکاردەبەن و بەرهەمەکانیان بە تێچوونی بەرز و بەدەستی کارێ ناکارەما(ناشارەزا) دێتەبەرهەمهێنان و لەکۆتایشدا ئەم ئابووریانە شمەکەکانیان نەك هەر لەئاستی بازاڕی گلوبال کڕیاریان نییە بەڵکو لەسەر ئاستی ئەو هەرێم و ناوچە ئابووریانەش داوای لەسەر نییە کە ئینتمایان بۆی هەیە (ئەمە لەگەڵێ ڕووەوە بەسەر ئابووری ولاتانی جیهانی عەرەبی وەك یەمەن و سودان و ئوردن پێرەودەبێ تادەگاتە هەندێ ئابووریتر لە ئەفەریفا و ئاسیای ناوەڕاست).

چونکە ئابووری کشتوکالی و پیشەسازی لەگەڵێ لە ولاتانی خاوەن تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ جارێ هەر مانای خۆی هەیە و گرنگیشی بۆ داهاتی نەتەوە هەیە. ئەمەش بەتایبەت دوای ئەوەی کە زانیاریگەری توانیوویەتی بچێتە ناو ئەو ئابووری و بەشێ زۆر لەو کەرتانەی کە لە هەندێ ئابووری ولاتانی جیهانی سێدا فەرامۆشکراو و ناکاریگەرن. لەهەمان کاتدا دەشێ ئەوەش یادخرێتەوە کە ئابووری گلوبال توانیوویەتی بەسەر ئەوەدا سەرکەوێ کە هەندێ یەکیەتی و مالی ئابووری هاوبەش دروستکەن (بۆنموونە بازاڕی ئەوروپای هاوبەش، یەکیەتی ئابووری ولاتانی باکوور. . . و) و بەرهەمەکانیان ج کشتوکالی و چش ئەو بەرهەمانەی زانیارێ تایبەت و ئالۆزیان تیابەکاردەبرێ لەنێو یەکدا ساغکەنەوە و جۆرە پسپۆریەك لەبواری بەرهەمهێنانیشدا پەسەندبکەن و ئەمەش دواتر کاریگەری خۆی نەك هەر بەسەر بازاڕی شمەك بەجێهێشتووە بەڵکو بەسەر هێزیکار و کارکردنیشەوە بەجێهێشتووە. ئەوەش دەبێ باسکرێ کە لە ولاتانی جیهانی سێدا و یان ئەو ولاتانەی لە بازاڕی گلوبالدا کاریگەرنین زۆرجار کێشە ئیتنی و ئاینی و سیاسیەکانیان دەبێ بەرێگر لەبەردەم پێکەوەکارکردنی ئابووری لەنێوانیان و لەکۆتایشدا خۆیان کوێرانە بە بازاڕی گلوبالەوە گرێدەدەن کە لەهەموو ڕووێکەوە ئەم بازاڕە سەرووی گشت تواناکانی ئەوانە. لەم حالەتەدا شوێنێ وەك کوردستان ناکرێ نەوەك یەکێ لە ولاتانی دەرەوەی بازاڕی گلوبال تەماشاکرێ و نەش وەك ئەو ولاتانەی بەڕێوەیە کە ببێ بە بەشێ لەم بازاڕە. چونکە ئابووری کوردستان ئابووریەکی پێشبڕکێ ئامێز و بەرهەمهێنەرانە نییە. کە ئەم دوو خالە زۆر گرینگن بۆ ئەوەی ئابووریێ لە ئابووریێ دی جیاکرێتەوە. یان ئەو خاسلەتانەیە کە ئابووری گلوبال لەخۆی گرتووە.

ئابووری کوردستان پتر ئابووریەکە کە پشت بە یارمەتی دەرەکی دەبەستێ و هەروەها بەو کەسانەی بەجۆرێ لە جۆرەکان پارەیەکیان پێکەوەناوە و ئارەزووی بازرگانی کردن دەکەن. نە ئەو پارەیەی ئەو تاقمە پێیانە دەکرێ بەجۆرێ تەماشاکرێ کە سەرمایەیێ جێگیر و گلوبالە و نەش سەرمایەدارەکان ڕوناکبیرییەکیان لە کاری بازرگانی و خستنەگەڕی سەرمایە دا هەیە. ئەمەش تەنیا کێشەیێ نییە کە بە سەرمایەداری کوردەوە تایبەت بێ بەڵکو کێشەیەکە دەستی لەلایەك سیاسی کوردیشی تیایە کە لە مانا و جەوهەری بازرگانی تازەی جیهان نەگەیشتووە و هەروەها لەلایەکی تر کێشەی بەشێ زۆر لە بازرگان و سیاسیەکانی وڵات و ناوچەکانی دەرەوەی کۆمەڵگەی تەکنەلۆژیای زانیاریشە کە لەوە بەئاگانین کە سیستەمی بازرگانی نوێ چەند لەناواخندا پاڕادۆکسال و نامرۆییە، هەروەها ئەم ئابووریە زۆر بەتوانایە لەوەی کە نادلنیای و خوریە بەرهەمبهێنێ. ئەم لایەنەش هەموو بە ڕوحی پێشبڕکێیاوی ئابووری گلوبالەوە بەستراوەتەوە کە باوەڕێ زۆری بە موغامەراتی بازرگانیەوە هەیە.

گەر تەماشای ئەو جوولە بازرگانیە وردە بکەین کە لە کوردستانی ئەمڕۆدا لە پەرەسەندن دایە دەبینین کە ئەم بازرگانیە لەژێر مەرحەمەتی ئەو تاقمە سیاسیەن کە پێیانوایە خاوەنداری ماڵی کوردن. ئەمان ئاشکرایە ئەو ئابووریەی هەیانبووە ئابوورییێ بووە کە تەنێ توانیویانە لەژێرسایەیدا کاری پارتیزانی خۆیانی پێبەڕێوەبەرن. بەڵام دوای هاتنەشار و بنکەدانان لە شار دا یەکەم شت کە کرا ئەمانە بیری لێکەنەوە پارە بوو کە ئەوەش بەخۆی جەوهەری ئەو ئیدارە سیاسییەی دواتر دەرخست کە پێکهات. زۆربەی ئەو جوولە بازرگانیەی لە شاریشدا دەکرێ بەجۆرێ لە جۆرەکان ئەمان بەشێکن لێی و ئەمە و جگەلەوەی کە بەشێ زۆر لە کۆمپانیا و بوارە جۆراوجۆرەکانی وەبەرهێنان هەر دەستی ئەمانی تێدایە و تا زەمەنێ تریش هەر ئەمان دەبن هەم سیاسی و هەم بازرگانەکان. بەدڵنیایشەوە ئابووری کوردستان بەم جۆرە بڕدنەڕێوە و ڕێکخستنەی ئەمڕۆ نە توانای بەخێوکردنی ئەو خەڵکە زۆرەی و نەش توانای پڕکردنەوەی ئەو ئارەزووە سیاسی و ئابووریانەی هەیە کە ئەو تاقمە سیاسیە هەڵگرین. بۆیە ڕێگا کردنەوە لەبەردەم بازرگانێ نائاسایی و بێبەرنامە و هەروەها یارمەتی وەرگرتن لە هەموولایەکەوە بووە بەتاکە سیاسەتێ ئابووری و دواتر ئەوەش ئەو دۆزەخە کۆمەلایەتی و ئابووریەی دروستکردووە کە ئێستا زۆربەی خەڵك تیای دەژین. تا شوێنێ وا نەتوانێ لە

سەردەمێ ئاوا بەئابووریکراودا ئابووریێ خۆمالی بۆخۆی دابیننەکا کە تیایا مافە کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی گشت کەسێ بپارێزرێ ناتوانێ مالێ کوردی کۆك و یان وەك ئەوەی باوە لە وتندا وتارێ سیاسی هاوبەش بهێنێتەکایەوە. چونکە ئابووری کوردستان ئابووریێ پێش Pre لۆکالیە و هەروەها ئەو ناوچەیەش کە ئەم ئابووریەی تیایە ناوچەێ زۆر سیاسییە و کاریگەری بەسەر بازاڕی گلوبالەوە لە هیچ شوێنێکەوە دیارنییە. بۆیە هەمیشە ئەو گۆڕانە سیاسی و کۆمەلایەتیانەی لەژێرکاریگەری پاڕادیگمی زانیاری لە شوێنێ وەك کوردستان دروست دەبێ زۆر لەوی لە ولاتانی خاوەن زانیاری نوێ و ئابووری تازە دروستدەبێ جیاوازترە. هەر لەم ڕووەشەوە دەکرێ بلێین کە، ئەوەتا بڕیاری ئەم دوایەی یەکیەتی ئەورووپایی بۆ بەندام وەرگرتنی 10 ولاتی تر (سلۆڤێنیا، چیك، مالتا، قوبرس، لاتیڤیا، لیتوانیا، ئیستۆنیا، پۆلۆنیا، سلۆڤاکیا، هەنگاریا) لە 2004 دا کارێ وادەکا کە هەندێ ولاتی دی بێنە ناو بازاڕی گلوبالەوە. بەمە ژمارەی ئەندامەکان کە دەبێ بە 25 خاوەنی 21 زمانی جیان و بوونیادی ئابووریشیان وەك بەك نییە و، پێش ئەم بڕیارەش تاڕادەیەك چەند ولاتێکی ناو یەکیەتیەکە (بەتایبەت ئیسپانیا، یۆنان، پرتووگال) کە هەمیشە لە دەرامەتی یەکیەتیەکە کەلکێ زۆریان وەرگرتووە دەکرێ وەك ولاتە هەژارەکانی ناو یەکیەتیەکە لەقەلەمبدرێن بەلام بەهاتنەناوەوەی ئەو دە ولاتە تازەیە لەوێنەی ئەو جۆرە ولات و ئابووریانە لەناو یەکیەتیەکە زۆردەبێ. چونکە ئەندامە تازەکان تا زەمەنێتریش هەر بەکاربری بەرهەمەکانی ئەم بازاڕەن و ئەم هاتنەناوەوەیەشیان هەر لەسەرەتاوە گەلێ ڕەهەندی جیای هەیە و دواتریش گەلێ ئاکامی لێدەیێتەوە. بەلام بەپێی ئەوەی پاڕادیگمی زانیاری لە دەرەوەی توانای ئەوانە و چەند هەنگاوێ لە شێوازێ بەرهەمهێنانی زانیاریشەوە دوورن جارێ ناتوانن ئەوەندە کاریگەربن. ئەگەرچی ئەم ولاتانە سوود لە داهاتی بەرزی ئەو ولاتانە وەردەگرن کە لە یەکیەتی ئەورووپایدان و بەجۆرێ لە جۆرەکان دەشکەونە ژێرکاریگەری دیموکراسیەت و مەسەلەی ماف و دادپەروەری ئەم ولاتانەوە، بەلام لەلاێ ترەوە ئەم ولاتە تازە بەئەندامبوونە دەبن بە بازاڕێ باش بۆ ولاتانی خاوەن تەکنەلۆژیای زانیاری و هەروەها بەم چوونە ناو مالی ئەورووپایەش گەشەێ پەلە و نایەکسانیش لەم ولاتانە دێنێتەدی و کێشەهایەکی سیاسی و کۆمەلایەتی گەورەشی دواتر بەدوادێ. بۆیە ئەم جۆرە یەکیەتیانە (وەك یەکیەتی ئەورووپایی) لە کۆتایدا دەبێ بە یەکیەتیێ بەربلاو و دواتریش هەج کێشەێ سیاسی و ئابووری و تەنانەت کاتاسترۆفێ

مرۆیی بێتەپێشەوە ئەوا ئەم ولاتانە لەبەرئەوەی یەك بەرژەوەندی ئابووریان هەیە هەموو یەك بڕیار دەردەکەن و پێکەوە وەك یەکیەتیەك لەگەل یەکیەتی و دامەزراوە نێودەولەتیەکانی تر هاوبڕیار و هاوداوادەبن. ئەمەش کە ئەوڕۆ جیهانی گلوبال، کە خاوەنی سیاسەت و ئابووریێ گلوبالن، پێیگەیشتوون دوای ئەو هەموو قەیران و شەڕ و نەهامەتیانە هاتۆتەدی کە بەسەر ئەم ولاتانەدا هاتووە کە دواتر توانیوویانە ئەم دامەزراو و یەکیەتیانە دروستکەن کە ئێستا بوونە بە خاوەنی ئەزموونێ سیاسی و ئابووری و تەکنیکی تایبەت بەخۆیان.

بەکورتی هەولێ زۆر لە گشت شوێنێ بۆ هاتنەناو ئەم ئابووریە گلوبالە لەئارادایە، بەلام هەمیشە سەرکەوتن بۆ ئەوانەیە کە بەتواناێ تەکنەلۆژی بالاوە دێنە ناو گۆڕەپانی ئابووری جیهان و خۆیان دەکەن بە ئەندام لە مالی ئابووری گلوبال و گوندی زانیاری گلوبال. ئەمەش لەئەمڕۆدا تەنیا بۆ چەند ولات و کارگەێ هاتۆتەدی یان بەشێ کەم لە جیهان توانیوویانە سوود لەم بای گلوبالیتێیە وەرگرن کە هەلیکردوە. ئەم ئابووریە هەر لەسەرەتاوە خۆی لە فۆڕمە ئابووریەکانی تر جیاکردەوە ئەمەش بە پشتبەستنی ئەم ئابوورییە بە زانیاری نوێ و ئەو توانا تازەیەی ئابووری ناوبراو لە پێشبڕکێ و پەیداکردنی بازاڕ و دروستکردنی قازانج تیایدایە(3). ڕەنگە ئەمە بۆ ئەو شێوازە ئابووریانەی ڕۆژئاوا پێڕەویکردووە شتێ تازە نەبێ بەلام تازەیەکەی ئەم لایەنە لەوەدایە کە ئابووری زانیاری گلوبال جۆرە ئابووریەکە کەم کەس دەتوانێ بکەوێتە پێشبڕکێ لەتەکیا و دواتر بووە بە مۆدێلێ کە زۆربەی ولات و کارگە و دامەزراوە نێودەولەتیەکان پەسەندیدەکەن. تەنانەت ئەو ولاتانەش (وەك چین، ئێران، کوبا وهەندێ لە ولاتانی ئاسیا و ئەو ولاتانەش کە ڕابردوویەکی کۆمۆنیستیان هەیە) کە خۆیان بەدوژمنی مۆدێلە سیاسی و ئابووری و کولتووریەکانی ڕۆژئاوا دەزانن پریشکی ئەم ئابووریە زانیاریە گلوبالەیان بەرکەوتووە و بەجۆرێ لە جۆرەکان خۆیان لەگەلیا گونجاندووە.

ئەم ئابووریەش هەروەك لەمەوبەریش وتمان هەر کردەیەکی ئابووری ئاسایی نییە کە لە کڕین و فرۆشتنێ دیاریکراو بریتیبێ بەلکو لەکۆتایدا لە هەموو ژیان و بوون بریتییە. چونکە ولاتە گەورە و کارگە مەزن و دامەزراوە نێودەولەتیە دەسترۆشتووەکان(یەکیەتی ئەورویا ، نەتەوە یەکگرتووەکان و ناتۆ) نوێنەرایەتیدەکەن. بۆیە ئەم ئابووریە خۆی وەك ڕاسترین ئابووری و مرۆیترین شێوازی بازرگانی و پێشکەوتوترین فۆڕمی ژیان دەردەخا. بۆ

ئەوەی ئەم ئابوورییە زانیارییە گلۆبالە هەبێ دەبێ بازاڕێ مالی(نەخت) لە پشتیەوە بێ کە پشت بە زانینێ تەکنیکی ئەلەکترۆنی دەبەستێ و لە هەموو کات و شوێنێکدا و بێ وەستان کاردەکا. ئەم بازاڕە مالییە ئەلەکترۆنیە بڕبڕەی پشتی ئەم ئابوورییە نوێیە گلۆبالە یە و ڕۆلێ سەرەکی لە ڕێکخستنی کارە ئابوورییەکان دەبینێ و ئەرکێ زۆری ئەم ئابوورییە گلۆبالەشی لەسەرە و ماناێ زۆریشی بۆ گوازتنەوەی سەرمایە و گەیاندنی ئابووری هەیە. پاشان نابێ ئەوە لەیادکەین کەئەم جۆرە بازرگانییە مالییە ئەلەکترۆنییە کە یەکێکە لە بناغەکانی ئابووری نوێ بەپالپشتی پاڕادیگمی زانیاری هاتۆتەکایەوە و ئەمەش ئەو ئابوورییە گلۆبالەی پێکهێناوە کە بووە بە ماهیەتی ئابووری ئەمڕۆ یان ئەو ئابوورییەی کە بناغەی بۆ دیاردەی جیهانگیری دانا. خراپ نییە کە هەر لەژێر سایەی ئەم لایەنەدا جەغت لەوەبکەین کە، بازاڕی گلۆبال تەنیا شمەك و سەرمایە ناگرێتەوە بەلکو زانست و زانینیش دەگرێتەوە و هەموو ئەمانەش لە ئاستێ گلۆبال دا بەدووی بەهای خۆیان دەگەڕێن و، هەروەها بەبێ بایەخدانە شوێن و کات دەگوێزرێنەوە و نرخی خۆیان لە بازاڕی زامستی نێودەولەتیدا پەیدادەکەن.
گومانیشی ناوێ ئەوەبلێین کە ئەم بازاڕە گلۆبالە لە چەند ناوچەێ ئابووری پێکدێ کە بەشێ لەوانە ناوچەهایەکی تازەن(وەك ناوچەی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای کە لە ولاتهیایەکی وەك تایوان و سەنگافوورە و ئێندۆنیسیا و کۆریای باشوور و.. پێکدێ) و بەشەکەی تری ناوچە ئابوورییە کۆنەکانن (باکووری ئەمەریکا و یەکیەتی ئەورووپایی)، بەلام گۆڕانێ زۆر هاتۆتە سەر میکانیزمی کارکردن ئەم بەشەی دوایی. ئەم دوو ناوچەیە یان هەرێمە ئەو هێزە ئابوورییە گلۆبالە دروستدەکەن کە لەسەر بناغەی پێشبڕکێێ گەورە دامەزراوە. هەروەها پێوەندی ئابووری نێوان ئەم دوو ناوچەیە و دواتر نێوان ئەمان و ولاتانی تر ئەو پێوەندییە ئابوورییە نێودەولەتیە پێکدێنێ کە لەژێرسایەی جیهانگیری ئابووری دروستدەبێ. بەلام ئەم پەیوەندیە ئابوورییە لەبەرئەوەی پێشبڕکێ ئامێزە و بەرهەمێ زانیاری زۆری تێدەکەێ زۆر ناجۆر و جۆراوجۆرە و هەروەها گەشەی ئەم ئابوورییەش ناجێگیرە و بەپێی ناوچە ئابوورییەکان جوداوازە. ئەمەو بازرگانی گلۆبال بناغە بۆ هەلوەشانەوەی سنوور و جوگرفیاکانیش دادەنێ و شێوە پەیوەندیێ تازەی دابەشدابەش لەنێوان هەرێم و ناوچەکان و هەروەها نێوەند و دەورووبەر دادەمەزرێنێ. بۆنموونە پێوەندی بازرگانی یابان چوارچێوەی کلاسیکی خۆی تێپەڕاندووە و ئێستا نەك هەر

لەگەڵ ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا یان ولاتانی یەکیەتی ئەوروپا ئەم پێوەندییە لە زیادبووندایە بەڵکە لەگەڵ ولاتانی ئەمەریکای لاتین و ولاتانی وەك تایلاند و سەنگافوورە و هۆنکۆنك و ئیندۆنیسیاش بەهێزبووە. بەهەمان شێوە پێوەندی یەکیەتی ئەوروپاش لەگەڵ ولاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکا و ولاتانی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایش لە نەشونمادایە. بەمجۆرە دەکرێ بووترێ کە پێوەندی ئابووری گلۆبال بەزۆری لەنێو ئەو ناوچە و ولاتانەدا لە گەشەدایە کە لەژێر کاریگەری تەکنەلۆژیای زانیاریدان. بەلام کاتێ کە تەماشای خشتەی ئەو هێنراو و نێراوانە دەکەین کە لەسالانی بۆ نموونە 1990 کان لەنێوان ولاتانی یەکیەتی ئەوروپا و جیهای عەرەبی یان کیشوەری ئەفەریقا و ولاتەیەککگرتوەکان دەکەین دەرك بەوەدەکەین کە بازرگانی نێوان ئەم بەشە زۆر ناجۆر و ناچووستە. ئەمەش بەزۆری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو جۆرە ناوچە و ولاتانە ( بۆنموونە جیهانی عەرەبی یان کیشوەری ئەفەریقا و یان هەندێ لە ولاتانی ئاسیا) بەقۆناغی تەکنەلۆژیای زانیاری تێنەپەڕیوون و بوونیادی بەرهەمهێنانیان جارێ هەر لە قۆناغی کلاسیکدایە. ئەمەش بەدلنیایەوە نەك هەر پێوەندیێ ئابووری ناجۆر و وابەستە لەنێوان ئەم ولاتانە و ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاری دروستدەکا بەلکو ئەم لایەنە کاریگەری بەسەر پرۆسێسی سیاسیشەوە هەیە. ئەم پرۆسێسەش دەکرێ بەگەلێ جۆر ڕوونکرێتەوە، بۆنموونە وابەستەێتی سیاسی و دواتر بازرگانیش. هەروەها کەوتنە ژێر ڕەحمەتی بانقە نێودەولەتیەکان بۆ گەشەدان بەکەرتەئابووریەکان. ئەم مەسەلەیەش لەم ئەمڕۆی گلۆبالەدا جێی سەرنجە و فونکشونێ سەرەکیە لە پێوەندییە نێودەولەتیەکان. بەپێی ئەوەی لەو ولاتانەی کە ناومانبنا، کە جارێ لە قۆناغی پیشەسازی کلاسیکدان، نە کەرتهایەکی ئابووری ستراتیژی تیا هاتۆتەکایە و نەش ناوچاهایەکی لەناو خۆیدا دروستکردووە کە بتوانێ ئابووری نەتەوە ببووژێنێتەوە. ئەوەتا لە هیندستان بۆمبای و چەند ناوچەێ تر، یان لە یابان جگە لە تۆکیۆ شاری تری ئابووری و زانیاری دروستکراوە یان لە چین جگەلە پەکین و شانگەهای هەرێمی تر گەشەیکردووە. ئەمە ئاماژە بۆئەوەدەکا کە ئابووری گلۆبال نەك هەر جوگرافیای نێو ولاتانی هەلوەشاندووەتەوە بەلکو جوگرافیای ناو خودی ولاتەکانیشی سەرلەبەرگۆڕیووە.

ئەوەی ڕاستیبێ ئەم جۆرە جوگرافیا نوێیەی تێیکەوتووین ئەو جوگرافیا پەرت و هەلوەشاوەوەیە کە پۆست مۆدێرنەکان پێشبینیاندەکرد و ئەو ناجۆریەش کە

له پێوەندیەکانی نێوان شارەکان و ناوچەکانی ناو هەمان ولات و ئەمجار پێوەندی سەرلەبەرگۆڕاوی لەلایەك وابەستە و لەلایەکی تر کەنارگیری نێوان ولاتانیش هەموو بەرهەمی ئەو هەلاوگۆڕانانەن کە چاخی ئەمڕۆمان لەژێرسایەی پاڕادیگمی زانیاری پیایتێدەپەڕێ. ئەگەرچی لەگەڵێ شوێندا کاستێلس ڕەخنەی خۆی ئاڕاستەی ئەم ناجۆری و ناچووستیەی ئەمڕۆ دەکا بەلام زۆرجاریش بەجۆرێ پۆزەتیف و دیاردەێ گەشەکردووی لەقەڵەمدەدا. بەدڵنیایشەوە قووڵنەبوونەوەشی لە ناوچە و هەرێمە جیاجیاکانی بەشێ لە ولاتانی جیهان و لەپێش هەمووشیانەوە جیهانی عەرەبی-ئیسلامی کێشەێ زۆری بۆ ڕوانینەکانی دروستکردووە و ئەو بەگشتیکردنەی تایبەت بە زانیاریگەری باسی لێوەدەکا زۆرجار لەو جۆرە شوێنانە نەك هەر هیچی ناخرێتەسەر بەڵکو وەك دیاردەێ ڕۆژئاوای و ئەمەریکیش تەماشادەکرێ و هەروەها وەك جۆرە ڕێگایەك تەماشادەکرێ کە بۆ سڕینەوەی کۆمەڵگەکانی ئەوان هاتۆتەکایەوە. بۆیە پاڕادیگمی زانیاری لەنێو ئەو 400 ملیۆن عەرەب و ملیارێك و دووسەرد ملیۆن موسلمانەی لە جیهانا هەیە ئەو مانایەی بۆیان نییە کە بۆ شوێنێ وەك یابان و ئەمەریکا هەیەتی. چونکە زانیاریگەریی و زانینی نوێ بۆ یابان و ئەمەریکا و ئەلبەتە ولاتانی ئەوروپاش جێی ئەو کولتوورە ڕۆحیەی گرتۆتەوە کە لە سەدەکانی ناوەڕاست هەیانبووە. ئەمەو جگە لەوەی زانیاری و زانین ئەمڕۆ بەهێزترین ئامرازیشن بۆ مانەوە و دروستکردنی ناسامەێ نەتەوەی بالا (ئەوەتا بەهۆی تەکنەلۆژیای زانیاریەوە ئەمەریکا گەیشتۆتە ئاستێ کە سەرووی ولاتانی ئەوروپاشە و لەناوەوەی خۆی ئەم لایەنە کاریگەرێ زۆری بەسەر خووڕەوشتی خەلك بەجێهێشتووە و نەشونمای دیاردەی پارتریۆتیزمیش هەر بۆ ئەم بالاخوازیەی تەکنەلۆژیای زانیاری ئەم ولاتە دەگەڕێتەوە). لەهەموو ئەمانەش گرنگتر زانیاری و زانینی نوێ باشترین و ڕاستەخۆترین ڕێگاشن بۆ دروستکردنی پارە و دەسەلات. کولتووری پارەگەرایش ئەو کولتوورە پەلەیە یە کە شارستانی ئەلەکترۆنی لەگەل خۆی هێناویەتی و دەشخوازێ ئەم شارستانیە ئەم کولتوورە لەجەستەی چاخی ئەمڕۆماندا بەرجەستەبکا و هەولیشدەدا هەمووان هاوچارەنووس و یەك ئامانجبکا. لێرەدا مەبەستەم ئەوەیە کە لە دواین قۆناغدا زانیاریگەریی دەبێ بەدوا کولتووری هەمووان و شوێنی ئاین و نەتەوە و مێژووش دەگرێتەوە. چونکە زانیاریگەری تەنێ مانای ئەوە نییە کە ئێمە وەدووی زانین و زانیاری دەکەوین بەڵکو مانای ئەوەیە کە زانین و زانیاری هەمیشە بەدوامانەوەیە و

هەولیشدەدا کە مانای جۆراوجۆر بۆخۆی بدۆزێتەوە و شوێن بۆخۆی دابینبکا.
هەموو ئەمانە باس لە گەشەی زانیاریگەریێ گلوبال و ئەو بەرژەوەندیگەریەش دەکەن کە ئەم زانیاریگەریە لەگەل خۆی بۆیهێناوین. ڕووبەری ئەمەش لەگەل هەلوەشانەوەی بلۆکی کۆمۆنیزم لە ئەوروپای ڕۆژهەلات زۆر بەرینبوو. چونکە ئەو بلۆکە لە پاشکەوتوویێ زانیاری دەڤیا و تەکنەلۆژیای زانیاری مەدەنی لەوێڕا گەشەێ ئەوتۆی بەخۆوە نەدیبوو و سەربازگەری تاکە ئامانجێکی ئەو زانستگەری و زانینە تەکنیکیە بوو کە لەو بلۆکەدا هەبوو. لێرەدا ستراتیژی سیاسی و ئابووری هەردوو پێکەوە ئەو ستراتیژیە سەربازی و ئایدیۆلۆژیەیان پێکهێنا کە دواتر بووە هۆی هەلوەشانەوەی ئەم بلۆکە. دواتر ئەو شێوازە ئابوورییە کلاسیکەی لەم بلۆکەدا پیادەکرا لەگەل هەلوەشانەوەی بوو بە گەورەترین ناوچە بۆ بازاڕی گلوبال. ئەم هەلوەشانەوەیەش بۆ ئابووری و سیاسەتی گلوبال پێداویسیێ گەورەبوو و هەروەها ئەو بالاخوازییەیەش پاڕادیگمی زانیاری بەهۆی شەپۆلی سەرمایە و زانیارییەوە بوونیادیدەنێ. پێویستیەکانی ئەم بلۆکەش بۆ هاتنەناو بازاڕی گلوبال و یەکبوون لەگەل بەشەکەیتری ئەوروپا و دروستکردنی مالێ ئابووری و سیاسی ئەوروپای خەونێ بوو لە خەونە ئابوورییەکانی سێستەمی سەرمایەداری گلوبال. ئەم سێستەمە بۆلەمەولا بێ ئەم یەکبوونە ناژی و وەك ڕێگایەکیش بۆ پێکانی گشت ئامانجەکانی بەکاریدەبا. چونکە بەئەوروپابوون بۆلەمەولا لێرەوە دەستپێدەکا.
واتە لە یەکبوونی ئەوروپا بەیەك و دروستبوونی ئەم جۆرە مالەوە پێکدێ. ئەمە کارێ ترسناك و هەلەیە کە ئەم یەکبوونە دژ بە بەرژەوەندی ولات و هەرێمهایەکی غەیرە ئەورەپایی بەکارببرێ. واتە کولۆنیالیزمێ دەستەجەمعی دروستبێ کە ئەوروپایزم ببێتەجێگرێ بۆ کۆلۆنیالیزمی کلاسیك و بناغەێ بۆ ڕاسیزمێ نەرمونیان. چونکە تا زەمەنێ زۆریش ئەو ولاتانەی دێنە ناو یەکیەتی ئەوروپایەوە جارێ هەر لە قۆناغێ پەراوێزدا دەمێننەوە و لە دۆزێ وابەستەدا دەبن. ئەمەش کاریگەری بەسەر ڕووداوەکانی جیهانەوە دەبێ و ئەو ناجۆری و ناتەباییەی بەهۆی پاڕادیگمی زانیاریشەوە دروستبووە قوولتردەکا.
بەلام ناشێ ئەوە لەیادکەین کە یارمەتی یەکیەتی ئەوروپای بۆ گەلێ لەو ولاتانەی لەم دوایە هاتوونەتە یان لە ئایندەێ نزدیکدا دێنە ناو یەکیەتی ئەوروپاییەوە لە بودجێتی یەکیەتیەکەوە دەدرێ و ئەم یارمەتیەش بەزۆری دەکەوێتە سەر شانی ئەو ولاتانەی ناو یەکیەتیەکە کە دەولەمەندترن. ئەگەر چی

هەندێجار ئەم لایەنە ڕەنگدانەوەی خراپی بەسەر ئابووری نەتەوەی ولاتانی یەکیەتیەکەوە دەبێ بەلام ئابووری ولاتانی تازە ئەندام دەبووژێنێتەوە و گەشەی زۆر بەکەرتە ئابوورییە بنەڕەتیەکان دەدا. ئەم جۆرە پێکەوە کارکردنە لەوێدا شکست دەهێنێ کە تەنێ لەناوچەی جوگرافیدا گیردەخوا و نایەوێ ڕووە و ئەو ناوچە و هارێمانە بلاوببێتەوە کە زۆرترین پێویستیان بەو یارمەتی و پێکەوەکارکردنانەیە. ئەو یارمەتییانەش کە یەکیەتی ئەوروپایی و یاخود نەتەوە یەکگرتوو و یان دامەزراوە نێودەولەتیەکان بە هەندێ لە ولات و شوێنی دەدەن بەزۆری ئەم یارمەتیانە لەکاتێکدا دەدرێ کە ئەم ولات و شوێنانە زۆریان پێویست بەم یارمەتییانە هەیە یان لەکاتێ دەدرێ پێیان کە دووچاری کاتاستڕۆف و گرفتێ نێودەولەتی دەبن (لافاو، بوومەلەرزە و....) یان زۆربەی جارەکان ئەم یارمەتیانە لەژێرەوە دەدرێ و یاخود بۆ مەبەستی سیاسی و تایبەت دەدرێن (بۆ نموونە یارمەتیەکانی فۆندی نەختی نێودەولەتی بۆ توورکیا یان میسر یان ئوردن و...). ئەوەی دەکرێ لەم بارەیەوە بووترێ ئەوەیە کە کاستێلس هەندێ جار و لەهەندێ شوێندا لێکدانەوەکانی لە دیاردەسیاسیەکان بەدووردەگرێ و باس لەو گرفتانە ناکا کە تایبەتن بەو ولاتانەی لە ئابووری نوێدا کاریگەرنین. ئەمەش بەدلنیایەوە کێشە لەبەردەم ڕوانینەکانی کاستێلس دروستدەکەن و جەغتیش لەوەدەکەن کە ئەو ئابوورییانەی نەیانتوانیووە شوێنێکیان لە ئابووری گلوبالدا هەبێ ئەو بەهایەیان بۆ گەلێ کۆمەلناس و توێژەرەوەی سەردەم نییە.

لەوە سەیر تر ئابووریەکان لەژێر زەبری ئەو دابەشبوونە جۆراوجۆرەی پیایتێدەپەڕن جۆرە دابەشکردنێ ئالۆزیش ڕێکەوتدەکەن کە تایبەتە بە پسپۆڕی هەنێ لە ولات و کارگە و یان هەرێم بە جۆرە شمەك و بەرهەمێکەوە. ئەم پسپۆڕیەش ئابووریەکان لەیەکتر جیادەکاتەوە واش لە هەندێ کارگە یان هەرێم دەکا کە بە بەرهەمهێنانی هەندێ شمەکەوە پسپۆڕبن و ئەمەش کاتێ ترسناك دەبێ کە ئەو شمەکانە زۆر ستراتیژی بن و گرینگیان بۆ ئابووری تەنەوە گەورەبێ. ئەمەش بەزۆری شمەکە ئەلەکترۆنی و تەکنیکیە بالاکان دەگرێتەوە کە بەرهەمهێنانیان زانیاریێ بەرز داوادەکەن. ئەم بەرهەمانەش لەلایەك بەرهەمهێنیان سەرمایەێ زۆری دەوێ و لەلایەکی تر فرۆشتنیان قازانجێ زۆری لێوەبەردێ و هەروەها بازاڕیشیان زۆر گەرمە و گوازتنەوەشیان ئاسانە و لەکاتی گوازتنەوەش خراپ نابن وەك ئەوەی دێتەسەر بەرهەمی کشتوکالی یان هەندێ بەرهەمی پیشەسازی. ئەلبەتە ئەو گەیاندنە ئەلەکترۆنیەش کە ئەمرۆ

لەژێرسایەی پاڕادیگمی زانیاری هاتۆتە دونیا ماناێ زۆری بۆ گەیاندنی ئامراز و ماتریال و دەستگای پێشکەوتوو هەیە. هەروەها یەکێ لە هەرە سیفەتە گەورەکانی ئابووری زانیاریش ئەوەیە کە ئەم جۆرە بەرهەمانەی زۆر تایبەت کردووە بە یەك دوو ولات و یان کارگەوە. پاشان نرخی ئەم بەرهەمانە زۆر گرانن و گەلێ قەبارە بچووکیشن و جێگاێ کەمیش لەکاتی گوازتنەوە دەگرن و ئەمەش وادەکا کاتێ کەمتریان بوێ لە گوازتنەوەدا.

یەك لەو لایەنانەی دەکرێ سەبارەت بە پاڕادیگمی زانیاری باسکرێ کە لەگەڵ هاتنی ئابووری گلوبال زۆر کاریگەر بووە لایەنی ڕێکخستنە لە ژیانی دامەزراوە ئابووری و کولتووریەکان. چونکە ئابووری گلوبال گۆڕانی کولتوور یشی شیاوکردووە و بوونیادی کۆمەلایەتی بەجۆرێ گۆڕیووە کە کۆمەلگەکانی پاڕادیگمی زانیاری ڕوو لە کۆمەلگەێ مولتی کولتووری بکەن و، شارستانی ئەلەکترۆنیش کولتوورێ ئەلەکترۆنیی لەگەڵ خۆ هێناوە کە جارێ سەرەتایەتی.

ئەو گۆڕانانەش لە ڕێکخراوەکانی ئابووری زانیاری دا ڕوویانداوە ڕەهەندی گەورە و جۆراوجۆریان خستۆتەوە. چونکە گۆڕانەکان زۆر بە لایەنی ڕێکخستنەوە تایبەت بوونە. ئەمەش بۆ پرۆسێسی دووبارە بوونیادنانی سێستەمی سەرمایەداری زۆر ماناداربووە و دواتر ئەو ئابوورییە گلوبالە سەرمایەدارییەی دروستکردووە کە ئەمڕۆ هەموو پلانێتەکەمانی گرتۆتەوە.

بەواتایەکی دی لە کارگەکانی ولاتانی ئابووری نوێ دا دەکرێ دەرك بەوەش بکەین کە فۆڕمێ تازە لە ڕێکخستن لەگەڵ وەگەڕکەوتنی پاڕادیگمی زانیاری لەدایکبوو و ماناێ زۆری بۆ شێوازی بەرهەمهێنان دروستکردوو و فۆڕمی بەڕێوەبردن و دابەشکردنیشی سەرلەبەر گۆڕی و یان لەتەك گۆڕانکاریەکانی تەکنیکی نوێ گونجاندی.

ئەوەی زۆر بەوردی کاستێلس کاری تیاکردوە لەم بارەیەوە ئەو لایەنەیە کە بە گۆڕانە ڕێکخراوەیەکانەوە تایبەتە کە بەخۆی بۆ گەشەکردنەکانی سیستەمی سەرمایەداری زۆر پێویستبووە. لەبەر ئەوەی گەشەی تەکنیك گەیشتە ئاستێ کە گۆڕانی نەك هەر تەنیا فرێدایە ناو کارگەکانەوە بەلکو ناو بازاڕ و بواری بردنەوەڕێوە و گەیاندنیش. ئەم مەسەلەیەش لەلایەن کارگە گەورەکانی ولاتانی یەکیەتی ئەورووپاوە زۆر کەلکی لێوەرگیراو و دوای هاتنەکایەوەی دیاردەی جیهانگیریش پتر دەرکەوت کە چەند سێستەمی ئابووری و کارگێڕی لە ولاتانی پاڕادیگمی زانیاری پێویستی بە گۆڕانەکانی بواری بەرهەمهێنان و ساغکردنەوەی بەرهەم و ئیدارەی کارگە هەبووە. ئەو ڕێکخستنە نوێیەی

لەژێرسایەی تەکنەلۆژیای زانیاری لە کارگەکان پێڕەوکرا پێوەندی نێوان کارگەکانی پێشخست و ڕۆلی لە زیادکردنی بەرهەمهێنانیش دی. بۆئەوەی ئەمەش سەربگرێ کۆمپیوتەر لە کارگەکانا لەئاستێ بالا کەوتەکارکردن و بۆ ئەمەم مەبەستەش پسپۆڕێ تایبەت هاتەکایەوە و گشت کارگەێ دەستەبژێرێکی تیادەرکەوت تا ئیشی کارگەکان لەڕووی تەکنیکیەوە بەڕێوەبچێ. ڕۆژ لەدوای ڕۆژیش ژمارەی ئەم دەستەبژێرە لە کارگەکاندا ڕووی لەزیادیکرد و تاوایلێهات هەندێ لە کارگەکان کارمەندەکانی تەنێ لەم جۆرە دەستەبژێرانە بریتیکران و هەروەها زۆربەی کارگەکان دەستیان کرد بە بەدەستهێنانی ئەو کرێکارانەی کە خاوەنی زانیاریێ تەکنیکی بالان. دروستبوونی ئەم دەستەبژێرە تەکنیکیەش (یان نێتۆکرات) کێشەێ زۆری بۆ ئەو چینە کرێکارە ناکارەما و ناشارەزایە دروستکرد کە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاری هەبوو و، بەمە بێکاریێ زۆریش کەوتە ڕیزی ئەو چینە کرێکارە و هەروەها جیاوازیێ زۆریش کەوتە نێوان مووچەی ئەم چینە و کارمەند و کرێکارە خاوەن کارمما تەکنیکیە بەرزەکان. ئەم لایەنە تا ئەندازەێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا هەولدرا بە بەرزکردنەوەی ئاستێ زانیاری و شارەزایی کرێکاران چارەسەرکرێ. بەلام ئەم جیاوازییە لەو ولاتانەی کە بە هێنانەکانی ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریەوە وابەستەن زۆر بەرزترە و ئەم لایەنەش بەسەر ئابووری نەتەوە و هەروەها بوونیادی کرمەلایەتیەوە زۆر کاریگەرترە. لەهەمانکاتدا ولاتانی دەرەوەی ئابووری زانیاری گلوبال زۆرجار لەتوانایان نییە ئەو جۆرە تەکنەلۆژیا بالایانە بهێنن کە تێچوونی بەرزە و شارەزایێ زۆری دەوێ و لەوە سەیرتر ولاتانی پێشکەوتووش لە ناردنە دەرەوە و فرۆشتنی ئەم جۆرە تەکنیکە پێشکەوتووانە سیاسەتی خۆیانیان هەیە و بەشێ لە بەرهەمە تەکنکیەکانیان بە هەندێ لە ولاتان نافرۆشن و مافی بەرهەمهێنیان نادەنێ. ئەوی تاڕادەیەکی زۆر ئەم پێوەندیە ئابووریانە ڕێکدەخا و بەرنامەداردەکا کۆمپانیا نێودەولەتیەکانە کە بە کۆمپانیا فرە نەتەوەیەکان ناسراون. ئەمانەش دەسەلاتیان زۆرجار سەرووی دەسەلاتی ولاتەکانیانە (واتە دەولەتی ناسیۆنال) و بەرژەوەندیەکانیان زۆر لە بەرژەوەندی دەولەتی ناسیۆنال گەورەترە. فۆرمی ڕێکخستن لەم کۆمپانیا فرەنەتەوەییانە زۆر بەرەو پێشەوەچووە و پێکەوەکارکردنی نێوانیشیان زۆر گەشەیکردووە. ئەم بەرەوپێشەوەچوون و پێشکەوتنەش بەزۆری بۆ بەپەلە ساغکردنەوە و گەیاندنی بەرهەمەکانە و زالبوونە لەو پێشبڕکێیەی لە بازاڕەکانا بەرقەرارە. هەروەها ئەم کۆمپانیا

نێودەوڵەتیانە سەرمایەی نەختی گەورە و تەکنەلۆژیای گەیاندنی بالایان لەبەردەمدایە کە دەتوانن شیاوێ زۆر لەبەردەم بازاڕەکانیانیاندا بکەنەوە. ئەمەو ئەزموونی باشیشیان لە دۆزینەوەی بازاڕ و دروستکردنی نێت هۆرکێ بازرگانی پێشکەوتوودا هەیە. پێشئەوەش کە زانیاریگەری وەك پاڕادیگمی نوێ بێتەکایەوە و بتوانێ چالاکیەکانی کارگە مولتی ناسیۆنالیەکان بەرەو پێشەوەبەرێ بازرگانی ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا ئاڕاستەی دەرەکی خۆی هەبووە و دەستی لە چەوسانەوە و بەرەودواوەبردنی ئابووریەکانی دەرەوەی خۆی هەبووە. سەرەتاکانی سیستەمی ئابووری سەرمایەداری و دیاردەهایەکی وەك کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم شایەتن لەسەر ئەوە.
سەرباری ئەوی لەسەرەوە ووترا، دەشێ ئەوەش بەرباسخرێ کە گۆڕینی فۆرمی ڕێکخستن لە کارگەکان تەنیا بواری بەرهەمهێنانی نەگرتەوە بەڵکو بواری بەڕێوەبردنیشی لەخۆگرت و ژیانی ئیداری لە ئۆفیسەکانا گۆڕانێ بوونیادی بەسەردا هات و ئۆفیسەکانی سەردەمی بەرهەمهێنانی زانیاری زۆر لە ئۆفیسی سەردەمی شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازیەوە جیاوازە. گەر تەماشای ئۆفیسێ لە ئۆفیسەکانی یەکێ لە کۆمپانیاکان لە شارە گەورەکان بکەین دەبینین کە گشت پێداویستیە نوێکانی بواری بەڕێوەبردن وەك فاکس و کۆمپیوتەر و دەزگای کۆپی و کۆمپیوتەری جانتا و هێڵی نێت و چەندین پێویستی تر، کە هەموو بەرهەمی ئەو زانیاریگەرییەن کە کۆمەڵگەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری پێیتێدەپەڕن، تێیدایە. ئەمە لەلایەك کاری بەڕێوەبردنی ساناکردووە و لەلایەکیدیش کارێ وایکردووە کە دەستیکاریش لەبواری بەڕێوەبردن دا سنورداركرێ. هەروەها ئەو کەسەی کە لەبواری کارگێڕی و بەڕێوەبڕدنندا کاردەکەن چەندین پرۆگرامی جیاوازیان لەبەردەمدایە کە دەتوانن کارەکانیان بەجۆرێ ئەنجامبدەن کە کاتێ کەم و شوێنێ کەمتریش بگرێ. بەلام زۆرجار ئەو کێشانەی دێنەپێش نێتی کۆمپیوتەر و ئەم شێوە گەیاندنانە دەبنە هۆی لەناوچوون و وونبوونی تێکڕای کارەکان. دیسانەوە دەکرێ ئەوە بووترێ کە ئەم گۆڕانە کە هاتۆتەسەر بواری بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیکردن تەنێ ئەو ولاتانە دەگرێتەوە کە زانیاریگەری بووە بە بەشێ لە ژیانی کۆمەلایەتی و ئیدارییان. هەروەها لە گەلێ ناوچە و ولات لە دونیادا جارێ نەك هەر کۆمپیوتەر لە ئۆفیسەکانا بەکارنابرێ بەڵکو هێڵی تەلەفۆن بەدەگمەن لە مالاندا هەیە و هەروەها لە هەنێ شوێن و ناوچەی تر کۆمپیوتەر لە ئۆفیسەکانا بۆ مەبەستی دیاریکراو بەکاردەبرێن و شارەزایش لەم دەزگایە لەناو خەڵکدا

نەبووە بە شتێ باو و گشتی. هەروەها لەگەڵێ لە ولاتانی عەرەبی تائەمڕۆش لە ئۆفیسی ئەندازیاراندا کۆمپیوتەر ئامادەنییە و ئەندازیارەکان مووچەکانیان بەشی ئەوە ناکا کە بتوانن لەماڵەوە کۆمپیوتەری خۆیان هەبێ. ئەمەو جگەلە لە کێشەکانی بەگشتینەکردنی دەزگای کۆمپیوتەر لە کارگە و زانکۆ و گەلێ لە بەڕێوەبەرایەتیە گرینگەکان. هەروەها گەر ئەم دەزگایە لەهەندێ شوێنیش کەوتبێتە بواری بەکاربردن بەلام هەموو کاتێ بە نێتەوە گرێنەدراون و بواری بەکابردنیشیان زۆر چوارچێوەدارە. بەلام لەناوجەرگەی ولاتانی پاڕادیگمی زانیاری ئەم مەسەلەیە جیاوازتر کەوتووەتەوە. چونکە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری، کە لەسەر بناغەی پێشبڕکێیێ گەورە دروستبووە، فۆڕمی نوێی بۆ ژیانی بەرخۆری ئابووری دروستکردووە و خەڵك بەچەندین ڕێگای جۆراوجۆر بە بازاڕی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە بەستراونەتەوە و هیچ بوارێ لە بوارەکان نەماوەتەوە بەجۆرێ لە جۆرەکان بە بازاڕی تەکنیکی نوێوە نەبەسترێتەوە هەر لە ژیانی ناو ماڵ و پێویستیەکانی خێزان و یاری و خۆشیەکانی منال و خواردن و مۆسیقا و تەلەفزیۆن و لایەنە کولتووریەکان و سێکس تادەگاتە کاری سیاسی و چالاکی کۆمەلایەتی و پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆژی. هەروەها لە ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا هاتنە ناو نێت و بەکاربردنی تەنیا پەیوەندی بە ژیانی کار و کۆمەلایەتیەوە نییە و بەڵکو لەلایەك پەیوەندی بەو ژیانە تازەیەوەیە کە پاڕادیگمی زانیاری لەگەڵ خۆی هێناویەتی کە ئەوەش جۆرە ژیانێکە لەوپەڕی ئیندڤیدوالیدایە و هەروەها تەنیایی و دابڕانی کەسەکان لەڕووی کۆمەلایەتیەوە لەیەکتر دەستیگرتووە بەسەر ژیانی گشت کەسێ و بووە بە باوترین و زالترین شێوازی ژیان و ئەمەش تەنێ بە هەبوونی کۆمپیوتەر و نێت لەماڵەوە پڕدەکرێتەوە و، لەلاێ تر پەیوەندی بەو ڕەوشتە ئابووریەشەوە هەیە کە فەلسەفەی ئابووری لەم ولاتانەدا چوارچێوەی بۆ داڕشتوە و ڕیشەشی لەناو خەڵکدا بۆ داکوتیووە.

کاستێلس بە ووردی ئەو لایەنانەی ڕوونکردۆتەوە کە لە کۆمەڵگەکانی زانیاریدا پێوەندی بە گۆڕینی بوونیادی کارکردن و کارەوە هەیە و، هەر لەمبارەیەشەوە کەرتە ئابووریەکانیش بەباشی شیدەکاتەوە کاتێ دەیەوێ ئەوە نیشاندا کە چۆن پاڕادیگمی زانیاری توانیوویەتی خۆی بگونجێنێ و کاریگەری هەبێ. بەلام ئیشکردنی پاڕادیگمی ناوبراو لە ولاتێکی ڕۆژاواوە بۆ ولاتێ تر یان بۆ ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك یەك نەبووە. ئەمەش بەزۆری پەیوەندی بە بوونیادی ئابووری ئەو ولاتانەوە هەبووە و هەروەها چۆنیەتی

کارکردنی ئابووری نەتەوە و دواتر مەسەلەی چۆنیەتی بایەخدان بە کەرتە کشتووکالی و پیشەسازی و خەدەماتیەکانەوە. بەلام ئەزموونی ئەم ئابووریانە لە کارکردن و بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەوە هەمیشە مانای خۆی هەبووە و ڕۆڵێ ئەوتۆشی دیوە کە ئەم ئابووریانە لە ئابوورییەکانی دەرەوەی خۆی جیاکاتەوە. جا کاستێلسیش وەك کۆمەڵناسێ شارەزا لە زانستی ئابووری نوێ و شێوازەکانی کارکردنی بەجوانی ئەم لایەنەی ڕوونکردۆتەوە و بۆ ئەو مەبەستەش چەندین نەخشە و هێلکاری و ئاماری جۆراوجۆر بەردەستدەخا.
گۆڕانی بوونیادی کارکردن لە ولاتانی پاڕادیگمی زانیاری لەگەل ئەو گەشەیە هاتەکایەوە کە تەکنیکی نوێ لەگەل خۆی هێنای. ئیشێ زۆر لەبواری ئۆفیس هاتەکایەوە و کارە کولتوورییەکانیش هەر بەجۆرێ لە جۆرەکان بە گۆڕانکارییەکانی بواری کۆنتوورەوە وابەستەبوون و تەکنیکی نوێ کەوتە ناو کارکردنی کولتووریش. نەك هەر لەبەر ئەوەی کۆمەلگەێ مولتی کولتووری هاتەکایەوە بەلکو لەبەرئەوەش کە خودی کولتوور بوو بە پاشکۆی زانیاریگەریی و ئەم زانیاریگەریەش کولتوورێکی تایبەت بەخۆی دامەزراند. پاشان زانیاریگەریی پێویستی بەوەش بوو کە کولتوور گلووبالییێ. بەلام نەك گشت کولتوورێ بەلکو ئەو کولتوورانەی کە دەتوانن ببنە نوێنەری کۆمەلگەی گلوبال و سەرچاوەێ بۆ ئابووری گلوبال. بەلام هەمیشە جیاوازیێ لەنێوان ئەم شێوە کارکردنەی کولتوور و گەشەی کاری کۆنتوور لە ولاتانی پاڕادیگمی زانیاری و ئەو ولاتانەی خاوەنی پاڕادیگمێ زانیاری دیاریکراونین بەدیدەکرێ. ئەمەو بەتایبەت لەم ولاتانەی دواتر زانیاریگەریی نەبۆتە کەرتێ دیاریکراو و هەروەها کاریگەریشی بەسەر کەرتە ئابوورییەکانی تریشەوە نییە. ئامادەنەبوونی کەرتی زانیاریش لەم ولاتانەدا کاریگەری نێگەتیڤی بەسەر ئابووری نەتەوەوە بەجێهێشتووە و واشی لە ئابووری کردوە کە تەنێ پشت بە کەرتی کشتوکالی و پیشەسازی ببەستێ و هەروەها ئەم دوو کەرتەش لە شێوازە تازەکانی تەکنیکی نوێ دوورکەونەوە. ئەمەش بۆیە دەلێین چونکە ئەمڕۆ ئابوورییەکان لەگەل یەکدا لە پێوەندییێ گەورەدان و هەر دواکەوتنێ لە ئابوورییێ لە ئابوورییەکانا بەدیبکرێ ئەوا ئەو ئابوورییانەی کە بەهێزتر و پێشکەوتووترن سوودێ زۆرتر وەردەگرن.
سەربارەی ئەوە، لە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریدا بایەخێ زۆر بە کەرتی خوێندن و تەندروستی و بایەخدانی کۆمەلایەتی دەدرێ. نەك هەر ئەوە بەلکو تەکنیکی نوێ زۆر هاتۆتە ناو ئەم کەرتانەوە و خودی دیاردەی جیهانگیریش

بەجۆرێ ئەوتۆ لە گەشەکردندایە کە بایەخێ زۆر بە کەرتی خوێندن دەدا و ئەو گۆڕانە تەکنیکیەش داوای زۆری لەسەر بەرزکردنەوەی ئاستی خوێندن و فێربوون هەیە. ئەگەرچی لە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاری دا جارێ بەپێی پێویست بایەخ بە کەرتی خوێندن و تەندروستی نادرێ و ئەو بودجێتەی بۆ ئەم دووکەرتە تەرخان دەکرێ زۆر لەو بوودجێتەی بۆ نموونە بۆ وەزارەتی پیشەسازی سەربازی تەرخاندەکرێ کەمترە بەلام لەچاو ولاتانی جیهانی سێ زۆر لەپێشەوەترە. بۆیە دەبێ لەوەبگەین کە گەشەی ئابووری ولاتانی خاوەن تەکنەلۆژیای بالا گەشەێ گشتییە و زۆربەی کەرتە ئابووریەکانی گرتۆتەوە و ئەم ولاتانەش لە دروستکردنی ئەو گەشە ئابوورییە و خولقانی پێوەندیێ لەنێوان گەشەی ئابووری و گەشەی تەکنیکیدا زۆر بە ئەزموونن. ئەم ولاتانەش بۆئەوەی مۆرکی گلوبالی خۆشیان لەدەستنەدەن دەبێ هەولی دروستکردنی ئەم پێوەندییە بدەن.

بەلام هەر ئەم گۆڕان و گەشەیە لە بوونیادی کارکردن لە ولاتانی زۆر پێشکەوتوودا مەسەلەی گۆڕانهاتنە سەر دەستی کار و بازاڕی کاریش دێنێتە پێشەوە. ئەوەی بە ولاتانی خاوەن تەکنیکی نوێوە تایبەتە ئەوەیە کە هێزێ کارێ زۆریان هەیە و بەشێ زۆر لەم هێزەش گۆڕانێ بوونیادی هاتۆتەسەر و توانیویەتی نەك لەتەك بازاڕی ناوخۆ بەلکو بازاڕی جیهانیشدا خۆی ڕێکخا.

ئەم گۆڕانە تەنێ پێوەندی بەو بایەخەوە هەیە کە ماوەێ لەمەوبەر لەبارەی گەشەی کەرتی خوێندنەوە باسمانکرد. ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری و زانستی ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا بەجۆرێ گۆڕاوە و گەشەی کردووە کە نرخێ زۆر بۆ زانینی نوێ دادەنێ و ئەم زانینەش لەناو دامەزراوە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەکادیمیەکانا دەسەلاتێ گەورەی بۆ خۆی دابینکردووە و زانین بوە بە شتێ کە سەرووی گشت شتێترە. ئەم ولاتانە لەدوای ئەو هەموو سەدە جۆراوجۆرە سیاسی و تەکنیکی و گۆڕانە کۆمەلایەتی و ئابووریانەوە هەر دەبێ کە بەمجۆرە تەماشای زانین بکا و یان کۆمەلگەێ دروستکا کە تیا زانینی نوێ ببێ بە بەبەهاترین شمەك تیایدا. وەلێ ئەمە دۆزی زانین نییە لە ولاتانی جیهانی سێ و بەتایبەت ئەو ولاتانەی ترسێکیان بەرامبەر بە زانینی نوێ هەیە و ڕەنگە ئەم ترسەش هەر بۆ ئەوەبگەڕێتەوە کە زانینی نوێ خۆی وادەردەخا کە لەدەرەوەی شیاویی و تواناکانی ئەوانە و ئەوەیش کە ئەمان بەرهەمهێنەری ڕاستەوخۆی ئەم زانینە نوێیە نین کێشەێ گەورەی کۆمەلایەتی و سیاسی و تەنانەت دەروونیشی بۆ دروستکردوون. بەلام ئەمە ئەوە ناگەێنێ کە گشت

دەستی کار لە ولاتانی پێشکەوتوودا دەستی کارێ کارەما و شارەزایە و بازاڕی کاریش بازاڕێ زانستییە. نەخێر. چونکە لەگەل هەموو بایەخدانێ بە کەرتی خوێندن لەم ولاتانە بەلام جارێ جیاوازیێ گەورە لەنێوان ئاستی کرێکاران و کارمەندانی کەرتە جۆراوجۆرەکان و هەروەها نێوان خودی ئەم ولاتانەدا هەیە. نەك هەر ئەوانەی خاوەن خوێندنێ بالای تەکنیکی نین لەژێر هەڕەشەی بێکاریدان بەلکو ئەوانەی تەکنیکاریشن دووچاری ئەم کێشەیە دەبن و ئەو گۆڕانانەش کە لەژێرسایەی تەکنیکی تازە زوو زوو دێنە سەر فۆڕمی ڕێکخستن و بەرهەمهێنان کاریگەریان بەسەر کرێکار و کارمەند و ئەندازیارانی تەکنیکیەوە هەیە.
ئەوی شوێنی سەرنجە سەبارەت بە بازاڕی کار ئەوەیە کە ئەم بازاڕە ناوێرێ خۆی گلوبالکا بەلام دەکارێ والە هێزی کار بکات گلوبال بێ. ئەمە یەکێکە لەو پرسیارانەی جارێ ئابووری گلوبال ناخوازێ وەلامی بداتەوە و یان نایەوێ ئەوە بهێنێتەدی کە بازاڕێ کاری گلوبال بێتەدونیا. کاتێ کە دۆزێ واشی دروستکردووە کە بازاڕی دەستی کار گلوبال بێ زۆرتر ئەمە جۆرە یاریەکی سیاسی و ئابووری نوێیە کە جارێ لە سەرەتای ئەم یاریەداین. بێگانەکان سوود لەم بەگلوبالبوونەی دەستی کار وەردەگرن و دەتوانن بەجۆرێ لە جۆرەکان خۆیان بگەێننە ولاتانی گەشەکردوو و وەبەختی خۆیان تاقیبکەنەوە. ڕەنگە زۆرجاریش ئەمە نەێتە دی. واتە بەجۆرێ یاسای کارێ ئاسان نەبێ و بەشێوەیەکی یاساغیش تەگەرەێ زۆری بێتەڕێ. دوای بەهێزبوونی دیاردەی ئیسلامیزمیش نەك هەر ژیانی ئەوانەی لەناو ولاتانی ئەورووپا دەژین لەژێر هەڕەشەی جۆراوجۆر دەبێ بەلکو ئەوانەی بەڕێوەشن نەهێلرێن بگەن و ئەوەندەش سەختیدەخە ڕێیان کە کەمترین ژمارە بگات. بەلام بەشێ زۆر لەمانە ناتوانن بێنە ناو کەرتە ئابووریە تایبەتەکانەوە و تاکە کارێ کە دەتوانن بیکەن ئەو کارانەیە کە هاولاتیانی ولاتەکە نایکەن. ئەو بێگانانەش کە بەدەگمەن دەگەنە کەرتە ستراتیژیەکانەوە بۆ ماوەێ زۆر ناتوانن کاری تیاکەن و بەردەوامبن. ئەمەش لەبەر گەشەی دیاردەی ڕەگەزپەرستی و دوژمنایەتی بێگانە. بەلام ئەم لایەنە لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێکی تری ئەورووپا جیایە. ڕەنگە ڕێگا زۆر کراوەبێ لەبەردەم ڕووسێ بۆ کارکردن و ژیان لە سوید یان دانمارك وەك بۆ ئێرانیێ یان کوردێ هەروەها بۆ ئەمەریگای لاتینیێ لەچاو فەلەستینی و ئەفغانیێ. ئەم جیاوازیەش لەنێوان خەلکی ئێرەو و خەلکی ئەوێ

لەگەڵ گلوبال بوونی دیاردەی تیرۆریزم و ئیسلامیزم و ئەورووپایزم لە پەرەسەندندایە و ڕۆژ بە ڕۆژ ئاکامی زۆر خراپیش دەخاتەوە.
ئەلبەتە ئێمە پێویستیێ زۆرمان بەوەشەکە ئەم کۆمەڵناسە نێودەولەتیە تەماشاکردنی بۆ هەندێ لە دیاردەکان بەجۆرێ بەردەست توێژەرەوە و پسپۆڕانی جیهان، لەبارەی دۆزی سیاسی گلوبال و گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری، نخا کە لە برینەکانی ئەو خەلکەنە نزدیکبخاتەوە کە خەڵکی ولاتانی زانیاریگەریی نین. چونکە ئەوی ئەو لەبارەی فۆرمە نوێیەکانی ڕێکخستنی کۆمەلایەتی و ئابووری باسیدەکا دەشێ لە ئاستی تریش باسکرێ و بە گۆڕانە سیاسیەکانیشەوە گرێدرێتەوە. چونکە هەرچی پرۆسێسی کارکردنە لە کارگە گەورەکان چ لەناو سنووری ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاری و چش لە دەرەوەی ستووری ئەم ولاتانە گۆڕانی هاتۆتەسەر و ئەمەش بەزۆری لایەنی ڕێکخستن و بردنەڕێوەی گرتۆتەوە کە لەبنەڕەتدا بۆ پەرەدانە بە ئاستی بەرهەمهێنان و ساغکردنەوەی بەرهەمەکان. ئابووری زانیاریش هەر لەسەرەتاوە خۆی بۆ هێنانەکایەوەی ئەم جۆرە سێستەمە لە دروستکردن و دابەشکردن و هەروەها بۆ گۆڕینی بوونیادی بەرهەمهێنان و ئیدارە لە کارگەکان تەرخانکرد و کردیشی بە ئامانجی سەرەکی خۆی. نە ئابووری زانیاری بێ ئەم گۆڕانە هەلیدەکرد و نەش ئەو سێستەمە ئابووریە سەرمایەداریە گلوبالەی کە لەپشت هێنانەکایەوەی ئەم ئابووریەوە بووە. بەلام ئەم هەلاوگۆڕانە هەمیشە بە زیانی ئابووریەکانی تر گەڕاوەتەوە و کەلێنێ زۆریشی خستۆتە نێوان ئەم ئابووریە زانیاریانە و ئەو ئابووریانەی جارێ لەم ئاستەدا نین. وێرای ئەوەش ڕۆلی تەکنیکی نوێ لە گۆڕان خستنە ئابووری ولاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا کاریگەری بەسەر ڕەوتی سیاسی ئەم ولاتانەشەوە بەجێهێشتووە و وتاری سیاسیشیانی بەجۆرێ ئەوتۆ گلوبال و ئەمجار بالادەستکردووە کە هیچ وەختێ لەم قۆناغەدا نەبووە. ئەم بەگلوبالبوونەی سیاسەتی ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریش کەلکێ زۆری بۆ پرۆسێسی ئابووری ئەمڕۆیان هەیە و سەرەتایەکیشە بۆ دروستبوونی کێشە لەنێوان ئەمان و ئەوانەی ئامانجیان دروستکردنی سیاسەتێ ترە. چونکە ئەو زانیاریگەریەی لەپال دروستبوونی ئەم سیاسەتە گلوبالەوە بووە وایکردووە ئەم سیاسەتە ڕەوایەتیێ زۆر لەگەل خۆی بهێنێتە ناو ژیانی ڕۆژانەوە کە بەشێ زۆری لەو ڕەوایەتیانەش لەژێرناوی ماف و دادپەروەی و مەدەنیەت پیادەدەکرێ. دامەزراوە نێو دەولەتیەکانیش باشترین شوێنن بۆ بەئاکامگەیاندنی ئەم ڕەوایەتیانە.

هەر ئەو گۆڕانە بوونیادیەی لە ڕێکخستنی ئابووری و کۆمەلایەتی ڕوویداوە بوارە کولتووریەکانیشی گرتۆتەوە. ئەمەش دیسانەوە بەهۆی ئەو گۆڕانانەوە هاتۆتەکایەوە کە تەکنیکی نوێ دروستیکردووە. ئەو گۆڕانەش کە هاتۆتە سەر گەیاندن مەبەستدارترین و دیارترین گۆڕان بوونە. مانای ئەم گۆڕانە لەبواری گەیاندن زۆر جەوهەری بووە و ئابووری گلوبالیش کەلکێ زۆری لێوەرگرتووە. چونکە ئەو گەشەیەی هاتەسەر دەزگاکانی گەیاندن بەتایبەت تەلەفزیۆن و تەلەفۆن بووە هۆی هێنانەکایەوەی کولتووری تر. هەروەها ئەو پێکەوەکارکردن و وابەستەێتیەی تەکنیکی ئەلەکترۆنی نوێ لەنێوان کۆمپیوتەر و تەلەفۆن و تەلەفزیۆندا دروستیکرد تەنیا پێداویستیەکی مرۆڤی سەردەم و پرۆسەی ئەو ئیندڤیدوالیزمە نەبوو کە زانیاریگەری بتەویکرد بەلکو ڕێگای تربوو لەبەردەم کارگە گەورەکانیش بۆ پەیداکردنی فۆڕمی تر لە بازاڕ و ڕێگای تر بۆ دروستکردنی پارە. هەروەها شێوەی کارکردن و بەڕێوەبردنی نوێی کارگەکان و پەرتبوونی پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکان و لەپێش هەمووشیانەوە خێزان کارێ وایکرد دەزگا ئەلەکترۆنیەکان(ڤیدیۆ، ئامرازی سیدی، کۆمپیوتەر و مۆبایل) ببنە شتێ سەرەکی لە ژیانی خەلك و ڕێگایێکیش بۆ ماناداران بە ژیان. بۆیە مرۆڤی گلوبال بێ ئەم دەزگایانە گلوبالیتێی خۆی لەدەستدەدا و ناشتوانێ خۆی لە مرۆڤی سەردەمەکانی تر جوداکاتەوە. بەلام ئەم گلوبالیتێیە تاکە قەدەرێکە کە مرۆڤی سەردەم هەیەتی و لەهەموو حالەتێکیشدا دەستکەوتی خۆیەتی.

هەروەك ووتمان تەکنیکی تازە سێستەمی گەیاندنی سەرلەبەر گۆڕی و سەردەمێ پەلە و خێرای هێنایەدونیا کە پێشتر بوونی نەبووە. مرۆڤی سەردەم کەوتە ژێرکاریگەری ماسمێدیا و فۆڕمە جۆراوجۆرەکانی گەیاندنەوە و ئەمەش دۆزێ کۆمەلایەتی و سیاسی جیاواز لە سەردەمەکانی تری بەرهەمهێنا. ئەم گەیاندنە نوێیە کولتوورێ کۆمەلایەتی وای لەناو خەلك بەرجەستەکرد لەگەل گۆڕانە ئابووری و سیاسیەکان هاوکاتبوون. ئەمەش ڕەنگدانەوەی خۆی بەسەر ژیانی ماتریالی مرۆڤەکانەوە بەجێهێشت و کولتووریش بوو بەبەشێ لەم ژیانە ماتریالیە و گەیاندنی تازەش کولتوورێکی ئەلەکترۆنی ئامادەی پێشکەشکردین. نە ئەم گەیاندنە و نەش ئەو کولتوورە ئەلەکترۆنییە بەتەواوەتی کاری خۆی لەناو ئەو کۆمەلگانە دەکا کە پاڕادیگمێ زانیاری تایبەت بەخۆیان بەرهەم نەهێناوە. بەلام ڕوحی جیهانی ئەم گەیاندنە و ئەو کولتوورەش بەجۆرێ ئەوتۆ پێکنەهاتووە کە لە چوارچێوەی ئەو ولاتانەدا گیربخوا کە شوێنی

بەرهەمهێنانیەتی. هەروەها کارگە مولتی ناسیۆنالیەکانیش لە هەوڵێ گەورەدان بۆ دروستکردنی نێتی گەیاندنی گلوبال و نەهێشتنی مەوداکان. لەهەمانکاتدا گەشەی گەیاندن و جۆاوجۆربوونی ئامرازەکانی بە بێگومانەوە دەشێ باسکرێ کە تێگەیشتنی مرۆڤەکانی بۆ واتای شوێن و زەمەنیش گۆڕی. چونکە ناردنی نامەێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ لە ڕابردوودا گەر چەند ڕۆژێکی خایاندبێ لە مرۆدا بە چرکەیەك دەگا ئەمەش بەهۆی ئەو نامەیەی بەڕێگاێ ئەلەکترۆنی لە کۆمپیوترێکەوە بە نێتەوە بەستراوەتەوە بۆ کۆمپیوتەرێ تر ڕەوانەدەکا کە بە نێتەوە گرێدراوە یان ناردنی هەمان نامە بەهۆی مۆبایلەوە کە ئەم لایەنەش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەپەرەسەند ندایە. چونکە نامەکە وەك تێکست و وێنە و دەنگیش دەگوێزێتەوە. ئەم گەشەیە لە گەیاندنی نێتیدا زۆر گۆڕانیتری بەدەمەوەیە و جیهامگیری ئابووری و زانیاری پتر لەمە داوادەکا و ئەو کەلێنە ئابووری و زانیاریش کە لەنێوان ولاتانی نێتۆرك و ولاتانی غەیرە نێتۆرکدا هەیە هەمیشە ڕۆژ بە ڕۆژ لە گەورەبووندایە و فاکتەرێکیشە بۆ زیادکردنی بەرهەمهێنان. بۆ نموونە داوای ولاتانی کشتووکالی و پیشەسازی لەسەر بەرهەمی ولاتانی پاش پیشەسازی و زانیاری یەکێکە لەو هۆیانەی کە بەرهەمهێنانی بەرهەمە ئەلەکترۆنی و زانیارییە نوێکان(فاکسی زۆر پێشکەوتوو، کۆمپیوتەری جانتا و کۆمپیوتەری شەخسیPC، مۆبایل، سکانیە، دەزگای کۆپی و پرینتەر و..) لە زیادبوون دا بێ. ئەم ولاتانە بەردەوامن لەسەر هێنانی ئەو بەرهەمانە و بەلام لەلایەك ئەو بەرهەمانە لەڕووی ئابووریەوە زۆر گران لەسەریاندەکەوێ و لەلایەکیدیش هەمیشە سەرقالی بەتالکردنەوە و پووچکردنی هەموو دۆزینەوە و داهێنانێکی ئەو ولاتانەن کە ئەم بەرهەمانەی لێوەدێنن و هەروەها خودی بەرهەمەکانیش لەڕووی کۆمەلایەتیەوە شوێنی دیاریکراوی خۆیان نادۆزنەوە. چونکە ئەو ولاتانەی تائێستا پاڕادیگمێکی زانیاری تایبەت بەخۆیان نییە لەنێوان دوو کولتووردا گیریان خواردوە یەکێکیان بەهۆی ئەو کولتوورە ئەلەکترۆنیەوە تێیکەوتوون کە کۆمەلگە زانیاریە نوێکان گرفتاری بوون و مۆرکێ گلوبالی بەخۆوە گرتووە ئەوی دی ئەو کولتوورە ئاینییە-سیاسیەیە کە لە کۆمەلگە غەیرە نێتۆرکەکان نابێتەوە. هەردوو کولتوورەکەش لە شوێنی خۆیانا کاریگەری خۆیان بەسەر ئابووری و سیاسەت و کۆمەلگەوە هەیە.

ئەوی مەبەستە لەم حالەتەدا زۆرتر جەغتی لەسەرکرێ ئەوەیە کە گفتووگۆکردن لەسەر بناغەکانی پاڕادیگمی زانیاری گلوبال و چۆنیەتی کارکردنی ئەم

پارادیگمە لەکۆمەڵگە نوێیکاندا کارێ پێویستە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پتر بۆماندەردەکەوێ کە چەند ئەم پاڕادیگمە نوێیە بوونیادە کۆمەلایەتیەکانی گۆڕیووە و چەندین دیاردەی سڕیووەتەوە و لەبڕی ئەوانیش چەندینی تری خولقاندووە. ئەم پاڕادیگمە زانیارییە شکڵێ تازەی کۆمەلایەتی دروستکردووە و لەخودی خۆشیدا ناسنامەێ تازەی خولقاندووە. هەروەها پاڕادیگمی زانیاری پاڕادیگمی ئەم جیهانە نوێیەیە کە مرۆڤایەتی تێفرێدراوە. هەروەها ئەم پاڕادیگمە ئەوە یاددەخاتەوە کە زانیاری بەهەمووجۆرێ لەخۆ شیاوکردندایە. بۆئەوەی ئەم پاڕادیگمەش بتوانێ کاری خۆی بکا دەبێ ئەم جیهانە نوێیە ب ێنێوەند بژی. یان لەوەببێتەوە کە نێوەندگەرایی پەسەندبکا. بەلام پێناچێ لە ئێستادا پاڕادیگمی زانیاری بتوانێ ئەوەبکا و بەتایبەت ئەم پاڕادیگمە بەخۆی لەسەر بناغەی نێوەندگەرایی دروستبووە و تائێستاش لە بەشێ لەم جیهانەدا قەتیسماوە و بەشە هەرە گەورەکە لێی بێبەرییە. هەر ئەم نێوەندگەراییە زانیارییە وادەکا دەولەتێ زانیاری بهێنرێتەپێشێ کە خۆی وەك بەرهەمی ڕاستەقینەی چاخی زانیاری و دەستکردێکی جەمسەرەکانی تەکنیکی نوێ و پەرەسەندنی گلوبال دەرخا. ئەم دەولەتە دوا فۆڕمی دەولەتە و کاتێ کە تەکنیکی زانیاریش چرکەی خۆی تێدەپەڕێنێ زۆرترین توانا و شیاویی بۆ دەولەتی هاوچەرخ دابیندەکا. ئەمەو دەولەتی زانیاری دەولەتێ سەرمایەداری گلوباڵە و لەپشت شێوازێ لە بەرهەمێنان و دەسەلاتی سەرمایەداریەوەیە. ئەم دەولەتە زانیارییە سەرەتاکانی لە دەولەتێ پیشەسازییەوە سەرچاوەی هەلگرتووە و دواجار بەرەو دەولەتێ زانیاری گلوبالی سەرمایەداری ڕێگای گرتۆتەبەر. ئەم جۆرە سەرمایەداریەی دەولەتی زانیاری سەرپەرشتی دەکا سنوور و میکانیزمی لەوجۆرە سەرمایەدارییە کە دەولەتی پیشەسازی پیادەیدەکرد جوداوازە. ئەم سەرمایەدارییە نوێیەش کە گشت پلانێتی گرتۆتەوە چالاکیەکانی بە گەشەی پاڕادیگمی زانیاریەوە وابەستەیە و، هەروەها کارگە مولتی ناسیۆنالیەکانیش ڕۆلێ گەورەیان لە بلاوکردنەوەی پاڕادیگمی تەکنەلۆژیای زانیاری ئەم دەولەتە هەیە. جەوهەری ئەم دەولەتە زانیاریەش لەسەر بناغەی بازاڕ دامەزراوە و ئەم بازاڕەش برتییە لە بازاڕێ مالی و تەکنەلۆژیاێ ئالۆز و تایبەت کە تەنیا هەندێ ولات توانای هەرسکردنیانی هەیە و یان دەکارن کاری تیاکەن و مامەلەی لەتەکدا بکەن. ڕەنگە لەسەر هەندێ ئاستی تر ئەمە تەماشاکردنی کاستێلس نەبێ چونکە کاستێلس لە ڕوونکردنەوەکانیدا باس لە چاخی زانیاری وەك چاخێ هاوبەشی نێوان

کۆمەڵگەکان دەکا. هەروەها پێیوایە ئەم چاخە زانیارییەی تیای دەژین دەخوازێ بەجۆرێ خۆی نیشانبدا کە ڕووە و ناسنامەیەکی هاوبەشمان دەبا. بەلام ئێمە پێمانوایە ئەم ناسنامە هاوبەشە تەنێ لەڕووی زانیارییەوە پێکنایێ بەڵکو دەبێ سیاسەت و ئابووریێ هاوبەشی گلوبالیش لەئارادابێ تا پیادەی ئەم زانیارییە گلوبالە بکرێ و لەکۆتاییشدا ئەم سیاسەت و ئابوورییە دەبێ جۆرە ڕەوتێ وەرگرێ کە کەلێن و جیاوازی نەخاتە نێوان کۆمەڵگە جۆراوجۆرەکان و، یان بەواتایێ بەرینتر بۆشاییەکانی نێوان ولاتانی نێتۆرك و ولاتانی غەیرە نێتۆرك قوولنەکا و بەشداری لە ئالۆزکردنی کێشەکان دا نەکا. کەسێ وەك داڤید هارڤیDavid Harvey، کە یەکێکە لەو ڕوناکبیرە ئەمەریکییانەی کاریگەری بەسەر کاستێلسەوە هەیە، کە بەبۆچوونێ کولتوورییەوە دێ و باس لە توانای سێستەمی سەرمایەداری دەکا لە دروستکردنی گۆڕان و شیاویی و پێیشیوایە ئەم سێستەمە دەتوانێ لەماوەیێ کورتدا دەست بەسەر گەلێ بواردا بگرێ ماهیەتی ئەو سێستەمە نیشاندەدا کە توانای خولقانی شیاوی و بەکاربردنی ئەم شیاویەی تێدایە. لەهەمان کاتیشدا هارڤی ئەو گۆڕانانەی بۆلەمەولا ڕێیەدیدەکەین دەیگەڕێنێتەوە بۆ گۆڕانی پێوەندی نێوان کات و شوێن (4) کە ئەمەش هەر سێستەمی ناوبراو و شێوازی بەرهەمهێنانە زانیاریەکە لێبەرپرسیارە.

هەر سەبارەت بەو لایەنە کە لەسەرەوە باسمانکرد دەشێ ئەوەش یادخەینەوە کە بەپێی بۆچوونی کاستێلس ئەمڕۆ یان ئەم چاخە زانیارییەی تیادەژین ڕێگا لەبەردەم فۆڕمێ تر لە ململانێی دەسەلات دەکاتەوە ئەوەش ململانێی کولتوورییە کە لەلایەن مێدیاکانەوە پیادەدەکرێ. ئەمە ڕاستە و ئەو دەسەلاتەش بەبێ ئەملاوئەولا دەرئەنجامێ دیاری ئەو دەولەتە زانیاریەشە کە پاڕادیگمی زانیاری دروستیکردووە بەلام دەسەلات لەژێر جەبەرووتی پاڕادیگمی زانیاری نوێ هەروەك دەسەلات کاردەکا و ناوەڕۆکی هەر برتییە لەو ناوەڕۆکەی گشت دەسەلاتێ کلاسیك هەیەتی کە ئەوەش دەستبەسەرداگرتن و بردنەڕێوە و سەرپەرشتیکردنە و یان لەهەمووی گرنگتریش هەولدانە بۆ بەهێزکردنی بناغەکانی ئەم دەسەلاتە کە ئەوەش لە بنەڕەتدا ماهیەتی نامرۆییە. تائێستاش پاڕادیکمی ناوبراو تەیتوانیووە ئەم ماهیەتە بگۆڕێ (واتە ماهیەتی کلاسیکی دەسەلات) و بگرە فۆڕمی تریشی داڕشتووە و ڕێگای لەبەردەم دەسەلاتدا کردۆتەوە کە بتوانێ خۆی بەتازەترین شێوە بپارێزێ. چونکە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری دەسەلاتی ڕاستەقینە دەخاتە دەست ئەوانەی

نێت سەرپەشتی دەکەن و هەروەها گەێنەر و پەرەپێدەری سێستەمی نێتی زانیاری نوێشن. هەروەك لەمەوبەریش باسمان لێوەکرد ئەوی ئابووری گلوبالی هێناوەتە دونیا ئەوە پاڕادیگمی زانیارییە کە ئەم ئابووریە بۆ ئەم پاڕادیگمە ئەمڕۆ بووە بە دوا جۆری دەسەلات و هەروەها ئەم ئابوورییە بۆئەوەی کاری خۆی بەباشی ئەنجامبدا پێویستی بە دادپەروەری و دیموکراسیەتێ بالا و گلوبالە. ئەگەرنا ئەوە ئەم ئابووریە گلوبالە بەدەست چەند کۆمپانیا و ولاتێکەوە دەبێ و خودی دادپەروەری و دیموکراسیەتەکەش هەر لەو جوگرافیایەدا قەتیس دەبێ کە ئابوورییە گلوبالەکە پیادەدەکا. بەمە دادپەروەری و دیموکراسیەت بەلۆکالی دەبێ و ئاکامەکانی ئەم بەلۆکالیبوونەش هەر ئەوە نابێ کە ئەم دیموکراسیەت و دادپەروەرییە لۆکالە لەژێر هەڕەشەی شەپۆلەکانی دەسەلاتی ئەم ولات و کۆمپانیایانەدا دەبن بەلکو ئەو بەشە جوگرافیەی، کە بەخۆی بەشە گەورەکەی جیهانە، نەك هەر بەرامبەر بە ئابووری و کولتووری ئەوی تر هەمیشە لەحالەتی دژەگەرایی و پەرچەکرداریدا دەبن بەلکو لەپێش هەمووشتێکەوە بەرامبەر بە خودی واتای دادپەروەری و دیموکراسیەتی ئەویتریش لەم حالەتەدا دەبن و، هەمیشە بەچاوێ پڕ لە گومان و بێ بەهایشەوە دەڕواننە ئەو دەستکەوتە کۆمەلایەتی و کولتووریانەی ئەو بەشە جوگرافیەی کە سەرپەشتی جیهاندەکا. ئەمانە وامان لێدەکا پێ لەسەر ئەوەداگرین کە دۆزی ڕاستەقینەی چاخی زانیاری پڕە لە نادلنیایی. ئەم نادلنیاییەش ئاکامی زۆر خراپی لەسەر گشت ئاستەکان هەر لە ئاستی ئابووری و سیاسی و کۆمەلایەتیەوە تادەگاتە کولتووری و ئیتنی و جوگرافی و دەروونی خستۆتەوە. هەروەها ئەم نادلنیاییە زۆرترین پەرتی فرێداوەتە ناو ژیانەوە و گەشەێ فرە جەمسەر و جۆراوجۆریشی دروستکردووە. ئەم لایەنانەش بە گۆڕانی تێگەیشتن بۆ کات و شوێن ڕەهەند و ئاقاری تری وەرگرتووە. چونکە ئەو مانایەی شوێن لە کۆمەلگە زانیاریەکانا بەخۆوە گرتوویەتی ئەوە نییە کە لە دەرەوەی ئەم کۆمەلگانەدا هەیەتی. هەر ئەم شوێنەش لەناو کاتێکدا بەرجەستەکراوە کە زۆر بەئەلەکترۆنی کراوە. بەکورتی باس و خواسی کاستێلس لەسەر جەوهەری گۆڕانەکان و شێوەی گەشەی سەردەم گەلێ تەوەر و لایەن دەگرێتەوە کە کات و شوێن یەکێکە لەتەوەرە گرنگەکانی. چونکە داهاتنی پاڕادیگمی زانیاری مانایێ تری بۆ کات و شوێن دۆزیوەتەوە و تەماشا کردنمانی بۆ کات و شوێن بەتەواوەتی گۆڕیووە. ئەو دید و ڕوونکردنەوانەش کاستێلس لەبارەی کات و شوێنی چاخی زانیاری

بەرهەمی دێنێ بەو گۆڕانکاریانەوە وابەستەیە کە هاتۆتە سەر ئەم کات و شوێنە (5). بەلام ئەم کات و شوێنە لەمیانەی دوو واتاوە ڕووندەکرێنەوە کە ئەوانەش بریتین لە مەودای شەپۆل و مەودای شوێن. بەهۆی ئەم دوو واتایەشەوە کاستێلس هەولدەدا زۆربەی تێگەیشتنەکانی لەسەر کات و شوێنی نوێ پراکتیزە بکا. کاستێلس جەغت لەوەدەکا کە ئەوی بناغەی ماتریالی مەودای شەپۆلە ئەوا تەکنەلۆژیای زانیارییە و، ئەم مەودای شەپۆلەش بەدەوری گرێکانی نێتۆرك دا کۆدەبێتەوە. ئەم مەودایە پێوەندیێ وابەستەیی بەو گەشەیەوە هەیە کە هاتۆتە سەر شارەکانی سەردەمی زانیاری. ئەم شارانە کە بەنێتۆرکەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە و گەیاندنێ ئەلەکترۆنی کارەکانیان مەیسەر دەکا لە زیادبووندان. بەواتاێ تر ئەو شارەی ئەمڕۆ لە لەدایکبوونداپە شارێ زانیارییە و هەموو فۆرمە کولتووری و کۆمەلایەتیەکانی ناو ئەم شارەش هەر بەرهەمی ئەو خۆ بەزانیاری کردنەیەتی. سەرەتاکانی سەرمایەداری گەلێ شاری پیشەسازی هاتنە دونیا کە ناودارترینیان شاریManchester مانشێستر ی بەریتانی بوو بەلام ئەمڕۆ لەم قۆناغە پۆست پیشەسازی و زانیاریگەریەدا گەلێ شاری زانیاریمان بەرچاودەکەوێ کە ناودارنرینیان شاریSilicon Valley سیلیکۆن ڤالی ئەمەریکیە. لە خاسلەتە سەرەکیەکانی شاری زانیاری تەنیا ئەوە نیە کە پێوەندیەکان بە نێتەوە بەیەکەوە گرێدراون بەلکو ئەوەش کە ئەم جۆرە شارانە لەژێر کاریگەری تەوژمی شوێن و کولتوورێ ترانس ناسیۆنالیدان و، هەروەها ئەم شارانە خاوەنی ئارکیتۆکتوورێ (بیناسازی) پۆست مۆدێرنیشن، کە ئەمە بەخۆی وادەکا شارە زانیاریەکان لە شارە پیشەسازیەکان بە ئاسانی بکرێ جوودا کرێتەوە. ئەم گۆڕانەش لەڕووی ئارکتیکتووریەوە تەنێ کارگە و شوێنی دامەزراوە ڕەسمییەکانی نەگرتۆتەوە بەلکو ڕێگاوبان و کتێبخانە و دیسکۆتێك و یاریگا و سەنتەرەکانی کڕین و فرۆشتنیشی گرتۆتەوە(6). ئەمانە تاڕادەیەك پێوەندیێ زۆریان بە گەشە و گەورەبوونی شارەکانەوە هەیە کە ئەوەش چەند شارێکی گرتەوە لە دوای ئەو گۆڕانەی بەهۆی تەکنیکی گەیاندنەوە کەوتە شارەکانەوە. بەتەماشاکردنێکی شارە گەورەکانیش لە جیهانا بۆماندەردەکەوێ کە ئەو گەشەیە چەند شارێکی بە قوولیگرتۆتەوە نەك گشت شارەکانی جیهان.
لە نووسینێ کلاسیکیشدا بەناوی (شارەکانی جیهان) پێتەر هالPeter Hall سەبارەت بە فراوانبوونی شار لە جیهان باس لە سێ فاکتە دەکا کە برتیین لە یەکەم: گەشەی بەردەوامی دانیشتوان، دووەم: گوازتنەوە لە گوندەکانەوە

بەرەو شارە پیشەسازی و خەدەماتیەکان و سێهەم: بەرزبوونەوەی شارنشینی لە شارە گەورەکانا(7). سەرباری ئەوەی ووترا ئەوش دەلێین، شوێن بەجۆرێ ئالۆز ڕێکخراوە و هەموو ئەو مەرجانەی تیایە کە دەولەتی زانیاری یان کۆمەلگەی زانیاری داوایدەکا. بەخۆی پێوەندیێ زۆر لەنێوان نێتۆرك و شوێندا هەیە و تەکنیکی نوێش ئەو تێگەیشتنە کلاسیکەکەی لەسەر شوێن باو بوو گۆڕیووە. هەروەها ئەو ڕۆلەی شوێن لە نێتۆرك دا هەیەتی کاریگەری خۆی بەسەر مانای کولتوور و ناسنامەشەوە بەجێهێشتووە. کە باسیش لە تازەیی شوێن یان تازەیی کات دەکرێ ئەمە مانای ئەوە نییە کە مرۆڤایەتی بە باشترین فۆرم لە کات و شوێن گەیووە. چونکە ئێمە لەژێر زەبری پاڕادیگمی زانیاریدا بەم فۆرمە لە کات و شوێن گەیشتووین و نەك لەژێر زەبری شتێ تر و هەروەها جارێ بەشێ لە جیهان تابلێی بەم فۆرمە تازەیەی کات و شوێنەوە نەبەستراوەتەوە. یان ئەم فۆرمە تازەیەی کات و شوێن بۆ ئەمان ئەو مانایەی نییە. چونکە ئەم کات و شوێنە تازەیە کاتێ دەکەوێتە کارکردن کە ئابووری و تەکنیکێ تازە لەئارادابێ ئەمەش دوای سالانی 1980 کان دەستیپێکرد. لەبەرئەوەی سیستەمێ ڕێکخستن و کارکردن و بەڕێوەبردنی نوێ هاتەکایەوە و داواکانی ئەم سیستەمە لەهەموو ڕوویێکەوە تازە و ئالۆزبوو. بۆیە هەج گۆڕانێ کە لەئاکامی ئەم سیستەمەوە هاتۆتەکایەوە تایبەتە بە بارودۆخی کۆمەلایەتی و ئیداری ئەو ولاتانەی ئەو مانا نوێیانەی بۆ کات و شوێن دروستکردووە. هەروەها گۆڕانی بناغە مەتریالیەکانی کات و شوێن(شار) گۆڕانی مانای ژیانی بەدواهات. چونکە مێژوو لەدوای ئەم گۆڕانانە لە بێ ئاڕاستەیدا دەژی.

ئەو فۆرمە کولتووری یان شێوازە ژیانە تازەیەی لە شارەکانا بەدیدەکرێ کە لەئاکامی گۆڕانی کات و شوێنەوە هاتۆتەکایەوە کاریگەریێ سەیری کردۆتە سەر ژیانی لاوان و منالان لەناو خێزاندا. ئەم گۆڕانەش خێزانەکانی بەسەر چەند ژوورێ دابەشکردوە و هەریەکەش ژوورێaceCybersp ی بۆخۆی دابینکردووە کە مالی کردووە بە بەشێ لە شاری زانیاری. بەواتای فراوانتر، هەموو کونووقووژبنەکانی شاری زانیاری باس لەوە دەکەن کە ئێمە لەCyberspace دا دەژین و کاتێکیش لاوان یان منالان دەچنە ناو ژوورەکانیان نایانەوێ/ ناتوانن بێنەدەرێ و تا سەر ئێسك بە وێنەکانی" تەکنەلۆژیای ناو مال" دەگلێن (ڤیدیۆ، سیدی، سەتەلایت، نێتی کۆمپیوتەر). بۆیە بێ بەها نییە گەر لێرەدا جەغت لەوەبکەین کە لەسەردەمی ئەمڕۆدا کە ڕۆژێ دیگیتالیزەکراوە، مال بووە بە بەشێ لە کارگەکان و بەرهەمە هونەریە

نوێکانیش (گۆرانی، مۆسیقا، فلیم ) کە مالیان کردووە بە ستۆدیۆی هونەری پشتگیری لە هونەری پۆرنۆگرافی (خەلاعی) و سینیستی (بێ خەیال، بێ ئایندە) بێمانا دەکەن کە کەسەکان لەوە دەخا بیر لە بێمالی و بێ ئایندەی خۆیان بکەنەوە و لەوە تێڕامێن لە زەمەنێ پچڕپچڕ دا دەژین. ئەم جۆرە هونەرە کە چەندین سیمبۆلی هونەری دروستکردووە و یەك کۆمەل مۆدەی لەتەك خۆ هێناوە بووە بە نیشانەیەکیش لەسەر داهاتنی ئازادی و دیموکراسیەت و دروستبوونی مرۆڤێ تازەی باوەڕ بەخۆ. بەلام موخابن ئەم مرۆڤە تازەیە بووە بە شمەکێ بەدەست بازاڕی زانیاری نوێوە و هەروەها ئەو تەکنیکە نوێیەش کە هەر خۆی بەرهەمی هێناوە کردوویەتی بە مرۆڤێ تەنیائامێز و پەرت. لەڕێگای ئەو جۆرە هونەرانەشەوە کە مرۆڤی تازەی پێگلێنراوە کارگەکانی بلاوکردنەوە و پەخشکردنی گۆرانی و مۆسیقا و فلیمی منالان(Disney) زۆرترین پارە بەدەستدەهێنن و زۆرترین دەسەلاتیان بەسەر منال و لاوانەوە هەیە. لاوان و منالان لە ولاتانی ئەوروپا و ئەمەریکا زۆرترین یارییان پێدەکرێ و هەریەکەیان لە ژوورەکانیان ئیمپراتۆریەتێکیان بۆخۆیان دروستکردووە و خەونەکانیان تەنێ بووە بەوەی چۆن ئیمزای گۆرانی بێژێکیان دەستکەوێ و یان لە ئاهەنگێ چاویان بەو هونەرمەندانەبکەوێ کە مێدیاکان کردوویانن بە فریشتە. لاوان دەیانەوێ بلێن سەردەمی دۆنکیشۆت بەسەرچوو و ئەمڕۆ گەڕان و موغامەراتەکان دەکرێ لە ژوورێ پڕ لە ئامرازی ئەلەکترۆنی بێتەدی. لاوان هەموو دەیانەوێ گرووپی خۆیان هەبێ و خەون بەوەوەدەبینن لەمالەوە چەکیان هەبێ یان لەژێر زەبری وەرزشێ زۆر ببن بە مرۆڤێ ڕۆبۆتی و کەسێ خاریق. گشت فلیمەکانی هۆلیودیش هەلگری ناوی وەك پایان، ئەبەدی، نەبوون، دوا، زەبەلاح، جەنگ، توانا... هتدن کە ئەو پەیڤانە ئەندێشەی لاوانیان داگیرکردووە. ئەلبەتە گەیشتنی تەکنەلۆژیاش بەم توانایەی ئێستا لەپشت ئەو ستاتۆسەوەیە کە هونەری ئەمڕۆ لەخۆی گرتووە. چاخی زانیاریش کە سەرەتاکانی بۆ ئەمەریکا دەگەڕێتەوە بناغەێ بەهێزی بۆ بلاوکردنەوەی کولتووری ئەمەریکی لە جیهانا داناوە. هەلگرتنەوەی کولتووری ئەمەریکی (Rap، HipHop، Playboy) لەگشت شوێنێ و لەناو گشت کولتوورەکان ( ئاریای، سامۆرای، بوودی، . . . .) بۆ ئەو گۆڕانە زانیاریە لە جیهانا دەگەڕێتەوە کە لەژێر کاریگەریی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وەك هێزێکی پاش جەنگی جیهانی دووەم هاتەکایەوە (8).

سەرباری ئەوی ووترا دەکرێ ئەوەش بووترێ کە، بارودۆخی دوای جەنگ جیهانی دووەم ڕۆڵێ زۆری دی لە دەرخستنی ئەمەریکا و، هەروەها دەرکەوتنی کۆکەکۆلا و پیشەسازی سەیارەش مانای خۆیان لە داگیرکردنی بازاڕی ئەوروپا دی و یارمەتیدەرێ گەورەش بوون بۆ بەگشتیکردنی شێوازی ژیانی ئەمەریکی. ئەمانە لەلایەك و لەلایەکیتر گەشەی هونەری ئەمەریکی لەژێرکاریگەری مۆسیقای نوێ و فلیمەکانی هۆلیود توانرا لاوانی ئەوروپا بخاتە ژێر ڕکێفی کولتووری ئەمەریکیەوە. لەم دوایەشدا گەشەی ئەم کولتوورە لەژێر زەبری تەکنەلۆژیای زانیاری کارێ ئەوتۆیکرد کە خۆی فرێداتە ناو گشت خێزانێکەوە و کاریگەرێ گەورە بەسەر منالانەوە بەجێدێلێ. گەر تەماشای ئەو سیمبۆلانەش بکەین کە لاوان هەلیدەگرن هەموو ئەو سیمبۆلانەن کە مێدیاکان پەسەندیدەکەن ( Nike، Pumma، Fila و. .... ) و بەجۆرێ واش بە ژیانیان تێکەلبوونە کە بوونە بە ڕێگایەك بۆ لاوان بۆ ماناداان بە ژیانییان و دیاریکردنی بوونی کولتووریان. سیحری ئەم سیمبۆلانە لەوەدایە کە گشت چین و توێژ و ڕەگەزێ هەلیدەگرێ هەر لە نیویۆرك و لەندەن و بۆدابست تادەگاتەشەنگەهای و کوردستان. کەواتە کاتێ کە تۆ یەکێ لەم سیمبۆلانە یان سیمبۆلی وەك کۆکاکۆلا یان ماکدۆنالدس هەلدەگرێ تۆ هاولاتیێ زۆر جیهانیت و کەس بەتۆ نالێ کە تۆ ئەمەریکی نیت و تۆ ئاسیایت یان کەس پێتنالێ کە تۆ ڕەش پێستی یاخود سپی پێستی، هەژاری یان دەولەمەندی. ئەم سیمبۆلانەش کە بەرهەمی شارستانی تازەن بەجۆرێ هاتوون کە بۆ هەمیشە نەمر بن و لە گشت کات و شوێنێ مانا بۆخۆیان بدۆزنەوە. گەشەی تەلەفزیۆن و پەخشی سەتەلایت و بەگشتی نێتی گەیاندن کارێ وایکرد کە کولتووری ئەمەریکی نەك تەنیا لە ئەوروپا بەلکو لە گشت بەشەکانی جیهان گەرادانێ. لە ڕۆمانەکانی بۆ نموونە ویلیام گیبسۆنWilliam Gibson دا لەوەدەگەین کە چۆن فۆرمی کولتووری سەردەم هەروەها چۆن نەوەی نوێ و کۆمەلگەکانی میلینیۆمی نوێ کەوتۆتە ژێرکاریگەری تەکنەلۆژیای تازەوە. ئەو گەردوونەی گیبسۆن وێنەی دەکێشێ لەلایەن مۆنۆپۆلە مولتی ناسیۆنالەکانەوە بەڕێوەدەچێ و شاریش لەژێرسایەی تەکنیکی نوێ پڕ بووە لە" دوا مرۆڤ" Post-human. ئەم دوا مرۆڤە لەوەگەیووە کە ئەم تەکنەلۆژیایە نائاساییە و هاتووە تابمێنێتەوە و بەتەماش نییە بڕوا(9).

دەکرێ بووترێ ئەو ئاڕاستە مێژووییە نوێیەی تیایدەژین، کە لەمەوبەریش ئاماژەمانپێکرد، مانای تازەی بە تێگەیشتنمان لەبارەی فۆڕمی کارکردن لە

شار و دەسەلاتی کات لە شار(واتە شاری زانیاری) داوە. ئەم گۆڕانەش هەموو دونیای نەگرتۆتەوە و تائێستا شارێ زۆر لە جیهانا هەیە کە کەر و عەرەبانە لەگەل مرۆڤ و سەیارەکان لەسەر هەمان ڕێگا دەڕۆن و خەلکی لەمبەرو لەوبەری جادەکان دانیشتوون بۆ فرۆشتنی ووردەواڵە و شتومەك. ئەو ولاتانە نەبێ کە تەکنیکی گەیاندن تیایا زۆر گەشەیکردووە ئەم تێگەیشتنە بۆ مانای جێگا و کات بوونی نییە. لەبەرئەوەی ئابوورییەکانی ئەو ولاتانە بەجۆرێ زانیاری گەشەدەکا و ئەمەش داوای گۆڕینی سێستەمی گەیاندن دەکا و ئەمەش وادەکا چ کات و چ شوێنیش بەدووی شیاوی تازە و بواری نوێدا بگەڕێن. ئەمە لە شوێنێ وەك نیویۆرك بەباشی دەبینرێتەوە بەلام لە شوێنێ وەك کابولی ئەمڕۆ پێچەوانەکەی دەبینین و کات و شوێن نەك بەرەو پێشەوە نەچووە بگرە زۆر لە لەمەوبەریش لەدواترە. هەروەها کاتی ئاسای لە ولاتانی زانیاریدا بە کاتێ تر یان بەفۆرمێ تر لە کات بەلەجیاتی دەکرێ کە ئەوەش کاتی ڤیژواڵە. گەر لە ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاریدا لە کارگەکان و یان لە مالان و یان لە دەرەوەی کاتی کاردا(ئەو کاتەی پێیدەلێن کاتی خۆشی) تەماشای شێوەی کارکردنی کات بکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە جۆرە کاتێ تر لە گەڕدایە کە ئەو کاتە نییە کە لەو ولاتانەدا کاردەکا کە خاوەنی پاڕادیگمێ زانیاری دیاریکراو نین. نەك هەر ئەوە بەلکو ئەوانەی لە دەرەوەی تەوژمی گلوبالی پاڕادیگمی زانیاریدان خۆیان بەدوژمنی هەرە گەورەی ئەم مانا تازەی کات و شوێنیش دەزانن.

**گفتوگۆی دووەم:**

## کۆمەڵگەی زانیاری نوێ و ئاکامی گۆڕانکارییەکان

**ڕەوتی باسەکە:**

دەمانەوێ لێرەدا شیاوی لەبەردەم گفتووگۆکردن لەسەر باسێ بکەینەوە کە تایبەتە بە تێگەیشتنە ئیمپیری و تیۆرییەکانی *کاستێلس* سەبارەت بە هەندێ دیاردە و ڕووداو کە لەمیانەی توێژینەوەکانی تایبەت بە چاخی زانیاری وەدەستمانهێناوە. گفتووگۆکەش لەسەر ئەو باسە تەنێ لەڕوویەکەوە تێگەیشتنەکانی کاستێلس بەر شیکردنەوە و توێژینەوە دەخا و بەردەوامیش دەبێ تا ئەو شوێنەی کە پێویستدەکا وابستەییە پەراوێزیەکانی کۆمەڵگەی لۆکال بە کۆمەڵگەی گلوبالەوە ڕوونکرێتەوە. چونکە ئەوەیان دەبێ بە تەوەری گفتووگۆیەکی تر. بەمجۆرە ئێمە تەنێ کار لەسەر توێژینەوە و شیکردنەوەی میکانیزمی دەرکەوتنی دیاردەی تەکنەلۆژیای زانیاری دەکەین و ئاکامی ئەو گۆڕانکاریانەش دەستنیشاندەکەین کە لەسنووری ئەم گفتووگۆیەدا گرنگداردەبن.
بەپێی مێتۆدی باسەکە هەولدەدەین ئەم چاخە زانیارییە ڕوونکەینەوە و ناتەبایی و ناچووستی ناو کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان کە چەندین ئاوەڵناوی ناڵێکچوو لەخۆدەگرێ بەردەستبخەین. ناکرێ نە تێکڕای بۆچوونەکانی ئەم پرۆژە نێودەولەتییەی کاستێلس پەسەندبکەین و نەش سەرجەم ئەو دیتنانەی لەم کارەدا سەبارەت بە دیاردە ئالۆز و زۆر هەستیارەکانی سەردەم بەرهەمهاتوون فەرامۆشبکەین. کەواتە ئەوی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە لەلایەك گفتووگۆیە لەتەك ڕوانینە ئیمپیریی و تیۆرییەکانی ئەم کۆمەڵناسە جیهانییە و لەلایەکی تر کۆششی ئەوەشدەکەین لەمیانەی گفتووگۆکەدا فسە بهێنینە پێشەوە لەسەر نادادپەروەری و پاڕادۆکسەکانی ناو کۆمەڵگەی نێتۆرکNetwork و پەیتاپەیتاش گرێیدەینەوە بەو لایەنانەی پێوەندی بە توێژینەوە و تەماشاکردنەکانی ئەم کۆمەڵناسە نێودەولەتیەوەیە هەیە. چونکە ئەوی کاستێلس کردوویەتی بەرهەمهێنانی نووسینە! بەلام چ نووسینێ ؟ ئەلبەتە ئەو نووسینەی لە ئاستێ تیۆری بالادا و لە چوارچێوەی مێتۆدێ توێژینەوە و شیکردنەوەی ئیمپیری بەریندا ئەنجامدراوە. کاتێ کە نووسینیش لەم ئاستەدا دەبێ بەدڵنیاییەوە زۆرترین بەرپرسیاریەتی لە ڕوونکردنەوە ولە لێکدانەوە

لەئەستۆدەگرێ. یان ئەم شێوە نووسینانە هەولدەدەن خۆیان غەرقی گەورەترین ئەرك و بەرپرسیاریی مرۆیی و ڕەوشتی بکەن. ئەم جۆرە نووسینانە بەرەو ئەو بینینەمان دەبەن کە نووسین لە جیهانا تا ئەمڕۆ هەر لەنێوان هەول بۆ ڕوونکردنەوە و هەول بۆ گۆڕینی جیهان قەتیسماوە. جیهانیش وەك هەموو دەبینین کە بریتییە لە دەسەلات لە گۆڕاندایە. وەلی گۆڕانەکان لە ناوەڕۆك و لە ناواخنی دەسەلات کەمناکەنەوە بەقەدئەوەی کە فۆڕمی دی بۆ دەسەلات دادەڕێژن و ئەم فۆڕمانەش ماهیەتی دەسەلات بتەوتر و بەتەمەنتردەکەن و بگرە ڕووخساریشی ئالۆزتر و نادیارتردەکەن. بەدلنیایشەوە دەبێ پێ لەسەر ئەوە داگرین کە ئەم گۆڕانانە ئەوەمان لەبیرنابەنەوە کە دەسەلات هەمیشە لەبەردەمماندایە و لەگشت شوێنێ ئامادەیە. ئەلبەتە ئەو شوێنانەش کە ناڕەوایی و نادادپەروەریی تیابلاوە ویست بۆ دەسەلات تیایانا لە لوتکەدادەبێ. بەمشێوەیە دەسەلات لەهەموو لایەکەوە، لە چوارچێوەی سەیرسەیر(سێکسوالی، فەنەتیستی، و. . . ) و لە شێوازی جۆربەجۆر(ناسیۆنالی، پۆست ناسیۆنالی، ئاینی، زانستی)، گەمارۆماندەدا و ئەوەشی پێیدەلێین نووسین، کە یەکێکە لە ڕووبەرەکانی پیادەکردنی دەسەلات، زوو دەتوانێ گوزارە لەو جۆرە دەسەلاتە بکا کە لەدواین باردا دەکەوێتە ژێر سیحریەوە. بۆیە نووسینی پاتۆجێنی(نەخۆشیزا، دەبێ بە هۆکاری نەخۆشی) یان ئەو نووسینانەی پڕن لە تووڕەی و لووتبەرزی یان نووسینی ماندوو یاخود ئەو نووسینانەی کە بۆنی دووبەرەکایەتی و ئاژاوە و بێ ئومێدیان لێدێ هەر حەزی دەسەلاتدارەکان پڕناکەنەوە بەلکو لە هەولێ گەورەشدان بۆ دروستکردنی دەسەلاتێ بەناوی گۆڕانخستنەئارا و داکۆکیکردن لەمەی پێیدەلێن ڕاستی. بەلام ئەوی کاستێلس لە دووتۆی ئەو سێ بەرگەدا(گەشەی کۆمەلگەی نێتۆرك، دەسەلاتی ناسنامە، پایانی هەزارینە-میلینیۆم-) لەبارەی چاخی زانیاری بەرباسیخستووە ناکرێ بە نووسینێ لاوەکی و بێ ئاراستە تەماشاکرێ. ئەمەش بەپێی ئەوەی ئەم نووسینە یەکێکە لەو جۆرە نووسینانەی کە دەخوازێ دەسەلات ڕوونکاتەوە و شوێنە تازە و شاراوەکانی دەسنیشانکا(ئەو ڕەخنانەی لەم گفتووگۆیە و لە گفتووگۆکانی تر لەم کۆمەلناسەی دەگرین و ئەو ڕەخنانەش کە لێیگیراوە و ئێمە دووبارە بەرباسیاندەخەینەوە ماهیەتی ئەم پڕۆژەیە بێ بەهاناکەن). ئاشکرایشە ئەوی دەسەلات هەمیشە پێی سەخلەت دەبێ ڕوونکردنەوەی گۆڕانەکانە و توێژینەوەی گرفت و نایەکسانییەکانە نەك وەك ئەوەی کە هەندێ دەیکا، واتە خۆکەنارگیرکردن و خۆدزینەوە لە ڕاڤەکردنی جەوهەری

گۆڕانکارییەکان و بنەچەی ناچووستییەکان. ئەمەش بەخۆی کێشە گەورەکە و هەڵە مەزنەکەیە بەتایبەت ناتەبایی و نادادپەروەری لە جیهانا هەروەك کەشەی زانینی تەکنیکی و زانیاری ئەلەکترۆنی لێهاتووە کە بە بەردەوام لە نەشونمادایە و لە هەموو چرکەیەکیشدا لە خۆگلۆبالکردندایە.
بەسێرکردنێکی چوارچێوەی کۆمەڵگەی ئەمڕۆشمان ئەوەمان بە ڕوونی بۆ دەردەکەوێ کە ئەم کۆمەڵگەیە کۆمەڵگەی زانیارییە. بەلام ئێمە هەر لەنێو ئەم کۆمەڵگەیەدا ناژین. ئێمەی مرۆڤی ئەم چاخە کراوین بە بوونەوەری ناو چەندین کۆمەڵگەی جۆراوجۆر یەك لەوانە کۆمەڵگەی زانیارییە، بەلام ئەم کۆمەڵگەیە دیارترین و تایبەتمەندترین کۆمەڵگەی سەرزەمینی ئەمڕۆمانە. ئەم کۆمەڵگەیە بەجۆرێ و بۆ مەبەستێ و بە ئامانجێ هاتووەتەکایەوە کە دەخوازێ سەرنجمان بۆ ئەوە ڕاکێشێ کە ئارەزووی گۆڕین و جۆراوجۆرکردنی تێکڕای کۆمەڵگەکانی تر دەکا و، خۆی وەك دوا مۆدێل و شێوازی کۆمەلایەتی، ئابووری و کولتووریش دەردەخا. زانیاری ئەم کۆمەڵگەیە لەسەر بناغەی تەکنەلۆژیای زانیاری بوونیادنراوە و فاکتۆمێ بناغەیشە بۆ خولقانی دەولەمەندی، دەسەلات و زانین. ئەم تەکنەلۆژیای زانیاریەش نێتۆرکێکی ئەوتۆی بۆ خۆی پێکهێناوە کە لەتوانایدایە گشت چالاکییەکانی سەرمایە، هێزیکار، زانیاری و بازاڕ لە سەرتاپای دونیا بە ئارەزووی خۆی ڕێکخا. دامەزرێنەرانی ئەم نێتۆرکە بەبێ گوێدانە هەندێ ناوچە، خەلك، کۆمەڵگا و کولتوور و ئابووری کارەکانیان بەهۆی بازاڕێکی نێتۆرکی مالی(نەختی، فینانسی) گلوبال جێبەجێدەکەن و ئەوی توانای بەشداریکردنی ناو ئەم یاری نێتۆرکەشی نەبێ ئەوا بەدلنیاییەوە لە دروستکردنی دەولەمەندی، دەسەلات و زانینێ گلوبال بێ ماف دەبێ و، لەهەمووی سەیرتریش وایلێدەکرێ کە تەنێ لە خەونی لۆکالی خۆیدا بمێنێتەوە. ئەلبەتە ئەم خەونە لۆکالیانەش گەلێ شتیان بەدەمەوەدەبێ کە یەك لەوانە ***پیشەسازی تیرۆریزمە*** کە دواتر لە پەڕەگرافی ***ئەمەریکا و کولتووری دیگیتال*** دێینەوەسەری.

## زانیاریگەریی و فۆڕمی تر لە هەژاری

ئابووری، کۆمەڵگا و کولتوور ئەمانە داوای ئەنجامدانی توێژینەوە و شیکردنەوەمان لێدەکەن، ڕاڤەکردن و لێکدناەوەی ئەمانە لە تێڕامان و لێخوردبوونەوە فەلسەفی و تێگەیشتنە شیعرگەرایەکانمان دوورناخەنەوە. ئەمانە (ئابووری، کۆمەڵگا و کولتوور) ئەو شتانەن کە لەدواین باردا داوای زۆرترین

توێژینەوەمان لێدەکەن و قووڵترین و گەورەترین بەرپرسیاریەتیشمان یاددەخەنەوە. ئێمەی مرۆڤی سەردەم کە ئەوانە دەخەینە بەر توێژینەوە بەوە پتر خۆمان لەبواری زانستە مرۆیەکان نزدیکدەکەینەوە و زۆرتریش لەوەدەگەین کە توێژینەوەی ئەوانە داوای ڕوناکبیریێ ئەکادیمیمان لێدەکەن و نووسینهایەکی ئەوتۆ گرنگ و پێویستدەکەن کە فاکتەئامێز و ئارگومێنتکارن و لە بۆچوونی پەلە و دیدی سەرپێی و تێکەڵاو بەدوورن.

بۆ ئەوەی شتێ زووتر بێنە نێو باسەکەوە ئەوا هەر لەم سەرەتایەوە ئاماژەبەوەدەکەین کە، لەم چەند دەیەی دوایدا شێوازێ بەرهەمهێنانی پیشەسازی، کە کۆمەڵگەهایەکی تایبەتی خۆی هەبوو و قۆناغێ دیاریکراویش بوو لە ژیانی مرۆڤ، لەگەڵێ جێگا لەسەر ئەم پلانێتەی لەسەری دەژین ڕێگای بۆ جۆرێ تر لە شێوازی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و بردنەڕێووە و ڕێکخستن چۆلکرد کە ئەوەش *شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە*. ئەم شێوازە نوێیەش بوو بە هۆکاری ئەوەی کە تووڕهەڵدرێینە ناو دونیایەك لە گۆڕانکارییەوە. گۆڕانکارییەکان سامناك و پڕ لەمەبەست و لە کردەن. گۆڕانکاریەکان بە هاتنی زانین و زانیاریهایەکەوە گرێدراون کە زۆر تایبەت و دەگمەنن و، ئەو شوێنانەش کە لەسەر ئەم پلانێتەی ئەمڕۆمان بە بەرهەمهێنان و وەبەرهێنانی ئەم زانین و زانیاریانەوە سەرقاڵن زۆرکەمن. شێوازی بەرهەمهێنانی ئەم زانیاری و زانینەش دۆزێ ئەوتۆی لە جیهانا دروستکردووە کە ڕۆژانە پێویستی بۆ زانیاری و زانین هەر لە نەشونمادایە و جۆرە تێگەیشتنێکیش لەنێو خەڵك دا باوە کە ئەم شێوە زانیاری و زانینانە لە دژواری و سەختی بوارە جۆراوجۆرەکانی کار و ژیان و کاتی ئازاد(وەقتی فەراغ) کەمدەکاتەوە و ڕێگا لەبەردەم ئاسانکردنی ئەرك و بەئەنجامگەیاندنی کارەکان دەکاتەوە. هەر ئەم زانیاری و زانینە مانایێ گەورەشی لەخۆگرتووە و لەگەڵ تەکنەلۆژیای زانیاری نوێدا ئەوەش سانا بووە کە زانیاری و زانین کۆکرێتەوە و ئەمجار پەخش و بڵاویشکرێتەوە. ئەم لایەنەش بەخۆی مەسەلە زۆر گرنگەکەی کۆمەڵگەی زانیاری نوێیە و داڕێژەری ئەو بناغە نوێیانەیە کە کۆمەڵگەی ئەوڕۆی پێبوونیاددەنرێ. واتە گۆڕانکاریەکان بەزۆری لەژێر ڕکێفی مەسەلەی بەرهەمهێنانی زانیاری و زانین و دواتر پەخش و بڵاوکردنەوەی ئەم زانیاری و زانینە وەگەڕدەکەون. دیدە نوێکانی میکرۆئەلەکترۆنی، بەدەنگ و وێنە و پەیڤ، ئەمە ئەوانەن کە زانیارییە ڕۆژانەییە نوێیەکان دەگەێنن و ئەم دیدە نوێیانەش چارەسەری مولتی مێدیایانەیان بەوردی شیاوکردووە و

فرپێشمانیانداوەتە ناو کولتووری ورێناوی و ناو ئەو ڕاستیەی کە لەنێو و بەهۆی ئەو وێنە و پەیڤ و دەنگەوە دروستدەبێ و خۆی دەکا بە ڕاستی ڕاستیەکان. لەم بارەیەشەوە دەکرێ باس لە گەشەی گەیاندنی کۆمپیوتەریش بکرێ، و بۆ نموونە ئینتەرنێت، کە ئاماژەیە لەسەر ئەو گەشەیە و ئەفسانەێ تایبەتیشە لە ژیانی ئەم کۆمەڵگە نوێیەی زانیاریش. هەر لەمبارەیەوە دەکرێ باس لە هەندێ دیاردەی تریش کرێ کە هەر بەم گۆڕانکاریانەوە گرێدراوە وەك:پەیوەندییە کۆمەلایەتییەکان کە لەلایەن نێتۆرکەوە، کە گەیاندنێ ئالۆزە و بەری ئەو پارادیگمە زانیارییە بالایەیە کە هاتەکایەوە، مەیسەردەکرێ. کۆمەڵگە و نەتەوە لۆکالییەکان لەم دەمووەختەدا لەخۆگلوبالکردندان. ماسمێدیا دەخوازێ بێدارمانکاتەوە و ئەوەمان پێڕاگەێنێ کە ڕۆلێ گەورەی بۆ کولتوور و ئابووری و سیاسەت هەیە. ئەگەر نەیەوێ ئەوەمان پێڕاگەێنێ کە بەخۆی بووە بەوانە(واتە بە کولتوور و سیاسەت و ئابووری) و لەتوانایشیدایە وامانلێکا لە جەوهەری ڕاستییە کۆمەلایەتییەکان بگەین. هەر لەمیانەی ئەوانەشەوە کۆمەڵگەی زانیاری نوێ دەیەوێ باس لە هەلوەشانەوەی باکوور و باشوور، نێوەند و پەراوێز یان چەق و کەنار، جیهانی یەکەم و دووەم و سێهەم، تیۆری پاشکۆیەتی و کۆمەڵگەی جیهانی بکا. کۆمەڵگەی ناوبراو پێمان دەلێ کە بۆلەمەولا باس لە باشوور و یان لە جیهانی سێ ناکەین بەلکە باس لە زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی دەکەین (تایوەن، هۆنکۆنگ، سەنگافورە، مالیزیا، کۆریای باشوور. . . .) کە بووە بە ناوچەهایەکی تازە گەشەکردوو و، لەمەولی گلوبالی خۆشیدایە و شوێنێ دیاریشی لە ئابووری گلوبالدا هەیە. بەلام ئەمە ئەوە ناگەێنێ کە بۆ لەمەولا جیهانێ تر یان ناوچەهایەکی جودا یاخود هەندێ سەرزەمینی ناهاوشێوە و کەنارگیر بوونیان نییە و پەراوێزخوازی و کەنارگیری و وابەستەیەتی ڕووی لە نەمان دەنێ. کەوابێ ئەی ئەو شوێنانە کوان؟ ئەو شوێنانە، ئەو ناوچە و ئەو هەرێمانەن وان لە گشت جێگەێکدا. چونکە بۆلەمەولا ئەو شوێنانە جێگاێ تایبەت و فەزاێ دیاریکراویان نابێ. جیهان بەجۆرێ سەرلەنوێ خۆ بوونیاددەنێتەوە کە لە هەج شوێنێ نێوەندێ دامەزرێ دەکرێ لەوێدا بەدووی فەرامۆشکراو و بێکار و هەژار و داماوەکان بگەڕێین. نێوەندەکان کەمدەبنەوە بەلام چڕ و زیادلەپێویست گەشەکردوو و گلوبالی دەبن. دۆزێ ئابووری و زانیاری گلوبالی ئەوتۆ دێتە دونیاوە ئەوی بەشێ نەبێ لێی چارەنووسی پاشکۆیەتی و

هەژارییە. هەر ئەمانە دەشبن بە وەرگری زانیاری و، زانینە نوێکان و هیچ داوائکیشیان لەسەر شێوازەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی نوێوە نابێ.
بۆیە شیاوە باس لەوەکرێ کە دۆزی نوێی کۆمەلگا و ئابووری ئەمڕۆی جیهان باس لە گۆڕانکاریدەکەن. باس لەو گۆڕانکاریانە دەکەن کە وابەستەی گۆڕانە تەکنەلۆژییەکانن. هەج توێژینەوەێکیش کە لەبارەی مێژووی تەکنیك و چۆنیەتی نەشونمای پیشەسازی و زانستی تەکنیك بکرێ ئەوە بەئاسانی نیشاندەدەن کە ئەو کەڵەکەبوونی زانیارییەی ئەمڕۆ لە جیهانا بەدیدەکرێ کاردانەوەی خۆی بەسەر بەهای ئابووری زانیاری و ئابووری کۆمەلگەی تازەوە هەیە. لەهەمووی گرتگر ئەم گۆڕانکاریانە باس لە بوونی گەشە دەکەن. گەشەیەك کە بە هاتنی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە وابەستەیە. هەر ئەم گەشەیە ڕۆژانە بێدارماندەکاتەوە و بۆ گۆڕانکارییە ئابووری، کۆمەلایەتی و کولتوورییە نوێکان ئامادەماندەکا. ئەم گۆڕانانە هەمیشە وەك مەسەلەیەك لەدەرەوەی مەبەستی مرۆڤی سەردەم خۆی دەردەخا و خۆی دەکا بە پێداویسنی و ویستێ ڕاستەخۆی سێستەمی سەرمایەداری نوێ ئەمڕۆ و هەروەها دەچێتە خانەی پرۆسەی سەرلەنوێ خۆبوونیادنان و خۆئامادەکردنی ئەم سێستەمە نوێیە بۆ پێشبڕکێ و بردنەڕێووەی تر. هەر ئەم گۆڕانکاریانە زۆرجار لەپشت دروستبوونی جۆرە ترسێکەوەن کە ڕەنگە لەو ترسە کلاسیکیەی مرۆڤ لەمەوبەر لە تەکنیك هەیبووە جوداوازبێ. ترس لە تەکنیکی ئەمڕۆ ترسە لە ئاکامەکانی نێتۆرك و ئەو زانیارییە ئەلەکترۆنییەی ئابووری تەکنیکاویکردووە. هەروەها ئەو ترسەی کە بەهۆی گەشەی بیۆ-تەکنیکەوە دروستبووە و ئەو موعجیزە بیۆلۆگیە سەیرسەیرانەی لەم بارەیەوە خولقاووە مرۆڤی دووچاری گەورەترین خوریە کردووە و ئەمەش کاریگەرێ زۆریی بەسەر مەسەلە کۆمەلایەتیەکانەوە بەجێهێشتووە. ترس لە تەکنیکی نوێ وەکیتر ترسە لە خودی ئەو گۆڕانکاریانەی بەهۆی ئەم تەکنیکەوە هاتۆتەکایەوە کە توانیوویەتی جەوهەری دیاردە کۆمەلایەتی و ئابوورییەکان بگۆڕێ. بەمشێوەیە، ترسی مرۆڤی ئەمڕۆ لە تەکنیکی تازە پێوەندی بە چۆنیەتی گۆڕانکاریەکان و ماهیەت و جۆری کەوتنەوەی ئەم گۆڕانکاریانە هەیە. ئەمە پرسێکی هەمیشە ئامادە و بزێوی مرۆڤی ناو ئەو کۆمەلگە نوێیانەیە کە بەهۆی گۆڕانکاریە پەلە و قوولەکانی زانینی تەکنیکی و زانیاری زانستی کەوتوونەتە ناو ڕیزێ تێڕامان و تێخوردبوونەوەی غەریب و تایبەت.

گومانی ناوێ گەر بووترێ خوێندنەوەی گەشەی تەکنەلۆژی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا گرنگی خۆی بۆ گەیشتن لە زانیاری نوێی سەردەم هەیە و ئەو هێڵەگشتیانەش ئاشکرا دەکا کە بەشداریان لە کەڵەکەبوونی زانینی تەکنیکی کردووە. ئەم گەشەیە کە چەند ناوچەیەکی گرتۆتەوە و مێژوویەکی دیاریکراوی خۆی هەیە فاکتەێ باشیشە بۆ توێژینەوە و تێڕامان لە سەرکەوتنی ئەم چەند ساڵانەی ئابووری بازاڕی سەرمایەداری گلۆبال لەلایەك و، هەروەها بۆ گەیشتن لە خودی گۆڕانی شێوازی بەرهەمهێنان و ڕێکخستنی ئابووری لەلایەکی دی. ئەمانە هەموو لە ئاکامی شەپۆلەکانی زانیارییەوە هاتۆتەدونیا و گۆڕانە گەورەکانیش ئەو کات مەیسەربوونە کە ئەم شەپۆلانە جێگای سێستەم و ڕێکخراوە ترادیسیۆنالییەکانیان(تەقلیدیەکانیان) گرتۆتەوە و دۆزی خێزان و دەولەتی ناسیۆنالیشیان گۆڕیووە. ئەو گۆڕانانەی بەهۆی گەشەی تەکنیکی نوێ هاتووەتە سەر خێزان و دەولەتی سیاسی و ئابووری ڕۆژئاوا گۆڕانهایەکی سادە نین و واشیانکردووە کە لەناوەڕۆکی چالاکی دامەزراوە کولتووری و کۆمەلایەتیەکانیش لەڕادەبەدەر بگۆڕێن. ئەم لایەنە کە لە گفتووگۆی تر دێینەوەسەری باسێ گرنگە لە ژیانی مرۆڤی سەردەم و ئەو کۆمەڵگەیانەش کە چارەنووسیان بە کۆمەڵگەی زانیاری نوێیووە گرێدراوە. لێرەشدا بەپێویستی دەزانین بچینەوە سەر تەماشاکردنەکانی کاستێلس لەو ڕاپۆرتەی لە ئاداری 1998 بۆ کۆنفرانسێ لە ئینستیووتی توێژینەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ گەشەی کۆمەلایەتی(UNRISD) لە ژنێف ئامادەیکردووە (10). چونکە کاستێلس لەم ڕاپۆرتەدا ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە چۆن دەکارین لە کۆمەڵگەی زانیاری بژین و، بۆ ئەم مەبەستەش هەولدەدا ئاکامەکانی جیهانگیری و شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری بەر توێژینەوە دخا. بۆ ئەم مارکسەی سەردەمی تەکنەلۆژیای زانیاریش(لەنێوەندی ڕوناکبیری و مێدیای سوید کاستێلس هەر لەسەرەتاوە کە ناوی کەوتە ناوانەوە بە *مارکسی کۆمەڵگەی تەکنەلۆژیای زانیاری* ناوبرا) ئەم دوو دیاردەیە کە لە پشت گۆڕانکاریەکانەوەن بۆ تێگەیشتن لە چاخی زانیاری و جوداکردنەوەی ئەم چاخەش لە چاخەکانی تری ڕۆژئاوا فاکەرێ سەرەکیین. ئەلبەتە ناوەڕۆکی ئەم ڕاپۆرتە بەرەو ئەوەماندەبا کە بڵێین توێژینەوەی ئاوا و بۆ مەبەستی لەمجۆرە هەردەبێ ئەرکی ڕاڤەکردنی پێوەندی سیستەمی کۆمەلایەتی نوێ و بەرزبوونەوەی نایەکسانی و بلاوبوونەوەی هەژاری و ناچووستی لە نەشونما لە جیهان لەئەستۆبگرێ. ئەنجامدانی ئەمەش کارێ ئاسان نییە و سەختیە

گەورەکەشی لەوێدایە کاتێ کە کەسی توێژەرەوە لەگەڵ هەموو ئەو ڕوناکبیرییە ئەکادیمیەی هەلگریەتی باوەڕی بەوەهەبێ کە جارێ شیاویێ زۆر بۆ هاتنەدەرەوە لە گرفتە کۆمەلایەتیەکان لەئارادایە و، بەکاربردنی تەکنەلۆژیای زانیاری و گەیاندن دەکرێ لە دونیای ئەوڕۆدا ببێ بە بناغە بۆ پەرەپێدانی ئابووری و کۆمەلایەتی. بۆئەوەی مرۆڤ بکارێ هەلگری ئەم جۆرە باوەڕانەبێ و توانای ئەوەشی هەبێ ئەوە ڕوونکاتەوە کە چۆن چۆنی جیهانی کۆمەلایەتی ئێستامان لەخۆ یەکخستن و لەخۆ ڕێکخستندایە و ئەو گۆڕانکاریانەش دیارییکا کە لەم جیهانە گلوبالە ڕوودەدەن و دواتر بتوانێ هەموو ئەوانەش لە دیدی گلوبالیدا کۆیانکاتەوە بەبێ یەك و دوو ئەم مرۆڤە گرنگە ئەزموونێ بەرین و قوولی لە بواری ئابووری و کۆمەلناسی هەبێ و هەلگری زانیاری نوێش بێ لە بارەی کولتوور و ئابووری و کۆمەلگەی نوێ سەردەم. بۆیە ئەگەر بە چاویلکەکانی ئەم کۆمەلناسەوە تەماشای جیهان بکەین پێویستە دانبەوەدابنێین کە جیهان لە کۆتای ئەم هەزارینەیەدا خۆی لەناو هەلاوگۆڕانی مێژوویی دەبینێتەوە. ئەم هەلاوگۆڕانە وەك هەلاوگۆڕانە مێژووییە گەورەکانی پێشوو فرە ڕەهەندە. هەروەها ئەم هەلاوگۆڕانە تەکنەلۆژیی، ئابووریی، کۆمەلایەتی، کولتووری و سیاسیشە. ئەمە هەر ئەوە نییە کە کاستێلس بەدووی دەکەڕێ. بەلکو ئەوی بۆ ئەم کۆمەلناسە مەبەستە بەر توێژینەوەخرێ ئەوەیەکە ئەم هەلاوگۆڕانە بۆ گەشەی کۆمەلایەتی و ژیانی مرۆڤەکان دەبێ چ مانایەکی هەبێ. بەخۆی ئەمە کارێ مەزنە کە توێژەرەوە بەدووی مانای گۆڕانکاری لەناو ژیان بگەڕێ و بەتایبەت لەئەم ئێستادا بێمانای و نەبوونی ڕێزێ بۆ ژیان بووە بە ڕەوشتێ باو و هزری گشت کەسێکی داکیردووە. جا لێرەدا تێڕامانەکە هەر لەمانای ژیان و لە گرنگی ئەم گۆڕانکاریانە نییە، بەلکو لەوەشە کە ئایا ئەم گۆڕانکاریانە مانایێ هاوبەشی بۆ هەمووان هەیە یان کەسی توێژەرەوە پێویستە مرۆڤەکان بەپێی پێوەندی تایبەتیان بەم گۆڕانە کۆمەلایەتیانەوە دابەشکا؟ لەڕاستیدا دابەشکردن یان پۆلکردنی مرۆڤەکان بەپێی پێوەندییان بەمەسەلەی هاتنەدونیای گۆڕانکاری و دروستبوونی سێستەمی کۆمەلایەتی نوێووە ڕەنگە کارێ بێ کەلك بێ. ئەمەش لەسەر ئەو بناغەیەی کە گۆڕانکارییەکان لەلایەك زۆر گلوبال و پەرتەوازە و جێنەگیرن و، لەلایەکی تر ئەم گۆڕانکاریانە ئەوەندە هێزئامێز و کاریگەرن تاڕادەیەك مەحالبووە خۆدەربازکردن لێیان. ئەوەی لەحالەتی ئاوادا گرنگە ڕەنگە هەر ئەوەبێ کە هەولبدرێ قسەکردن لەسەر ڕەچەلەك و ناواخنی گۆڕانکارییەریەکان بهێنرێتە

پێشەوە و پرسیار لەسەر ئەوەکرێ کە پێیدەوترێ ئایندەمان و ئەمجار تێگەیشتن لەوەش کە چارەنووسمان لەنێو تەوژمەکانی گۆڕاندا بەرەو کوێ ملدەنێ و بەچیمان دەگەیێنێ.

هەموو ئەوانەی لە ئاکامی پەرەپێدانەکانی دیاردەی زانیاری و زانین هاتۆتەگۆڕێ و تێگەیشتنمانی بۆ دیاردەکانی ناو ژیان و بوون گۆڕیووە بەگۆڕانکاریی لەقەلەمدەدرێ. مانا و بەهای ئەم گۆڕانکاریانە یان کەلك و سوودی گۆڕانەکانی گەشەی ئابووری و بازاڕ و لەهەمووی سەیرتر مەسەلەی بارودۆخی هاتنەکایەوەی ئەم سەردەمە تازەیە بۆ هەموو کەس و چین و کۆمەلگەیەك وەك یەك نییە. بۆ نموونە بۆ دەولەمەندەکان، بۆ زانایانی تەکنیك، بۆ خاوەن کارگەکان، بۆ ئەوانەی لەبواری مێدیا و بەشە کولتوورییە گلوبالییەکان کاردەکەن مانا و بەهای تر یان کەلك و سوودێ تری هەیە لەوی بۆ بێکارەکان، بۆ هەژار و کەمدرامەتەکان، بۆ پەراوێزەکانی کۆمەلگەی ئابووری نوێ هەیەتی. ئەمە ناوەڕۆکی یان ڕاستی بوونی ئەم تەکنیکە نوێیە و زانیارییە تازەیە پووچناکاتەوە بەقەدئەوەی چۆنیەتی ڕەوتی سەرهەلدان و پەرەپێدانی دەخاتە ژێرگومانەوە و ئەو نادادوەریی و ناتەباییە بەرباسدەخا کە لە جەوهەری دیاردەی نەشونمای زانیاری و زانین دا حەشاردراوە. کەوابێ زۆر ئاساییە بۆ ئەوانەی لەژێرکاریگەریی هەژاریێ بەردەوام و لەناو سیستەمێ کۆمەلایەتی بێ گەرەنتیدا دەژین ئەوەی پێیدەلێن گۆڕانکارییەکانی سەردەمی زانیاری و شۆڕشی زانستی تەکنیکی نوێ و جیهانگیری ئابووری و زانیاری تەنێ لە ئایدیۆلۆژیایەکی سەرمایەداری نوێ بریتیبێ. هەروەها هەر بۆ ئەمانە ناوەڕۆکی تەکنەلۆژیای زانیاری واتە نوێکردنەوەی تەقینەوە کۆمەلایەتیەکان، کەمکردنەوەی کار، وێرانسازی ژینگە و چوونە ناو ژیانی پریڤاتیسێرەکردن کە ئەمانە هەموو ترسێکیان بەرامبەر بە گەشە و ئەو گۆڕانکاریانەی لەئاکامی ئەم گەشەیە هاتۆتەکایەوە، دروستکردووە. کاتێ کە ئاوڕیش لە دۆزی جیهانی نوێی ئەوڕۆ دەدەینەوە دەرك بەوەدەکەین کە ئەو جیهانە دەمێك نییە چووەتە ناو ئەم گۆڕانکارییە نوێیانەوە و بەلام ئەو سەختێ و کێشانەی لەمەوبەر لەبەردەم هەندێ کەس و چین و کۆمەلگەدا هەبوونە بە چوونە ناو چاخی زانیاری و موغامەراتە ئابوورییە گلوبالییەکانی ئەم چاخە قووڵتر و جۆراجۆرتر بوونە. ئەمە جۆرە سێرکردنێ تایبەت نییە بۆ گۆڕانکارییەکانی چاخی زانیاری و ئەو ناتەباییانەی بوونە بە بەری ئەم گۆڕانکاریانە. بۆیشە وادەلێین چونکە ئەم لایەنەی باسیدەکەین بۆ کەسێ وەك ئەم کۆمەلناسە

ئیمپیرییه مەسەلە سەرەکییەکە نییە و وەلامیشی لەمبارەیەوە بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئێمە دەبێ ئاگامان لەوەبێ کە پەرەپێدانی کۆمەلایەتی ئەمرۆ داوای دیدی ترمان لێدەکا. ئەم دیدەش بۆ ئەم بە تازەگەرییە تەکنەلۆژییەکان و بە بەها مرۆییەکانەوە وابەستەدەبێ، کە دواترخودی ئەو گۆڕانانە لەوە گرنگتردەبن و دەبنە هۆی دروستبوونی ڕێکخراو و دامەزراوی نوێ، کە ئەمەش پەیوەندییەك لەنێوان بەرهەمهێنان، فلێکسبیتێ(مرونەت)، هاوکاری(سۆلێداریتێ)، دلنیایی و بەرپرسیاریەتی دروستدەکا. ئەم کۆمەلناسە دواتر مەسەلەکە بەرەو ئەوەدەبا کە دەکرێ هەموو ئەوانەی لەسەرەوە ئامارەی پێکرا لە مۆدێلێکی ژینگەساز و کۆمەلایەتی گەشەکردوودا پێکەوەکارکەن. من بەشبەحالی خۆم ئەم لایەنە لەجۆرە دیدێ گەشبینی تەکنیکیدا دەبینمەوە کە ڕەنگە لە وێنەی زۆربووبێ. لەبەرئەوەی ئەو چەوسانەوە و داماوکردن و غوربەتەی مرۆڤایەتی بەهۆی شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازییەوە دووچاری بوو زۆر ئاساییە کە بەهۆی شێوازی بەرهەمهێنانی تەکنەلۆژیای زانیارییەوە دووچاری ببێتەوە و بگرە تەنانەت ئەوی مرۆکان لەژێر سایەی تەکنەلۆژیای زانیاری دووچاری دەبن زۆر ئالۆزتر و ناواخن جوداتر و کێشەئامێزتر ببێ لەوی پێشوو. چونکە ئەمەیان ئەزموون و دەسەلات و بەرهەمهێنانێ زۆری لەبەردەستدایە کە دەتوانێ پەلەترین و وردکارترین ڕێگا بۆ دروستکردنی دەولەمەندی و توانا بەکاربەرێ.

ئێمە لەم حالەتەدا دەکارین بچینەوە سەر تێزە بناغەییەکەی کاستێلس سەبارەت بە هۆکاری ئەو گۆڕانکاریانە و بارودۆخی گەشەی زانیاری نوێ. ئەمەش بەهۆی ئەو دەستنیشانکرنەی کاستێلس بۆ جیهانی نوێی ئەمرۆم کە ڕیشەکەی بۆ سێ پرۆسە دەگەڕێنێتەوە و ئەمەش هەر لە کۆتای شەستەکانەوە تادەگاتە کۆتای هەفتاکان دەگرێتەوە : شۆڕشی دیگیتال یان سەرهەلدانی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ، گرفتی بوونیادی ناو سێستەمی سەرمایەداری نێودەولەتی و گەشەی بزووتنەوەی کۆمەلایەتی نوێ(بزووتنەوەی مافی مرۆڤ، بزووتنەوەی ئافرەتان، بزووتنەوەی ژینگە و. . . ). ئێمە لێرەدا دەمانەوێ بەئاگاییەوە ئامارە بەوەبکەین کە ئەو کۆمەلگەی نێتۆرکەی بۆ لەمەولاش باسدەکرێ دەکەوێتە ناو ئەم پرۆسانەوە. وەلی ئەم پرۆسانە شانبەشانی ئەو دیاردانەی لەئاکامی نەشونمای پەلەی تەکنیك هاتوونەتەکایەوە کاریگەری بەسەریەکەوە جێدێلنن و پێکەوە فاکتەهاێ ئەوتۆ دروستدەکەن کە شایانی تێخوێندنەوەن و گرنگێ بێ پایانی خۆشیان دەبێ بۆ گەیشتن لەو گۆڕانکارییە کۆمەلایەتی و

ئابووری و کولتوورییانەی لە جیهانا وەگەڕکەوتوون. پێمانوابێ خراپ نییە گەر ئاماژە بە بەشێ لەو دیاردانە بکەین کە لەئاکامی گەشەی خێرای تەکنیك دێنەدونیاوە، لەوانە بۆ نموونە:چالاکی ئابووری کە ئاڕاستەی گلوبال وەردەگرێ، بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان کە لە نێت دا وەدووی خولقانی ناسنامە دەکەون و ناسنامەی کۆلێکتیڤ دونیا دەگرێتەوە (بۆنموونە: مناڵپارێزی، فۆندەمینتالیزم، خۆ سەوزکردن، ئەتاك – دژە جیهانگیرییەکان- Attca و..) یان بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە نوێکان کە خۆیان وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر جیهانی گلوبال دەردەخەن، دەسەڵاتی دەوڵەتی ناسیۆنال کە ڕوو لە کزی دەنێ، داڕمانی دەوڵەتگەڕایی کە دەبێ بە ڕیالیتێ و ئەمەش کارێ وادەکا کە هەموو بکەوینە ناو یەك جۆر لە شێوازی بەرهەمهێنان و دەسەڵات و ئەزموونەوە، سێستەمی ڕەفاهیەت کە دەخرێتە لاوە و دەوڵەت ڕەوایەتی خۆی لەدەستدا، نێتۆرك کە دەبێ بە پەناگا بۆ شوێن و، شەپۆلی شوێنیش کە کار لە مانا و ناسنامە دەکا، دەوڵەمەندی و هەژاری کە لە پەرەپێداندادەبن، هێزیکار کە ئیندڤیدوالیزەدەکرێ و نێتۆرکیش کە فۆڕم بۆ ئیندڤید دادەڕێژێ، ڕاستی کە دەبێ بە وێنە و ئەمەش بەهۆی گەیاندنێ ئەلەکترۆنیی ئاڵۆزەوە پەخشدەکرێ.
ئەم دیاردانە و چەندین ئاماژەی تریش دەبن بە جەوهەری ئەو گۆڕانکارییە ئابووری و کوولتورییانەی کە بەشداری لە گۆڕینی تێگەیشتنەکانمان لەبارەی ئێستاوە دەکەن. واتە ئێستا دەبێ بەو گۆڕانکارییانە و؛ دواتریش بە هەڵاوگۆڕانەکانی ئەم گۆڕانکارییانەوە وابەستەدەبن. بەبێ گومان هەریەکەش لەئەمڕۆدا دەکارێ ناوێ بۆ ئەم گۆڕانکارییانە و دروستکەری گۆڕانکارییەکان دابنێ وەلی بۆ کاستێلس ئەوە *زانیارییگەرییە* کە لەپشت ئەم گۆڕانکارییانەوەیە. زانیاریگەریش ئەو فۆڕمە تازەیە کە سەرمایەداری نوێی سەردەم یاخود سەرمایەداری گلوبالی ئەوڕۆ بەخۆیەوە دەیگرێ. هەروەها نێتۆرك وەك بەرهەمی ئەم زانیارییگەرییە دەبێ بە ئامرازێ ئاڵۆز و نادیار کە هەولی دروستکردنی ڕێکخراو و سێستەمە نوێکان دەدا.
بەم شێوەیەبێ و بەپێی ئەو سەرنجانەی سەرەوەبێ ئێمە وا پێدەنێینە ناو ئێپۆکێ (چاخ، سەدە) نوێوە. نوێی ئەم ئێپۆکە جارێ زۆر لەسەرەتادایە. هەر ئەم نوێیەشە کە دەمانخاتە نێو گۆڕانکاری و جۆراوجۆرییەکانەوە. نوێکارییەکە ناهاوشێوە و بەردەوامە. نوێی ئەم ئێپۆکە بەوە دەناسرێتەوە کە ئێمە ئەوڕۆ لە قۆناغێ دەژین پڕە لە زانیاری. بەلام چ جۆرە زانیارییەك؟ ئەلبەتە زانیارییەك کە زۆر ئاڵۆز و ناتەبا و گۆڕاو و تایبەتە. هەروەها زانیارییەکان بەجۆرێ

ئەوتۆ بەرهەمدێن کە پرۆسەی ژیانمان نادیاردەکەن و لەهەمانکاتدا وابەستەی خۆیانیشماندەکەن. واتە ئەوەی پێیدەڵێن مرۆڤ یان بوونەوەر دەبێ بە زانیاری یان گشت بوونمان دەبێ بە ڕیزێ زانیاری ناجێگیر و پەرت. ئاشکرایشە کە هەر ئەم زانیارییە نوێیانەیە کە دەبێ بە مۆڵگەی گەشەکردنی ئابووری و سەرچاوەی گۆڕانە کۆمەلایەتیەکان. بەلام بەپێیئەوەی ئەم گەشەکردنە سەرچاوەکەی (کە هەروەك ئاماژەی پێکرا کە نێتۆرکە) زۆر تایبەتە ئەوا بارودۆخێ ئەوتۆی هێناوەتەئارا کە تەنێ دوو لەسەر سێی زەوی بگرێتەوە و ئەوی تری لێبێبەشبێ. ئەم بێبەشبوونەش واتە کەوتنە دەرەوەی گۆڕانە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان. کەواتە بەرهەمهێنەران کەمن و بەکاربران زۆرن. بەلام ئەم زۆری بەکاربردنە تێکڕای سەرزەوی ناگرێتەوە. هەروەها لەبەرئەوەی گۆڕانەکان بازاڕێ نێت هۆرکی گلوبال سەرپەرشتی دەکا، ئەم بازاڕە هەولی خۆشی هەیە بۆئەوەی جۆرە گەشەیەکی سەرتاسەریش دروستکا، بەلام ئەو پرۆسەی دروستکردنە دواجار دەبێ بەهۆکاری سەرەکی بۆ داهێنانی ناتەبایی و ڕۆلێ زۆریش لە خولقانی کەلێینی نوێ دەبینێ. واتە دەولەمەندی و هەژاریی بۆ نموونە لەتەك یەکدا دەژین و ڕێگای تازەش لەبەردەم دروستبوونی دەولەمەندی دا دەکرێتەوە و جۆرە هەژارێ تر لە دونیا سەرهەلدەدا کە دەشێ بە هەژاریێ نوێ یان هەژاری سەردەمی تەکنەلۆژیای زانیاری ناونرێ. ئەم هەژارییە وەك هەژارییە کلاسیکەکە نییە کە تەنێ لە دەرەوەی ولاتانی پیشەسازی دروستبێ بەلکو ئەم جۆرە هەژارییە لەناو ولاتانی نێتۆرکی زانیارییەوە سەرهەلدەدا و وەك گشت دیاردەکانی تری جیهانگیری ئابووری و زانیاری گلوبال ڕوو لە خۆ گلوبال کردن دەکا. لێرەوە و بەبێ بەزەیترین شێوە پارە گەورەترین بەها وەردەگرێ و بەهای پارە بەرامبەر بە بەهای مرۆڤ دەوەستێتەوە. جیهانگیری ناوبراو زانیاری دەکا بە سیمبۆلێ(هێما) بۆ پارە پەیداکردن و قۆرخکردنی ئەو کۆکەلگەیانەی توانای بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە سیمبۆلانەیان نییە. دروستکردنی پارە و بوونی پارە بە مەزنترین بەها لەژیانی مرۆڤ شتێ تازەنییە بەلکو ئەو شێوازانە تازەیە کە پارە لەخۆ دەیگرێ و هەولدەدا مانا بەگشت شتێ بەنێوی خۆیەوە بدا و پارە دەبێ بە میکانیزمێ بۆ زانیاری خولقان و وەرگرتنیشی. واتە ناوەڕۆکی زانیاری پارەیە و ئەمەش ئەو تاکە توانایییە کە بوونمان سەرپەرشتی دەکا. هەروەها باوەڕناکەم کە تەکنەلۆژیای زانیاری بۆ ئەوە هاتبێ کە لە قوودرەتی پارە کەمکاتەوە یان پارە لەوەخا کە ئیدی سمبۆلێ نەبێ بۆ داهێنان و بردنەڕێوە. بەپێچەوانەوە

تەکنیکی نوێ و زانستی تازە نەك هەر پشتگیریێ زۆر لە مانای پارەدەکەن بەلکو پارە وەك قەدەرێ میتافیزیکی نیشاندەدەن و بوونی خۆیان و نەشونماشیان هەر بە پارەوە گرێدەدەن. کاتێ کە دروستکردنی پارەش بە گەشەی تەکنیکی نوێوە دەبەسترێتەوە و زانیارییگەرییش دێتە دونیاوە تا بە نوێترین ڕێگا بکرێ پارە پەیداکردنێ ئێمەی بوونەوەری ئەم چاخە نوێیە بەپێی شوێنی ئامادەبوونی ئەم زانیارییگەرییە پۆلدەکرێین و دەولەمەندی و هەژاریمان بەوەوە گرێدەدرێ لە کوێ و بە چی دەژین. ئەمەش ناوەڕۆکی ئەو چاخە تازەیەیە کە لەخۆ گلوبال کردندایە و هەلگری ئامرازی جۆراوجۆری ئابووری و کۆمەلایەتیی تازەیە.
لێرەوە دەمانەوێ ئەوە بلێین، کە، گەر تەماشای ئاستی گەشەی ژیانی تەکنیکی نوێی ئەوڕۆ بکەین بەئاشکرا هەست بەوەدەکەین کە بەشێ لە جیهان، ئەلبەتە بەشە بچووکەکە، بەتەواوەتی لەپشت ئەم گەشەی خێرا و بەردەوامەی تەکنیکەوەیە و کەچی بەشەکەی تری، ئەلبەتە بەشە گەورەکە، کاریگەریێ ئەوتۆی بەسەر ئەم گەشەیەوە نییە و لەدەرەوەی ئەو فاکتەرە ئابووری و زانیاریەشە کە ئەم گەشەیە دروستدەکا و دواتر هیچ قوودرەتێکیشی بەسەر بڕیارە ئابووری و سیاسی و یاساییەکانیشەوە نییە. ئەم لایەنەش زۆرترین مەترسی لەبەردەم ئەو بەشەگەورەیەدا دروستدەکا و زۆرترین ڕۆلیش لە پەراوێزکردن و بەلۆکالیبوونی کێشە کۆمەلایەتی و ئابووری و سیاسی و دیمۆگرافیەکانیان دەبینێ. ڕەنگە مەسەلەی چۆنیەتی سەرهەلدانی شۆڕشەکانی تەکنیك و پەرەسەندی زانست و پێوەندی ئەمانەش بە شوێنەوە لەم ڕووەوە بتوانێ وەلامێکمان سەبارەت بەم ناتەبایە و جۆراوجۆرییە لە نەشونمای ئابووری و کۆمەلایەتی و زانیاری بداتێ. چونکە پشکنین لە بارودۆخی سەرهەلدانی داهێنانە تەکنیکیەکان و تازەگەرییە زانستیەکان هەمیشە ئەو فاکتە مێژوویی و جوگرافی و سیاسیانە دێنێتەوە بەرباس کە مانایان بۆ جیاوازیەکان لە گەشە و یان بەپێچەوانەو لە دواکەوتن هەبووە. ئەم لایەنە هەر چۆنیەتی دروستبوونی شارستانی بەناو ڕۆژئاوا و یان ڕۆژهەلات ناخاتە ژێرپرسیارەوە بەلکو ئەو مانایانەش دەخاتە ژێرپرسیارەوە کە خودی واتای شارستانی خۆی لەسەر بوونیاددەنێ. چونکە شارستانی پێشکەوتوو دواتر بووە بە شارستانی زانستی و ئەمجار بە شارستانی مەدەنی و مرۆیی و سەرووی هەمووشی بە شارستانی ڕەفاهیەت. بەهاتنی تەکنەلۆژیای زانیاری نوێ و بەمشێوەیەش، واتە ئاوا خێرا و گلوبالی، لە ناواخنی واتای

شارستانی ڕۆژئاوا بەهێزتر و فرەئاڕاستەتر کردووە و، هەر ئەم بەشە بچووکەی جیهان، کە خولقێنەری جیهانگیرییە ئابووری و زانیارییەکانە، توانیوویەتی کارێ وا لەو بەشە بکا، کە ڕۆلی لە داهێنان و دۆزینەوەکان نەبووە، کە گۆڕانکارییەکان زۆر زووتر کاریتێکا و تەنانەت زۆر بێکاریگەریش بمێنێتەوە و توانای فۆرمولێرەکردنی کێشە و وەلامەکانی خۆشی نەبێ. هەروەها ئەو گەشەکردنە تەکنیکییە تازەیەی ئەمڕۆ، کە لە بنەڕەتدا ناکۆك و ناچووستە، توانیوویەتی کەلێنهایەکی ئابووری ئەوتۆ دروستکا کە کاریگەریێ زۆر بەسەر مەسەلە سیاسی و کۆمەلایەتیەکانەوە بەجێبێلێ و وابەستەیەتی ئەوانەی لەدەرەوەی دورگەی تەکنەلۆژیای زانیارین قوول و جۆراوجۆرکا. ئەمەش لەبەرئەوەی تەکنیکی نوێ و زانینی تازەی سەردەم ڕێگایەکە و بگرە باشترین و خێراترین ڕێگاشە بۆ دروستکردنی قازانج و هێنانە دونیای دەولەمەندی. بەواتایەکی دی دەشێ بووترێ، ئەو بەشە گەورەیەی لەدەرەوەی نێتۆرکی گلوبال دەبێ لە دروستکردنی ئەو ئابوورییە بێبەشدەبێ کە بەهۆی نێتۆرکەوە پێکدێ. بەمجۆرە نێتۆرك یان بەگشتی زانیاریگەری واتە ئابووری و تەنانەت ئابووری تازەش. ئابوورییەك کە جەوهەرێ نوێی هەیە و شێوەی دروستکردنی جودایە و کاریگەرییەکانیشی تایبەت و غەریبە. هەر هەمووش دەبێ لەسەر ئەوە کۆکبین کە تەکنەلۆژیای زانیاری کۆلەکەی ئابووری تازەی سەردەمە و خولقێنەری گەشەی ماددیە و سەرچاوەێ نوێشە بۆ هەبووی و زۆردەرامەتی. نەك هەر ئەوە بگرە ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییە بناغەشی بۆ دروستکردنی نایەکسانی ئابووریێ هەمیشەیی و نادادپەروەریێ کۆمەلایەتی جۆربەجۆر داناوە. سەرباری ئەوی وترا ئەوەش دەلێین کە، کۆمەلگەی زانیاری (یان هەروەك هەندێ بە کۆمەلگەی پاش-پۆست- پیشەسازی ناویدەبەن) هەروەك کۆمەلگەی پیشەسازی پێشوو دەستی لە دروستکردنی کەلێن و بۆشایی لەنێوان کۆمەلگەکان و لەنێو کۆمەلگەکانا هەیە و، میکانیزمێ تایبەتی خۆشی لە پەیداکردنی پەراوێز و یاخود دروستکردنی نێوەند دا هەیە. چونکە لە خاسلەتە سەرەکییەکانی ئەم نێتۆرکە گلوبالە ئەوەیە کە ناخوازێ نێوەندی دیاریکراو بوونی هەبێ و دەسەلاتێ جگەلە لە دەسەلاتی نێتاوی (لە نێتەوە وەرگیراوە) خۆی زیاتر ئامادەبێ و ڕۆلی بردنەڕێوە و سەرپەرشتیکردنی پێببەخشرێ. نەك هەر ئەوە بەلکو ئەم نێتۆرکە بەشداریێ زۆریش لە هەلوەشانەوەی تێکڕای بوونیادە تەقلیدییەکان دەکا و بەپێی ئەو بنەما تەکنیکیە ئالۆزەش کە کاری لەسەر دەکا لە فۆڕمی مۆدێرندا بەین و

مەودا لەنێوان هەژاری و دەولەمەندی دادێنێ و، دۆزێ واش دێنێتە پێشێ کە ئەوانەی لە ناوەوەی کۆمەڵگەی نێتۆرك دەبن پتر لەناو ژیانا ئامادەن وەك لەوانەی لەدەرەوەی کۆمەڵگەی نێتۆرکن. واتە، نێتۆرك جیهانێ پێکدێنێ سێیەمی دانیشتوانی ئەم جیهانە پەراوێزدەکرێن و گەشەی نێتەکەش بەجۆرێ وەگەڕدەکەوێ کە وردەوردە ناوچە گەورەکان دەخرێنە زۆنی بیرچوونەوەوە و دوورگەکانی هەژاریش دەکەونە ناو هەردوو لە وڵاتە دەولەمەند و کەمدرامەتەکانەوە. ئەمەش ئەوەدەگەێنێ کە، لە 20٪ ی دانیشتوانی سەرزەوی لە دەرەوەی ئەو ئابوورییە تازەیە و ئەو وێنە هاوبەشەن کە نێت ئەیخولقێنێ. لەهەمووی سەیرتر، نێتۆرك لە جیهانێ وەگەڕدەکەوێ کە هەموو دەقەیەك 30 منالی تیا دەمرێ، لەبەرئەوەی خواردن نییە کە بیخۆن. بڵاوبوونەوەی برسیەتی و هەژاریی و وشکانی و نەخۆشی وا خەریکە وردە وردە دەبێتە هۆی لەناوبردنی قارەیەك(ئەلبەتە ئەفەریقا). قەرز و ئافاتە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان وا چەندین کۆمەڵگا دەهەژێنن(وڵاتانی ئەمەریکای لاتین). تا ساڵی 2020 پتر لە 70 ملیۆن کەس بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە دەمرن. دووچاربووەکانی ئایدز بەشێکی دەکەوێتە وڵاتانی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا و وڵاتانی پاش کۆمۆنیزم( ڕووسیا، ئۆکراینیا و وڵاتانی تری ئەورووپای ڕۆژهەڵات) و بەشەکەی دی بەتەنیا دەکەوێتە ئەفەریقاوە. ئەمڕۆ کۆمەڵگەکانی پۆست کۆمۆنیزم(ڕووسیا و ئۆکراینیا و وڵاتانی تری ئەورووپای ڕۆژهەڵات) بوونە بە گەورەترین بازاڕی نارکۆتیکە و بازرگانی منال و ئافرەت. تا ساڵی 2010 پتر لە 25 ملیۆن لەدونیادا بێ باوك و دایك دەبن، ئەمەش دوای ئەوەی کە باوك ودایکیان بەهۆی نەخۆشی ئایدزەوە سەردەنێنەوە. ئەلبەتە بەشە گەورەکەی ئەم ڕێژەیە دیسانەوە دەکەوێتە ئەفەریقاوە. ئەوەندەی خەتی تەلەفۆن لە ناوچەی مانهاتان (ئەو شوێنەی کە تیرۆریستەکان دوو تاوەرەکەیان تیاهێنایەخوارێ) لە هەموو بیابانی ئەفەریقادا هێندە نییە. ئەفەریقا و بەشێ لە وڵاتانی گەشەنەکردوو ڕۆژانە دووچاری ڕەگەزپەرستی تەکنەلۆژی دەبن. قوتابخانەکانی ئەفەریقا نەك بێ ئینتەرنێت و بێ تەلەفۆن و کارەبان بەڵکو لەبەشێ زۆر لە قوتابخانەکان تەختەڕەشی تیا نییە، بە قەولی باوەمان، کە لەسەری بنووسن. دانیشتوانێکی زۆری جیهانی سێ جارێ هەر بە دۆلارێ دەژین و نەك لەماڵەوە خەتی ئینتەرنێتیان نییە بەڵکو بەبەردەوام کارەبایان نییە. وڵاتهایەکی زۆر جارێ گرفتاری دەستی دیکتاتۆرن و بۆیان نییە بەئاسانی بێنە ناو نێتەوە یان نێت جارێ هەر مەسەلەیەکی

دەوڵەتیە(بۆنموونە کۆریای باکوور یان چین) یان لەهەندێ وڵات جارێ هەر یاساغە یاخود بگرە گوناهیشە بەکاربردنی(بۆنموونە سودان). کەچی لەشوێنێ وەك سوید تا جەنیوەری 2000 نزدیکەی سێ ملیۆن و نیو (کە دانیشتوانی ئەم وڵاتە خۆی لە 9 ملیۆنێك دەدا) کەس لەنێوان تەمەنی 12 بۆ 79 ساڵی توانییویانە نێت بەکاربەرن. ئەم ژمارەیە زۆر لەو ژمارەیە زۆرترە کە لەهەموو ئەمەریکای باشوور بۆی هەبووە بێتە نێتەوە. نێتی گەلێ لە کۆمەڵگەکانی پۆست کۆمۆنیزم لە پایتەخت و شارەگەورەکانا کۆبووەتەوە. ئەم شارە گەورانەش بوونە بە شوێنی ڕابواردنی گەشتووگوزارکەرە ڕۆژئاواییەکان و هەروەها شوێنی بڵاوبوونەوەی ئایدز و بێ ماڵ و سواڵکەر و سۆزانی. ئەمانە تەنێ دیاردەی ناو ئەم کۆمەڵگانە نیە کە گرفتاری دەستی لیبرالیزمی نوێ و سەرمایەداری گلۆبالیزەکراون بەڵکو لەناوچەرگەی وڵاتانیEU و خودی ئەمەریکا کە ماڵی ڕاستەقینەی کولتووری دیگیتالە هەژاری و سۆزانیەتی و کریمینالیتێ شانبەشانی ئەو گەشەیەی لە نێتۆرك و زانینی تەکنیکیدا ئەنجامدەدرێ لە زیادبووندایە. بەپێی پرۆگرامێکی تەلەفزیۆنی سویدی ئێستا لە گەلێ لە کەبارێکانی (سەماکا و یانەی شەوان) تۆکیۆ کچە سویدیەکان کاردەکەن ئەمەش لەبەرئەوەی ڕەنگە ڕووخساریان هۆکارێ بێ بۆ ئەوەی ئەم کارەیان دەستکەوێ و دواتر ئەم کارە لەوڵاتی خۆیان ناکەن لەبەر هەندێ هۆی کۆمەڵایەتی، لەوانە ڕەگە شەرمبکەن، و دواتر کاتێ ئەم جۆرە کارە لە شوێنێ وەك تۆکیۆ دەکەن پارەێ زۆرتریان دەستدەکەوێ لە چاو ئەوەی کە ئەگەر ئەمە لە سوید بکەن، بەڵام ئەوانەی ئەم کارە(واتە سۆزانیەتی) لە سوید دەکەن ئەوا بەپلەی یەك خەڵکانی وڵاتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵاتن(پۆڵۆنی، ڕووس، ئۆکراینی) و هەروەها هەنێ لە ئاسیایەکانیش کە لەڕاستیدا ئەم خەڵکانە ژیانیان ڕۆژ بەڕۆژ ڕوو لەکەمدرامەتی دەنێ یان لە نەبوونی و گرفتی سەیر سەیرەوە بەرەو ئەم وڵاتانە هەڵاتوون و کەچی لێرە دووچاری نارکۆتیکە و سۆزانیەتی و هەژارێ نوێی دەبن. ئەو ناوچانەی لە وڵاتانی نێتۆرك کە بێگانەکانی تیا دەژین نەك هەر پڕە لە کریمینالیتێ (تاوان) و بێکاری و نەخوێندەواری بەڵکو پڕە لەو گەڕایەی کە نەوەێکی لێدەبێتەوە کە ڕقی بەرامبەر بە پیاوە سپییەکە هەیە و ئەمجار هەژاری مەترسیەکە لەبەردەم دانیشتوانی ئەم ناوچە دابڕاوانە لە خەڵکانی ئەسلی وڵاتەکە. ئەو مەسەلەیە هەر دیاردەیەکی هەژاری ڕووت نییە بەڵکو هەژارێ بەرنامەدار و هەمیشەییە. چونکە نە ئاستی خوێندەواری ئەو گرووپە ئیتنیانە ڕێگایان دەدا کە بێنە ناو

کەرتە ئابوورییە پارە دەرهێنەرەکانەوە(وەك کەرتی تێت یان گەیاندنی تەلەفۆنی و بواری مالی کە بەشێ زۆر بەئەلەکترۆنیکراوە) نەش مەنتەلیتێت(خو ورەوشت) و ترادیسۆنیان(عاداتیان) ڕێگایان دەداتێ کە لەگەل پرۆسەی سیاسیانەی یەکخستن و چوونەنێویەکدی(ئینتگرەیشن) بڕۆن.
ئەوی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا تاڕادەیەك باس لەوەدەکەن کە بۆلەمەولا شیاوە، واتە لەگەل هاتنی کۆمەلگەی نێتۆرك، باس لە هاتنەدونیای جیهانێ نوێکرێ کە ئەوەش بەباوەڕی کاستێلس *جیهانی چوارەمە*. ئەمەش بەدلنیاییەوە ئەو جیهانەیە کە هەموو پەراوێزکراو و فەرامۆشکراوەکانی چاخی زانیاری لەخۆدەگرێ. ئەمە ئەو جیهانەیە کە لە گشت شوێنێکدا بوونی هەیە. لە کوردستان هەروەك لە هۆنکۆنگ یان لە مۆسکۆ هەروەك لە نیۆیۆرك. ئەمە جیهانێکە کە بووە بە پەناگای گشت بێ دەرەتان و سەرڕەش و بێدەرامەت و بێمال و سۆزانی و بێکار و غەریب و دووچاری ئایدز و هەلاتووی دەستێ دیکتاتۆر و هۆمۆسێکسوێلەکان. ئەمە جیهانێکە زۆرپەرش و بلاوە و شوێنێ دیاریکراو و نیشتمانێ دەستنیشانکراوی نییە. ئەم جیهانە لەدەرەوەی ولاتانی نێتۆرك هەروەك لە ولاتانی نێتۆرك دا وەك یەك ئامادەیە و، ئەمەش لەبەرئەوەی جیهانگیری ئابووری و زانیاری توانیوویەتی لە مندالدانی هەموو چەقێ چەندین پەراوێز و لە ئامێزی گشت نێوەندێ چەندین دەورووبەر دروستکا. خەغتکردن لە کەمبوونەوەی نێوەند و چەقەکان و زیادبوونی کەنار و پەراوێزەکان نە گەڕانەوەیە بۆ قوتابخانەی ئابووریزم نەش داکۆکیکردنە لە تیۆری پاشکۆیەتی و پەرەسەندن بەلکو گرنگی دانە بەو تیۆرانەی کە لەسەردەمی نوێ دەتوانن کێشە کۆمەلایەتیەکان بەبێ جیاوازی ئایدیۆلۆژی بەرباسبخەن و ناوەڕۆکی ناتەبایی سیاسی و ئابوورییەکان ڕوونکەنەوە.
ئەوەی کە دەبێ جەغتێ زۆری لێکرێ گەشەی ناجێگیر و جۆراوجۆری تەکنەلۆژیای زانیارییە کە لەپال سەرجەم گۆڕانکاریەکانەوەیە و هۆکارێ سەرەکیشە بۆ گۆڕینی مەرجەکانی شێوازی بەرهەمهێنانی سەرمایەداری لە گشت بوارەکانا هەر لە خزمەت گوزارییەوە تادەگاتە کەرتی مالی. ئەلبەتە گۆڕانەکانی بواری کەرتەکان بەپێی گرنگی کەرتەکان جوداوازە. بەپێی ئەوەی کە کەرتی مالی کەرتێ سەرەکیە بۆ بازاڕی گلوبال لەگەل هاتنی زانیارییگەری زۆرترین بایەخی دراوەتێ و خودی کەرتەکەش بەجۆرێ ئەوتۆ خۆی لەگەل سیستەمی تەکنیکی نوێ گونجانووە کە توانیوویەتی زۆرترین گۆڕان بهێنێتەسەر دەستووری کارکردنی. ئەم لایەنە و پەرەی خێرای کارگەکان بوونە هۆی

ئەوەی ئابووریێ تر، ئابووریێ گلوبال، بێتە دونیا و شێوەی کارکردن و خۆرێکخستنێ نوێ بەرهەمبهێنرێ.
ئەمانەی لەسەرەوە باسکران تا ئەندازەێ زۆر بەرەو ئەوەمان دەبەن کە بڵێین توێژینەوەی گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری و کاریگەری ئەو گەشەیە بەسەر ئابووری، بەرهەمهێنان و کار لەلایەك و لەلایەکیتر بەسەر ناسنامە، سیاسەت و یەکبوونی کۆمەلایەتی گرنگی خۆی هەیە. هەروەها ئەو گەشە خێرایەی تەکنەلۆژیا لە کۆمەڵگەدا کاریگەری بەسەر مەسەلەی کولتوور و شێوازی بەرهەمهێنان و بەکاربردن و گەیاندنیشەوە بەجێهێشتووە. بەمجۆرە ڕونکردنەوەی ئەم گەشەیە واتە ڕوونکردنەوەی شەپۆلی زانیاری، سەرمایە و گەیاندنی کولتووری، هەموو ئەمانەش لەگەل هاتنی زانیاریگەریی مانا بۆخۆی دەدۆزێتەوە. ئەمانە کە ئابووریێ گلوبال پێکیاندێنێ لەئەم ئێستادا بۆ فۆرمەکانی ڕێکخستنی سەرمایەداری گرنگی خۆیانیان هەیە. واتە تەکنەلۆژیای زانیاری مانایێ گەورەی بۆ جیهانگیری ئابووری هەیە و ئەو پەرەسەندنەش پێشکەشدەکا کە لە توانای دەولەتی ناسیۆنال نەبووە بیهێنێتەدی. جا بۆئەوەی جیهانگیری ئابووری بەردەوام بێ و بەو شێوەیەی ئارەزووی لێیە کاری خۆی ئەنجامدا دەبێ تەکنەلۆژیای زانیاری هەبێ. بۆیە بەنەشونمای تەکنەلۆژیای زانیاری دەولەتی ناسیۆنال لاوازدەبێ و گەشەی ئابووری لە کۆمەلگەدا ڕەوتێ زانیاریاوی گلوبالی وەردەگرێ. وێڕای ئەوەش پاڕادیگمی تەکنەلۆژی نوێ زۆر بەئاسانی کاردەکاتە سەرگۆڕینی کولتووری ماتریالیمان و، ئەم کولتوورە ماتریالیەش والێدەکا خۆی لەدەوروبەری تەکنەلۆژیای زانیاری ڕێکخا. ئەلبەتە لەم حالەتەشدا دەکرێ بڵێین کە تەکنەلۆژیای زانیاری گۆڕانە گەورەکەیە کە هاتۆتە سەر سەرمایەداری و پەروبالی گلوبالی بۆ خولقانووە و لە گرفتە بوونیادیەکانی دەربازکردووە. فۆڕمە کۆمەلایەتیەکانی ئەم سەرمایەداریەش نوێن و هەلگری بناغەی تازەن و وابەستەی دۆزینەوە زانستیەکانیشن. بەس ئەم بناغە تازەیە ماتریالی سەرەکی نییە و بەلکو ئەوی کە سەرەکی و بگرە زۆیش سەرەکییە پرسیارە ئایدیۆلۆژی و کولتووریەکانە کە بەبەراورد لەگەل پێشوو (11) ڕۆلێ گرنگری هەیە. لێرەدا ناخوازین بچینەوە سەرهەندێ دیدی کاستێلس بەتایبەت ئەوی پێوەندی بە توێژینەوەکانی لەبارەی جیهانگیری ئابووری و چارەنووسی دەولەتی ناسیۆنال لەژێرسایەی داهاتنی کۆمەلگەی زانیاری هەیە کە ئەمیان لە گفتووگۆی دیدا دێینەوەسەری.

## نێتۆرك خەونی گلۆباڵە

بۆ کاستێلس نێتۆرك شانبەشانی تەکنەلۆژیای زانیاری و جیهانگیری ئەو سێ شتەن کە سێستەمی سۆسیۆ-ئابووری نوێی لێپێکدێ. ئەمەش لەبەرئەوەی کە لەم چەند ساڵانەی دواییدا گۆڕانکارییەکان گەیشتنە ئاستێ ئەوتۆ بووە هۆی دروستبوونی فۆڕمی نوێ لە ڕێکخراوی کۆمەڵایەتی و ئابووری. ئاشکرایشە کە دوای داڕمانی یەکیەتی سۆڤیەت هەموو کەوتینە، بەباوەڕی ئەم کۆمەڵناسە، ناو یەك سێستەمی ئابوورییەوە کە ئەوەش سێستەمی ئابووری سەرمایەدارییە. ئەم سەرمایەدارییەی ئەمڕۆش جۆرە سەرمایەدارییەکە کە بەشە کۆن و تازەکەشی خستۆتە ناو بازاڕێکەوە کە دەشێ بە بازاڕی سەرمایەداری گلۆباڵ ناوببرێ. هەموو ئاماژەکانیش بەرەوئەوەمان دەبەن کە بڵێین ئەم سێستەمە تازەیە لەبەرئەوەی ئامرازێ تازەی هەیە کە ئەوەش تەکنەلۆژیای زانیاری و گەیاندنە، و بناغەشە بۆ شێوازێ لە بەرهەمهێنانی نوێ و فۆڕمێ تازە لە ڕێکخستن وداهێنانێ ئابووری گلۆباڵ. ئەم تەکنەلۆژیای زانیاری و گەیاندنە ئامرازێ ستراتیژە و مندالدانی گۆڕانکاریەکانی لەمەودوایە. گەر تەماشای ساڵانی 1990 کان بکەین دەبینین کە گشت گەیاندنی مرۆڤایەتی خۆی لەدەوروبەری کۆمەڵگایێ کۆکردۆتەوە کە لەسەر بنەمای زانیاری بوونیادنراوە و ئەم بنەمایە لە پرۆسەیەکی نوێبوونەوەی تەکنەلۆژیشدایە. هەروەها ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییەی ئەم چەند ساڵانەی دوایی کارێ وایکردووە کە هیچ شتێ ئەوەندە نەتوانێ هێندەی خودی تەکنەلۆژیای زانیاری گۆڕان شیاوبکا. بەپێی ئەوی لەسەرەوە ئاماژەی پێکرا دەکرێ بووترێ کە، کاستێلس لەمیانەی توێژینەوەکانی سەبارەت بە چاخی زانیاری لەوە دڵنیاماندەکا کە تەکنەلۆژیای زانیاری کەلێنەکان لەبەیندەبا و سێستەمەکان (هێرارکیەکان) ناهێڵێ. ئەم لایەنەش بەقەولی ئەو سەرکەوتنێ باشی بەدەستهێناوە و توانیوویەتی دیمەنی سیاسی و ترادیسیۆنی خەباتی کرێکاران و بزووتنەوەی کۆمەڵایەتی بگۆڕێ. دەشکرێ ئەم تەکنەلۆژیایە بەوەش بناسرێتەوە کە بەزانینێ بەرزەوە هاتووە و لە چوارچێوەی چالاکیەکانی دەوڵەتی ناسیۆناڵ و سێستەمی سیاسی دەچێتە دەرێ و چارەنووسی ئەوانیش وەدوی خۆی ڕادەکێشێ و بەشداری لە خولقانی دەستورێ تر لە فرۆشتن و ساغکردنەوەی بەرهەم و بەرینکردنی ڕووبەری بازاڕ دەکا. گەر نەختێ

ڕوونتر بدوێین ئەوا دەڵێین کۆمەڵگەی نێتۆرك ناهێڵێ دەوڵەتی ناسیۆنال وەك یەکەیەکی شیکردنەوەی ڕێژمیی بمێنێتەوە و کارەکانی وەك جاران ئەنجامبدا. چونکە هێزی سەرووی دەولەتی تر هەن، لەوانە EU، یاخود کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان(فرە نەتەوەییەکان)، کە ئەم کارە دەکەن و خۆیان وەك دەسەلاتی سەرووی سنووری دەولەتی ناسیۆنالی نیشاندەدەن. وێڕای ئەوە، مێتۆدە ترادیسیۆنالیەکان ناتوانن وەك جاران کاری خۆیان بکەن و کۆنترۆلی بازاڕی کار و یان کۆنتڕۆلی شەپۆلی جوولەی سەرمایە بکەن. واتە ناتوانن ئەو کارانە ئەنجامبدەن کە هێزە نێودەولەتیەکان سەرپەرشتی دەکەن.

ئەم لایەنەش کە هەندێ سەرنجی سیاسی دەوروژێنێ بۆ کاستێلس مانای تر یان تێگەیشتنی سیاسی دی دەخاتەڕوو. چونکە بۆ ئەم سیاسەت دەبێ لە گۆڕانکارییەکانی جیهانا بەشداربێ و خودی ئەو سیاسەتەش خۆی لەوە بەئاگابێنێ کە جیهان لە کۆمەڵگەی پیشەسازیەوە بەرەو کۆمەڵگەی زانیاری دەڕوات و، ئەو گۆڕانە ئابووری و کۆمەلایەتیانەش کە بەهۆی ئەم کۆمەلگە تازەیەوە ڕوودەدەن داوای ئەوەدەکەن کە فۆڕمێ دەولەتی تر بێتەکایەوە. لەم بارەیەوە کاستێلس گرنگی بەوەدەدا کە ئەو فۆڕمە نوێیەی دەولەت لەئەوڕۆدا بەخۆوە گرتوویەتی دەولەتی نێتۆرکە و نموونەکەشیEU ە. واتە ئەوەی ڕاهاتووین ناویبنێین بە دەولەتی ڕۆژئاوای یان دەولەتی ناسیۆنالی مۆدێرن کە بۆ لەمەولا یان لەئەم ئێستادا بووە بە دەولەتی نێتۆرك و ئەم دەولەتە نێتۆرکەش ئەو دەولەتەیە کە خاوەنی تەکنەلۆژیای زانیاری ئالۆز و بازاڕی مالی ئەلەکترۆنی گلوبالە. دەولەتی نێتۆرك یان دەولەتەکانی پۆست ناسیۆنال هەموو ئەو دەولەتانەن کە نێوەندێکن بۆ نێتی تەکنیکی و زانینی زانستی تازە. واتە ئەو هێزەن کە لەپشت داڕشتنی گشت ڕێسا و یاسا ئابووری و سیاسیەکانەوەن. دەشکرێ دامەزراوێ نێودەولەتی وەکEU ببێ بە دالدەیەك بۆ ئەم دەولەتی نێتۆرکە و یان قسەکەری سیاسی و ئابووری و زانستییەکەی. بۆیە هەندێ واتەماشادەکەن کە ئەو فۆڕمە نوێیەی دەولەت ئەوەیە کە دەولەتی ناسیۆنال لەگەل دەسەلاتە سەرووی دەولەتی و دامەزراوە ناوچەیی و لۆکالییەکان کارێ زۆر بۆ چۆنیەتی ڕێکخستن و پێکەوەکارکردن لەتەکیەکا بکەن. گوایە تەنێ بەمجۆرە دەکرێ ڕێگا لە گەشەی ئەو تاوانە ئابووریانە بگیرێ کە لە جیهانا لە بلاوبوونەوەدایە (12).

ئەوەی لەسەرەوەش وترا، ئاماژە بەوەدەکا کە نێتۆرك ئەو واتایەیە کە بەهۆیەوە دەکرێ کاراکتێریزەی ئەمڕۆمانی پێبکرێ و، لەوەش گرنگتر دەکرێ

ئەوە بووترێ کە کۆمەڵگەی ئەمڕۆمان بەدەوری ئەو پێوەندیانەدا دەخولێتەوە کە نێت ڕیشالیان دەهۆنێتەوە و ئەم جۆرە کۆمەڵگەیەش لەسەر بناغەێ کاردەکا کە لە نێت و خود پێکدێ. کاتێ کە دەشوترێ نێت ئەمە بەمانای یان شتێ پتر دیاریکراوتر دێ لەوی کە ناودەبرێ بە ئینتەرنێت. یان دەکرێ بووترێ کە ئەم نێتە ئەو پاداشتەیە کە تەکنیکی زانیاری پێیدەگا و هەموو خودەکانیش وابەستەی خۆیدەکا. دەشکرێ جەغت لەسەر ئەوەشکرێ کە ئەم واتایە بەمانایەکی کورتر بۆ ناسینەوەی دوو پرۆسەی هاوشان پووختدەکرێتەوە. یەکەم جیهانگیری ئابووری و ئەویتر بلاوکردنەوەی تەکنیکی زانیاری بەبێ گوێدان بە مانای کات. واتە لەگەڵ نێت دەکەوینە ناو بێکاتییەوە و لەهەمان کاتیشدا دەکەوینە ناو شەپۆلی شوێنەوە. هەر لەمیانەی ئەم بێکاتیەشدا دەکرێ ئەم نێتۆرکە وەك لۆژیکێ کاریگەری ئەوتۆ تەماشاکرێ کە کاریگەریی خۆی لەیەککاتدا بەسەر پرۆسەی بەرهەمهێنانی بەرهەم و کولتوور و دەسەلاتەوە وەك یەك هەیە. واتە پیادەی دروستکردنی شمەك، ج وەك شمەکی زانیاری و چش وەك شمەکی ماتریالی، دەکا و گرنگی لە دابەشکرن و ساغکردنەوەشی دەبینێ. لەم حالەتەشدا شمەك تەنێ لە کارگەکانا بەرهەمنایێ بەڵکو شوێنێ تریش بۆ بەرهەمهێنانی هەیە لەوانە ئینستیووتەکانی پشکنین و توێژینەوە و یان تاقیگەکانی بیۆ-تەکنیك. بەشێ زۆر لەو بەرهەمانە دواتر دەبن بە بەرهەمی ماتریالی یان بە بەرهەمی زانیاری. بەرهەمهێنانی کولتووریش هەر دەچێتە ڕیزی ئەو شێوازی بەرهەمهێنانە نوێیانەوە کە شتە ماتریالی یان زانیاریەکانی پێبەرهەمدەهێنرێ. هەموو ئەو بەرهەمانەش کە بەبێ گوێدانە شوێن و کات بەرهەمدێن دواتر لەمیانەی نێتۆرکەوە، بۆ نموونە لە ئینتەرنێتدا، دەکرێ پەیوەندیان پێوەبکرێ و یان بەرهەمەکان بکەونە بەردەستەوە و یان هەر بەمجۆرە(واتە لەمیانەی نێت) و لەم شوێنەدا(واتە لە ئینتەرنێت)دەکرێ ئەو بەرهەمانە ڕیالیتێی خۆیان وەرگرن. لێرەدا نێت دەبێ بە مۆلگەی دەسەلات و بوارێ بۆ فۆرمولێرەکردنی ئەو بەرهەمانە(شمەکانە) و یان ئەو شوێنەی کە توانای بەهادانی هەیە.

ئەم چەند دێڕەی سەرەوە ئەوەمان فێردەکەن کە دەبێ لەوبگەین، نێتۆرك پێکهاتەێ نوێی کۆمەلایەتی کۆمەڵگەی ئەمڕۆمانە یاخود ئەم نێتۆرکە شارستانیێ نوێیە و سەرووی شارستانییەکانی ترە. ئێمە کە لە سەرەتای چوونە ناو ئەم شارستتانیەتەین ووردە ووردە وامانلێدەکرێ کە دانبەهەبوونی ئەم شێوە شارستانیەتە بنێین و خۆ لەتەکیا ڕێکخەین و بکەوینە بەکاربردنی کە

لەخودی خۆیدا پێچەوانەکەی ڕاستە، واتە بەکاردەبرێین و دەشکرێین بە لێهاتووترین و شارەزاترین بەکاربر. ئەم شارستانیەتە زۆرترین بواری تیا ڕەخسێنراوە بۆ بەکاربردن و بەهێزترین پێوەندیشی لەنێوان بەکاربر و بەکاربردن دروستکردووە. ئەم پێوەندیە زۆر لە پێوەندیەکانی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ یان مرۆڤ و خاك یاخود هەج ڕوانینێتر کە مرۆڤ پێوەی وابەستەیە بەهێزتر و سەمیمیترە. بەلام بەکاربردن لەژێر زەبری نێت دا بەقۆناغێ ئالۆزدەڕوا. چونکە ئەم مەسەلەیە بەهۆی نێتەوە ڕێکدەخرێ و دواتر سەرپەرشتیشدەکرێ. وێرای ئەوە دەکرێ بووترێ کە فۆڕمەکانی ڕێکخستن لەم شارستانیەتە جودا و جۆراوجۆر و نوێن. پاشان ئەوەی کە پێشیدەوترێ نێتۆرك هەر خۆی دەبێ بە خودی ئەو فۆڕمی ڕێکخستنەی تیای دەژین. بوونی ئەم نێتۆرکەش مانای زۆری بۆ پۆلکردنی کۆمەلایەتی لە ئەمڕۆدا هەیە و بناغەیەکیشە بۆ خولقانی گەردوونێ جیاواز و ناتەبا. ئەم نێتۆرکەش لەم گەردوونەی خۆیدا تەنێ خۆی خودی خۆی وەگەڕدەخا و بارێ ئەوتۆش دێنێتە پێشەوە کە ئەوانەی ئەم نێتۆرکە بەکاردەبەن پتر لەگشت کەسێ تر(یان لەچاو ئەوانەی بۆیان نالوێ بەکاریبەرن) دەکەونە ناو ژیانەوە یان لەناو گەردوونی نوێدا چەقگیردەبن. چونکە ئەم گەردوونە نوێیە شێوازێ لە ڕێکخستنی هێناوەتەکایەوە کە هەموو شتەکان لە نێتۆرك دا ئۆرگەنیزەدەکرێ(ڕێکدەخرێ). ئەم ئامادەبوونە لەناو نێتۆرك زۆرترین مانا بە بوونی کەسەکان یان کۆمەلگەکان تەنانەت نەتەوە و گرووپە ئیتنیەکانیش دەدا. دەبێ ئەوە بزانین کە هەج هاتنە دەرەوەیەکیش لە نێتۆرك یان ئامادەنەبوونێك لەناو ئەم نێتۆرکە بەمانای لەدەستدانی دەسەلات دەکەوێتەوە و یان نەتوانینی بەدەستهێنانی شوێنێ باش لەم گەردوونە نوێیە. لێرەدا مەبەست لە دەسەلات واتە نەبوونی توانا بەسەر ئۆرگەنیزەکردنەوە کە ئەمەش گەورەترین کێشە لەبەردەم ئەوانە دروستدەکا کە کەوتوونەتە دەرەوەی بازنەی نێتۆرك و هەمیشەش لەتەك ئەوانەی لە ناوەوەی ئەم نێتۆرکەدان لەحالەتی دووبەرەکەیاتی دەبن. بەمشێوەیە جیهانی نوێ لەوکاتەوە دەستپێدەکا کە لەناو نێت دا ئامادەدەبین و بە کەوتنەناو ئەم نێتەشەوە پتر لەگشت کاتێ نز خۆ لە ژیان نزدیکدەکەینەوە نەك لەبەرئەوەی ئەوەی پێیدەلێن ژیان لەوێدا ئامادەیە بەلکو لەبەرئەوەی ئەم نێتە دەبێ بە هەموو ژیان و بگرە لە ژیانە ڕاستەقینەکە زیاتر ژیان خۆی تیا حەشاردەدا. ئێمە لێرەدا نە ستایشی ئەم جۆرە ژیانەی ناو نێت دەکەین نەش خودی نێتۆرکیش ئاوا بە شتێ بێ لایەن و چارەسەر دەزانین. بەلام

ناهەمواریەکانی ئەم جۆرە ژیانە و فۆرمە جۆراوجۆرەکانی ڕێکخستن لە نێتۆرك و قودرەتی ئەم نێتۆرکە لەدرێژەی ئەم گفتووگۆیە و گفتووگۆکانی تر نیشاندەدەین.

دووبارە دێینەوە سەر باسەکەمان و دەڵێین، شارستانی ئەوڕۆ کە وەك شارستانی نێتۆرك خۆی دەردەخا ئایدیۆلۆژیا و ڕۆح و خەونەکانی ئەم شارستانیەتە دەبێ بە نێتۆرك و لە نێتۆرك دا خۆی حەشاردەدا. کاتێ کە دەشکەوینە ناو ئەم نێتۆرکەوە یان کە خۆ بەم نێتۆرکەوە گرێدەدەین ئەو کات لەوە دەگەین کە کەوتووینەتە ناو چ سەدەێ تازە و چ کۆمەڵگەێ نوێ و بەچ کولتوور و ئابووریەکەوە ئەم سەدە تازە و کۆمەڵگە نوێیە وەگەڕکەوتووە و دەشخوازێ کاری خۆی ئەنجامبدا. ئەم نێتۆرکە ئەو دوا پاڕادیگمەشە کە گەشەی سەرمایەداری گلوبال پێیگەیشتووە. ئەم پاڕادیگمە بەوەی ئەم نێتۆرکەی هێناوەتەکایەوە لە گشت پاڕادیگمەکانی تر جوداترە. بەکورتی ئەم پاڕادیگمە تازە و تایبەتە تەنێ دەکرێ بەهۆی ئەو بەرهەمە زۆرەی زانیارییەوە بناسرێتەوە کە سەرجەم بوونمانی لە کۆمەڵگەی نێت دا داگیرکردووە. هەروەها کۆمەڵگەی نێتۆرك دەکرێ بە ئاسانی بەهۆی ئەو شەپۆلە زۆرەی زانیاری بناسرێتەوە کە لە ئاڵووگۆڕی و لە گوازتنەوەێ بەردەوامدایە. ئەم گوازتنەوەیەش لەنێوان خاڵەکان (Node) یان گرێکان دایە. هەر ئەم خاڵانەش یان گرێیانەش بەخۆیان بوونە بەو شتەی کە وەك مێدیۆمێك ڕۆلی یەکگرتنەوەی نێوان نێتەکان ببینن. بەکورتی ئەم خاڵانە گرنگیێ زۆر لە پێکەوەگرێدانی ئەم نێتانە دەبینن. لەهەمانکاتدا دەکرێ ئەوەش باسکرێ کە لەلایەك پێوەندی لەنێوان گرێ یان خاڵەکانی نێتۆرك دا هەیە و لەلایەکیتر پێوەندی لەنێوان ئەم گرێیانە و و شەپۆلی زانیاریشدا هەیە. خودی ئەم پێوەندیەش چوارچێوەی ئەو دەسەلاتە دیاریدەکا کە لەگەڵ سەردەمی زانیاری دێتەکایەوە. هەروەك لەسەرەوەش ئاماژەی پێکرا، بەداهاتنی کۆمەڵگەی نێتۆرك، کاستێلس وتەنی، دەسەلات دەکەوێتە ناو ئەم نێتۆرکەوە یان بەواتایێ تر نێتۆرك دەبێ بە شوێنی کۆبوونەوەی دەسەلات و بوارێ بۆ دروستکردنی پارە. هەر ئەم نێتۆرکە دەسەلاتێ ئەوتۆ بەخۆوە دەگرێ کە جێی دەسەلاتی دەولەت دەگرێتەوە و لەهەمانکاتیشدا ئەم دەسەلاتە هێندە توانا بۆخۆی پێکدێنێ کە دەبێ بە دەسەلاتێ گلوبال و، ئەم بوون بە دەسەلاتە گلوبالەش واتە بوون بە دەسەلاتێ سەرووی دەسەلاتی دەولەتی ناسیۆنال. ئەم بوونەشی بە دەسەلاتێ سەرووی دەسەلاتی ناسیۆنال واتە چالاکییەکانی ئەم نێتۆرکە سەرووی توانای دەولەت و

کارگە و کەناڵەکانی مێدیاش دەبێ. هۆی ئەوەی کە ئەم نێتۆرکە دەتوانێ ئاوا کارکا و بەم ئاکامانەش بگا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کارەکانی لەدەرەوەی کاریگەری شوێن ئەنجامدەدا و هەروەها بوونیشی هەمیشە لە گۆڕان و لە خۆ نوێکردنەوەدایە. ئەم نێتە بەوەش دەناسرێتەوە کە لەلایەك فلێکسبلیتێێ (مرونەت) بەرزی هەیە و لەلایەکیتر توانای ئەوتۆی هەیە کە واڵە دەسەڵاتی نێوهەندی سەرمایەداری بکا هەمیشە لە گوازتنەوەدا بێ. ئەم گوازتنەوەی سەرمایەداریش هاوکاتە لەتەك جوولەی سەرمایەداری مالی. بۆ زێتر ڕوونکردنەوەی هەموو ئەوانەش کە لەسەرەوە دەستنیشانکرا گرنگە ئەوە بلێین کە دەسەڵات لەنێو درزەکانی ئەو گرێیانەی باسکرا و لەژێربالی شەپۆلەکانی زانیاریدا خۆی حەشارداوە. هەروەها دەسەڵاتی نوێ ئاوا کاری خۆی دەکا و هەر بەوجۆرەش شوێن لێرە یان لەوێ بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. ئەمە ئەو دەسەڵاتەیە کە پێشتر وێنەی نەبووە و ئەوەندەش بێ شوێن نەبووە.
سەربارەی ئەوی وترا، دەمانەوێ سەرنج دخەینە سەرئەوەش کە، بۆ نووسەری *چاخی زانیاری* دەسەڵاتی شەپۆلەکانی زانیاری لە شەپۆلی دەسەڵات گەورەترە (13). ئەو نێتۆرکەش کە بەهۆی زانیارگەرییەوە دروستدەبێ هەر لە بناغەدا هێزێ گلوبالە و ئەم هێزەش لەتوانایدایە چالاکی دامەزراوە سیاسیەکانی سەرمایەداری گلوبال و چوارچێوەی جوولەی کارگە ترانس (سەروو) ناسیۆنالییەکان و ئەندازەی تاوانە نێودەولەتیەکان بگۆڕێ. لەهەمووی سەیرتر ئەم نێتۆرکە توانیویەتی ڕۆلێ ئەوتۆ ببینێ کە هەموو ئەوانەی ناویان هات بەدور خۆیا کۆکاتەوە و بیانکا بە بەبەشێ لە چالاکییە گلوبالییەکانی. بەڵام ناکرێ لێرەدا بەشێوەێ پۆزەتیڤ تەماشای مانای ئەم گۆڕانە بکەین. چونکە ئەم گۆڕانە کە بەمشێوەیە دروستدەبێ مانای سیمبۆلی و ناجێگیر و پڕگماتیشی هەیە. ئەم گۆڕانە تایبەت و دیاریکراو و بەرنامەدارە. جارێ زۆری ماوە کە تێکڕای سەرزەوی بگرێتەوە و هەموو لە داهاتی ئەم نێتۆرکە دخۆن و لە بردنەپێشەوە و پەرەپێدانیدا بەشداربن. چونکە نێتۆرك تەنیا مانای بەکاربردن ناگەێنێ بەڵکو مانا گەورەکەی برتییە لە دروستکردن و خولقان و بوون بە بەشێ لە پەرەپێدەرانی ئەم زانیاریە باڵایە و هەروەها داهێنانی گەشە لەو بوارەدا. کێشەکەش لەوەدایە کە دۆزێ زانستی و زانیاری لە جیهانا هاتۆتە پێشێ کە هەر زوو جۆرە پۆلکردن و جەمسەرگەرییەکی لەتەك خۆدا هێنا کە بووە هۆی دروستبوونی دۆزەرەوە و بەرهەمهێنەرانێ کەم و دیاریکراو و وەرگر و بەکاربرانێ زۆر.

ئەم جۆرە پۆلگردنەی ئەمڕۆ لە دونیای گلوبال دا پیادەدەکرێ زۆرجوداترە لەوی لەمەوبەر. پۆلکردنی کۆمەڵگە و ناوچە و جوگرافیاکان بەپێی توانای زانینی و زانستیان قوولترین کەلێن و ئەستوورترین دیوار دروستدەکا و کەمترین گەشە و بەردەوامترین گەشە لە بەشێ لە جیهان سازدەکا و زۆرترین دواکەوتن و هەمبشەیترین وابەستەیەتی لە بەشە گەورەکەدا دادێنێ. ئەم لەیەك دابڕانەش چەندین شێواز لە بەیەکاچوونەوە و هەلوێست لەیەك وەرگرتن بەخۆوەدەگرێ و لەهەموو چرکەیەکیشدا لە فۆڕمی سەیرسەیر و ناکۆکدا دەردەکەوێ. لەئەمڕۆشدا دامەزراوە نێودەولەتیەکان، کە هەر بەدەست ولاتانی نێتۆرکەوەیە، زۆرجار دەبێ بە شوێنی ئەو بەیەکاچوونەوە و دژایەتیکردنانە و لەسەر بچکۆلەترین کێشەی ئابووری و کۆمەلایەتی و ژینگەی ناخوازن هەلوێستێ یەکانگیر وەرگرن و چارەسەرێ هاوبەش پێکەوە بدۆزنەوە. بەلام ولاتانی نێتۆرك کە هەر ئەوانیش بکەری سەرەکی ناو دامەزراوە سیاسی و ئابووری و سەربازییەکانن هەمیشە لە چوارچێوەی دەسەلاتە گەورەکەیان وەدووی چارەسەری کاتی بۆ کێشە ئابووری و کرمەلایەتیەکان(ئایدز، شەڕی ناوخۆ، ژینگە، هەژاری) دەگەڕێن و بۆ گەشەدان بە فۆڕمی سیاسی و یاسای واژەکانی مافی مرۆڤ و دیموکراسیەت بەشداری لە داڕشتنی هەندێ گۆڕانکاری کاتی یان هەمیشەی و بەردەوامی پراگماتیدا دەکەن.

## بوونی ڕاستی بە وێنە

بەهۆی ڕوونکردنەوە ئیمپیریەکانی کاستێلس بۆ نێت (هەروەها ئیتەرنێت یان نێتی کۆمپیوتەر) لەوەدەگەین کە چۆن کۆمەلگەی زانیاری کاری خۆی بەهۆی نێتەوە مەیسەردەکا و ئەم نێتەش لەناو ئەم کۆمەلگەیەدا بوونیادێ کۆمەلایەتی بناغەیی بۆ خۆی پەیدادەکا و واش لە ئێمە یان لە خودەکانی سەردەمی چاخی زانیاری دەکا کە هەر هەموو بەجوولەکانی نێتەوە گرێدرێین. واتە نێت کۆششی ئەوەدەکا کە بەجۆرێ سەیر گشت بوارەکانی ژیانی کۆمەلایەتی بگرێتەوە و ئەم ژیانەش پێکەوەگرێدا و سەرپەرشتیشیبکا. جگەلەوەش هەر ئەم نێتە وا لە پرۆسێس و فونکشونە زالەکانی ئەم چاخەش دەکا کە هەموو لە نێتۆرك دا خۆ ڕێکخەن. کاتێکیش کە کۆمەلگەی نێتۆرك بە پشتبەستن بەو زلنینە تەکنیکی و زانستە ئەلەکترۆنیەی دەبێ بە خاوەنی ئابوورێ نوێ، واتە ئابوورێ زانیاریاوی و گلوبال، ستروکتورێ سۆسیالی بناغەیی نوێ بۆ خۆی دابیندەکا کە سەرچاوە لە کولتوورێ تازەوە هەلدەگرێ.

لێرەدا گەر بمانەوێ بەکورتی و لەچوارچێوەی ئەم گفتووگۆیەدا ئاماژە بەمانای ئەم کولتوورە تازەیە بکەین دەڵێین کە مەبەست لەم کولتوورە تازەیە ئەوا کولتووری ڤێژوال Virtual (واقیعی، فیعلی). ئەم جۆرە کولتوورە ئەو کولتوورەیە کە لەگەڵ پایەداربوونی نێتۆرك دەکەوێتە گەڕ و دەبێ بە خاوەنی ستاتۆسی کۆمەلایەتی خۆی. ئەم کولتوورە ئاڕاستەێ مێژوویی چاخی زانیاریشە. کولتووری ناوبراو گوزارە لە ڕاستی ئەم چاخە دەکا و بۆیشە بە کولتووری ڤێژوالی ڕاستی ناودەبرێ. تەنانەت خودی ئەم کولتوورە کە وەك ڕاستیەکی ڤیژوالVirtual Reality خۆی دردەخا ڕیشەکەی بۆ توێژینەوە سەربازیەکان دەگەڕێتەوە کە جەنگی کەنداوی 1991 نموونەیەکە لێی(14).
بەواتاێ تر و بۆ زێتر نزدیکبوونەوە لە جەوهەری باسەکە دەگەڕێینەوە سەر نووسەری *چاخی زانیاری* کە پێیوایە لەگەل داهاتنی کۆمەڵگەی نێتۆرك بۆ یەکەمجار هەست بەمانای ڕاستی دەکەین و دەکەوینە ئامێزی جیهانی ڕاستیەوە. بەلام بۆ ئەم کۆمەڵناسە ئەمەریکی-ئیسپانییە ئەم ڕاستییە ڤێژوالە و ئەو جیهانەش کە ئەم ڕاستی لەخۆدەگرێ ئەوا جیهانێ هۆشیارە Intelligence. وەلی گرنگە بزانین کە ئەم ڕاستیە لەکوێدایە یان کوێ دەکا بە شوێنی خۆی و جێگای ڕەنگدانەوی؟. کۆمەڵگەی نێتاوی(لە نێتەوە وەرگیراوە) ئەمڕۆ کە هەندێ شوێن و بەشێ لە جیهان دەگرێتەوە ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە ئەو ڕاستییە، کە پێشتر ناونرا بە ڕاستی ڤێژوالە، ڕاستیێ تایبەت و دەگمەن و بالایە و، ئەم ڕاستییەش دەشێ تەنێ هەر لە نێتۆرك دا دەستکەوێ یان تەنێ لە نێت دا بوونی هەبێ. بەلام دەبێ لەوەبەئاگابین کە نێت بۆ لەمەولا تەنێ کاری ئەوە نییە کە ڕاستی دروستکا بەڵکو ئەم نێتە وا خۆی دەردەخا کە بووە بە ڕاستی یان ئەم نێتە تواناێ ئەوتۆی هەیە کە ئەوەمان پێڕاگەێنێ کە خودی ڕاستی واتە نێت. بەمجۆرەبێ نێت ڕۆلی بوونی ڕاستی دەبینێ و لێشمان دەبێ بە ڕاستی ڕاستی. یان کاتێ کە بمانەوێ بەدووی ڕاستیدا بگەڕێین دەبێ بێینە ناو نێتەوە. چونکە نێت لە دۆزێ ئەوتۆی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریدا گەشەی کردووە کە بووە بە ڕاستیەك کە لە ڕاستی ڕاستی تر بێ. نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەم نێتە خولقێنەری ئەو ڕاستیە ڕۆژانەیشە کە بەردەستمان دەکەوێ یان بەرگوێمان دەکەوێ. ئەمە ئەو ڕاستیەیە کە بۆ لەمەولا دەخوازێ قۆرغی مانای ڕاستی بکا بەلام ئەوە نابێ بشتگوێخرێ کە ئەم ڕاستیە نوێیە(واتە ڕاستی ڤێژوال)، کە تەنێ لە نێتدا ئامادەیە و یاخود لە نێتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ، تەنێ بۆ بەشێکە و تەنێ

ئەوانەی لەناو نێتدان کارپێدەکەن. بەواتایەکیتر دەمانەوێ بڵێین بوونی نێت بە ڕاستیەکی هوشیاری باڵا تەنێ بۆ هەندێ جێگایە لەم جیهانە گلوباڵە. تەنیا هەندێ لە دانیشتوانی سەرڕووی زەوی دەتوانن ئاوا ڕۆژانە و بەبەردەوام لەم ڕاستیەوە نزدیکبن یان بۆیان هەیە بچنە ناو هەناوی ڕاستییەوە و مامەڵەی لەتەکدا بکەن. ئەمە ڕەنگە جارێ کێشە سەرەتاییەکە بێ(واتە توانای نەهاتنە ناو نێتەوە) و دواتر کێشەکە ڕەهەند و ئاقاری تر وەردەگرێ کە یەك لەوانە ئەوەیە کە تەمەنی ئەو ڕاستییەی بەهۆی نێتەوە دروستدەبێ چەندە ؟ یان ئەم ڕاستییە لەمەڕ چی و کێ دەدوێ؟ و ئەمجار چۆن ئەم دوانە دادەڕێژرێ؟ تادەگاتە ئەوەی کە بووترێ تاکەی نێت دەسەڵاتی بەسەر بەرهەمهێنانی ڕاستییەوە دەبێ ؟ و ئەوانەش کە لەدەرەوەی نێت دان چی لە ڕاستیەکانی خۆیان بکەن؟. هەموو ئەو پرسیارانە ئەو تێگەیشتنە بەرباسدەخەن کە باس لەوە دەکا کە بۆدەبێ ئەو هەموو هێز و بەهایە بە نێتۆرك بدرێ و توانای ئەوەی هەبێ کە شوێنی گشت بەها ڕەوشتی و مرۆییەکان بگرێتەوە. گەر ئێمە کێشە سەرەتاییەکەمان لە ئەمڕۆدا ئەوەبێ کە جارێ هەموو نەکەوتووینەتە ناو نێتەوە و هەروەها هەموو لەبواری نێت دا وەك یەك بەرهەمهێنەو و وەبەرهێنەر نیین ئەی پاشان کاتێ کە گەشەی نێت دەکاتە ئاستێ ئەوتۆ کە هەریەکە بەپێی توانای خۆی بەرهەمهێنەر و بەکاربر دەبێ کێشەکانمان زۆر لەوی ئەمڕۆ قووڵتر و بەرینترنابن.

گەر بگەڕێینەوە سەر ناواخنی ئەوی لەسەرەوە وەسەرەتای هاتین دەڵێین ئەو کولتوورە نوێیەی کە بەهۆی نێتۆرکەوە دێتەکایەوە و وەك ڕاستیێ ڤێژوال ناودەبردەکا ڕاستیێ ڕووکەشە و تەنێ لەناو ئەو شاشەیەدا بوونی هەیە کە نێت کاری خۆی تیا ئەنجامدەدا. جا ئەو ژیانەش کە بەهۆی ئەم شاشەیەوە دروستدەبێ ژیانێکە کە لەناوەوە و دەرەوەی شاشەکەدا وەك یەکوایە (ئەم لایەنەش پێشتر لەلایەن بۆدریاردەوە بەرباسخراوە). بەپێی ئەم تیۆریەش بێ ڕاستی ڤێژوال سیستەمێکە کە خودی ڕاستی لە جیهانی مێدیادا تووندەکا و شاشەش ج وەكTV و چش وەك شاشەی کۆمپیوتەر بەشێکە لەو مێدیایە و لەوێشدا دیاردەکان تەنێ لەو شاشەیەدا، کە بەخۆی شوێنی گەیاندنی ئەزموونەکانی ئێمەیە، گیرناخۆن بەڵکو ئەو ئەزموونانە دەشکۆڕدرێن. بۆیە دەکرێ شتێ وەك TV وایلێدەکرێ کە هەر شاشەنەبێ بەڵکو لە ژیانە ڕاستەقینەکە ڕاستر خۆی نیشاندا. واتە ڕاستی ڤیژوال ڕاستیێ ترە، ڕاستیێ ئونیڤێرسومێ ئەلەکترۆنییە کە ئەمڕۆ لەتەکیا دەژین. ئەمە ئەو ڕاستیە

فیزیاییەیە کە کەوتووینەتە ناویەوە. ئەم ڕاستیە بوونیادێ کۆمپوتەری هەیە(15). کاتێ کە نێتیش بە فیعلی کار لە تێژیانی کات و شوێن دەکا ئەم مەسەلەیە وا لە کاستێلس دەکا بگاتە ئەو باوەڕەی کە وێنەی ڕاستی لە گۆڕاندایە. ئەلبەتە دەکرێ لەم بوارەدا ئەوە یادخرێتەوە کە بەشێ زۆر لە توێژەرەوەکان باس لە گەیاندنی کات و شوێن دەکەن کەچی ئەم کۆمەلناسە لەبری ئەوە باس لە واتای تەوژمی یان شەپۆلی شوێن و بێ کاتی کات دەکا کە دەخوازین لە گفتوگۆیەکی دیدا بێینەوە سەری.

## ئەمەریکا و کولتووری دیگیتال

دوای دروستبوونی گەشەیەکی بەهێز لە ناوەندی هەفتاکان بەولاوە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەناوی گەشەی زانیاری نوێ وایلێهات کە زۆربەی بوارەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و زۆربەی چالاکی و مەرجە نوێکانی کارکردن لەلایەن دەزگا تەکنیکییە ئالۆزەکانەوە ببرێتەڕێوە و، کۆمپیوتەریش ببێ بە ئامرازێ سەرەکی بۆ گەشەدان بە شێوازەکانی بەرهەمهێنان و بردنەڕێوەوە. بۆیە شوێنی سەرهەلدانی کۆمەلگەی نێتۆرك بەبێ یەك و دوو واتە ئەو شوێنەی کاستێلس تیای دەژی(لێرەدا مەبەست ئەمەریکایە). ئەو شوێنەی کە بۆتە بنکەی زانیاری دیگیتال و تەکنیکی نوێی جیهان و جێگای دروستکردن و سڕینەوەی بەها و مانا. بەهۆی ئەم جۆرە گەشەیەوە لە زانینی تەکنیکی نوێ دەستووری تر بۆ خولقان و بەرهەمهێنان هاتەکایەوە. لێرەوە شیاوییەك هاتەدونیا بۆ مالئاوایی لە شێوازی بەرهەمهێنانی کلاسیك و بۆ وەگەڕخستنی مۆدێلێ دی بۆ بردنەڕێوە و دابەشکردنی دەسەلات، دەولەمەندی و بازاڕ. لەهەمووی سەیرتر بوارێ سیاسی و ئابووریی ئەوتۆ لەم شوێنەدا لەدایکبوو کە گرنگی دی لەوەی ناسنامە کوولتورییەکان لە فۆڕمی تردا بەرجەستەکرێن و هەروەها ئەم ناسنامانە وەك گشت شمەکێ تر گلوبالکرێن. نەك هەر ئەوە بەلکو تێگەیشتنە ئەکادیمی و توێژینەوە تیۆرییەکانی ئینستیووتەکانی پشکنین و شیکردنەوەی ئەم کۆمەلگەی زانیارییە دیگیتالە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەوتە ئەوەی ڕۆلێ بناغەیی لە پۆپولێرکردن و گشتیکردنی واتا و چەمکەکانی ژیانی سیاسی و کولتووریمان ببینێ و هەمووش بەو گۆڕانکاریانەوە گرێدا کە خۆی لەئاکامی گەشەی زانین و چوونە ناو قۆناغی زانیاریگەرییەوە دووچارییبووە. توانای تەکنیکی و زانیاری زانستی بارودۆخێ ئەوتۆی بۆ ئەم کۆمەلگەیە (لێرەدا مەبەست

کۆمەڵگەی ئەمەریکییە) ڕەخسانووە کە وا لە فۆرمە نوێکانی ناسنامە و پەیوەندییەکانی نێوان دەسەلات و بەرهەمهێنان و زانین بکا وەدووی تەکنەلۆژیای زانیاریی نوێوە بن. ئەم لایەنەش پێش هەموو شوێنێ لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکادا سەقامگیر بووە و بەتەواوەتی ڕیالیتیی خۆی بەدەستهێناوە. بۆیە ئەمەریکا مالی ڕاستەقینەی جیهانگیری ئابووری و زانیارییە و دیارترین دالدەشە بۆ خۆگلۆبالکردن و گەیشتن لە جەوهەری زانینی نوێ و واتای تازەی بازاڕ. بۆیە لەمەولاش کە گوێمان لەناوی ئەمەریکا دەبێ شارستانی ڕۆمانیمان دێتەوە پێشچاو بەلام بە زانیاریێ ئەلەکترۆنی و ئابووریێ گلوبالی دیگیتالەوە. کەوابێ لەم شوێنەوە گۆڕانکارییە نوێکانی ئەمڕۆمان، هەر لە ئەفسانەی جیهانیبوون و دۆزینەوە فزیۆلۆژی (کارئەندامناسی) و بیۆ-تەکنیکییە سەیرەکان و تیۆریە ئابووریی و کۆمەلایەتیە پراکماتیەکانەوە تادەگاتە هەلاوگۆڕانە سیاسی و ستاتۆسە تازەکانی ناسنامە، ڕوەو بەشە جۆراوجۆرەکانی جیهان ملیڕێگا دەگرنەبەر. ئەم هەلاوگۆڕنە تەکنیکی و زانیارییە تەنێ مەرجەکانی کارکردنی لە کارگە پیشەسازییە ئەلەکترۆنیەکان نەگۆڕیووە بەلکو کاریگەری خۆی بەسەر ئینستیتووتەکانی ڕاڤەکردن و توێژینەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریش بەجێهێشتووە و ئەمەش لەئاستێ بالادا کاریگەری خۆی بەسەر بڕیارە سیاسی و ئابووریەکانیش جێهێشتووە و ڕۆلی لە دروستکردنی تابەیایی فکریش دیووە. لەم سالانەی دوایشدا زانکۆ و ئینستیتووتەکانی ئەمەریکا بووە بە شوێنێ کە پێشوازی لە زۆربەی شەپۆلە فکری و قوتابخانە سیاسی و فەلسەفی و کۆمەلایەتیەکان دەکا. تەنانەت زۆربەی بیریارانی ڕۆژئاوا زۆرتر لەوێ سمینار سازدەکەن و هەر لەوێشەوە شوهرەت لەگەل خۆیان بۆ ولاتەکانیان دێننەوە و یان ئەوێ دەکەن بە سەکۆێ بۆ خۆ گلوبال کردن و ناساندنی تیۆریەکانیان. لەم بارەیەشەوە دەکرێ مرۆڤ تەماشای لیستەی وەکرانی خەلاتی نۆبل لە: پزیشکی، فیزیا، کیمیا، زیندەوەرناسی، کارئەندامزانی و ئابووری بکا کە سالانە دەدرێ بە ئەمەریکایەکان و بەشێ زۆریش لەوانە بەڕەچەلەك ئەمەریکی نین و وەکیتریش ئەو زۆر وەرگرتنەی ئەم خەلاتە لەو بوارانە بەتایبەت ئابووری و پزیشکی نیشانەیە لەسەر مۆنۆپۆلکردنی بواری توێژینەوە و پشکنین لەلایەن ئەم ولاتەوە. هەر سەبارەت بەم دیاردانە گەر تەماشای ئەم دوو دەیەی دوایی بکەین هەست بەوەدەکەین کە گەلێ لەو تیۆرییانەی، بۆنموونە تێمای زانین و دەسەلاتی فوکۆ یا هەلوەشانەوەگەری دریدا یاخود

دیاردەی فێمینیزمی فەرەنسی و تەنانەت تەوژمی رەخنە لە مۆدێرنیتێش، لە ئەمەریکا بووە بە جێی باس نەك هەر گۆڕانییان تێکەوتوە بەڵکو واشیانایکراوە کە کۆپی ئەمەریکیشی لێدروستکرێ و لەتەك رێبازە سیاسی و فەلسەفیەکانی دوای سالانی هەشتا و نەوەتەکانی ئەم ولاتە تێهەلکێشیشکرێ. ئەمەو جگەلەو تێۆرییانەی لەم ولاتە سەبارەت بە جیهانی سێ و تێمای پۆست کۆلۆنیالیزم و رۆژهەلاتناسی رۆژانە بەرهەمدەهێنرێ و چەندین شوێنی جۆراوجۆری ئەکادیمیش بۆ ئەم مەبەستەدروستکراوە بۆئەوەی لەمبارەیەوە توێژینەوە ئەنجامدرێ. زۆرجار ئەو توێژینەوە و شیکردنەوانە لە ستراتیژی سیاسی ئەمەریکی ناچنە دەرەوە و هەندێ جاریش نەك هەر ئەوە ناکەن بەڵکو دەبن بە کۆلەکە بۆ ستراتیژی سیاسی و ئابووری ئەمەریکی و بناغەدانەری تێۆریە یاسایی و سیاسیەکانی چاخی تازە. چاخی تازەش وایلێکراوە کە لەوێوە سەرهەلدا. چاخی تازە ئەو چاخە زانیاریە نوێیەیە کە پشت بە پاڕادیگمێ تەکنیکی نوێ دەبەستێ کە بووە بە بناغەی بۆ ئابووریێ زانستی و زانیاریێ تایبەت. ئەم ئەمەریکایە کە لەگشت بوارەکانا بووە بە بنکە بۆ زانین و زانیاری نوێ بەرهەمهێنەری ئایدیۆلۆژیایێ پاتریۆتیزمی (نیشتیمان پەروەی) تازەشە. ئەم پاتریۆتیزمیە نوێیە ئەو پاتریۆتیزمیەیە کە لەدوای نەمانی جەنگی سارد و مەترسی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی دادێ و بەکەلك وەرگرتن لە زانیاریگەریی دەبێ بە مۆدێلێ بۆ جیهانیگەریێ تاك جەمسەریش. لێرەوە دەکرێ بووترێ کە نە هەموو ئەمەریکا وەك فۆکۆیاما بیردەکاتەوە نەش نووسینەکانی شومسکی بووە بە ئینجیلی ئەمەریکیەکان. ئەمەریکا تێۆریە رۆژئاوایەکان وەردەگرێ و دواتر بە پێی تێگەیشتنی سیاسی و ئابووری خۆی دایدەرێژێنەوە. بەمجۆرە ئەمەریکا دەکرێ وەك جێگایێ تەماشاکرێ کە فابریکەی (کارگە) تێکڕای پاڕادۆکس و ناچووستیەکانی جیهانە. ئەم ولاتە لەپاش نەمانی جەنگی سارد و ترسی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی بووە بە مندالدانی مۆبلیزەی (تەعبیئەی) ئایبیۆلۆژی جیهانی. گەر لەمبارەیەوە بشمانەوێ رەوانتر بدوێین ئەوا دەچینەوە سەر قەولێکی کافکا کە دەلێ کەسێ کە بۆ ماوەێ زۆر دوژمنایەتی کەسێ تر دەکا دواتر دەبێ بە هەلگری هەموو سیفاتەکانی ئەو کەسە. ئەمەش زۆر بەسەر ئەمەریکادا پەیڕەو دەکرێ وەك لە ولاتێ تری دونیا. بەسەفەرێ بۆ روسیای ئەمڕۆش مرۆڤ ئەوەی بەباشی بۆ دەردەکەێ کە ئەم ولاتە کەوتۆتە ناو چ بێ ئایدیۆلۆژیایەکەوە و هەلپەی ژیان چی بەسەر مرۆڤی ئەم ولاتە هێناوە کە پێشتر بنکەی گەورەترین ئایدیۆلۆژیای جیهانی بووە.

بەلام بەسەفەرێ بۆ ئەمەریکا چیمان بۆ دەرناکەوێ! بەدلنیایەوە ولاتێ دەبینین کە فرەجەمسەرترین هێزی لەخۆیدا بەرجەستەکردووە و دۆزێ دەروونی ئەوتۆشی بۆ خۆی و کەسەکانی ئەم ولاتە دروستکردووە کە هەمیشە لە حالەتی جەنگ و داکۆکی لەخۆبن و خۆش نەك هەر بە ئازا و ئازاد بزانن بەلکو زۆر بە گوناه و غەدرلێکراویش لەقەلەمبدەن. بەشێ زۆر لە ئەمەریکایەکان نەك هەر زانیاریان لەسەر ولاتانێ زۆری ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست نییە بکرە هێدەی دانیشتوانێکی ولاتانی عەرەبیش لەبارەی ولاتانی باکووری ئەورووپا(بۆنموونە ئەسکەندەنافیا) نازانن و هەمیشەش پرسیاری ئەوەدەکەن کە بۆ دەبێ ئەمەریکا هێندە یارمەتی ولاتانی تر بدا و کێشەی میللەتانی تر چارەسەرکا یان بۆ تائێستا دامەزراوی نەتەوە یەکگرتووەکان نەبووە بە دامەزراوێ ئەمەریکی یان بۆ ئەم دامەزراوە (واتەUN) بەپێچەوانەی تێگەیشتنی ئەمەریکی کاردەکا. ئەوی ئێمە باسیدەکەین تەنێ وێنەیەکە لە ئەمەریکا. باشە ئەمە ئەمەریکایە کە سیمبۆلە بۆ ئازادی و مافی مرۆڤ و شوێنی داهێنان و دۆزینەوە یان سۆڤیەتی جارانە. بۆشە وادەلێم چونکە لە کۆمەلگەی ئەمەریکیدا دیاردەیەکی وا لەسەر بەئەمەریکاییوون باوکراوە کە گوایە ئەمەریکا بۆ ئەو کەسانەیە کە داهێنەرن. یان ئەمەریکا ئەرکی هێومانی جیهانی لەکۆل گرتووە و هەموو دەست تێوەردانەکانیشی بۆ پاراستنی ستاتۆسی تازەی مافی مرۆڤ و دیموکراسیەتی گلوبالە. پێمان وانییە هیچ ولاتێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا هێندەی ڕژێمی یان دەولەتی ئەمەریکا کار بۆ مۆبلیزەی دانیشتوانی ولاتەکەی خۆی بکا و مێدیای خۆشی بۆ مۆنۆپۆلکردنی ئیندڤیدی ولاتەکەی خۆی بەکاربەرێ. ئەوەندەی کێشەی سیاسی کوردەکان لە مێدیای ولاتانی ڕۆژئاوا یان ولاتانی ئەسکەندەنافی باسدەکرێ لە هەموو مێژووی سیاسی ئەمەریکا ئەوندە باسنەکراوە. تەنێ کوردەکانی ئەمەریکا دەزانن کە چەند دێڕ لەسەر کێشەکەی ئۆجەلان لە مێدیای ئەمەریکی وترا لەکاتێکدا کە ولاتانی ڕۆژئاوا و بەگشتی ئەورووپا بەهۆی دەستگیرکردنی ئۆجەلانەوە بوو بە گۆڕەپانی ناودارترین خۆپیشاندانی سیاسی کوردی کە لە دوای خۆپیشاندانەکان بۆ ڕوداوی هەلەبجە و کۆڕەو دەکرێ حسێبی باشی بۆ بکرێ. ئەوەی کە ئەمەریکاش ئەمڕۆ زیندانێ سیاسیە بۆ ئەوەی بیرکردنەوەی لەتەك ئیدارەی سیاسی ئەمەریکی نەگونجێ ئەمە ڕاستیەکی زیادلەپێویست ڕوونە بەلام حاکمیەتی کولتووری و سیاسی ئەمەریکی دۆزێ کۆمەلایەتی و دەروونی ئەوتۆی هێناوەتە پێشێ کە کۆتای بە فسەکردن لەسەر ناتەبایی و

ناکۆکییەکان بهێنێ و یان وایکردووه که قسەکردن لەوبارانەوه تەنێ بکا به پیشەی ئەوانەی که ئەگەر نخوازن خۆ نخەنه لیستی ڕەش و لیستی تیرۆریستەکانەوه. واته که تۆ قسەتکرد دەبێ پێشوەخت ئامادەبی وەك گومانلێکراو و نایاسایی و دژ بەشارستانی تازه تەماشاکرێی. ئەمە نەك هەر له ئەمەریکا بەڵکو له ولاتانی ڕۆژئاواش باوبووه و بەمجۆره کەوتۆتەوه. لێرەدا مەبەست ئەوه نییه که ئەو کەسه زیندانی دەکرێ یان سەرنگوومدەکرێ نەخێر بەڵکو مەسەلەکه ئەوەیه که تۆ لەڕووی کۆمەلایەتیەوه فەرامۆشدەکرێ و تێگەیشتنەکانت به نامۆ و بێ بناغه دەزانرێ و ڕەنگه وەك کەسێ تەماشاکرێی ئاساییه وابیرکەیتەوه چونکه له شوێنهایەکەوه هاتووی که لەڕووی شارستانییەوه دواکەوتووه و یا جەنگی لێبووه یان دەکرێ کۆنه کۆمۆنیست یاخود ئیسلامیست بی. ئەم لایەنەش دوای ڕووداوەکانی 11/9 زۆر ناشرینترکەوتۆتەوه و ولاتانی ڕۆژئاوا بۆ هەلاتووەکانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی(یان بەقەولی مارکس خەلکی ناوچه مەحەمەدییەکان) بوو به دۆزەخ. بۆلەمەولاش نەك هەر سەرڕەشی گرفتی دەروونی لەدوایه بەڵکو خودی ئەم سەرڕەشیه بەپێی جوگرافی پۆلدەکرێ و سەرڕەشێکی دانیشتووی ولاتەکانی ئەمەریکای لاتین یان ئاسیای ڕۆژهەلات یان جنوبی ئەورووپا له سەرڕەشێکی ولاته عەرەبیکان یان جیهانی ئیسلامی جودایه. نەك هەر لەبەر ئەوەی ئەمان ئیسلامن و ئیسلامیشن له پشت ئەو هەرەشه ڕۆژانەیانەیه که دانیشتوانی ولاتانی ڕۆژئاوا تیایدەژین بەڵکو لەبەر گەلێ هۆیتر که پێوەندی به ناو و مانتەلیتێت (خووڕەوشت) و مۆسیقای گەلی و شێوازی خواردن و چەندین شتی ورد و درشتی ڕۆژانەوەیه که ئاساییه مرۆڤی پێ بێ بەهاکرێ. بەلام دەبێ ئەوەش بووترێ که ناوچه مەحەمەدییەکانیش بەهەشتێ ئەوتۆ نییه بۆ لەمەولا بۆ ئەوانەی که له ڕۆژئاوا و ئەمەریکاوه ڕوویتێدەکەن.

ئەم باسەش مەسەلەیەکی تر دێنێته پێشێ که پەیوەندی به دیاردەی ئەنتی ئەمەریکای Antiamericanism یەوه هەیه که پتر دیاردەیەکی دەرەوەی ولاته یەکگرتووەکانی ئەمەریکایه و بەتایبەت ولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا. له ئەورووپای ڕۆژئاوا ئەم مەسەلەیه ڕەوتێ جوداوازتری وەرگرتووه وەك له دەرەوەی ڕۆژئاوا. لێرەدا دەبێ لەوەبگەین که لەگەڵ هاتنی تەوژمی جیهانگیری ئەو ڕەوته له ولاتانی ڕۆژئاوا چوارچێوەی پتر فکری تری وەرگرت وەك لەجاران و مەسەلەی ئەنتی ئەمەریکای بووه به واژەی تر و به واتای تر بەلەجیاتیکرا. چونکه بەئاشکرا ئەوه دەرکەوت که جیهانگیری ئابووری و

زانیاری و ئەمجار بەئەلەکترۆنیکردنی شارستانی نوێ شوێنێ وەك ئەمەریکا لەپشتیەوەیە وەك لە ولاتێ تر. بۆیە ڕق لە جیهانیبوون بە ڕق لە ئەمەریکا تێکەلکرا و دیاردەی بەجیهانیبوون بوو بە سینۆنیمی (هاوشانی) بەئەمەریکاییبوون.
زۆرجار دەبێ لەو مەسەلەیەش بەئاگابین کە ئەو ئەنتی ئەمەریکاییەی ناو ڕۆژئاوا تەنیا شتێ سەرپێی و هەرەمەکی نییە بەلکو بنەمای ڕوناکبیری خۆی هەیەو بگرە فەلسەفەیەکیش لە پشتیەوەیە. ئەم لایەنەش لەسەر زۆر ئاست دەکرێ ببینرێ. بۆ نموونە لەسەر ئاستی ڕوناکبیری و لەنێو ڕوناکبیرانی فەرەنسی دەکرێ بۆ ئەو سەفەرە ڕەخنەئامێزەی ژان بۆدریار بگەڕێینەوە کە بەرەو ئەمەریکا کردویەتی وەك ڕەخنەگرێ لە مۆدێرنە و کۆمەلگەی زانیاری ئەمەریکی کە دواتر لە کتێبێ بەنێوی (ئەمەریکا، 1986) بەرجەستەیکردووە(16). ناوبراو لەوێڕا وێنەیەکمان لەسەر کۆمەلگەی بەرخۆری و شەکەتئامێزی ئەمەریکی دەداتێ کە بنەما بۆ تیۆرێ لەسەر نەك هەر کۆمەلگەی ئەمەریکی بەلکو لەسەر ئەو کۆمەلگە هیچگەراو و بێئایندە و نامورالیەش دەداتێ کە لە گشت کۆمەلگە نوێکانا گەرایداناوە. ئەم شێوە ڕەخنەی بۆدریار وامانلێدەکا بەتەواوەتی هەست بە سەرەتاکانی سەرهەلدانی جۆرە ڕەخنەێ نوێی فەرەنسی (هەروەك ئەوەی کە پێشتر مێژووکرد و فەیلەسوفی فەرەنسی دۆتۆکفیل پێش سەدەو نیوێك ئەنجامیداوە ) لە کۆمەلگەی ئەمەریکی بکەین(17). هەر ئەم ترادیسیۆنە ڕەخنەیە لای ڕوناکبیرانی فەرەنسی گەشەدەکا و تادەکاتە ئەو کاتەش کە گەورەترین کارەسات لە ئەمەریکادا ڕوودەدا و جەرگبڕترین ڕووداو دێتە سەر کۆمەلگەی ئەمەریکی کەچی دەبینین ئەم ڕوناکبیرانە هەلوێستی خۆیان ناگۆڕن و پێیشیان وایە ئەوی ڕوویداوە(لێرەدا مەبەست ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەرە ) پڕ بەپێستی ئەمەریکایەکانە. واتە ئەمەریکایەکان نەك هەر دەکەن بە بەرپرسیاری سەرهەلدانی تیرۆریزم بەلکو ئەو تیرۆریزمەش کە لەناخی گشت کەسێکدا لە ژیاندایە(بۆدریار ووتەنی). هەر هەلوێستی بیریاری پۆست مۆدێرنی فەرەنسی بۆدریار جارێ تر و بەهەمان ناوەرۆکی ڕەخنەئامێزانەوە دێتە گۆڕێ و هەموو هەلەکانیش دەخاتە ئەستۆی خودی کۆمەلگەی ئەمەریکی و سیاسەتە چەوتەکانی. لەو سەروتارەش کە لەژێرناوی"ڕۆحی تیرۆریزم" لە نۆڤەمبەری سالی 2001 دا دەینووسێ سەبارەت بە ڕووداوەکانی 11ی سێپتەمبەر ناوبراو داکۆکی لە تیرۆریزم دەکا بەرامبەر بە وێرانبوونی سۆپەر دەسەلات. ئەمەو

بگره جگەلە لە گالتەکردنەکانی بە جەنگی کەنداوی 1991 کە بەقەولی" ئەو" ئەوەی ڕوویدا شەڕ نەبوو و هیچ شوێنێکیشی نەگرت. دەشێ سەرنجێ بخرێتە سەر ئەو لایەنەش کە ئەم هەلوێستەی بۆدریار وەك بیریارێ فەڕەنسی تازە نییە و بگرە فەڕەنسیەکان بەمجۆرە هەلوێستانە ناسراون، بۆنموونە هەلوێستەکانی فوکۆ بۆ شۆڕشی ئێرانی، یان سەروتارەکانی ڕێجیە دۆبرێRegis Debray کە لە کۆسۆڤۆ وە بۆ ڕۆژنامەی لۆمۆند ی فەڕەنسی دەنارد سەبارەت بە سرپەکان کە چەند دلێرن (بە قەولی هارالد بێرگیۆسHarald Bergius ). . لەڕاستیدا ئەنتی ئەمەریکای لە ولاتانی ڕۆژئاوا جیاوازە لە ولاتانی غەیرە ئەوروپی و تاڕادەیەك دەتوانێ ببێ بە فکریش نەك هەر دژایەتیێ هەڕەمەکی و بێسەروبەر وەك ئەوەی لە ولاتانی پاکستان و ئەفغانستان و کوردستان و شوێنهایەکیتری دەرەوەی ڕۆژئاوا باوە. قسەکان لەسەر ئەمەریکا هەمیشە دەبەسترێتەوە بە سەرمایەداری گلوبالی ئەمەریکی و ڕۆحی دەسەلاتئامێزی سیاسی ئەمەریکی و ئەو کولتوورە ئەمەرکییە بێ خەیال و ناتەندوروستەی کە وەك پەتا گشت جیهانی نوێی گرتۆتەوە و ئەلبەتە پێش هەموو شتێکیش کە خەریکە گشت ڕۆژئاوا(چاترە بلێین تێکڕای ئەوروپا) دەکا بە شارێکی ئەمەریکی.

هەستی ئەنتی ئەمەریکای ڕوناکبیرانی ئەوروپای لەگەل گشت کێشەێ کە دێتە پێشەوە سەرلەنوێ سەوزدەبێتەوە و نەشونمادەکا. بەلام ئێمە کە باس لە بونی دیاردەی ئەنتی ئەمەریکای لە ولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوایی دەکەین زێتر مەبەستمان ئەو بزووتنەوە و گرووپە سیاسیانەیە کە بە چالاکییەکانیان لە نێتۆرك و یان لە دەرەوەی نێتۆرك (بۆنموونە لە مێدیادا) کاری خۆیان دەکەن نەك ڕژێمەکانی ئەم ولاتە ڕۆژئاواییانە کە بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری و یاسایی بە ئەمەریکاوە دەیانبەستێتەوە. بەلام ئەو تێگەیشتنە بۆ ئەمەریکا و ئەمجار بۆ دیاردەی جیهانگیریش نە لە ولاتانی ئەرووپای ڕۆژهەلات بەو قولییە فکرییە بوونی هەیە و نەش لە ولاتانی یان لە جیهانی عەرەبی-ئیسلامی. چونکە ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات بە ڕژێم و دانیشتوانەکانیشیەوە لە دۆزێ ئابووری ئەوتۆدان کە ناپەرژنە ئەوەی پێناسەێ دیاریکراو بۆ ئەمەریکا بدۆزنەوە و بگرە سیحری بەئەمەریکاییوون لەوێدا ئەوەندە بەرزە کە ڕەنگە لەدوای خودی ئەمەریکا لەوێ ئەوەندە بەئەمەریکاییوون مانای هەبێ. ئەمەریکاش ئەو سیحرەی لەو ولاتانەدا تەنێ بەهۆی ئابووریە گلوبال و زانیاریاویەکەیەوە دروستکردووە. ئەلبەتە ئەو ئیلیتە

(دەستەبژێرە) جووە ئەکادیمی و بازرگان و سیاسیانەش کە لەو ولاتانەدا(بۆنموونە ڕووسیا و ئوکرانیا) هەن هەمیشە باشترین هێزبوونە بۆ بلاوکردنەوەی پەتای فەلسەفەی بازاڕ و یان ئایدیۆلۆژیای لیبرالی کە مارکسیزم یەك لەو ئایدیۆلۆژیایانە بووە. هەر ئەوان لە پشت هاوردنی شەپۆلی کۆمۆنیزم بوون و هەر ئەوانیش لە پشت داڕمانی ئەم شەپۆلە و هێنانی ئابووری بازاڕیشەوە بوون. بۆیە لەبەرچەندین هۆی سیاسی و کولتووری و ئابووری و زانستیش لەئەم ئێستادا ناکرێ تەماشاکردنەکانی دانیشتوانی ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات بۆ کێشەکانی سەردەم بکرێ بە بناغە بۆ دامەزرانی تیۆری نوێ یان بکرێ بەجۆرێ لە جۆرەکان کەلك لە سێرکردنی سیاسیانەی ڕژێمە سیاسیەکانی ئەم ولاتانە بۆ گرفتەکانی چاخی زانیاری وەرگیرێ. دواکەوتنی ئەمان لەڕووی ئابووری و زانیارییەوە تاڕادەیەکی زۆر لەپشت ئەو کەلەکاییەی ئەمەریکاوەیە و تەنانەت ئەو گەشەیەش ئەمەریکا لە بواری زانیاری پێیگەیشت بۆ ئەوەبووە کە بتوانێ سەرووی ئەوان بێ و کەلێنێ ئەوتۆش بخاتە نێوان خۆی و ئەوان کە بە هاتنی ئێپۆکێ تریش چارەسەرنەکرێ. بەکورتی گەشەی تەکنەلۆژیای زانیاری ئەمەریکی لە ناوەڕۆکدا سیاسی بووە و دواتر ئابووری بووە. ئەمەش هەموو بەسەریەکەوە ئابوورێ زانیاری و گلۆبالی دروستکرد کە بە هیچ ولاتێ لەقنەکرێ. هەرچی جیهانی عەرەبی-ئیسلامییە ئەوە هەمیشە لە خەونی خۆیدایە و هەر ماوەی جارێ بەجۆرە ڕقێکەوە خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەمەریکا تەرخاندەکا و نەیاران دژ بە ئەمەریکا لێرە و لەوێ کۆدەکاتەوە. لە هەموو ڕقەکانیشدا هەمیشە مەسەلەی ئیسلام و کێشەی فەلەستین هەوێنی ڕقەکانە. ڕقی هەردوولا وەك یەك کۆن و دژانگیر و شەڕانگیزە. ئەمەریکایەکان نایەناوێ بەئاشکرا پێیان بلێن کە ئێوە واز لە سیاسەتکردن بێنن یان واز لە ئاینی خۆتان بێنن یان دەست لە ئابووری خۆتان هەلگرن یان ئێوە لە باسی وەك مافی مرۆڤ و دیموکراسیەت ناگەن و بگرە تێکیشدەدەن. ئەمانیش دەمێکە تەعبیئەی خۆیان و دانیشتوانەکانی خۆیانیان کردووە کە ئەوی ئەم گەردوونەی پیسکردووە ئەوا سەلیبی-یەهوودیەکانە و هەرجارەی بە بیدعەیەکەوە دێن و خەلکی سەر ئەم زەمینە بێهۆشدەکەن و دەست لە دەستتێوەردان ناکشێننەوە و ئەو شوێنەی ڕووی تێدەکەن گەڕای دووبەرەکی تیادادەنێن. ئەم دوولایەنە، واتە ولاتی ئەمەریکا وەك لایەك و جیهانی عەرەبی-ئیسلامیش وەك لایەکیتر، ڕۆژانە هەلە و تاوان دەرهەق بەیەکدەکەن و مرۆقەکانی سەر خاکی خۆیان بۆ پشتگیریکردن

له سێرکردنه ڕق ئامێزەکانیان بەکاردەبەن. ئەمیان بە کولتووری دیگیتال و لۆژیکی ڤێژوالەوە، کە لە هەموو گیان و هەستێ دابڕاوە، و ئەویتیشیان بە کەلەپووری خۆمالی و ئەفسانەییەوە، کە کەمتر لە زانیاریگەریی ترسناکتر نییە، دەخوازن بەشداری لە شەڕی هێمنی هەمیشەی بکەن کە پاڕادیگمی نوێی تەکنیك لەگەل خۆی هێناویەتی.

سەرباری ئەوی لەسەرەوە وتمان ئەوەش دەلێین کە، هاتنەکایەوەی ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییە و ئەمجار دوابەدوای ئەمەش سەرهەلدانی ئابووریێ گلوبال لەشوێنێ وەك ئەمەریکا شتێ هەڕەمەکی نییە و بگرە ناوەڕۆکی ئەو سێستەمە بازرگانی و ئەمجار سیاسیەش ڕووندەکاتەوە کە لە پاش جەنگ لە ئەمەریکا دا سەریهەلدا. بەکورتی هاتنەدونیای ئابووری نێودەولەتی و بەڕێوەبردنی ئەم ئابووریەش بەهۆی نێتۆرکەوە ئەو کۆششە بەئاگایەی ئەمەریکایە کە لە پاش جەنگ بەPax americana پاکس ئەمەریکانا(ئاشتی ئەمەریکی) ناوبرا. چونکە هەر ئەم ڕێگایە(واتە بەهۆی ئابووریێ گلوبالی بناغە زانیاری) لەبەردەم ئەمەریکادا مابوەوە کە بتوانێ جیهانی پێ مۆنۆپۆلبکا و بەشێ زۆر لەسەر زەوی لەو دەسەلاتە بێ بەشبکا کە بەهۆی ئەم ئابوورییەوە دروستدەبێ. گەر واشنەبا نەدەکرا نە بازاڕێ زۆر لێرە و لەوێ پەیداکرێ و نەش ئەو دژە جەمسەرەی (لێرەدا مەبەست ئەفسانەی جەمسەری سەرمایەوداری سووری سۆڤیەتییە) کە هەمیشە باسدەکرا ئاوا بەئاسانی داڕمێنرێ و، واش لەم جەمسەرە بکرێ موحتاجی ئەو بازاڕە کرێ و نەشتوانێ هیچ کاریگەریکەێکی بەسەر بڕیارە ئابووری و سیاسی و یاساییەکانەوە هەبێ.

وێرای ئەوە، کولتووری دیگیتالی ئەمەریکی دەیەوێ بەڕاشکاوی ئەوەمان پێڕاگەێنێ کە کۆمەلگەی تازەی ئەمڕۆ لە کۆمەلگەی پیشەسازی لەمەوبەر جوداوازە و، ئەو ڕۆلەش کە بۆ لەمەولا نێتۆرك، یان گەر فراوانتر بدوێین زانیاریگەریی، دەیبینێ ڕۆلێ سەرەکیی و مێژووییە یان هەر ئەو ڕۆلەیە کە پێشتر پیشەسازیگەری لە دروستکردنی هەلاوگۆڕان و دیاردەی چاوەڕێنەکراو دیوویەتی. بەلام ئەمە (واتە پیشەسازیگەریی) لە شوێنێ تری سەر زەوی هاتۆتە دونیا(بەریتانیای مەزن) و دواتر بارودۆخێ دروستبووە کە لێرە لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا مالئاوای لێکرێ. واتە ڕۆلی پیشەسازی وەك شێوازێ لە بەرهەمهێنان و بەکاربردنی شتی ماددی لەم شوێنەوە کۆتای بە ڕۆلی دەهێنرێ و بە شێوازێ تر لە بەرهەمهێنان و پاڕادیگمێ تر بەلەجیاتی

دەکرێ. بۆ ئەمەریکا ئەم شێوازە لە بەرهەمهێنان و ئەم پاڕادیگمە تەکنیکیە کۆنە تواناێ ئەوتۆی بەرهەمهێنانی تیا نییە و بەکەڵکی پێشبڕکێ گلۆبالییەکانیش نایێ و، بۆیە ئەم ولاتە شێوازێ لە بەرهەمهێنان دەخاتەگەڕ کە بەزۆری زانیاری و زانینی تەکنیکی بەکاردەبا و پێشبڕکێ ئابووری و تەکنەلۆژیەکانیش بەخۆیەوە گرێدەدا. واتە ئەم شێوازە تازەیە لە بەرهەمهێنان کە نێتۆرك بەرهەمدێنێ کارێ وادەکا کە ئەم نێتۆرکە ببێ بە چارەنووسمان و مەجبووریشمان دەکا کە خۆمان لەبەردەم شیاوییەکانی ڕاگرین. لەم حالەتەیشدا وشەی نێتۆرك زۆرتری تیابەدیدەکرێ وەك لەوەی کە خۆی دەردەخا. ئەمەی ئێستاش لەژێرسایەی نێتۆرك تیایدەژین تەنیا ناوەڕۆکێ ڕووکەشە و جارێ زۆر لەسەرەتاین. جارێ زۆر دۆزینەوە و داهێنانی عەجیب عەجیب ماوە کە پێیبکەین و کاری لەسەر بکەین. ئەو هەلاوگۆڕانانەی بەهۆی زانیاریگەرییەوە تێیدەکەوین تێگەیشتنێ ئەوتۆمان لادروستدەکا کە ئەوەی ڕوودەدا یاریێ مێژووی نییە بەڵکو ڕیالیتێێ نوێی لەمەولایە و حوکمی دوا پاڕادیگمی زانستییە.

دەکرێ باس لەوەشکەین کە، نەك هەر ئەمەریکا بەڵکو زۆربەی ئەو ولاتانەی کاریان بۆ بەنێتۆرککردنی کۆمەڵگەی ئەمڕۆ کردووە کۆمەڵگەی نێتۆرکیان وەك هەنگاوێك لەنێوان شۆڕشی تەکنەلۆژیای گەیاندن و جیهانگیری سەرمایەداری توندکردووە. هەروەها شەپۆلی زانیاری ئەو ئابوورییەی ئەم کۆمەڵگەی نێتە پشتی پێدەبەستێ وەك ڕیسکێ خۆی دەردەخا کە هەمیشە لەبەردەممانداىە و چارەنووسی کۆمەلایەتی و کولتووریشمانی بەخۆیەوە وابەستەکردووە. ئەم جۆرە ئابووریە کە دوا فۆڕمی ئابووری جیهانە و دوا توانا لە بەرهەمهێنانی بناغەکانیدا بەکابراوە لە توانایدایە ڕۆژانە هەڕەشە لە مافەکانمان و لە مانای جێگیری سیاسی و گەشەی دادپەروەری بکا.

لێرەشدا بێ مانا نابێ گەر لە میانەی ئەم پەڕەگرافەدا سەرنجێ بخەینە سەر مەسەلەی نێتۆرك و دۆزی ئاسایشی جیهان کە بەرپرسیاریەتی ئەم ئاسایشە وادەردەکەوێ تەنێ نەکەوتۆتە ئەستۆی دەولەتی ترانس (سەرووی) ناسیۆنالیەکان بەڵکو کەوتۆتە ئەستۆی دامەزراوە و کارگە مولتی (فرە) ناسیۆنالیەکانیش. ئەم پێوەندیەش لەنێوان دەولەتە ترانس ناسیۆنالیەکان و کۆمپانیا مولتی ناسیۆنالییەکان بەرژەوەندی ئابووری و سیاسی لەپشتەوەیە و کە دەشکرێ ئەملایەنە بەهۆی تێگەیشتنێکی کاستێلسەوە ڕوونکرێتەوە، کە لەدووتۆی ڕاپۆرتێ بەرباسیخستووە کە لەسالی 1998 بەنەتەوەیەکگرتووەکانی

پێشکەشکردووە(18). کاستێلس لەو ڕاپۆرتەدا باس لەوەدەکا کە بۆئەوەی حکومەتە ناسیۆنالییەکان بەختی ئەومیان هەبێ شەپۆلە گلوبالییەکانی سەرمایە و زانیاری بەکاربەرن پێکەوە دامەزراوی سەرووی ناسیۆنالی ئەخولقێنن(فۆندی نەختی نێودەولەتی، EU، Nafta یان ئۆرگانی پێکەوەکارکردنی هەرێمی تر) بەرامبەر بەمەش واز لەبەشێ لە دەسەلاتی خۆیان دەهێنن. ئەمانە لەهەمانکاتدا لەناو فۆڕمی دەولەتی نوێش دەژین کە دامەزراوە سەرووی دەولەتیەکان، دەولەتی ناسیۆنال دارودەستە لۆکالی و ناوچەییەکان لەگەل ڕێکخراوە نا- دەولەتیەکانیش هەموو پێکەوە لە نێتۆرکێکدا پێکەوە گرێدەدرێن. ئەمەش هەموو بەسەریەکەوە فۆڕمی سیاسی چاخی زانیاری پێکدێنێ یان دەکرێ بە *دەولەتی نێتۆرک* ناوبنرێ. ئەم ناوەی کە ئەم کۆمەلناسە مارکسی یە بۆ دەولەتی سەردەم یان دەولەتی ئاییندە، یاخود ئەو دەولەتەی بەرێوەیە، دۆزیویەتەوە جوانترین ناوە. بەلام پرۆسەی ڕوونکردنەوەکەی بۆ ئەم شێوەیە لە دەولەت و جەوهەری ئەم دەولەتە و ئەرکەکانی ڕەنگە بۆچوونی جۆراوجۆر لای ئەم و ئەو بوروژێنێ کە بەندە یەك لەو کەسانەیە. چونکە ئەو دەولەتە نائاسایی ترین دەولەتە گەر بە دەولەتەکانی تری جیهان یان بەو بەشە بەراوردکرێ کە لە دەرەوەی نێتۆرك دەژی. ئەم دەولەتە خاوەنی گشت توانایەکی دەولەتیی تازەیە و بناغەکەشی لە ئابووریێ زانیاریاوی ئەوتۆ پێکهاتووە کە بەئاسانی دەکارێ بۆ هەموو پێشبرکێیەك خۆی ئامادەبکا. ئەزموونی ئەم دەولەتە نێتۆرکە زۆر بەرین و کاریگەرە و تواناێ زۆریشی لە ئۆرگەنیزە و داڕشتنی بڕیاری سیاسی و ئابووری هەیە. ئالێرەوە دەشێ لەوەبگەین کە چۆن دەسەلات لە کۆمەلگەی زانیاری نوێ پێکدێ و لە کوێش ئەم دەسەلاتە خۆی مەلاس دەدا یاخود دەسەلاتی تازە لە مشتی چی و کێدایە و چۆن قورمیش دەکرێ. لەمەش گرنگتر دەسەلاتی نێتۆرك نێوەندێ بێ نێوەندە و هێزێ شاراوە و گومڕایە و بەێ ئەوی دەرك بەبوونی بکەی لەگشت شوێنێ ئامادەیە و لەبەردەماندایە. دەسەلاتی ئاوا زۆر لە دەسەلاتە دیکتاتۆرییە بەرچاوییەکان ترسناك تر و ئایندەی تریشە. ئەم جۆرە دەسەلاتە دوا مۆدێلی دەسەلاتە کە لەسەر بناغەی زانیاریێ ئالۆز و زانستێ گەشەدار پیادەی کارەکانی دەکا. بۆ نموونە ئەو دیاردانەی کە جارجارە لە شوێنێ لە جیهان وەك هەڕەشەیەك خۆی قووتدەکاتەوە (لەوانە : بەرەنگاربوونەوەی تیرۆریزم، چارەسەردانان بۆ کۆچی خەلکی ولاتانی جیهانی سێ ڕووەو ڕۆژئاوا، بەرەنگاربوونەوەی نارکۆتیکە) ئەم دەولەتی نێتۆرکەی کاستێلس باسیدەکا و

پێشیوایە کە دەولەتێ نموونەییە، هەولدەدا چارەسەری کتوپڕ و خێرای بۆ بدۆزرێتەوە و بەهۆی ئەو تەکنەلۆژیای گەیاندنەی کە لەبەردەستیدایە، کە ئەوەش بەرهەمی ئەو زانیاریگەییە کە دەولەتی نێتۆرك پێیگەیشتووە، وەك گەورەترین کێشە و کاتاسترۆف(بەلا) نیشانی جیهانی بدا. ئەم جۆرە بەرەنگاربوونەوەیە سیاسەتکردنێ نوێیە و مەبەستی تری لە پشتەوەیە کە دەولەتی نێتۆرك بەجۆرێ لە جۆرەکان خۆی هۆکاری دروستبوونیەتی. هەریەك لەو هەڕەشانەش کە باسکران ئەوە ڕووندەکەنەوە کە دروستبوونیان لەخۆڕا نییە و بەسەرهاتی خۆیان هەیە کە دەولەتی نێتۆرك بۆلەمەولا ئارەزووی ئەوەناکا گوێبیستی هەقایەتەکانی بێ و، ئەمەش بەتایبەت کە ئەو هەڕەشانە خودی ڕابردووی دەولەتی نێتۆرك و ئەفسانەی گەشەکەشی دەخاتە ژێرپرسیارەوە. بۆیە گرنگە لەوە بەئاگابین کە گەشەی تەکنیکی نوێ نەنیا لە قوژبنی کارگەکانا کاری خۆی ئەنجامنادا بەلکو هاتۆتە سەر سنوورەکان و بەتازەترین شێوە کار بۆ دۆزینەوەی:گومانلێکراو، پەناهەندە یاساغ، ئەنتی-گلوبالیست (یان تاقمیAttac کە هەمبشە لە جوولەن لەنێوان ولاتانی ڕۆژئاوا بۆ بەشداریکردن لە خۆپیشاندانەکانیان دژ بە جیهانگیری و بەزمەکانی ئەم دیاردەیە)، پێدۆفیل (منالباز)، قاچاخچیەکانی سۆزانی نێوان ولاتانی ئەورووپای ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات دەکا، و لەهەموو ئەمانەش گرنگتر ئەمڕۆ خۆی لەئاستێ ڕێکخراوەی گلوبالدا بۆ دۆزینەوەی دوژمنە هەرە تازە و گەورەکەی جیهانگیری ئابووری و زانیاری ئامادەکردووە کە ئەوەش تیرۆریستەکانە، یان بەقەولێ باوی ئەورووپایی و ئەمەریکایەکان فۆندەمینتالیستە ئیسلامییەکانە، ئەو دوژمنەی کە پاڕادیگمی تەکنیکی نوێ بۆخۆی دۆزییەوە و کردی بە ئەلتەرنەتیڤی(جێگیری) ئەو سەرمایەدارییە نێودەولەتیەی کە لە چەند شوێنێکدا ناومانا بە *سەرمایەداری سوور*.

لەسنووری ئەم گفتووگۆیەش بەپێویستی دەزانین بچینە سەر دیاردەی تیرۆریزم و پێوەندی ئەم دیاردەیەش بە کۆمەلگەی زانیاری نوێ و جیهانگیرییەوە. چونکە ئەو ڕووداوە تیرۆریزمیەی لە 11 ی سێپتێمبەر(یان 11/9) ڕوویدا زۆرترین پرسیاری لەبەردەم دەولەتی نێتۆرك و ئابووری گلوبال دروستکرد. گەورەترین خورپە بوو بۆ دامەزراوە گلوبالی و نێتاویەکان. تێڕامانێ بێ سنوور بوو کە چۆن لەگەل هەموو ئەو گەشەیەی پێیگەیشتووین دەبێ ئەمە ڕووبدا یان بۆ دەبێ تیرۆریزم بەم توانایە و بەم ئاستە لە ئۆرگەنیزە بگا. ڕەنگە بۆ گەلێ کەس ئەوی لە 11/9 لە ناوچەی مانهاتان لە نیویۆرك ڕوویدا

کەووکورپییەک بێ لە سیستەمی ئاسایش و توانای تەکنەلۆژی یان جۆرە هەڵەیەک بێ - سیاسەتی داکۆکی و ئۆرگەنیزەی ئەمەریکی. بەهەرحال ئەم ڕووداوە بوو بە هەنگاوێ کە نەك هەر ئەمەریکا بەڵکو گشت ولاتانی نێتۆرك و خاوەن مۆدێلی تەکنەلۆژیای زانیاری هەولی سەرلەنوێ خۆ بوونیادناوەی وتاری سیاسی و ئابووری و تەکنیکی ئاسایش و داکۆکییان بدەن و، ئەوی سەرمایەداری جیهانی لە ناوەندی هەفتاکان کردی بۆ سەرلەنوێ خۆبوونیادنان تا بەرهنگاری گشت هەڕەشەکانی بازاڕ و مەترسی کۆمۆنیزم ببێتەوە، ئەمڕۆ پاش بیست و پێنج سال بەجۆرێ تر و بۆ مەبەستێ تر ئەم خۆسەرلەنوێ بونیادنانە پیادەدەکرێ تا بەرهنگاری نەك هەر تیرۆریزم بەڵکو هەڵەکانی ڕابردووی خۆشی ببێتەوە. بەواتایەکیتر، دۆزی سیاسی(هەڕەشەی سەرمایەداری دووری سۆڤیەتی-ئەم دەربڕینە لە زۆر شوێن بەکارمان بردووە و گەر بشێ پەسەندکرێ-) و ئابووری(بەرزبوونەوەی نرخی نەوت) سالانی هەفتاکان گەیشتە ئاستێ ئەوتۆ کە دەبایە سەرمایەداری جیهانی سەرلەنوێ خۆ بوونیادبنێتەوە و ئەمەش تەنیا بەهۆی هاتنەکایەوەی تەکنەلۆژیای زانیاری یان با بلێین پاڕادیمی تەکنیکی نوێ کرا بێتەدی. وەلی گرنگە دانبەوەدا بنرێ کە، ڕووداوەکانی 9 11 دەرفەتی تری لەبەردەم ئابووری گلوبالی جیهانکردەوە کە دەزگای ئاسایش و بەرژەوەندی نێودەولەتی خۆی، هەر لە کاری بانقییەوە تا دەگاتە فۆرمەکانی پێوەندی ناو ئینتەرنێت و گەیاندنی نێودەولەتی و ڕەوتی بزوتنەوەی سیاسی و کولتووری و کۆمەلایەتییەکان، بەجۆرێ ئەلەکترۆنی و زانیاریاوی کۆنترۆلبکا. ڕووداوەکەش ئەوەندە جەرگبڕ کەوتەوە کە ڕەوایەتیێ زۆری بەکاری ئەم کۆنترۆلکردنە دا و ڕووێ یاسایی و ئینسانیشی بۆ دروستکرد. بۆیە ئەم حالەتەدا و سەبارەت بەم دیاردەیە کاتێ تەماشای ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا دەکەین دەبینین ڕووداوەکانی 11/9 شیاویی بالای لەبەردەم وتاری سیاسی دەمەریکی دا کردەوە ئەوەبکا کە دەمێبوو نیازییوو هەلیوەشێنێتەوە و بەبەلگەشەوە زێدەڕۆیی لە چەککەرایی سەربازی بکا و دەستیش لە سیستەمی مافی گلوبال بکشێنێتەوە و ئەمجار پێکەوەکارکردنی نێودەولەتی لاوەکی و بێ مانا و پراگماتیش بکا. بۆ ئەم مەبەستەش فۆڕمێ بۆ دژایەتیکردن هێنایەکایەوە ناونرا جەنگ دژی تیرۆریزم. ئەم جەنگە کە لە سەرەتادا وەك دیاردەیەکی ئیرۆنی(گالتەئامێز) خۆی دەرخست دواتر بوو بە جەنگێ ریالیستێ و بەهەموو جۆرێ هەولدرا تێگەیشتنێ نێودەولەتی بۆ ڕەوایەتی ئەم جەنگە بدۆزرێتەوە و مانای هێوٚمانی بدرێتەپال. واتە بەم جۆرە

جەنگ کرا بە ڕێگا چارەسەر بۆ دروستکردنی دادپەروەری و مەسەلەیەکی ئینسانیش. جەنگی ناوبراو کە نێتۆرکێ ناجۆر و یەکانگیر سەرپەرشتیکرد یاریەکی دامەزراوی گلۆبال بوو بەسەرەتایەکی دیار و کۆتاییەکی نادیارەوە کە کە لەوێڕا جیاوازی نێوان جەنگ و ئاشتی سڕاوەتەوە و دەنگدان بەهەج لایەك لەلایەکان بدرێ ئەوا ئەو لایەی دیش پەسەندکراوە. لێرەوە ئەمەریکایەکان زەمینەیان بۆ کێشەێ خۆشکرد کە بەرهەمهێنەری ناتەبایی و دووبەرەکییە لە جیهانا و بەهێزکەری جەمسەر گەرایشە. بەلام چ جەمسەرگەراییەك؟ ئەو جەمسەرگەراییەی لە سەردەمی زانیاریگەرییدا دێتەدونیا و چەندین نێوەندی نێتۆکراتی بەرامبەر بە چەند نێوەندێ دواکەوتوو، زانیارییگەریی بەرامبەر بە فۆندەمینتالیزم و دەولەمەنێ لۆکال بەرامبەر بە هەژارێ گلۆبال دەوەستێتەوە. هەروەها شارستانیەك کە هەر لە ناوەڕۆکدا لەسەر بناغەی نادادپەروەری و نایەکسانی بوونیادنراوە و بەزەبری مێدیایەکی دیگیتال یەکخراوە تەنێ جەمسەرگەریی بەرهەمدێنێ و گەشە بە دابڕان و ناچووستی دەدا. بۆ ئەم جەمسەرگەراییە جەنگ ڕاستیەکی ڤێژواله و پەیامێکه کە دەبێ هەر بگەێنرێ. بەلام ئەم پەیامە بەهۆی ئامرازەکانی زانیاریگەرییەوە دەگەێنرێ. زانیارییگەریش وەك بەری زۆربەی ئەو گەشە ناتەبا و ناکۆکانەی مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیوویەتی گەورەترین فاکتەیە بۆ هێنانەدونیای ئەم شێوە جەمسەرگەراییەی ئەوڕۆ. لە ناوەڕۆکدا ئەم جەنگە کارێ وایکرد کە چەندین فۆڕمی تر لە ناتەبایی و دووبەرەکی بڕژێتە ناو ئەم شارستانیەی ئێستاوە. زۆربەی ئاماژەکانیش باس لەوەدەکەن کە ئەم جەنگە، یان بەگشتی جەنگی سەردەمی زانیاریگەریی، یەکێکە لە پێداویستیەکانی نێتۆرکی سەرمایەداری گلۆبال و ڕێگایەکیشە بۆ بەئاکامگەیاندنی مەبەستە سیاسیە پراگماتییە نوێکانی و بەدەستهێنانی نێچر و لایەنگری نوێ لە دەرەوەی ولاتانی نێتۆرك و هەروەها بەخۆوە گرێدانی تێگەیشتن و چارەنووسی سیاسی ولاتانی نێتۆرکی ڕۆژئاوایی و پێکەوەکارکردن لەگەل ئەم ولاتە نێتۆرکە ڕۆژئاواییانە بۆ گۆڕینی ناوەڕۆکی دادپەروەری و پۆلکردنی واتای دیموکراسی و بێ بەهاکردنی پرنسیپەکانی دەولەتی ماف و خولقانی دوژمنێ هاوبەش و ترسێ هەمیشەیی و بەلۆکالیکردنی جێگیری سیاسی و ئابووری و، هەروەها سنووردارکردنی گەشەی دەولەتی ڕەفا. ئەمانە زنجیرەێ مەبەستی نوێین و کلێشەی ترن لە بەرەو پێشەوە بردنی سیاسەتی پێشبڕکێ و پاراستنی گەشەی نێتۆرك و دوورخستنەوەی ئەوانەی نەك هەر لە دەرەوەی نێتۆرکدان بەلکو ئەوانەش کە

ناحەزییان لە ناخدایە بەرامبەر بە گەشەی تازە و ئەو ئەفسانانەی کۆمەڵگەی نێتۆرك لەتەك خۆیدا هێناویەتی.
دەکرێ ئاماژە بەوەشکرێ کە، داننان بە بوونی تیرۆریزم مەسەلەیەکی بۆتۆپی (خەیالی) نییە. چونکە تیرۆریزم هەمیشە هەبووە و بوونیشی پێوەندی بە ڕەگەز و کولتوور و ئاین و نەتەوەیەکی دیاریکراوە نەبووە. بۆیە ناکرێ باس لە تیرۆریزم و ئاینێ دیاریکراو یان تیرۆریزم و شارستانیێ دیاریکراو بکرێ. بەلام ڕوودان و پیادەکردنی لەگەڵ گەشەی کۆمەلایەتی و ئابووری و گۆڕانکارییە کولتووری و سیاسییەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە. گۆڕانەکان دید و تەماشاکردنەکانی تیرۆریستەکانی گۆڕیووە و ئەم گۆڕانەش مرۆڤایەتی بەرەو نەهامەتی و سەرگەردانی بردووە. واتە تیرۆرەکان جۆراوجۆر بوونە و لە تیرۆری ئیندڤیدوالەوە(تاکەوە) بەرەو تیرۆری کۆلێکتیڤ (دەستەجەمعی) و لە تیرۆری دەولەتییەوە بۆ تیرۆری نێودەولەتی یان لە تیرۆری لۆکالیەوە بەرەو تیرۆری گلوبال و لە تیرۆری نابەجێ و هەڕەمەکیەوە بۆ تیرۆری ڕێکخراو و دیگیتال گەشەیکردووە. تیرۆر وردە وردە بەجۆرێ گەشەیکردووە کە بووە بە پێداویستی بۆ لەناوبردنی نەیار و ناحەز و دژ و جیاواز بەلام بەشێوەێ ئەمە ئەنجامدراوە کە گوایە ئەوە کێشەی نێوان دادپەروەری و نادادپەروەری یان باشە و خراپەی پێچارەسەردەکرێ. واتە هەموو کەسەکان و گرووپەکان یان ڕێکخرا و دامەزراوەکان هەروەها دەولەت و هێزە سەرووی دەولەتیەکانیش بەپێی توانا و لەبەرمەبەستی جیاجیا کاری تیرۆریستیانەیان ئەنجامداوە و ڕەوایەتیشیان بۆ ئەم سڕینەوە و لەناوبردنە هێناوەتەوە(ئەوی لە هەلەبجە ڕوویدا یان ڕوداوی ئەنفال تیرۆرێ بەرنامەدار و هوشیارانە نەبوو؟ ). بەشێ لەوانە بەهانەی ناوخۆی و تاکی و لۆکالی و دەولەتی بۆ هێنراوەتەوە و بەشێتری بەهانەی دەرەکی و دەستەجەمعی و گلوبال و نێودەولەتی بۆهێنراوەتەوە و، ئەو تیرۆرەش بەجۆرێ لەجۆرەکان ڕونکراوەتەوە کە هەندێکی بەیاسایی و بەئینسانیکراوە و هەندێکی تری بە واتای وەك باوەڕ یان شەریعە تێکەلکراوە و پاساودانی ئایدیۆلۆژی یان تیۆلۆژی بۆکراوە. بەمجۆرە تیرۆر هەمیشەش هەولیداوە خۆی وەك ئامرازێ بۆ گەیشتن بە ڕاستی و دروستکردنی دونیایەك بەبێ ئەویتر دەرخا. بەلام ئەم تیرۆرانە لە ئەنجامدا نەیانتوانیووە نە ئەو ڕاستیە بهێننەدونیا و نەش دونیایەکیان بەبێ ئەویتر دروستکردووە. بەتەماشاکردنێکیش ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کە زۆرجار تیرۆر ڕێگاچارەبووە لەبەردەم کەسێ یاخود گرووپێ سیاسی یان ئیتنی یاخود

ئاینی بۆئەوەی داواکانیان بەرزکەنەوە و لەسەر ئاستێ دیاریکراو جەغت لە ناسامەی هەبوونیان بکەن. ئاشکرایشە ئەم داوایانە هەمیشە ڕەتکراوەتەوە و ئەو کەسە یا ئەو گرووپە دەستبەجێ لەناوبراوە یان بۆ هەتایە سەرنگووم و لەبەرچاوونکراوە. ئەم مەسەلەیە ئەوە ڕووندەکاتەوە کە نە ئەوانە ڕاستبوونە کە بەمجۆرە داواکانیان بەرباسخستووە نەش ئەوانەی کە دۆزێ ئەوتۆیان بۆ ئەم کەس یا گرووپانە دروستکردووە کە هەولبەن بیر لەوەبکەنەوە کە بەمجۆرە بە ماف و داواکانیان بگەن یان جیاوازی خۆیان بەمشێوەیە لەتەك ئەوانی تر بسەلمێنن. ئەم دیاردەیەش لەگەل بەئەلەکترۆنی بوونی بەشێ لە کۆمەلگەی جیهان و کەوتنەدەرەوەی بەشە گەورەکە ڕۆژ بەڕۆژ زەقتردەبێ و ئاڕاستەی سەیریش وەردەگرێ. تاڕادەیەك ئەمانە هەر ئەو کەس و یان گرووپانەن کە کاستێلس پێیوایە لەگەل چوونە ناو چاخی زانیارییەوە چالاکیەکانیان زیاددەکا و نێتۆرکیش بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانیان و خۆڕێکخستنیان بەکاردەبەن. کاستێلس ئەوانە بە بزووتنەوە فۆندەمینتالیستییە ئاینییەکان ناودەبا. ئەم بزووتنەوانە بۆ کاستێلس تەنێ لە فۆندەمینتالیستی ئاینی ئیسلامی پێکنایێ بەلکو بزووتنەوە فۆندەمینتالیستییە مەسیحی، یەهوودی، هیندۆسی و تەنانەت بوودیەکانیش دەگرێتەوە. ئەم بزووتنەوانە کە بناغەێ ئاینیان هەیە لەگەل بزووتنەوە ئیتنی و ناوچەی و ناسیۆنالییەکان(بۆ نموونە زاپاتیستەکانی مەکسیکۆ یان ئەوانەی لە میترۆکانی ژاپۆن ژەهریان دەپرژان Shinrikyo Aum، بزووتنەوەی ژینگە یان ئافرەتان یاخود ئاشتی هەروەها دژە جیهانگیرییەکان ) لەگەل هاتنەدونیای چاخی زانیاری بەدووی ناسنامەی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووریی خۆیان دەگەڕێن و نێتیش دەکەن بە شوێنی ومارەسەی چالاکیەکانیان. گومانیشی ناوێ لەگەل زیادبوونی شەپۆلی پەناهەندەیەتی لە سالانی هەشتاکان بەولاوە و بەتایبەت لە سەرەتای نەوەتەکانەوە و دوای هەلوەشانەوەی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی و ئەورووپای ڕۆژهەلاتی لە ناو ولاتانی نێتۆرك دا، ج لەEU و ج لە USA ش، هەندێ بزووتنەوەی تر گەشەیان کردووە و ئەوانی پێشووش بەهێزتربوونە و کەلکێ زۆریش لە نێتۆرکی نوێ دەبینن بۆ خۆ ڕێکخستن و خۆ فۆرمولێرەکردنیان. ئەمەش هەر لە بزووتنەوە مافیاییەکانی ولاتانی ڕووسیا و ئۆکراینیا و ئەورووپای ڕۆژهەلات دەگرێتەوە(بۆ بازرگانی ئافرەت و نارکۆتیکە و ئەلماس و چەك و نەوت) تا دەگاتە بزووتنەوە ناسیۆنالی و ئاینی و

گلوبالییەکان(ئاینییەکان و بەتایبەت ئیسلامییەکان، فەلەستینییەکان، کوردەکان، چەپ، ئەنارکیست، سەوزخوازەکان و هۆمۆسێکسوێلەکان ).
ئەوەی ڕاسیبێ کاستێلس لە بەرگی دووەمی *چاخی زانیاری* دا، واتە لە *دەسەلاتی ناسنامە* دا، دێتەوە سەر ئەم لایەنانە بەلام نە ترسناکی هەندێ لەو بزووتنەوانە بەوردی باسدەکا(بۆ نموونە ئیسلامییەکان یان ئەوانەی لە میترۆکانی ژاپۆن گازی ژەهراویان بەخەلکادەکرد) و نەش دەسەلاتی سیاسی و ئابووری و کولتووری ئەمەریکی بەقوولی باسدەکا(19). تەنانەت لەو لێدوانە ئەلەکترۆنیەش کە بەڕێگایe– mail لەلایەن گۆڤاری Ord & Bild ی سویدیەوە لە مایسی 1999 دا لەگەلیدا کراوە (ئەم لێدوانە دوای هاتنەدەرەوەی هەر سێ بەرگی *چاخی زانیاری* ئەنجامدراوە) قسەکردنەکانی لەسەر ئەمەریکا زۆر گومڕایە. نە لە قسەکردنی نەیارانی ئەمەریکی دەچێ و نەش لە قسەی ئەو ڕوناکبیر و ئەکادیمیانەی کە دەلێی لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکی یان لە پێنتاگۆندا کارمەندن. لەم لێدوانە ئەلەکترۆنیەدا کاستێلس پێیوایە کە ئەمەریکا تاکە سۆپەردەسەلاتە لە ئەمڕۆدا بەلام ئەم ولاتە تائێستا ئەم دەسەلاتەی بەکارنەبردووە و کاتێ کە بەکاریشی دەبا وەك سەربازی لێگۆ( سەربازی لۆگۆ ئەو جۆرە سەربازەیە کە لەدەرەوەی خاکی خۆی چالاکی دەکا و لەسەر تێچوونی خۆی) ئەوانی تر کەلکی لێوەردەگرن. لێرەدا کاستێلس دەیەوێ جەغت لەوەبکا کە ئەمەیە دۆزی سەربازی ئەمەریکی کە هەمیشە لەسەر حسێبی خۆی لەپێناوی کەسانی تر کاردەکا. ئەمەریکاش بۆ ئەم تەنێ ئەم لایەنە و تەنێ بریتی نییە لە سۆپەردەسەلاتێ، بەلکو لەمەش زیاترە. ئەمەریکا کۆمەلگەی دینامیکییە و کولتووری مولتی ئیتنی (فرە ڕەگەز و ) دیموکراسی و شوێنی دۆزینەوەکانیشە. بەمشێوەیە ئەمەریکا دەکرێ وەك گرنگترین گرێ یان خال Node لە نێتۆرکی گلوبالی دید و پارە تەماشاکرێ. شیاوی لەبەردەم ئەمەریکاشدا دەبینێتەوە کە دەولەمەندتر و بەرهەمهێنەرتر بێ و بەجۆرێ ئەوتۆش سەرکەوتووبێ کە بتوانێ پتر لەگشت کۆمەلگەکانی تر سوود لە هێزی خولقێنەری ناو کۆمەلگەی زانیاری وەرگرێ. بەلام لەهەمانکاتیشدا دانبەوەدا دەنێ کە 50٪ ی دانیشتوانی ئەمەریکا کێشەی گەورەی کۆمەلایەتیان هەیە کە ئەوەش لەسەر کەمی هاریکاری و بێیاری ئیندڤیدوالیزم وەستاوە. ئەمە و جگەلە هەندێ قەیرانی کەسێتی و ڕەوشتی تر کە لەئاکامی هەلوەشانەوەی کەلەپووری خێزان و کەمبوونەوەی هەنێ میکانیزم کە دەتوانێ گەرەنتی (زەمانی) ئاسایشی شەخسی مرۆڤەکان لە کۆمەلگادا بکا. هەرچی شارە

گەورەکانیشە وەك نیویۆرك و لۆس ئانجلۆس ڕوژ لە دوای ڕۆژ بەتواناتر دەبن و پێشوازیش لە شەپۆلی تازەی بێگانە و مرۆڤە خولقێنەرەکان دەکەن و پڕیشن لە زەبروزەنگ و ئیندڤیدوالیزمی توندڕەو و کێشەی کۆمەلایەتی و ژینگەیی.

لەڕاستیدا نەك هەر لەم ائێدوانە بەلکو لەدووتۆی کارە ناودارەکەشی و بەتایبەت لەو شوێنانەش کە باس لە بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکانی ناو نێت دەکا شتێ ئەوتۆ لەبارەی توندڕەوی ئەمەریکا نالێ باس لەوەناکا کە ڕەفتاری سیاسی و ئابووری ئەمەریکی هەمیشە وای لە هەندێ گرووپی سیاسی و ئیتنی و مەزهەبی و تەنانەت چەندین ولاتیش کردووە کە بیر لە تۆلە بکەنەوە و هەبوونی خۆیان بە دڕترین و توندڕەو(ئێکستریم)ترین ڕێگا بسەلمێنن. ئەو گەشەیەی نێتۆرکیش لە کۆمەلگەی ئەمەریکی و کۆمەلگەکانی ڕۆژئاوا مسۆگەری کردووە ناحەزێ زۆری لەو بەشەی جیهان کە بێ بەرییە لەم گەشەیە دروستکردووە. کاتێکیش هەندێ لە بزووتنەوەکانی ئەم جیهانە ناتەبا و پاڕادۆکسالە و بەتایبەت بزووتنەوە ئیسلامیە توندڕەوەکان(یان ئەوی لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوا ناودەنرێ فۆندەمینتالیستی ئیسلامی) کەوتنە جموجۆل و گەورەترین تۆلەیان لە شوێنگەی زانیاریگەری گلوبال کردەوە و جیهانی ئەوڕۆیان دابەشی دوو بەشەی دژبەیەککرد. ئەو بەشەی بەرهەمهێنەری زانیاریگەرییە و بەرژەوەندێ بێ پایانی لەتەك زانستی نوێدایە و ئەم زانستەش بناغەی بۆ ئابوورییە نوێکەی داناوە و، خۆی بۆ جەنگێ ئامادەکردوە و ناوی ناوە جەنگ دژی تیرۆریزم. بەشەکەی تریش هەموو خۆیان لە دامێنی ئەو بەشەدا دیووە کە لە دەرەوەی زانیاری تازەدان و بانگەشەش بۆ ئەوەدەکەن ئەوی بەسەر ئەمەریکادا هاتووە پاداشتی ڕابردووی سیاسی و کەلەگایەتی خۆیەتی. لێرەدا سەیرەکە تەنیا لەوەدانییە کە چۆن ئەمەریکا و ولاتانی مۆلگەی نێتۆرکی ئەلەکترۆنی ڕۆژئاوا یەکیانگرتەوە یان چۆن ئەم یەککگرتنەوەیە لەنێوان ولاتانی دەرەوەی نێتۆرك یان بەجۆرێ لە جۆرەکان ئەو شوێنانەی بنکەی نێتۆرکی فۆندەمینتالیستی و توندڕەویین سەریگرت بەلکو لەوەداشە کە کاتێ جەنگ دژی تیرۆریزم سەریهەلدا هیچ دامەزراو(فۆندی نەختی نێودەولەتی، بانقی ئەورووپای نێودەولەتی، . . . ) و ڕێکخراوی نێودەولەتی (UN ، EU؛ NATO و هتد. . . ) یان هیچ یەکێ لە ولاتانی ڕۆژئاوا یان ئەوەی کاستێلس ناویدەبا دەولەتی نێتۆرك بەهیچ جۆرێ خۆیان لەوباسە نەدا کە لە زۆربەی ولاتانی لۆکال (یان لە جیهانی سێ، یان لەو جێگایانەی بە دالدەی

فۆندەمینتالیزم ناسراوە) باسدەکرا کە تیرۆریستە ئیسلامییەکان بەرهەمی دوانەیی وتاری سیاسی ئەمەریکین و، ئەمەریکایەکان سالانێ زۆر ئەم گرووپانەیان بۆ دژایەتیکردنی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی بەکاربرد. ئاشکرایشە ئەمەریکایەکان ئەمەیان لە گەلێ شوێن لە جیهانا کردووە و هەمیشەش دەستیان لە بەخێوکردن و بەکاربردنی تاقمی ناحەز و دژ و چەوت هەبووە و تەنانەت ڕۆلیشیان لە دروستکردن و پشتگیریکردن لە ڕژێمهای دیکتاتۆر و دیسپۆتیسنیش (باشترین نموونەش لەم بارەیەوە ولاتانی ئەمەریکای لاتینە کە لەناو ئێمەدا جێی باس نەبووە) دیووە.

ئەلبەتە هەلوێستی ئەو گرووپانەش و بەتایبەت ئیسلامییەکان بەرامبەر بە ئەمەریکا هەر ئەوە نەبوو کە چۆن ئەمەریکایەکان کەوتنە پشتکردن لەم گرووپانە نەخێر بەلکو ئەم گرووپانە بەو نەختە یارمەتیە ناوەستن و ئامانجەکانیان هەر وەك هێزە گلۆبالییەکانی تر ویستە بۆ دەسەلاتێ سەرتاسەری و مۆنۆپۆلکردنی چارەنووسی مرۆڤ و، بەتایبەتیش ئەم گرووپانە ئەمرۆ خاوەنی نێتۆرکی سیاسی خۆیانن و خۆشیان بە گەورەترین وتاری ڕۆحی و ئایدیۆلۆژی چاخی زانیاری دەزانن و هەروەها خۆیان بە تاکە قسەکەر و نوێنەری داماو و پەراوێزەکانی کۆمەلگەی مرۆڤایەتیش دەزانن و گشت ئاینزا و باوەڕەکانی تر هەموو بە بێ توانا دەزانن لەبەردەم نابوودی و نەهامەتیەکانی دونیا و لەبەردەم ئەو پەتایەی زانیاریگەری و زانستخوازی فرێیداوەتە ناوژیانی ئێستاوە. ئەمەش بێناسنامەیێ ترە و جۆرە غرورێ تری تیابەدیدەکرێ کە بەدلنیاییەوە نەهامەتی و چەوسانەوە و پەراوێزخوازیێ تر لەگەل خۆی بەدیاری دێنێ. لەهەمووی سەرنجڕاکێشتر ئەوەیە کە ئەم جۆرە گرووپانە بەهۆی ئامادەبوونی ئێستایان و بلاوبوونەوەیان لەناوچەی دەولەتی نێتۆرك و کەلك وەرگرتنیان لە خوێندن و ئەمجار مرونەتی یاسایی ولاتانی تەکنەلۆژیای زانیاری و ئەو ناحەزییەی لە ولاتانی دەرەوەی نێتۆرك ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەژێر ناو ونیشانی سەیر سەیر دروستدەبێ توانیان خۆ بۆ تۆلەیێ ڕێخکراوی گلۆبال ئامادەبکەن و دووبەرەکایەتیێ جیهانی نخەنەوە یان دوژمنایەتیێ کۆن نوێکەنەوە و فۆڕی تری بۆ داڕێژن. چونکە ئەم گرووپانە، واتە فۆندەمینتالیستە ئیسلامییەکان، لە وتار و هوتافەکانیان دەربڕینی وەك سەرمایەداری جیهانی، ئابووری گلۆبال، دەولەتی نێتۆرك و کۆمەلگەی پاش پیشەسازی یان دەولەتی پۆست کۆلۆنیال بەکارنابەن و ڕەخنەش لە دەولەتە دیسپۆتیستیێ(ستەمکار و زۆردار)ە کانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی ناگرن کە

دواکەوتووی و نەخوێندەواری و ناحەزی خەلکی ئەم ناوچانەش بەرامبەر بە ولاتانی نێتۆرك، یان بەقەولی باوی خۆیان بەرامبەر بە ولاتە سەلیبی- یەهوودیەکان، بۆ بەرهەمهێنان و ساغکردنەوەی بەروبوومەکانی بەکاردەبا. هەر ئەم شوێنانە نابن بە کارگەی بەرهەمهێنانی شمەکی تیرۆر بەلکو ناوچەرگەی ولاتانی خاوەن وتاری جیهانگیری زانیاری و ئابووریش دەکرێ بە مەوادی خاو بۆ باشترکردنی جۆر و ناوەرۆکی ئەم شمەکە. ئەم شێوە بەرهەمهێنانەش وەك شێوە بەرهەمهێنانەکانی هەندێ کارگەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی ئەوروپای وایە کە هەر بەشەی لە شوێنێ دروستدەکرێ. بۆ نموونە خوێندنی بالا و توانای ئابووری ئێستای نەوەکانی ئەو خەلکانەی لە جیهانی عەرەبی-ئیسلامیەوە هەلاتوون و ڕوویان کردۆتە ولاتانی نێتۆرك و باری کراوەیی و ئاستی زانستی بەربلاوی ئەم ولاتە گەشەکردوانەش، هەموو ئەمانە بەسەریەکەوە بەوردی لەلایەن ڕابەری ئەو گرووپانە و ئاراستەی ڕێکخراوەی ئەم گرووپانەوە کەلکی لێوەردەگیرێ و بۆ دروستکردنی ئەو شمەکەی ناوەمان نا تیرۆر بەکاردەبرێ. کەواتە تیرۆر لەدوایین باردا دەبێ بە دوا شمەکی هەرێمە لۆکالیەکان و لەسەر بناغەی ڕق، نائومێدی، تۆلە و هەست بە ژێرکەوتن بەرهەمدەهێنرێ و، تیرۆر دەبێ بەتاکە ڕێگایەك، بۆ دۆزینەوەی بەها و دانی مانای بە بەرهەمهێنەری ئەم شمەکە و، هەروەها بۆ دروستکردنی تێگەیشتنێ لەسەر کولتوور، کۆمەلگە و ئابووری یان شارستانێی دێرینی خۆی. ئەم هەستەش بەێ یەك و دوو پیشەسازیەك بەرهەمدێنێ بەناوی تیرۆریزمەوە و مەوادی خاوی ئەم پیشەسازییە زانیاریێ ئالۆز و زانینێ تەکنیکی ئەبستراکت نییە بەلکو فەنەتیزم و هەندێ ڕەفتاری کتووپڕی داخلەدلانە و پڕ لەتووڕەی ڕۆژانەیە کە باوەڕێ مەزهەبی و ئیمانێ فەنەتیك بەرهەمیدێنێ نەك تاقیگەێ تەکنیکی و ئینستیتووتێ توێژینەوە. بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە کە تاقیگەکانی تەکنیك و ئینستیتووتەکانی توێژینەوە توانای بەرهەمهێنانی تیرۆریزمی نییە. هۆلۆکۆست یەکێکە لە بەرهەمەکانی تاقیگە مۆدێرنەکانی ڕۆژئاوا و لەو دیاردانەی کە هەمیشە دەبێ وەك هەلەیەکی زانستی تازەی ڕۆژئاوا تەماشاکرێ (20).

هەر ئەو تیرۆریزمەی کە لەسەرەوە باسکرا لەگەل سەرهەلدانی بەم شێوەیە و لە چاخی زانیاریدا دەبێ بە دیاردەیەکی پەرچەکرداری دژ بەو تێمایانەی جیهانگیری، بەناوی مافی کەمایەتی و منال و ئافرەت و تەنانەت بانگەشەی هەلوەشانەوەی سیستەمی باوکسالاری و دادپەروەری کۆمەلایەتی، بانگەشەی

بۆدەکا. ئەمانەش تاراده‌یەك بەشێکن لەو شتانەی دەولەتی نێتۆرك کاری بۆدەکا و لەبەردەم کۆمەلگەکانی تر شانازی پێوەدەکا. واتە تیرۆریزم لە کۆششی ئەوەدایە ببێ بە وەلامێ بۆ دروستکردنی یەکسانێ ئیتنی و رەوشتێ کۆمەلایەتی بەرز و خولقانی وتارێ لەبارەی ئەوەی کە گوایە کاتی ئەوە هاتووە مانا بە ژیان بدرێ و کودەکانی ژیان کە بوونە بە شمەك و لەدەرەوەی دیدی ئەخلاقی بەکاردەبرێن بگۆردرێن. هەروەها پیشەسازی تیرۆریزم دەبێ بە شێوازێ لە بەرهەمهێنانی هەرەشە ئامێزی گلوبال و ئامرازێ بەدەست ئەوانەی کە ناتوانن بێنە ناو نێتۆرکی زانیارییەوە و لە دروستکردنی ئەوەی کە پێیدەلێن دەسەلات و دەولەمەندیێ گلوبال بەشداربن. ئێمە دەبێ ئەو شێوە بەکاربردنە کەمەی کۆمپیوتەر و ئینتەرنێت لە ولاتانی پر لە هەژاریی و دواکەوتوویی و نەخوێندەواریی لەو شێوە بەکاربردنە زۆرەی ولاتانی نێتۆرك جیاکەینەوە. لە ولاتانی نێتۆرك دا نەك هەر مەبەستێ ئابووری و زانیاری لەپشت ئەم بەکاربردنەوەیە بەلکو خودی ژیانی کۆمەلایەتی و ئابووری و زانیاری و کولتووری ئەم ولاتانە زۆر بەم دەزگایانە و بە گەشەی نێتۆرکەوە وابەستەیە. هەروەها بۆ ولاتانی نیتۆرك کە بنکەی جیهانگیری و تەکنەلۆژیای زانیارییە نێتۆرك رێگایەکە بۆ دروستکردنی بەرهەمهێنان و قوودرەت و پارە. بەلام بۆ ولاتانی پەراوێز و هەژار رێگایەکە بۆ وەرگرتنی زانیاری و کۆکردنەوەی زانین لەسەر خۆیان و لەسەر ئەوی تر. دواتر مەسەلەکە هەر لە شێوەی بەکاربردندا نییە بەلکو لە بەرهەمهێنانی ئەو زانین و زانیاریانەشە کە نێتۆرك کاری پێدەکا و هەروەها لەو تەکنیکی نیت و زانستە نوێیەیە کە لە دروستکردنی زانیاریگەریدا بەشداردەبێ. چونکە لە کۆتایدا هەر ئەم لایەنەیە کە لە مەسەلەی دروستکردنی ئابووری و فۆرمەکانی قوودرەتی نوێ دا زالدەبێ. لەبەرئەوەی ئەوەی کە پێیدەلێن زانیاریگەری لەکۆتایدا رێگای ترە بۆ دروستکردنی دەسەلاتی ئابووری و پارە بەزووترین و بە ئاسانترین کات. جا ئەوانەی ئەم توانایەیان لەبەردەستدا نییە نەك هەر لە هەژاریێ رەها و هەمیشەی دەژین بەلکو لەو جۆرە حالەتانەشدا دەبن کە هەمیشە ببن بە شوێنی لەدایکبوونی ئەو جۆرە پەرچەکردارییانەی کە لەمەوبەر باسمانکرد و کە ئەوانەش دواتر بەزەرەری دانیشتوانی ئەم ولات و ناوچانە دەگەرێتەوە.

لە پووختەی ئەوی لەسەرەوە سەبارەت بە پیشەسازی تیرۆریزم و جیهانگیری ئابووری و زانیاری ووتمان دەشتوانین ئەوەش بلێین کە بەرەنگاربوونەوەی ئەو فاکتانەی ژیان و بەهای مرۆڤ تێکدەدەن تازەنین و بگرە هەموو کاتێ

گرنگیان هەبووە. بەلام لەبەرئەوەی تێکدانەکان شێوەی تازەیان وەرگرتووە بۆیە بەرەنگاربوونەوەکان دەبێ هەمیشە ڕێگای نوێ بگرنەبەر(21)، جا موخابن نە بەرەنگاربوونەوەکانی تیرۆریزم بەسوودی مرۆڤایەتی گەڕاوەتەوە و نەش تازەگەریەکانی جیهانگیری زانیاری و ئابووری توانیوویەتی ئەوە بسەلمێنێ کە دەکارێ ئاراستەی گۆڕانکارییەکان ڕووەو و ئەو شوێنانەبەرێ کە کۆتای بە دیاردەی وەك: هەژاری، بێکاری، بێمالی، دیسپۆتیزم، منال فرۆشتن، سۆزانیەتی، تێکدانی سروشت، گالتەکردن بەباوەڕ و ڕەگەزی پەراوێز و کەمدرامەتەکان بهێنێ. هەروەها نە تیرۆریزم توانیوویەتی و نەش نێتۆرکی پارە و زانین ئەوە بسەلمێنێ کە ئەوی ڕوودەدا شەڕی دەسەلات نییە و کۆشش نییە بۆ مانەوەی هەمیشەی و، ئەمەو هەریەکەش بەشێوەی ناسنامەی جەمسەرگەریی خۆی دەسەلمێنێ کە بناغە بۆ دوژمنایەتیێ درێژخایەن دادەنێ و دۆڕانیش لەمحالەتەدا هەر ئەو کەسەیە کە پێیدەوترێ مرۆڤ(!). نێتۆرك زانیاری و تیرۆریزمیش فەنەتیزم بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی بەکاردەبا. هەروەها ئەم نێتۆرکە پێغەمبەرەکانی نێت و ئەندازیارە لووتبەرزەکانی تەکنیکی نوێ بەکاردەبا بۆ بەدەستهێنانی تازەگەرییەکانی و بەلام پیشەسازی تیرۆریزم و فۆندەمینتالیزم چەند نووقم بوویەکی ناو باوەڕ و پێوەندیدارێ بە فەنەتیکەوە دەکا بە قوربانی تا وێنە لەسەر نەزاکەت و تەهارەتی خۆی دروستکا.

بۆیە دەکرێ جەغت لەوەکرێ کە ئەوی لە مانەاتان ڕوویدا دەبێ بە سەرەتایەك بۆ زەرەو و پێکدادان و بەرەنگار بوونەوەی تر، جیاواز لەوەی کە هەردوو جەنگی جیهانی و جەنگی سارد دروستیانکرد. چونکە ئەمە لەنێوان دوو ئەزموون و دەستپێکی جودا ڕوودەدا. یەکێکیان باس لە دیگیتالکردنی سەرزەمینی ئەمڕۆمان دەکا و دەخوازێ لەسەر زەوی و لەسەر ئاسمانیش جێگیرمانکا و ئەویتریشیان دەمانگەڕێنێتەوە ناو ژیانێ ڕۆحانی و نزدیکبوونەوە لە جەوهەری نەمان. بۆ ئەوی یەکەم مانەوەمان لە دونیادا و بەردەوامبوونمان لەسەر بەرهەمهێنان و بەکاربردن ئاماژەیە لەسەر بەهای بوونمان و نیشانەشە لەسەر هەبوونی مرۆیمان و کەچی ئەویتر فەوتان و نەمان لەپێناو باوەڕ و سڕینەوەی گشت بەها نائاسمانیەکان بەگەورەترین دەستکەوت دەزانێ. ئەوی ئەم دوو لایەنەش لەم دوادوایەدا بەیەکیانیکرد بەشێکی ئەو دۆزەخەی لێپێکهات کە لە ولاتانی نێتۆرك بۆ خەلکانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی دامەزرا و بەشەکەی تری ئەو کەلێنە گەورەیە بوو کە کەوتە

نێوان دانیشتوانی ولاتانی نێتۆرك و خەڵكانی دەرەوەی ئەم ولاتانە و كە بەشێكیان ئەمڕۆ لە ولاتانی نێتۆرك دەژین تادەگاتە ئەو ترسەی كە بۆ دانیشتوانی ولاتانی نێتۆرك بەهۆی هەڕەشەكانی تیرۆریستەكانەوە دروستبوو كە ئەمەش قینیانی بەرامبەر بە گشت شتێ كە ناوی ئیسلام و عەرەب و ئاینی پێوەبێ زۆرتركرد، هەروەها ئەو بایكۆتانەی بەچەندین شێوازی دیگیتالانەی جیاجیا ولاتانی خاوەن ئابووری تازە دەیخەنە سەر ئەو ناوچە و شوێنانەی كە مۆلگەی تیرۆریزمن یان دالدەیاندەدەن. ئەمانە هەموو پێكەوە نەهامەتی و ڕاڕایەكی نوێ بۆ مرۆڤ دروستدەكەن و ئەو یاریانەی لێبێكدێ كە هەرگیز كۆتای نایێ. ئەمانە یاریهایەكن كە مرۆڤ لەژێرسایەی زانیاریگەری و فەنەتیزم بەیەكتری دەكەن.

## خود و گەیاندنی ئەلەكترۆنی

ئەو گۆڕانكاریانەی لەبواری زانست و تەكنەلۆژیا لەم بیست ساڵەی دوای ڕوویداوە كاری زۆریان كردۆتە سەر مەرجەكانی ژیانی كۆمەلایەتی و هەروەها پەیوەندیەكانی نێوان خود و كار، خود و ئابووری و خود و سیاسەتیشیان گۆڕیووە و بوونیادێ كۆمەلایەتی نوێشیان لەتەك خۆدا هێناوە كە گۆڕانیان خستۆتە ئەزموون، بەرهەمهێنان و دەسەلاتیشەوە. تێكڕای ئەو گۆڕانانەش لەوێوە دەستپێدەكا كە كۆمەڵگەی زانیاری نوێ پەیوەندیێ سەیری لەنێوان خود و نێت دا دروستكردووە. واتە ئەم كۆمەڵگایە خود بەشێوەیەكی ئەفسووناوی وابەستەی نێتۆرك دەكا و دواتر بەپێی بۆچوونی ئەم نێتەش ئەم خودە فۆڕمولێرەدكرێ. چونكە نێت ئەو دەسەلاتە نادیارەیە كە زانیاری نوێی سەردەم بەرهەمیهێناوە و بەرپرسیاریشە لە بردنەڕێوەی و دەستنیشانكردنی ئاقار و ئامانجەكانیشی. ئەوەی وانە ڕەقەكانی نێتیش پێماندەلێتەوە لەبارەی خود (یان مرۆڤ) ئەوەیە كە دەبێ باوەڕ بەوەبكەین كە خود وەك واتایەكی فیزیای وونبووە و ئەو خودەی ئەمڕۆ هەیە ئەوە خودێی یان مرۆڤێ ڤیژواڵە(22). هەروەها مرۆڤ Human لەژێرسایەی تەكنیكی نوێ بووە بە مرۆڤێ ڤیژوال(23).

لەناو نێت دا خود تەنێ ئیندڤید یان كرێكارێ نییە بەلكو ئەو پاڕادۆكسەشە كە نێت بەكاریدەبا. هەروەها نێت تەنێ سەرمایەكی ڕووت نییە بەلكو سەرمایەكی مولتی سەرمایەشە و ئەو هێزە گلوبالەشە كە خود دەكابە لۆكالی خۆی. سەرباری ئەوە، نێت و خود پێوەندیەكانیان بەجۆرێ داڕێژراوە كە لەلایەك

پێداویستیەکانی ئەو خودە بۆ نێت دیاریدەکا و لەلایەکی تر گەشەی ئەم نێت و بوونی بە مەسەلەیەکی سەرەکی لەژیانی گشتیدا. ئەمەش وادەکا ناتەبای بێتەئاراوە. خولقانی ناتەبایش بەهۆی نێتەوە شیاوێ تازەیە و بەرهەمی زانستی نوێیە. ئەو ڕێکخراو و سێستەمە گەورانەش (خێزان، کلیسە، سەندیکا، دەولەت و. . ) کە هەمیشە خود لەمەوبەر وابەستەی بووە بەتێت بەلەجیاتی دەبێ و خودەکانیش هەموو پێکەوە چینهایەکی کۆمەلایەتی نوێ پێکدێنن. ئەم چینانەش لەوانە پێکدێن کە هەندێکیان نێت بەرهەمدێنن و دواتر بەڕێوەی دەبەن کە ئەمە چینە کەم و بەشە بچووکەکەیە لەگەل ئەو چین و ئەو بەشە گەورەیەی کە لەگشت شوێنێکدا ئامادەیە و کاری تەنێ بەکاربردنی ئەم نێتەیە. بەلام گرنگی نێت لەوەدایە کە بکارێ لەم چینە کۆمەلایەتیە تازانەی باسکران هێزی بەرهەلستکار دژ بەو نایەکسانیانە دروستکا کە نێت ئەیخولقێنێ.

ئەو جیهانەی نێت ڕیشالەکەی دەچنێ لەگشت لایەکەوە لەلایەن دەستەبژێرێکەوە بەڕێوەدەچێ کە خاوەن سەرمایەێ گەورە، کە شیکەرەوەێ بەتوانای مالیی(نەختی، فینانسی) ن، کە پسپۆری کۆمپیوتەرن و خاوەنی خوێندن و شارەزایێ بالان لە بواری مۆبیل تەلەفۆن و گەیاندنی ئەلەکترۆنی. واتە بۆ بەشێ لە خودەکانی کۆمەلگەی نێت کارگەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری کارێ باش مەیسەردەکا و دەیەها نێوەندی توێژینەوە و پەرەدان بەکاری زانستی تەکنیك و زانیاری بەرهەمهێنان دروستدەکا کە دواتر ئەمان شەپۆلەکانی نێت ئاڕاستەدەکەن و گۆڕانکارییەکان بەرهەمدێنن کە لەدواین باردا لەژێرناوی زانستی نوێ و *نێتۆلۆژیا* دەسەلاتێ دێتەکایەوە مانایان بۆ بڕیارە سیاسی و ئابووریەکانیش هەیە.

ئەم نێتە ئامرازێ تەکنیکی دروستکردووە کە پتر لە خود خۆی ئیندڤیدوالتر دەردەخا پێیدەوترێ ئینتەرنێت. ئەم ئامرازە زۆر سەرنجڕاکێشە و لە کۆتایشدا دەبێ بە نزدیکترین کەسی ئەم خودە نێتاوییە. نێت دەتوانێ کارێ وابکا ئەو خودەی کە تەنیا و دابڕاوە لە بەهاکان و خزێنراوەتە ناو یاری و گالتە و خەندەکانی سندوقێکەوە کە پێیدەوترێ TV ببێ بە باشترین هاوڕێی ئەم ئامرازە. ئەم ئامرازە هاوڕێی تریشی هەیە، بۆنموونە: هەمیشە بێدارەوەبووەکانی کۆمەلگەی زانیاری، ئافرەتە تەنیاکان، ئەو منالانەی هەر زوو بێ دایك یا بێ باوك دەبن(ئێستا لەزۆربەی ولاتانی دەولەتی نێتۆرك دا لە 50٪ ی ئەو منالانەی لەدایك دەبن لەدەرەوەی پێوەندی خێزانی یان ئەوەی

پێیدەڵێن ژن و مێرد لەدایکدەبن) و دواتر دەبن بەوەی کە زۆربەی کاتەکانیان لەبەردەم ئەم ئامرازە دانیشن. بەکورتی ئینتەرنێت ئەو ئامرازەیە کە دەبێ بە کولتووری سەردەم. ئەم جۆرە کولتوورەش کولتوورێکە سەرووی ئەو کولتوورانەیە کە لەمەوبەر تیای ژیاوین. ئامرازی ناوبراو زۆر بەکاربر و کۆمەلایەتییە. لەلایەك ئامرازێکە بەدەست دەولەتەوە و لەلایەکیتریش ئامرازێکە بەدەست ئیندڤیدەوە. دەولەت پرسیارە سیاسی و مەبەستەکانی پێئیدامەدەدا و، ئیندڤیدیش کارەکانی خۆی پێمەیسەر دەکا. بۆ ئەوەی شتێکیش لەبارەیەوە بگەڕێینەوە سەر ڕوانینەکانی کاستێلس ئەوا بەپێویستی دەزانین سەرەتا بێینە سەر ئەو بەرهەمەی کە لەپاش ***چاخی زانیاری*** بەناوی ***گەلاکسی ئینتەرنێت*** (گەلاکس بەمانای مەجەرە یان سێستەمی ئەستێرە دێ) نووسیوویەتی(24).

ئەم ئامرازە بۆ کاستێلس لەم دوادوایەدا بووە بە بابەتێ گرینگ و بۆ زێتر قوولکردنەوە و ڕوونکردنەوەی تەماشاکردنەکانیشی هاتووە لەبارەی فۆڕمی کۆمەلایەتی کۆمەڵگەی نێت و سیاسەتی نێت و بەرچاوخستنی نەشونما و دروستبوونی ئینتەرنێت کتێبێکی تایبەتی لەبارەی ئینتەرنێت نووسیوە و تێیدا باسێ زۆری هێناوەتە پێشێ لەسەر کولتووری ئینتەرنێت. لەوێ کاستێلس پێ لەسەر ئەوەدادەگرێ کە ئینتەرنێت پەیامە (ئەمەش بەخۆی تێزێکی مارشال ماکلۆهان Marshall McLuhan ە کە دەلێ :مێدیا پەیامە) بەلام بۆئەوەی بوونە کولتووری ئینتەرنێت ڕوونکاتەوە دێ جیاوازی لەنێوان چوار کولتووری ئینتەرنێتدا دەکا :کولتووری تەکنیکی-شایستەسالاری، کولتووری بەدووکەوتن و چوونەناوسێستەمی کۆمپیوتەری کەسێ ترەوە، کولتووری ئەنجوومەنی ڕاستی و کولتووری پەیمانکار (25) ئەوەی ئێمە مەبەستمانە لەکاتی قسەکردنەکانمان بەرباسیبخەین ڕوونکردنەوەی کولتوورەکان نییە. بەلکە ڕۆشنایی خستنە سەر ئەو مەسەلەیەیە کە ئینتەرنێت بەجۆرێ ئەوتۆ نەشونمای کردووە کە ببێ بە کولتوور و ئەمجار مێژووی گەشەکردنەکەشی دەمانخاتە ناو تێڕامانی ئەوتۆوە کە بلێین ئینتەرنێت بە چەندین قۆناغی جودا تێپەڕیووە تا ئەم ئامرازەی کولتوورییەی لێدەرچووە کە زۆرجار سەرووی کولتووریشە و تاکە کولتوورێکیشە کە ڕاستی دەدا. واتە لەمیانەی ئینتەرنێتەوە دەگەی بە ڕاستی و ئەم ڕاستیەش تەنێ لە نێتی ئینتەرنێتدا نییە بەلکو لەو ژیانەشدایە کە بەنێتی ئینتەرنێتەوە گرێدراوە. خودیش یەکەم کەسە کە ئەم ڕاستییە وەردەگرێ و کاریلەسەردەکا. خود و نێتی ئینتەرنێت بۆ لەمەولا پێوەندیان هەمیشەیی و بەردەوامدەبێ. ئەو مانایەش ئینتەرنێت لای خود دروستی دەکا هەر ئەو ژیانە

ڕووکەشە نییە کە خود تیای دژی لە دەرەوەی ئینتەرنێت بەڵکو بەپلەی یەك ئەو ژیانە ڕاستەقینەیەشە کە ئینتەرنێت چرکە بە چرکە بۆ ئەم خودەی ئامادەدەکا. ئەم ژیانەش بەبێ گومان بۆ ئەم خودە ڕاستیئامێزە و زۆر جێی باوەڕە. دەکرێ لێرەوە و لەگەڵ هاتنەکایەوەی ئەم ئامێرە لەو میتافیزیکیایە بگەین کە تەکنەلۆژیا لەگەڵ هاتنی لەناخۆیدا بوونیادی ناوە.
هەروەك لەگەڵێ شوێن لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد کە کۆمەڵگەی زانیاری بەوە دەناسرێتەوە کە هەڵگری بوونیادی کۆمەلایەتی، ئابووری و کولتووری نوێیە. چالاکیەکانی ئەم کۆمەڵگەیە لەڕێگای نێتەوە، و بەتایبەت ئینتەرنێت ئەنجامدەدرێ، و ئاڕاستەی خود دەکرێ یان هەر خود بکەرێ چاکی ناو ئەم نێتەیە. ئەم چالاکیانە هەر لە چالاکیە ناسیۆنالی و ئیندڤیدوالیەکانەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە چالاکییە مولتی ناسیۆنالی و کۆلێکتیڤەکان. هەر لە ناردنی نامەی ئەلەکتررۆنییەوە تادەگاتە لەشفرۆشی و بانگەوازی سیاسی و کرینی هەچ شمەکێ کە بخوازرێ. ئەم نێتە وەك پرنسیپێ سەرەکی بۆ ڕێکخستنی کۆمەلایەتی ئەوڕۆمان خۆی دەردەخا. ئەم ڕێکخستنەش تەنێ مانای ئابووری نیە بەڵکو سیاسی و کولتووریشی هەیە. ئەم نێتە تەنێ ئامرازێ نییە بەڵکو ئامرازێ بناغەیشە بۆ ڕەفتارکردن لەتەك سیاسەتدا. ڕەنگە هەر ئەمەش لەمدوادوایەدا وای لەگەڵێ نووسەری ڕۆژئاوایی کردبێ کە باوەڕ بەوە بکەن کە دەکرێ ئەم ئینتەرنێتە ڕۆل لە دروستکردنی دێیاتێ(گفتوگۆ) دیگیتالی ئەلەکترۆنی ببینێ و ئەمەش بەرەو ئەوەمان ببا کە ئینتەرنێت مانا بە دیموکراسیەت بدا. وەکیتریش هاتنی ئەم نێتە و چالاکییەکانی بەدڵنیاییەوە ڕۆلی خۆی لە نەهێشتنی دامەزراوە گەورەکانیش دیووە. ئەم نێتە یان چاترە بلێین ئینتەرنێت کە خودی سەردەمی نێتۆرك زۆر هۆگریەتی بووە بە یەکێ لە بناغە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی تەکنەلۆژیای زانیاریی کە توانیوویەتی گەیاندنێ پەلە و دڵنیا بە مرۆڤی سەردەم بدا و بەنرخێ هەرزان پێوەندیەکان لەگەڵ گشت بەشەکانی جیهان ڕێکخا. هەروەها دەکرێ جەغت لەوەشکرێ کە لەبەرئەوەی خودی سەردەم لە شار و ئەمجار لە شارە گەورەکان (نیویۆرك، لەندەن، پاریس، لۆس ئانجلۆس) دەژی ئەم ئینتەرنێتە بۆبردنە ڕێوەی پێوەندیەکانی ئەم خودە بەجۆرێ خێرا و بەتێچوونێ کەم توانیوویەتی زۆرترین مانا بۆخۆی دروستکا.
لێرەدا ئەوە مەبەستە بووترێ کە ئینتەرنێت هەموو شێوازە پەلەکانی بۆ بلاوکردنەوە و گەیاندنی مەرجەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی زانیاری

گرتۆتەبەر و، هەروەها بەمە توانیوویەتی مانای کات و جێگاش لەیەك کاتدا بگۆڕێ و واله مرۆڤی سەردەم بکا کە لەهەچ کات و لەهەچ شوێنێ ئارەزوویلێبێ خۆی بە ئینتەرنێتەوە گرێبدا. ئەمەش بەتایبەت هەریەك لەو شارەگەورانەی خەلکی ئەمڕۆ تیای دەژی شارۆچکەی تریان لەناو و لەدەوروبەری خۆیان دروستکردووە و ئەمەش وایکردووە گەیاندن لەنێوانیاندا ئالۆزبێ و تەکنیك بکارێ مانایێ گەورە بە واتای خێرای لە ژیانی مرۆڤەکان بدا و، گەیاندنیش لەخودی خۆیدا وایلێهاتووە زۆرتر بەواتای خێراییەوە پێوەنیداربێ وەك لە شتێ تر. هەروەها هاتنی ئینتەرنێت خۆی وەك بەلگەیەك نیشاندەدا لەسەر نەمانی فۆڕمەکۆنەکان و ئامادەبوونی ئەو شێوە ژیانەی کە ئەڤینداریەکی لەتەك نێت دا هەیە. بەمجۆرە لە کۆمەلگادا نیشانەیە لەسەر مانەوەی بۆ هەتایە. هەر باسی ئینتەرنێت باسی ئەو دەزگایەش دێنێتەپێشێوە کە پێیدەوترێ ئامێری کۆمپیوتەر. هاتنەکایەوەی ئەم ئامێرە گۆڕانێ زۆری لەبواری کار و لە ژیانی ناو مال دروستکرد، بەلام ئەو شوێن و ناوچانەی ئەم ئامێرە بەکاردەبەن لەچاو دانیشتوانی کۆی سەرزەوی زۆر دیاریکراون. هەروەها ئەم ئامێرە بەکاربردنی لە کەسێکەوە بۆ کەسێ تر و لە دامەزراوێ کولتووری و ئابووری یان سەربازی و کارگەیەکیەکەوە بۆ دامەزراوێ کولتووری و ئابووری یان سەربازی و کارگەیەکی تر جوداوازە. نەك هەر ئەمە بەلکو بەکاربردنی ئەم ئامێرە بەڕادەیەکی زۆر لەبواری کار بۆتە هۆی بلاوبوونەوەی چەندین نەخۆشی دەروونی و فزیۆلۆژی جۆراوجۆر و هەروەها بەهەلەبەکاربردنیشی چەندین کێشەی کۆمەلایەتی و ڕەوشتنیشی خستۆتەوە. ئەمە و بەکاربردنی کۆمپیوتەر لەبواری کاردا بەڕێژەیەکی زۆر و لەئاستێ بەرزدا بووەتە هۆی دروستبوونی چین و توێژی ناتەبا و هاتنەکایەوەی دەستەبژێرێ بەنێوی *نێتۆکرات* و وابەستەبوونی گەشەی کارگەکانیش بەم دەستەبژێرانەوە. لەهەمانکاتدا دروستبوون و پەرەسەندنەنی ئەم ئامێرە دۆزێ بازرگانی تایبەتیشی لەگەل خۆدا هێناوە و بووەتە هۆی هێنانەکایەوەی بازاڕێ تایبەتیش بە پرۆگرامەکانی ئەم ئامێرە و پسپۆربوونی یەك دوو کارگە لە بەرهەمهێنانیاندا. بەواتایەکیتر، گەشەی پرۆگرامی کۆمپیوتەر گەیوەتە ئاستێ کە زۆربەی کارگە و ولاتەکانی نێتۆرك ببەسترێتەوە بەو شوێنانەوەی کە بەرنامە بۆ گەشەی زانیاری دادەنێن و دەستیشیان لە دروستکردنی بازاڕێ تایبەت بە زانیاری تازەوە هەیە. هەر ئەم جۆرە پسپۆڕییەی یەك دوو کارگە یان ولات لە جیهانا بەخۆی نیشانەیە لەسەر ئەو ناتەباییەی لە ئابووری و

زانیاری گلۆبال دا هەیە. چونکە دەستگرتن بەسەر نێتۆرك و بازاڕی ئامراز و ئامێرەکانی ئەم نێتۆرکە لەتوانایدایە ببێ بە گەورەترین دەرامەت و خێراترین ڕێگا بۆ دەولەمەندی. ئەمەش دەرگا لە پێوەندیەکی نوێ لە جیهانا دەکاتەوەکە تازەترین وابەستەیەتی و پاشکۆیەتی تیابەرهەمدێ. فۆڕمی ئەم پێوەندیەش سەرچاوە لە گەشەی کۆمەلگەی زانیاری و زانینی زانستی نوێوە هەلدەگرێ و لەناو خودی گشت نێوەندێ پەراوێز و دەوروبەرێ دابیندەکا. ئەم نێوەندە یان نێوەندانە بەئاسانی ناگوێزرێتەوە و زیادیش ناکەن بەپێچەوانەی پەراوێز و دەوروبەرەکانەوە کە وەك هەندێ نەخۆشی سامناك وان هەمیشە لە زیادبوون و بلاوبوونەوە و گوازتنەوەدان. بۆیە دەبێ هەمیشە بەگومانبین لەو گۆڕانە کۆمەلایەتیانەی کە بەهۆی بەکاربردنی نێتەوە دروستدەبێ و یان گرنگە لەوەبگەین کە ئەم گۆڕانانە بەرەو کوێ دەمانبەن و چ پێویستیەك لەپشت بوونیانەوەیە.
هەرباسی گەیاندن بەرێگای نێت بابەتێ تر دێنێتە کایەوە کە ئەوەش بابەتی مێدیا و دەسەلاتی کۆمپانیای مێدیای مولتی ناسیۆنالیەکانە. واتە، بلاوبوونەوەی گلوبالی مێدیا وایکردووە کە خودی سەردەم لە گشت جیهانا و لەیەك کاتدا بتوانێ تەماشای هەمان پرۆگرامی تەلەفزیۆنی یان یارییەکی تۆپی پێ لە کەنالێ دیاریکراوەوە بکا یاخود بەرێگای چات Chat بتوانێ قسە لەگەل هەر کەسێ کە بیەوێ لە جیهانا بکا. ئەمە گەشەکردنێ بێ وێنەیە لە کردەی گەیاندن و لەژیانی مێدیادا. پاشان ئەم مێدیایە هەروەك ئینتەرنێت وایە هەمان شت هەرسدەکا کە کۆمەلگەی مولتی مێدیا دروستیدەکا و ئەم مولتی مێدیایەش ڕۆژلەدوارۆژ دەبێ بە گرنگترین ژینگەی سمبۆلی خودەکانی ئەم کۆمەلگایە. لە ئاکامی چڕبوونەوەی پێوەندی نێوان نێت و خود لەم کۆمەلگەی مولتی مێدیایەدا جۆرە پێوەندیەکی سەیر کەوتۆتە نێوان ژیانی مرۆڤەکان و مانای مێدیا چ لە بواری کار و چش لە ناو خێزان. پێشمانوانییە کە ئەم ئاستەی گەیاندن پێیگەیووە هەر ئاوا بێ ئامانج و بێ مەبەست بێ. ئەم گەیاندنەی دەولەتی نێتۆرك پێیگەیشتووە بەرهەمی ڕاستەخۆی ئەو زانینە ئەلەکترۆنی و ئابوورییە گلوبالیە کە لە دوای سالانی هەفتاکان هاتە دونیا و لە 1990 کانا بە ئامانج و هیوای خۆی گەیشت. ئەو سالانە گرنگی خۆیان دی بۆ دروستکردنێ دەسەلاتێ بەناوی مێدیا و لەناو مێدیا نوێدا. هەروەها تێڕامان لەوەی کە دەسەلاتی ڕاستەقینە لەم حالەتەدا بەدەست کێوەیە و یان کێ دەسەلاتی بەسەر مێدیا و زانیارییەکانی ناو مێدیاوە هەیە یەکێکە لە تێڕامانە

گرنگەکان. چونکە ئەبێ دەستەبژێرێك هەر هەبێ کە بەرپرسیاربێ بەرامبەر بەو زانیاریانەی لەکەناڵە جۆراوجۆرەکانی مێدیادا پەخشدەکرێن و یان بەئاگابێ لە چۆنیەتی فۆرمولێرەکردن و ڕێکخستنیان. ئەمەش هەر دەبێ وابێ بەتایبەت خودی پرۆسەی جیهانیبوونی دیاردەکانیش هەر بەڕێگای ئەم مێدیایەوە ئۆرگەنیزەدەکرێ. بەپێی ئەوەی مێدیا گۆڕانێ ئەوتۆی بەسەر هاتووە کە بووە بە خاڵی یەکگرتوونەوەی نێوان کۆمەڵگە و پرۆسەی جیهانیبوون. ئەم پرۆسەیەش کاتێ دەردەکەوێ کە شەپۆلی سەرمایە فەرالستانی مێدیا بەڕێوەدەبا و کاریش دەکاتەسەر بڕیاری سیاسی و دەشبێ بەباشترین ئامرازی بردنەوەی دەسەلاتی ئابووری. واتە مێدیا شوێنێ سیاسی گەورەی لە کۆمەڵگادا هەیە. ئەم شوێنەش بەهۆی ئەو زانیارییە زۆرانەوە دەناسرێتەوە کە بەرهەمهاتوون و ئەمجار سیاسەتی ئەوەش کە ئەم بەرهەمانە لەکۆتایدا دەبێ هەربگەێنرێ. مەبەستمان لێرەدا ئەوەیە کە مێدیا لەسەر ئەو پرنسیپە دروستبووە کە ئەو زانیارییە زۆرەی لەبەردەستدایە بەبێگوێدانە کۆمەڵگا دەیگەێنێ و لەتواناشیدایە بەهۆی ئەم زانیاریانەوە وێنە دروستکا. وێنە لەسەر ڕووداوەکان و دیاردەکان. ئەو وێنانەش کە بەهۆی ئەم مێدیا ئەلەکترۆنییە ئاڵۆزەوە پەخشدەکرێن خۆیان زۆر هەمیشەیی و سەرتاسەری دەردەخەن. هەروەها وێنەکان زۆر دەسەلات ئامێزن و تاك جەمسەر و لایەندارن.

## ئەفسانەی ئابووری نوێ یان سەرمایەداری زانیاری!

ئابووری نوێ ئەو واتایەیە کە بەهۆی کارە سێ کوچکەییەکەی کاستێلس لە بارەی *چاخی زانیاری* لە نێوەندی ئەکادیمی و مێدیای گلوبالدا دەوروژێ. بەپێی تێگەیشتنی ئەم کۆمەڵناسە ئیمپیرییە ئەم ئابوورییە نوێیە واتە گەشەی زۆر و بێ کاریێ کەم و هەلاوسانێ لاواز کە بەوەدەچێ ئەمە جۆرە شادبینیەکی تەکنیکی بێ. ئەگەر نا ئەیچۆن! لەهەمانکاتیشدا باس لەوەش دەکا ئابووری نوێ واتە ئابووری گلوبال و کات(زەمەن) ێ تازە، بەلام مرۆڤ لەمیانەی کارکردنە گلوبالییەکانی ئەم ئابوورییە نوێیەدا بەباشی لەوەدەگا کە ئابووری نوێ ناوێ ترە بۆ سەرمایەداری نوێ و تەکنەلۆژیای زانیاری و جیهانگیری سەرمایە و بازاڕ. هەروەها ئەم ئابوورییە نوێیە واتە ئابووری نێتۆرك. ئەمەش(واتە ئابووری نێتۆرك) ئەو ئابوورییەیە کە گەشەێ نابەردەوام و ناجێگیر ئەخولقێنێ و جێگیری سیاسی و ئابووری تێکدەدا. کەچی ئەم ئابووریە نوێیە بەباوەڕی کاستێلس ئەو ئابوورییەیە کە ئەو گەشەیەێ

خولقاندووه که هەمیشە باسدەکرێ و، هەروەها ئەم ئابوورییە مەرجی کۆتای هێنان بەبازنەی بارودۆخی ئابووریشی تێدایە. ئەو ڕێسێسیۆن (ڕکود) انەی کە پەیتا پەیتا لە بازاڕی مالیش ڕوودەدەن بۆ ئەم کۆمەڵناسە پێوەندیان بە تەکنەلۆژیای زانیارییەوە نییە. بەپێی ئەمەش ئابووری ناوبراو بریتییە لە سەرمایە و بازاڕێ گلوبالی ئەلەکترۆنی کە بەبەردەوام لە بزاوتن و جوولەدایە. ئەم سەرمایە و بازاڕە شوێنی کارکردنی دیاریکراو نییە و باوەڕیشی بە جوگرافیا و هیچ سنوورێ نییە. هەروەها لەهەموو شوێنێ کە کاردەکا دەسەلاتی خۆی هەیە و خۆشی لەوێڕا خاوەن بڕیارەکانیەتی. ئەنتۆنی گێدینسAnthony Giddens یش ووتەنی بۆیەکەمجارە لە مێژوو سەرمایە لە بازاڕێ مالی یەکخراوی گلوبال دا و لە کاتێ فیعلیReal دا شەوڕۆژ کاردەکا(26) کە ئەمە هەمان بۆچوونی کاستێلسیشە. بەگشتیش زۆربەی ئەوانەی توێژینەوەیان بۆ بازاڕی مالی نوێ کردووە گەیشتوون بەو باوەڕەی کە ئەم بازاڕە توانایێ زۆری هەیە و چالاکیەکانیشی زۆر گلوبالە.
مەبەستمان ئەوەیە کە لە ئابووری نوێدا دەسەلات بەدەست کارگە گەورەکانەوەیە کە لەناواخندا کارگەهایەکی مولتی ناسیۆنالی(فرە نەتەوەی) ین و دەسەلاتیشیان سەرووی دەسەلاتی دەولەتە. ئەم کارگانە کە ئەرکی دروستکرندی ئابوورییێ جێگیر و بەرزکردنەوەی ئاستی ژیانی خەلك دەگرنە ئەستۆ خۆیان بە نێتۆرك پڕدەکەن و بەمەش دەبن بە پشت بۆ ئابووری نوێی گلوبال و زانیاریی. وەکیتریش ئەوی پێیدەوترێ جیهانگیری ئەو نێتۆرکەیە کە پرۆسەی کارکردنەکەی هەموو بوارەکانی گرتۆتەوە و، توانیوویەتی گەشەی خێرا و پەلە بە کارگەکان ببەخشێ و خۆی لەو ئابوورییە هێرارکییە ڕێکخراوە جیاکاتەوە کە پیشەسازیگەریی پشتیپێدەبەست. ئەم ئابوورییە نوێیەی ئەم کۆمەڵناسە کاتالانییە (ئیسپانییە) باسی دەکا بەدەوری ڕەمزێ دەخولێتەوە کە ئەوەش نێتۆرکە. ئەم نێتۆرکەش ئەو شتەیە کە کاستێلس هەر لەسەرەتای کارکردنەکەی لەسەر چاخی ئەمڕۆمان، کە بە چاخی زانیاری ناوی بردووە، خۆی گرفتاریدەکا.
ئەم جۆرە تیۆرەش لەسەر ئابووری ئەمڕۆ بەرەو ئەوەمان دەبا بلێین کە زۆر بەئاسانی دەرك بەوەبکەین کە بەهۆی تەوژمی ئابووری نوێوە کەوتووینەتە ناو گۆڕانە فرە جەمسەرەکانەوە کە ئەوانەش دەرگایان لە جەمسەرگەریێ Polarization نوێ لە دونیادا کردۆتەوە کە بەرهەمی سەرمایەداری گلوبال/ زانیارییە. ئەم جۆرە گۆڕانکارییە هەڕەشەیێ زۆر لە چارەنووسی سیاسی

گلوبال و باری مرۆڤایەتی سەردەم دەکا. بۆیە ئێمەی مرۆڤی سەردەم کاتێ کە گوێمان لە گوزارەی کۆمەڵگەی زانیاری نوێ دەبێ یەکسەری لەوەدەگەین کە دیاردەی ئابووری نوێ بەری ئەم کۆمەڵگایەیە و ئەم ئابوورییەش کە بوونیادێ گلوبال و زانیاری(گەر بشێ دەڵێین زانیاریاوی لەسەر ئەو بناغەیەی کە بەزانیاری بووە و هەروەها بەزانیاریکراوە) هەیە توانای باشیشی لە گەشەدان بەخۆی هەیە و، بەدڵنیاییشەوە بلاوکردنەوەی زانینی نوێ هەر یەکێکە لە خاسلەتەکانی ئەم ئابوورییە نوێیە و هەر ئەمەش جوودایدەکاتەوە لەو ئابوورییەی کە لەمەوبەر تیایژیاوین. بەلام هەموو ئەمانە ناتوانن ئەوە روونکەنەوە کە ئەم ئابوورییە ئەگەر ئابووریێ ڕەوشتی یان هێۆمانی تر بێ لەو ئابوورییانەی مێژووی مرۆڤایەتی بەخۆیەوە دیوویەتی. چونکە یەك لە خاسلەتە سەرەکییەکانی ئەم ئابوورییە نوێیە ئەوەیە کە مرۆڤەکان گەیشتوونەتە ئەو قۆناغەی بکارن بەپەلەترین کات و بەکورترین ماوە و لەهەج جێگایەکەوە کە بخوازن و ئارەزوو بکەن دەسپێبکەن و بۆ ئەو مەبەستەش کۆمۆنیسێرە (لە کۆمۆنیکەیشنەوە وەرگیراوە -واتە گەیاندن-) لەتەك یەکدا بکەن و، لەگشت ئەمانەش سەرنج ڕاکێشتر لێرەدا ئەوەیە کە ئەم ئابوورییە گلوباڵە/زانیارییاوییە وایکردووە کە بازرگانی پارە، کاغەزی بەهادار و هێزی کار بەرێگای تازە کاری خۆیان ئەنجامبدەن. بەبێ ڕاڕایشەوە دەشێ باس لەوەکرێ کە ئەو تەوژمە نوێیانەش کە لەژێرسایەی ئەم جۆرە ئابوورییەدا دروستدەبێ گەلێ خالی یەککگرتنەوە و چەقی نوێ ئەخولقێنن کە لەوێرا دەسەلات و دەولەمەندی شوێن بۆ خۆیان دەدۆزننەوە. بەکورتی، لەگەڵ هاتنی ئەم شێوە تازەیە لە ئابووری دەسەلات دەبێ بە نێت و زۆر بەووریایی و بەجۆرێ نادیار و ئالۆز لەڕووی نێودەولەتیەوە ئۆرگەنیزەدەکرێ(ڕێکدەخرێ). مەبەستە سەرەکییەکەش لەم حالەتەدا ئەوەیە کە دەمانەوێ ئەو مەسەلەیە بەرباسبخەین کە نێت بووە بە بناغە بۆ ئابووری نوێ و هەروەها ئەم نێتە لەتوانایدایە دەسەلات شاراوە و ناڕوونکا و تێگەیشتنیشمان بۆ دەسەلات بگۆڕێ. ئەمەش لەبەرئەوەی ئابوورییەکانی لەمەوبەر، بۆنموونە ئابووری پیشەسازی، جۆرە دەسەلاتێکی تایبەت بەخۆی بەرهەمهێنا و ناوەرۆك و میکانیزمی ئەم دەسەلاتەش زۆر پێوەندی بە توانای ئەو ئابوورییەوە هەبووە کە لەلایەن ئەو شێوازی بەرهەمهێنانەوە بەرهەمهاتووە. واتە، دەسەلاتی کۆمەڵگەی زانیاری نوێ ناکرێ وەك دەسەلاتی کۆمەڵگەی پیشەسازی (سەدەی هەژدە و نۆزدە) تەماشاکرێ. ئەمەش لەبەرئەوەی دەسەلاتی چاخی زانیاری

جێگای دیار و نێوەندێ ئاشکرا و جەمسەرێ ناسراوی نییە. بەلام لەهەمان کاتیشدا دەشێ دەرك بەوەکرێ کە لەکوێدا ئامادەیە. چۆن؟ چونکە مادام ئابووری تازەی ئەمڕۆ لەدەوری نێتۆرکێ گلوبالی پشتبەستوو بە سەرمایەێ زانیاری و زانینێ تەکنیکی بالا کۆبووەتەوە دەتوانین ئەو شوێنانە دەستنیشانکەین کە لەسەر ئەم پلانێتەی ئەمڕۆ تارماییەکانی ئەم دەسەلاتەی تێکەوتووە. بارودۆخی ئەم پلانێتەش بەجۆرێ ئەوتۆ چنراوە کە دەسەلاتی ڕاستەقینە تەنێ ناکەوێتە دەستی سیاسییە گلوبال و بەڕێوەبەری ڕێکخراو و بانقە نێودەولەتیەکانەوە بەلکو دەکەوێتە دەستی ئۆپێرەتۆر و ئەندازیاری تەکنیکە ئالۆز و پسپۆرە دەگمەنەکانی بواری بازاڕی مالیشەوە.

هەر لەمیانەی ئەم قسانەش لەبارەی ئابووری نوێ ئەوە یاددەخەینەوە کە لە جیهانی ئابووری نوێدا ئەوەی پێیدەلێن سیستەم گرنگی نامێنێ و دەبێ بە خال یان گرێ Node و، ئەم خالانەش خالی هاوبەشی نێوان نێتەکانن. واتە جیهانی ئابووری نوێ لەو خالانە پێکدێ و لەنێو ئەم خالانەشدا دەسەلاتە کولتووری، سیاسی و ئابوورییەکان شەپۆل لێدەدەن. گرنگیێ تری ئەم خالانە لەوەدایە کە کۆنترۆلی تەوژمی سەرمایەشیان لەدەستدایە و، ئەمەش کۆنتڕۆلی مێدیاکان دەکا کە ئەمانەش بەخۆیان کاردەکەنە سەر بڕیاری سیاسی. بەمجۆرە بێ ئەم خالانە بوونە بە شوێنی بردنەڕێوەی دەسەلاتی ئابووری. ئەو جۆرە دەسەلاتانەش کە بەهۆی ئەم خالانەوە دروستبوونە بەئاسانی دەگوێزرێتەوە و ئەوەندەش بەووردی چنراون کە ئەستەمە گۆڕینیان.

ئابووری نوێ هەر لەسەرەتای سەرهەلدانیەوە ئەوەی نیشانداوە کە لە ئابووری پێشوو، یان لە ئابووری کۆن، جوداوازە. چونکە ئابووری نوێ لەسەر بناغەی زانیاریگەریی و هێزێ گلوبال خۆی پێکهێناوە کە شەیدای پێشبڕکێیە. کەچی ئابووری پێشوو، واتە ئابووری پیشەسازی، ئابوورییەکی بەراوردکاریی(کۆمپەرەتیڤ) بوو و  توانایێ گەورەشی نە لە پێشبڕکێ و نەش لە مەسەلەی خۆ ڕێکخستن و خۆ یەکخستن Integration دا هەبوو، کە ئابووری نێتۆرك پسپۆرە تیای. ئابووری نێتۆرك یان نوێ کە داوای فلێکسبلیتێ و گۆڕانێ گەورە دەکا بەکارکردنەکانی لەسەر بناغەی ڕێکخستن و یەکخستنی بەرهەمهێنانی زانیاری و زانین جەوهەری خۆی گلوبال دەکا و بەهێشتنەوەی چەند لۆکالێ هەولی پەراوێزکردنی بەشێ زۆر لە هێزیکار و پەرتکردنی کاریش دەدا. ئەم ئابوورییە نوێیە ئەوەمان یاددەخاتەوە کە زانیاری لەم دوادوایەدا بووە بە بەشێ گەورە لە ئابووری- زانین لەو ڕۆژەوە

بووه به فاکتەێ گرینگ که مرۆڤ دەستیکردووه به بەکاربردنی سیمبۆل- و، هەروەها ئابووری زانیاری وای لەخۆکردووه که بەپلەی یەك لەبواری بەرهەمهێنانی زانیاریدا نەك شتێ تر دا پسپۆڕ بێ. ئەمەش بەخۆی ناوەڕۆکی ڕاستەفینەی کۆمەڵگەی زانیارییه (یاخود کۆمەڵگەی پاش پیشەسازی) که بەرهەمهێنانی شمەکی پیشەسازی تێدەپەڕێنێ(27). بەلام ناشکرێ گومان له تەکنیکی زانیاری نەکرێ که ڕۆلێ زۆری له بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنان نەدیووه و ئەمەش کاریگەری خۆی بەسەر هێزی کارەوه بەجێنەهێشتووه. گەر ئەمه بەلایەنێ پۆزەتیڤی ئەم جۆره ئابوورییه لەقەلەمبدرێ ناکرێ ئەوه لەبیرکرێ که ئەم لایەنه چەند شوێن و ناوچەیەك له جیهانا دەگرێتەوه و ناکرێ بەسەر هەموو دونیادا گشتیکرێ.

لێرەدا زۆر بەئاسانی دەکرێ دەرك بەوەکرێ که ئەم ئابوورییه نوێیه له توانایدایه گەشەێ زۆر بۆ خۆی و نابوودیێ زۆریش بۆ ئابوورییەکانی دەرەوەی خۆی دروستکا. ئەمەش لەبەرئەوەی ناوەڕۆکی ئەم ئابوورییه لەسەر ئەوه پێکهاتووه که مولکی ژمارەیەکی دیاریکراوه لەسەر زەوی و، هەموو لایەك ناتوانێ بێته ناویەوه و ئەو نێتۆرکەش بەکاربەرێ که پشتیوانی گەورەی ئەم ئابوورییه نوێیەیه. ئەو گەشه گەورەیەش که بەهۆی نێتۆرکەوه هاتووەتەدی تەنێ دوو لەسەر سێ دانیشتوانی سەر زەوی دەگرێتەوه و ئەو بەشەی تری دەکەونه دەرەوەی دەستکەوتەکانی ئەم گەشه تازەیه و ئەم ئابوورییه نوێیەشەوه. ئەو گۆڕانکاریانەش که بەهۆی تەکنیکی نوێوه دروستبووه هەر کارگەکانی نەگرتۆتەوه، بەلکو هەر له کولتوور و ژیانی خێزانەوه بەریکەوتووه تادەگاته فۆڕمی نانخواردن و پێوەندی سێکسی و دابونەرێتی نوێی هەلگرتنەوەی منال و ئاستی جوانکاری هونەر. بەلام دەکرێ بووترێ که خالی هاوبەشی نێوان ئەم گۆڕانانه ئەوەیه که هەموو لەژێرسایەی جیهانگیری ئابووریدا ڕوودەدەن. خودی ئەو جیهانگیرییه ئابوورییەش به گەشەی تەکنەلۆژیای زانیارییەوه بەنده.

لەهەمانکاتدا دەشخوازین بلێین که ئەوەی پێیدەلێن جیهانگیری هەندێ جار خۆی وەك پرۆسەیەکی ئابووری ڕووت دەردەخا. بەلام ئەمه گروندێ تەکنیکی هەیه که لەم سالانەی دواییدا ڕیتمێ نوێی به جیهانداوه. واته بوونی ئابووری به ئابووری نێت هاوکات لەتەك ئەو فۆڕمه سەرمایەدارییه گلوباله هاتۆته مەیدان که به سەرمایەداری زانیاری ناودەبرێ. بەپێی ئەوەی که شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری بووه به بەشێ سەرەکی له بوونیادی ئابووری جیهانی

سەرمایەداری و، هەروەها لەهەمانکاتدا ئەم تەکنەلۆژیای زانیارییە بووە بەوەش کە فۆرمێ نوێ لە سەرمایەداری بەرهەمبهێنێ و، ئەم جۆرە سەرمایەدارییەش بووە بە سەرمایەداریێ ئالۆز و دیگیتالیزەکراو. بۆ کورتکردنەوەی گشت ئەوانەش دەلێین، سەرمایەداری زانیاری ئەو سەرمایەدارییەیە کە دوادەستکەوتی سەرمایەداری جیهانە و سەرپەرشتی و بردنە ڕێوەی ئابووری و سیاسەتی لە ئامانجە سەرەکییەکانیەتی.
وێرای ئەوەی کە لەبارەی ئەم جۆرە ئابوورییەوە وترا دەمانەوێ ئەوەش بلێین کە یەك لە ڕووخسارە سەرەکییەکانی ئەم ئابوورییە نوێیەی بە سەرمایەداری زانیارییەوە گرێدراوە ئەو بازاڕە مالییە گلوبالە یە کە بەهۆی تەکنیکی گەیاندنی نوێوە لەگشت جیهانا کاری خۆی ئەنجامدەدا. ئەم بازاڕە گلوبالە مالییە لە هەموو بوارەکانی تر بێ شوێن و بێ کات ترە. گلوبالیتێی ئەم بازاڕە بەرهەمی ڕاستەقینەی ئەو گەشەکردنەیە کە کۆمەڵگەی نێتۆرك پێیگەیشتووە. ئەم لایەنەش بەرەو ئەوەمان دەبا پێ لەسەر ئەوەداگرین کە نابێ بەهەڵە لە یەکانگیری و گلوبالیتێی ئەم بازاڕە بگەین. چونکە ئەم بازاڕە تەنێ مولکی ئەوانەیە کە لە توانایاندایە بێنە ناویەوە و لە گەیاندن دا بن لەتەك ئەوانەی لە گۆڕەپانی ئەم بازاڕەدان. کەواتە بوونی ئەم بازاڕە جەغت لە بوونی دوو جۆر لە ولات یان کارگە یاخود ئۆقیانووس دەکا. جۆرێ کە دەتوانن بێنە ناو ئەم بازاڕە و کاری خۆیان لەگەل یەکدا جێبەجێبکەن و، جۆرێ تر کە لە توانایاندا نییە بێنە ناوەوە. ئەم ئامادەنەبوونە لەناو بازاڕی ئابووری گلوبال و نێتۆرکی مالی جیهانی تەنیا ئاکامەکەی دوورکەوتنەوەێ جوگرافی یان ئابووری ڕووت نییە. بەلکە زانیاری و سیاسیشە. ئەمەش لەبەرئەوەی کە دواجار هەر ئەم بازاڕەیە بەشدار دەبێ لە داڕشتنی بڕیارە سیاسی و ئابوورییەکان و سەرپەرشتیکردنی هێزە سەربازییە نێودەولەتیەکانیش. بەکورتی کەوتنە دەرەوەی بازنەی ئەم بازاڕە واتە نەبوون بە هێزێ کاریگەر و دابڕان لە مافی بردنەڕێووە و سەرپەرشتیکردن. ئالێرەدا دەکرێ باس لە مەسەلەی ئەو بارودۆخە کرێ کە نێتۆرك، جیهانگیری و ئابووری نوێ دروستیدەکەن بۆ مەسەلەی بردنەڕێوەی سیاسی و داڕشتنی یاسای نێودەولەتی و مەرجی بازرگانی. ئەوانەی کە پێیان دەوترێ دەولەتی نێتۆرك خاوەنی چەند فۆڕمێکن لە دەسەلات. بەپێی توانای ئابووری و زانیاریان دەسەلاتێکیان لەناو سنووری دەولەتی نێتۆرك دا هەیە، کە لێرەدا سنوورەکە تەنیا لەناو ستاتۆسی دەولەتی ناسیۆنالدا نییە بەلکە لەناو گشت ستاتۆسی دەولەتی نێتۆرك دایە کە ئەوەش دەکرێ بە دەولەتی

سەرووی(ترانس)ناسیۆنال یان دەولەتەکانی نێتۆرك ناوببرێ. دەسەلاتێ تریش هەیە کە لەناو دامەزراوە نێودەولەتییەکانە ( UN، EMU، NATO، EU، . . . و ). گەر تەماشای دامەزراوە نێودەولەتیەکان بکەین ئەوە دەبینین کە ئەو یاسا ئابووری و فۆرمە سیاسی و کۆمەلایەتیانەی لەوێڕا دادەڕێژرێن و دواتر کاریان پێدەکرێ بەزۆری پێشنیاری دەولەتەکانی نێتۆرکن (دەکرێ هەر بە تاك ئەم دەربڕینە بەکارببرێ واتە بووترێ دەولەتی نێتۆرك لەبڕی دەولەتەکانی نێتۆرك کە مەبەست لێی ئەو دەولەتانەیە کە خاوەنی ئابووریێ زانیاریاوی و گلوبالن و لەتواناشیاندایە خۆیان وەك یەك دەولەتی ڕێکخراو و کۆك نیشاندەدەن. ) و بەپێی باری ئابووری و تەکنیکیان دەتوانن گەشە بە پێشنیار و داواکانیان بدەن. بۆیە لە کۆتایدا کە بڕیار لەسەر بایکۆتکردنی ولاتێ یان ناوچەێ دەدرێ دەتوانن بەچەندین شێوەی سیاسی و یاسای جۆراوجۆر بۆچوون و داواکانیان بەئاکام بگەێنن. گەر بۆ نموونە بیانەوێ باسێ بێننە پێشەوە لەسەر مەسەلەی بەئەورووپابوونی یان بەئەورووپاکردنی توورکیا دەتوانن ئەمە بەچەندین مەسەلەوە گرێدەن کە بەهۆیەوە مەبەستە سیاسی و ئابووریەکانیان بپێکن. جا ئەوەش هەمیشە لەسەر باری سیاسی ئەو چرکە سیاسیە و ئەو مەسەلانەی کە لە دنیاتی نێودەولەتیدا گرنگی هەیە دەوەستێ. گەر لەو چرکەیەدا پێویستکا توورکیا وەك ولاتێ ئەورووپایی گەشەکردوو، ئەندامێ بکەری ناتۆ و پردی نێوان خۆرئاوا و خۆرهەلات تەماشادەکرێ یان بەپێچەوانەوە وێنەی ئەوتۆی لەسەر دروستدەکەن کە ولاتێ سەربازییە و دژ بە مافەکانی مرۆڤە و هەروەها ولاتێ ئاسیاییە کە جارێ لەژێر کاریگەری کولتووری ئیسلام و دیسپۆتیستی ڕۆژهەلاتییە. بەلام کاتێ تەماشای ئەو یارمەتیانە بکەین کە دەولەتی نێتۆرك بەناوی فۆندی نەختی نێودەولەتی بە ولاتی توورکیای داوە ئەوەمان بۆدەردەکەوێ کە چۆن دامەزراوە نێودەولەتییەکان تەنێ ئامرازێ سیاسی و بازرگانیین بەدەست ئەو ولاتانەوەی کە لە پرۆسەی جیهانگیری ئابووری و زانیاری ئەمڕۆ بەرپرسیارن. هەروەها بۆچوونە زالەکانی ناو ئەم دامەزراوانە بەری ئەندێشەی نەك هەر ئەم ولاتانەن بەلکو ئەو ولاتانەشن کە سالانە پارە بەو دامەزراوانە دەدەن و دواتر بەپێی ئەو بەشداربوونانەیان لە بەهێزکردنی بودجەی ئەو دامەزراوانە دەتوانن داوا سیاسی و خەیالە بازرگانیەکانیشیان بهێننەدی. مێژووی ئەم پراگماتیزییە سیاسیە ڕۆژئاواییە کۆنە و بەوەش ناچێ دەولەتی نێتۆرك ئاوا بەئاسانی دەستبەرداری بێ بەتایبەت ناوەڕۆکی پرۆژەی

سیاسی و ئابووری دەولەتی نێتۆرك، كە مۆدێلێ پڕ لە پاڕادۆكس و ناتەبا پیادەیدەكا، ئەم پڕاگماتیزمییە بەهێزتر و جۆراوجۆر تردەكا. ئەم جۆرە هەلوێستەی دامەزراوە نێودەولەتیەكان و وابەستەیەتیان بۆ ولاتانی خاوەن وتاری ئابووری و سیاسی و زانیاری نوێ هەمیشە هۆكارێ بووە بۆئەوەی كە لە دەرەوەی خۆیان ناحەز و نەیارێ زۆر دروستبێ و پەرچەكرداری و پرۆتێستێ سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەردەوام لە گەشەكردن دا بێ و ئەم لایەنەش وابكا كە رۆل لە خولقانی گەورەترین جەمسەرگەری و پۆلكردنی ناوچەی و ئیتنی و مەزهەبی ببینێ. زۆرجاریش وارێكەوتووە كە ولاتانی رۆژئاوا و ئەندازیارانی دامەزراوە نێودەولەتیەكان زۆر گوێنەدەر و بێ باك خۆیان نیشان دەن و هەلوێستێ دیاریكراو و دەستبەجێ نەگرنەبەر بەرامبەر بەو دژایەتیكردن و ناحەزییانەی كە لە دەرەوەی چوارچێوەی جوگرافی خۆیان نەشونمادەكا. رەنگە رووداوەكانی 11/9 یەكێ بووبێ لەو پەرچەكرداری و پرۆتێستانەی كە نەیار و دوژمنانی سیاسەت و ئابووری رۆژئاوا و دامەزراوە پڕاگماتیەكانی نیشانی جیهانیان دا. هەر لەم رووەوە دەكرێ دەولەتی عێراقیش هەر لەسەرەتای دروستبوونیەوە بەیەكێ لە هەلە كوشندە و ناڕەوشتیەكانی ساسیەتی دولایەنە و بەرژەوەندیگەرانەی ولاتانی رۆژئاوا تەماشاكرێ كەچۆن سەرەتا ئەم ولاتە لەرووی سیاسیەوە پێكهاتوو و پاشان ئەم ولاتە وایلێكرا بەم توانایە لە سەربازیی بگا و دواتر بشبێ بە هەرەشەیكی ساختە بۆ سەر ئەو جیهانگیرییە ئابووری و سیاسی و یاساییەی كە ولاتانی رۆژئاوا كاریبۆدەكەن و هەروەها بوونیشی بە سیمبۆلێ بۆ ناسیۆنالیتێێ چەوت و ئیسلام گەرایێ رێكخرا و پرۆگرامكراو.

دەگەرێینەوە سەر باسكەی خۆمان و دەلێین ئامادەبوون لەناو مالی نێتۆرك یان بوون بە بەشێ لە دەولەتی نێتۆرك واتە بوون بەیەكێ دارێژەر و توێژەر و باسكەری ئەو یاسایانەی سەبارەت بە دیاردە ئابووری-سیاسیەكان و دواتر مەسەلە كولتووریەكان دێتەپێش. ئەوانەش كە لەناو مالی نێتۆرك دا جێگیربوونە بەپێی باری ئابووری و تەكنیكیان بكەرێ چاكی ناو ئەم مالە و ئەمجار ناو دامەزراوە نێودەولەتییەكانن و، خاوەنی بەلایەنی كەمیشەوە یەك تا سێ كارگەی مولتی ناسیۆنالیین كە لە درەوەی چوارچێوەی دەولەتی ناسیۆنال كاردەكەن و نەك هەر دەولەتی ناسیۆنال گوێ رایەلی خۆیان دەكەن بگرە ئەو ولاتانەش وابەستەی خۆیان دەكەن كە كاری تیادەكەن. ئەمەش زەوینەی ترسناك لەوكاتانەدا دروستدەكا كە ئەم كارگە مولتی ناسۆنالییانە لە

ولاتهایەك كاربكەن كە نە بەشێ بن لە مالی نێتۆرك و نەش خاوەنی ئابووری گلۆبال و زانیاریاوی بن. ئەم كارگانەش بەو ڕابردووە ئابووری و تەكنیكی و سیاسیانەیانەوە دەتوانن بەئاسانی كار لە گەلێ جوولەی سیاسی و ئابووری ئەو ولاتانە بكەن و ئابووری نەتەوە و گەشەی ناوخۆش بەخۆیانە گرێدەن.
ئەو جۆرە ولاتانەش كە ئەمەیە قودرەتی ئابووری و تەكنیكیان تەنێ لە چوارچێوەی دەولەتی ناسیۆنالی خۆیان ئاوا ناكاریگەر و بێ توانا نیین بەلكو لە دەرەوەی ئەو چوارچێوەیەش هەر بەوجۆرەن و هیچ ڕۆلێكیان لە گۆڕانی ناواخن و یان داڕشتنی یاسا سیاسی و بازرگانییە نێودەولەتیەكان نییە. بۆیە ئەو ولاتانەی ناوماننا ولاتانی دەرەوەی نێتۆرك كاتێ لەناو هەندێ لە دامەزراوی نێودەولەتی (نەتەوەیەككگرتووەكان، فۆندی نەختی نێودەولەتی و،) دا ئەندام دەبن لەچاو ئەو ولاتانەی بەشە سەرەكیەكەی مالی نێتۆرك پێكدێنن ئامادەبوونەكانیان زۆرجار بێ هێز و بێ بەها دەبێ. ئەمەش لە جیهانی سیاسی و ئابووری ئەمڕۆدا مەسەلەیەكی بێ نرخ نییە. چونكە زۆرجار فەرامۆشكردنی ئەو لایەنە بە زیانێ گەورەی دۆزی سیاسی و كۆمەلایەتی نێودەولەتی گەڕاوەتەوە و تەنانەت ئەم هەستی خۆ بەپەراوێز و بەكەمزانین و بێكاریگەر بوونەش وایان لەو ولاتانە كردووە كە لەدەرەوەی مالی نێتۆركی ئابووری و پارە و سیاسەتن ببن بە گرووپی جیاجیا و ڕەوایەتی بەرەفتاری سیاسی و ئابووری یەكتر بدەن و پاساودانیش بۆیەكتربكەن. لەم ڕووەشەوە دەكرێ گەلێ نموونەی لەم جۆرە بهێنرێتەوە. لێرەدا بەكوورتی دەچینە سەر دوو نمونە یەكەمجار دەچینەسەر ڕەوشی ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و دواجاریش دەچینەسەر ولاتانی یان جیهانی عەرەبی- ئیسلامی.
بۆنموونە باری ولاتانی پێش هەلوەشانەوەی یەكیەتی سۆڤیەت و ئەورووپای ڕۆژهەلات زۆر لەمەوە نزدیكە كە ئێستا گۆڕاوە بە بارێكیتر و ئەم بارە نوێیەش زۆر لەوی پێشووش باشتر نییە. لەبەرئەوەی پێشتر هەموو بەكانگیرییەكی خۆیان لەسەر بناغەی ئایدیۆلۆژی دروستدەكرد كە هۆكاری سەرەكی بوو بۆ ئەو جەمسەرگەراییە سیاسییەی جیهان تیایدەژیا. ئەمڕۆ دۆزەكە بەجۆرێ تر وەگەڕدەكەوێ و جەمسەرگەرایی و بێ هەلوێستیەكەی ئەم ولاتانە مانای تری هەیە و مەبەستە سیاسی و ئابوورییەكانیشیان بە شێوەێ دی مسۆگەردەكەن كە زۆر لەو ڕەوشتە سیاسی و ئابوورییەوە نزدیكە كە زانیاریگەریی و ئابووریخوازی لەگەل خۆی هاوردوویەتی. بۆ ئەوەی ڕوونتر بدوێین دەلێین ئەوی ئەم ولاتانە(لێرەدا بەگشتی تێكڕای بلۆكی سۆسیالیستی

مەبەستە) لەئەمرۆدا ئارەزوویەکەن ئەوەیە کە چۆن بکارن بێنە ناو یەکیەتی ئەورووپاوە و ببن بە ئەندام لەو دامەزراوانەی کە پێشتر کاریان تیانەکردووە و تەنانەت بە دامەزراوەهایەکی ئیمپریالیش لەقەلەمیانداوە. بۆئەوەش کە ببن بەولاتهایەك کە داڕێژەری یاسا ئابووری و سیاسیەکان بن وازیان لەهەموو چالاکییەکی سیاسی و ئینسانی خۆیان هێناوە و تەنێ خەون بەوەوە دەبینن کە چۆن بتوانن یارمەتی لە فۆندی نەختی نێودەولەتی یان دامەزراوێکی سیاسی و ئابووری وەك یەکیەتی ئەورووپایی وەرگرن. ئەم ولاتانەش کاتێ کە بەو ڕابردووە ئابووری و تەکنیکی و ساسیشەوە هاتوونەتە ناو مالی ئەورووپاییەوە نەك هەر بەرامبەر بە کێشە ناوچەی و نێودەولەتیەکان بێ هەلوێست و ناکاریگەرن بەلکو ئەو ڕابردووە و ئەو شێوە هاتنەناوەوە وابەستەییانەیەش بارێ ئەوتۆی هێناوەتەگۆڕێ کە پێش هەموو شتێ ولاتەکانی خۆیان کردووە بە باشترین دالدە بۆ بێکاری، سوالکردن، نارکۆتیکە، مافیاگەری، سۆزانیەتی و هەژارێ مۆدێرن. ئەمە و جگەلە گەلێ دیاردەی دزێویتری وەك: سەربازە گەورە و خانەنشینەکان کاری چەرچیەتی بە فرۆشتنی چەك و تەقەمەنیوە دەکەن. بەشێ زۆریش لەو بازرگانیانەیان لەگەل ولاتە دیکتاتۆر و داپلۆسێنەرەکان دەکەن. هەروەها پسپۆرەکانی چەك دروستکردن و بەتایبەتە چەکە بیۆلۆگی و ترسناکەکان لەلایەن ئەو ولاتانەوە دەکڕدرێن کە ناحەزی و دوژمنگەرایی لە سیاسەتیاندا سەقامگیرە (لەوانە ئێران، عێراق، ئیسرایل، توورکیا). مافیاگەری تەنێ لە شەقامەکاندا ناخولێتەوە بەلکو ئەم مافیایانە تاقمی سیاسی و دیپلۆماسیشیان لێدەرچووە کە بەناو دامەزراوە سیاسی و ئابووریەکانیش دا وەك نەخۆشی بلاوبوونەتەوە. هەربۆیشە پیاوە لێهاتوو و نوێنەرەکانی ئەم ولاتانە لە نێوەند و دامەزراوە نێودەولەتیەکانا یان هەر کۆنە سیاسییەکانن یانیش ئەو لاوانەن کە مێشکیان بە جیهانگیری ئابووری و سیاسی شۆراوەتەوە.

بەلام ئەوەی پێوەندی بە دۆزی جیهانی عەرەبی-ئیسلامییەوە هەیە لەچاو ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات جیاوازە. نەك هەر لەبەرهۆی سیاسی (هەولی چەندین سالەی ئەم ولاتانە بۆ خولقانی دوژمنێ هاوبەشی بەناوی ئیسرایل یان تێکشکانە ئایدیۆبۆژی و ناسیۆنالییەکان) و یان توانای ئابووری(لەلایەك بوونی ولاتانێ بەدەرامەتی باش و لەلایەکیتر ولاتانێ تریش کە ڕۆژانە لەبەر هەڕەشەی هەژاری و برسیەتیدان) و سەربازی (نەبوونی ئەزموونێ باش و یان پیشەسازیێ سەربازی خۆمالی و هەروەها نەبوونی کەرتی سەربازی بە

بوارێ پیشەسازی زو زانستی وەك ئەورووپا) بەلکو لەبەرهۆی تریش وەك کولتووری، زمان و ئاستی تەکنیکی و زانستی (نەخوێندەوارێ زۆر و دواکەوتوویێ کۆمەلایەتی گەورە و دانیشتوانێ زۆریش) و هەروەها مەسەلەی مەزهەبی و ئیتنیش. چونکە هەموو لێکترنزیکبوونەوەیەك کە لەنێوان ئەم ولاتانەدا ڕوویداوە هۆکاری مێژووی خۆی هەبووە و زۆربەشی پێوەندی بە مەسەلەهایەکی وەك مەسەلەی مەزهەبی و ئیتنی و ناسیۆنالییەوە هەبووە وەك لە مەسەلەی ئابووری یان زانستی. کێشەی ئەم ولاتانە ئەوەیە کە نە ئایدیۆلۆژیایەك وەك ئایدیۆلۆژیای مارکسیزم ڕۆلی دیووە لە یەککرتنەوەیان وەك ئەوەی کە لە ئەورووپای ڕۆژهەلات گرنگی هەبووە نەش ئایدیۆیۆلۆژیایەك وەك ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم و ئابووری بازاڕ ڕۆلی لەیەك خستنیان دیووە وەك ئەوەی کە لە ئەورووپای ڕۆژئاوا ڕوویداوە. ئێستاش جیهانگیری زانست و ئابووری توانیوویەتی هەردوو جەمسەرە دژەکە یەکخا و گەلێ پێوەندی پراگماتی جۆراوجۆر و هاوشێوە لەنێوان ئەو ولاتە ئەورووپاییانەی لە پەراوێزی جیهانگیری ئابووری و زانیاریدان و ئەوانەش کە لەنێوەندان دروستکا. بەلام هەرچی پێوەندی بە ولاتانی عەرەبی-ئیسلامییەوە هەیە بەوجۆرە نییە چونکە ئەم ولاتانە دەمێکە پیشەیان بووە بەوەی گرووپ گرووپ سیاسەت بکەن و هەر جارەش لەدژی یەکتر نەك لەبەر هەلوێستێ سیاسی و ئابووری دیاریکراو خۆیان بکەن بە وابەستەی دەولەتێ لە دەولەتاکانی نێتۆرك یان بەپێچەوانەوە لەدژی دەولەتی نێتۆرك و دامەزراوە نێودەولەتی و کارگە مولتی ناسیۆنالییەکانی ئەم دەولەتی نێتۆرکە دەکەونە پشتگیریکردن لەدیاردەی سەیرسەیر و بەخێوکردنی تاقم و گرووپی جۆراوجۆری ناحەز و بێ بار و بێ ئامانج و دواتریش دەکەونە بەکاربردنی ئەم تاقم و گرووپانە و بۆمەبەستی سیاسی و ناسیۆنالی و ئیتنی خۆیان بەکاریاندەبەن. ئەماناش هەر بەزەرەی جیهانی عەرەبی- ئیسلامی ناگەڕێتەوە بەلکو گەورەترین هەلەن دەرهەق بە خودی مرۆڤایەتیش. تەماشاکا تا ئێستا ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی هەلوێستێ تەبا و دیاریان بەرامبەر بە کێشەی نێوان فەلەستینییەکان و ئیسرائیلییەکان نییە و هەریەکێکیشیان بەجۆرێ کە خۆی باوەڕی پێیە دەستی لە داڕشتنی تێگەیشتنی سیاسی فەلەستینیەکان دا هەیە. ئەمەش یان بە دروستکردنی ڕێکخراوی جۆراوجۆری فەلەستینی یانیش بە بەخێوکردنی ڕێکخراوە سیاسیەکانی فەلەستینیەکان کۆتای هاتووە. جا لە هەموو ولاتێ عەرەبی و ئێستا لە هەندێ لە ولاتە ئیسلامیەکانیش فەلەستینی سەر بە ڕێکخراوی فەتح

هەیە و شانبەشانی ئەوە تاقمی جەبهەی شەعبی و ئیسلامی فەلەستینیش هەیە.
ئەم ولاتانە(بۆنموونە ڕۆلی سیاسی سوریا و ئایدیۆلۆژی میسر و مەزهەبی ئێران و ئەمجار ئابووری و ناسیۆنالی هەندێ ولاتی وەك ئوردن و عێراق و ولاتانی کەنداو) ئەمە هەر لەبەر ئەوەناکەن کە بیانەوێ هەمیشە خۆیان وانیشان دەن کە بەشێکن لە کێشەی نێوان فەلەستینیەکان و ئیسرائیلیەکان و، یان هەروەها بیانەوێ ببن بە یەکێ لە نوێنەرانی فەلەستینیەکان و بەهۆی ئەمەشەوە لەگەل دەولەتی نێتۆرك و دامەزراوە نێودەولەتیەکانی لە دنیاتی بەردەزامدابن تا هەمیشە پێکەوە چوارچێوەی سیاسی بۆئەم کێشەیە دانێن. نەخێر ئەم ولاتانە ئەمەدەکەن لەبەر ئەو هۆیانە و لەبەرئەوەش کە لەلایەك دەیانەوێ ببن بەبەشێ لە وتاری ناسیۆنالیزمی عەرەبی (بەتاییەت سوریا و میسر و عێراق) و هەروەها مەزهەبی و ئایدیۆلۆژی ئیسلامیش (لەوانە ئێران) و هەروەها لەلایەکی تر دەیانەوێ بەهۆی ئەم هەلوێستانەیانەوە دەمکوتی ناحەزەکانیان لەناو ولاتەکانی خۆیان بکەن و لەهەمووشی سەریرتر هەولبدەن وێنەیەکی نەتەوەی و ئینسانی لەیەك کاتدا لەسەر سیاسەتەکانیان دروستکەن (دوو سالێ لەمەوبەر عێراق 5 ملیۆن ئیرۆی کرد بە دیاری بۆ ئەو مالە فەلەستینیانەی کە لە خۆپیشاندانەکانا کوژراویان هەبوو). جیهانگیری ئابووریش دۆزێ سیاسی پاراپادۆکسالی ئەوتۆی لەتەك خۆدا هێناوە کە کێشەی فەلەستینیش دووچاری ئەو دۆگما سیاسی و ستراتیژیە دوانەییە کردووە کە ولاتانی نێتۆرك دەیانەوێ بیخەنە ناو کێشەی نێوان فەلەستینی و ئیسرائیلیەکانیشەوە. بۆ نموونە میسر بەپلەی یەك و ئوردن بەپلەی دوو توانیوویانە بەجۆرێ ئەم کێشەیە بەر دنیات دخەن کە نزدیکە لە زەمانی جیهانگیری ئابووری و سیاسەتی نوێووە و بەرامبەر بەوەش سالانە و وەرزانە زۆرترین یارمەتی لە فۆندی نەختی نێودەولەتی وەردەگرن و هەرچی سوریایە جارێ هەر لە لیستی ڕەشدایە بەهۆی هەلوێستە توندڕەوەکانی بەرامبەر بەم کێشەیە بەلام ئەم یارمەتیەکانی لە ولاتانی کەنداو وەردەگرێ کە ئەمەش بۆخۆی بەشێکی ترە لەو یاریە سیاسیەی کە جیهانگیری زانیاری و ئابووری باوەڕی پێیەتی. ئەمە هەلوێستی ولاتانی عەرەبییە و کەچی لە واقیعدا کاتێ کە تەماشای کامە ولاتی عەرەبی دەکەی دەبینی هەریەکە لەم ولاتانە فەلەستینێکی لەناخی خۆیدا دروستکردووە و خۆشی بووە بە ئیسرائیلێك بەسەریەوە (بۆ نموونە دۆزی کوردەکان لە سوریا یان ئیسلامییەکان یان گرووپە ئیتنی و مەزهەبیەکانی تر لە زۆربەی ولاتانی

عەرەبی). ئەوەی بە ولاتانی ئیسلامیشەوە تایبەتە ئەوەیە کە ئەم ولاتانە ئەوی لەسەرەوە باسمانکرد دەیکەن یەك لەبەرئەوەی نوێنەرایەتیکردنی ئەم کێشەیە دەچێتە خانەی وتاری یان ئیسلامیزمەکەیانەوە و دووش لەبەرئەوەی ئەوەی پێیدەلێن ولاتانی جیهانگیری و دەولەتی نێتۆرك کە لە هەمان کاتدا ئەو لایەنە (واتە جیهانیبوونەکە و نێتەکەی ڕۆژئاوا) گەلێ شتی تری وەك وتاری دیموکراسی و مافی مرۆڤ و دادپەروەری کۆمەلایەتی دێنێتە پێشەوە بۆ ئەم ولاتە ئیسلامییانە دیاردەهایەکی سەلبیی-مەسیحین و لەپشت زۆربەی کێشەکانی مرۆڤەوەن. کێشە نێوان فەلەستینی و ئیسرائیلییەکانیش تاکە کێشەێ نییە کە بەمجۆرە لەلایەن ولاتانی عەرەبی-ئیسلامییەوەڕەفتاری لەگەلکراوە بەلکو گەلێ کێشەی تری ناوچەی و هەرێمی هەن کە جارێ ئەم ولاتانە زۆر تەماشاکردنێ ناحەز و نادادپەروەرانەیان بۆ هەیە. بۆ نموونە کێشەی کوردەکان و دەولەتی عێراق یان کێشەی کورد بەگشتی و هەروەها تازەترین کێشەی جیهانیش کە ئەوەش دیاردەی تیرۆریزمە.

ئێمە کاتێ کە تەماشای کامە ولاتی عەرەبی-ئیسلامی یان سەرجەم ولاتانی ئیسلامی دەکەین دەبینین خۆیان بەناشرینترین و زۆردارانەترین شێوە ڕەفتاریان لەتەك ڕێکخراوە ئیسلامییەکانی ناو ولاتەکانی خۆیان کردووە کەچی پشتگیری لەکاری تیرۆریستی دژبە ئیسرائیلییەکان دەکەن و تاقمی ئیسلامی توندڕە و بکوژ دروستدەکەن و مەشقیان پێدەکەن و بۆکاتی تەنگانە و بۆ خستنەڕووی داواکانیان بەکاریان دەبەن. ئەلبەتە ئەو چەوتیەش لە سیاسەتی ئیسرائیلییەکاندا هەیە هەمیشە کاریگەری خۆی بەسەر ئەو شێوە سیاسەتکردنەی ولاتانی عەرەبی- ئیسلامیەوە هەبووە و هەشیەتی. ولاتانی عەرەبی-ئیسلامیش لەئاکامی ئەو جۆرە سیاسەتەی ئیسرائیلیەکان، کە ئیسرائیلییەکان ئەم سیاسەتەیان بە پشتیوانی دەولەتی نێتۆرك و دامەزراوە نێودەولەتیەکان لەو دەوروبەرە خۆیان پیادەیانکردووە، دووچاری نائومێدی و بەدڕەفتاری بوونە و واشیان لێکراوە کە ئیسلام وەك ئەلتەرنەتیڤێکی تەکنەلۆژیای زانیاری نیشانبدەن و بیکەن بە هیوایەك بۆ دروستکردنی ناسنامەی ناسیۆنالی و ئیتنی خۆیان. بۆیە ئەم ولاتانە نایانەوێ ئەوە نیشاندەن کە ئیسلام ئەتوانێ تیرۆریزم دروستکا یان ئیسلام لەئەمڕۆدا پێویستی بەوەیە بۆ ماوەیەك وەك تیرۆریزم ناوزەد کرێ و وەك هێزێ ترسناك تەماشاکرێ تا بەئاکامەکانی خۆی دەگا. هەروەها ئەم ولاتە عەرەبی - ئیسلامیانە و تەنانەت ئۆپۆزیسیۆنە ئیسلامی و ڕادیکال و چەپەکانیشی

ناخوازن باوەڕ بەوەبکەن کە ئیسلام دەتوانێ هەروەك هەموو بزووتنەوە ئاینیەکانی تر( مەسیحی، یەهوودی، هیندۆسی، بوودی) لە دروستکردنی دیاردەی فۆندەمینتالیستانە و هەروەها جمووجۆلی توندڕەوانە بەشداربێ. بەقەولی کاستێلسیش ئەم بزووتنەوە ئاینیانە لە گەل داهاتنی چاخی زانیاری بەدووی ناسنامەی خۆیان وێلدەبن و نێتیش بۆ بەئەنجام گەیاندنی چالاکییەکانیان بەکاردەبەن و بەجۆری ئەوتۆش بلاودەبنەوە کە گشت جیهان دەگرنەوە. لەلایەن خۆمەوە پێموانییە کە هەموو مەسەلەکە هەر ئەوەبێ. چونکە کاستێلس بەووردی نەچۆتە ناو ئەم لایەنەوە و ئەو ووردەکارییانەی لەبارەی چالاکیەکانی دەولەتی نێتۆرك کاری لەسەر کردووە هەمان شتی لەبارەی ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی نەکردووە و لە توێژینەوەکەیدا ئەو بایەخە قوولەی نەداوەتێ. هەروەك لەسەرەوەش ئاماژەمان پێکرد کە ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی نایانەوێ ڕووداوەکانی نێوان خۆیان و ولاتانی نێتۆرك وەك خۆی تەماشاکەن و بینینی خۆیان بگۆڕن. ئەم داخلەدلیەش یەك تەرەفی نییە و هەردوولا، چ ولاتانی جیهانگیری و چش ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی، سالەهایە لە دروستکردنی وێنە هەلە و ناتەباکان بەشدارن. دروستکردنی ئەو وێنانەش تەنێ دەستی ڕژێمەکانی ئەم ولاتانەی تیا نییە بەلکو ئەو دەستبژێرە ئەکادیمی و ڕوناکبیرە ڕادیکالانەش هەمیشە ڕۆلیان لە بەرهەمهێنانی ئەم جۆرە وێنە و تەماشاکردنانە دیووە. ئەم لایەنە لە ڕۆژئاواش ئامادەبووە و بگرە زۆر بەزانستیشکراوە. کاتێ کە ڕووداوەکانی 11/9ش هاتەپێشەوە زۆربەی ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی سێرکردنێ ڕوون و دیاریکراویان لەوبارەیەوە نەبوو و تەنانەت لە مێدیاکانیشیاندا ولاتانی ڕۆژئاوایان کرد بە قەسابخانەیەك بۆ گشت عەرەب و ئیسلامێك. گومانی ناوێ کە ولاتانی نێتۆرك لەسەرەتادا هەموو توانای خۆیان وەگەڕخست تا ناشرینترین وێنە لەسەر خەلکی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی دروستکەن. ئەمەش لەگەلێ ڕووەوە سەریگرت و بەتایبەت زەمینە بۆ ئەم دوژمنایەتییە نەرم و ڕقە هێمنە دەمێك بوو لەئارادابوو. لەلایەك دەولەتی نێتۆرك لەدوای نەمانی مەترسی سەرمایەداری سووری سۆڤیەتی پێویستی بەوە هەبوو کە جارێتر بکەوێتە دروستکردنی دوژمنێ هاوبەش و جەمسەرێ نوێ. جا ئیسلامیزم لەمحالەتەدا بۆ ولاتانی نێتۆرك باشترین جەمسەر بوو. چ لەبەرئەوەی خۆیان بەدوژمنی تەکنەلۆژیای زانیاری و ئابووری گلوبال دەزانن و چش لەبەرئەوەی دالدەن بۆ بەرهەمهێنانی دیاردەی فەنەتیزم. لەلایەکی تر خەلکی ولاتانی نێتۆرکیش دەمێك بوو ناحەزیەکی شەفاف و بووخزێکی

نەرمونیانیان لە ناخی خۆیاندا سەبارەت بە خەلکی ولاتانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی حەشاردا بوو، لە دوای زۆربوونی شەپۆلی کۆچیش لە ولاتانی عەرەبی و ئیسلامییەوە بەرەو ولاتانی نێتۆرك خەلکی ولاتانی نێتۆرك پتر لەجاران زانیاریان لەسەر ناوەرۆکی ئاینی ئیسلام و خوورەوشتی ئیسلامی پەیداکرد و بەهۆی ئەمەشەوە ئەمان (واتە خەلکی ولاتانی نێتۆرك) بەوەگەیشتن کە هەموو ئەوەی پێیدەلێن خوورەوشتی ئیسلام و جەوهەری ئەم ئاینە پێچەوانەی ئەو کراوەیی و ئازادی و بێ سنوورییەیە کە ئەوان کاری بۆدەکەن. بەلام گشت ئەو کراوەیی و ئازادیی و بێ سنووریەش کە دانیشتوانی ولاتانی نێتۆرك دەخوازن خۆیانی لەسەر ڕابێنن و شانازی پێوەدەکەن بۆ موسلمانێ، کە لەئاکامی جەنگ وهەژاری و زولم و بێ شوێنی پەنای بۆ ولاتانی نێتۆرك و بنکەی تازەگەرییەکان بردووە، بریتییە لە بێ ئیمانی و سەرەڕۆیی و بەڕەلایی.
لەڕاستیدا، ئەم دژایەتی و دووبەرەکایەتیە دوولایەنانە هەمیشە لەتوانایاندایە سەرلەنوێ بژێنەوە و لەلایەن هێزە شەڕانگیز و بکوژەکانیشەوە بەکارببرێن و مانای تایبەت و گشتیشیان بدرێتەپال. مرڤایەتی ئەوەندە کەلێنی گەورە و مەودای بێپایانی تێکەوتووە کە ئەم جۆرە دیاردانە زۆر بەئاسانی دەتوانن شوێن بۆخۆیان بدۆزنەوە و لە فۆڕمی سەیر سەیردا وەبەربهێنرێن. کاتێ کە دیاردەی تیرۆریزمی ئیسلامیش خۆی بەجۆرێ ترسناك چڕکردەوە بووە هۆی دروستبوونی ڕووداوەکانی 11/9 و هۆکاری پۆلکردنی زۆربەی تەماشاکردنە سیاسی و مەزهەبی و ئاینییەکان. ڕوناکبیر و ئەکادیمیکەر و ڕۆژنامەنووسی ولاتانی نێتۆرك هەروەك ئەوی ولاتانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی کەوتنە خۆ دابەشکردن و هەلوێستی هەلە وەرکرتن و وتاربێژتنی گومانئامێز و نابینا. هەردوو ئەوەیان لەبیرکرد ئەم جۆرە خۆ دابەشکردن و خۆ پۆلکردنە ج گالتەکردنێکە بە مرۆڤ و بەو گرفتانەی کە زۆر لە دیاردەی تیرۆریزم هەنووکە ترن و یان ئەو هەقایەتانەی ئەم جۆرە دیاردە و ڕووداوانە بەرهەمدێنێ. کۆمەلناس و بیریار و ئابووریناسانی کۆمەلگەی نێتۆرك چاك ئەوە دەزانن کە زانیاریگەریی و ئابووریخوازی سەردەم و ئەو فۆڕمە کۆمەلایەتی و کولتووری و ئابووریانەی سەرمایەداری گلوبال دەیخاتە ناو ژیانی ڕۆژانەوە چەند ترسناك تر و وێرانکارانەتر و هەمیشەیی ترە لە دیاردەیەکی پڕ لە تووڕەیی و ڕقئامێزی وەك تیرۆریزمی ئیسلامی. هەروەها ئەو دەستەبژێرە ڕادیکال و ڕەخنەگرانەی ولاتانی عەرەبی-ئیسلامیش دەبێ

چاك لەوە تێڕامێن كە دیاردەیەكی وەك تیرۆریزمی ئیسلامی لەلایەن ڕژێمە دیسپۆتیستی و بكوژەكانی ولاتەكانیانەوە بۆ گەلێ مەبەست بەكاردەبرێ و تەنانەت زۆرترین سیاسەتیشی پێوەدەكرێ. ئەو ڕژێمانە كە هەریەكێكیان تیرۆریستێكی ولاتانی خۆیانن بەوپەڕی ئاگاییەوە هەولدەدەن ئەم جۆرە ڕێكەوتانە بقۆونەوە و بۆ ئەو مەبەستانەش بەكاریبەرن كە مانەوەی خۆیانی پێبەرەبدەن. ئەگەر جیهانگیری ئابووری و زانیاری ولاتانی نێتۆرك لەناوجەرگەی ولاتانی خاوەن وتاری جیهانگیری لەپشت سەرهەلدانی جۆرە هەژارێ نوێ و بێكارێ بەردەوام و كرمینالیتێێ ئابووری ئۆرگەنیزەكراوەوە بێ ئەوا دیاردەهایەكی وەك فۆندەمینتالیزم و فەنەتیزم نەك هەر بەرهەمی ئەو ناتەباییە كە جیهانگیری ناوبراو لە ناوچە كەمدەرامەتەكان بەرپرسیارە لە دروستبوونی بەلكو ئەو دەستكورتی و نەخوێندەواری و بێ مالی و ستەمەش كە لەوێدایە شمەكی لەوە باشتر بەرهەمناهێنێ. ئەو ستەمەی لە كارگەكانی بەرەمهێنانی شمەكی دیگیتال و ئامرازی ئەلەكترۆنی ئالۆزدایە كەمتر نییە لەو ستەمەی لەناو ڕێكخراوە چەكدار و خۆتەقێنەرەوەكان دایە. ئەو ستەمە ئۆرگەنیزەی زانیاریكەری ئابووریخوازی دروستكردووە كەمتر لە و ستەمەی فۆندەمینتالیزم و فەنەتیزمی بەدیاری بۆ هێناوین هەڕەشەئامێزتر نییە.
پێمانوایە كە گرنگە لێرەدا ئاماژە بەوەبكەین كە قسەكردنمان لەسەر ئەو لایەنانەی كە لەسەرەوە ئاوڕمان لێدایەوە هاتنەدەرەوە نییە لە ناواخنی باسەكە بەلكو جەختكردنە لە مانەوەمان لەناو چەقی ئەو گفتووگۆیانەی كە هەر لەسەرەتاوە دەستمان داوەتێ. ئەمەش یەك لەبەرئەوەی كە لەڕووی مێتۆدیی باسەكەوە پێوستمان بەوەیە كە هەندێ لە خاسلەتەكانی دەولەتی نێتۆرك و دامەزراوەكانی و ئەمجار یارییە سیاسی و ئابوورییەكانی ئەم دامەزراوانە و هەروەها بەهەلەتێگەیشتنەكانی ولاتانی دەرەوەی نێتۆرك ڕوونكەینەوە. دووش لەبەرئەوەی كاستێلس لەو توێژینەوە نێودەولەتیەی لەبارەی چاخی زانیارییەوە هیچ بایەخێكی بە ولاتانی عەرەبی-ئیسلامی نەداوە. ئەمەش تاڕادەیەكی زۆر یەكێكە لەو لاوازیانەی كە لەم كارەدا بەرجەستەیە. واتە ئەوەی پێیدەلێن جیهانی عەرەبی-ئیسلامی شوێنێ دیاریكراوی لە تیپۆلۆژیای تۆژینەوەكانی ئەم كۆمەلناسە لەمەڕ كۆمەلگەی زانیاری نوێ نییە. ڕەنگە ئەمەش بەزۆری پێوەندی بە پلەی سفری بەشداری ئەم ولاتانەوە بێ لە بەرهەمهێنانی زانیاری و تەكنیكی نوێ و كاریگەریشیان بەسەر بازاڕی ئابووری گلوبالەوە. بەلام هیچ نەبێ دەبایە پەراوێزی و دواكەوتوویی یان گەشەی هەندێ دیاردەی نوێ كە

بەشێکی بەهۆی جیهانگیری ئابووری و زانیارییەوە دروستبووە و بەشەکەی تریشی فاکتەی سیاسی و کولتووری و مەزهەبی دروستیان کردووە بۆ کاستێلس شایانی باسبوایە. ئەوەی بەزۆری و بەقوولی لە توێژینەوە تیۆری و ئیمپیریەکانی کاستێلس لەڕووی ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتوورییەوە شوێنیان دراوەتێ هەندێ ناوچە و شوێن و هەرێم و ولاتن کە گرنگی سەرەکی و بناغەییان بۆ چاخی زانیاری هەیە. ئەمەش بەمجۆرە کراوە. ڕوونکردنەوەێ وورد و بەرین بۆ ولاتەیەککگرتووەکانی ئەمەریکا و ولاتانی ڕۆژئاوا و ڕۆلی دامەزراوە نێودەولەتیەکان و کارگە مولتی ناسیۆنالییەکان. ڕوونکردنەوەێ بەرتەسك و ڕووکەش بۆ ولاتانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و بایەخێ باشتر بە ڕووسیا و خوێندنەوەێ جدی و ووریا بۆ یەکیەتی سۆڤیەت و ئاوڕێ قوول لە یابان، چین و ئەو ناوچانەی وەك ولاتهایەکی تازەگەشەکردووە دێنە ناو بازاڕی گلوبال کە ئەوەش ناوی زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیایی (تایوەن، سەنگافوورە، هۆنکۆنگ، تایلاند) لێنراوە. ئەلبەتە لەسنوورێ دیاریکراویشدا بایەخ بە ولاتانی ئەمەریکای لاتین و ئەفەریقاش دراوە.

ئەوەی کە کاستێلس لەم توێژینەوە گلوبالەدا بایەخی خستۆتە سەر ئەوەیە کە کۆمەلگەی (دەولەتی) زانیاری تەکنەلۆژی ببێ بە شوێنی دروستبوونی ڕەفاهیەت، بەلام ئەم ڕەفاهیەتە تەنێ لەتەك ئابووری نوێدا دەکارێ هاوڕێکابێ. بۆیە مەحرووم بوونی بەشێ زۆر لە چوونە ناو ئەم نێتەوە دوورکەوتنەوەشیەتی لە ڕەفاهیەتی ئابووری. تەنانەت ئەوانەش کە لە کۆمەلگەی زانیاری نوێدا لە بواری کەرتی تەکنەلۆژیای زانیاری کاردەکەن دانیشتوانی خودی ئەو کۆمەلگەیانەن و بێگانە و پەناهەندەکان نیین. ئەم کەرتە جارێ بەجۆرێ تایبەت ماوەتەوە و بەباشی ئینتگرێرەی(لە ئینتگرەیشنەوە وەرگیراوە- واتە یەکخستن) نەکردووە و تائێستاش لەگەلێ لە ولاتانی نێتۆرك دا بێگانەکان لەم کەرتە دوورخراونەتەوە و ئەو جۆرە خوێندن و پسپۆریەشیان دەستناکەوێ کە بتوانن بەئاسانی بێنە ناو نەك هەر ئەم کەرتەوە بەلکو هەندێ کەرتی تریشەوە. واتە نەك هەر کەرتی تەکنەلۆژیای زانیاری بەلکو ئەو کەرتانەش کە تایبەتن بە تەکنیکی گەیاندنی دیگیتال و کاری نەختی ئەلەکترونی و ئیشە بانقییە نێودەولەتیەکان و کار لە دامەزراوە نێودەولەتیەکان و کارگە مولتی ناسیۆنالەکان. کەچی کاستێلس پێیوایە کە ئەم کەرتە لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا زۆر مولتی ئێتنییە و ئەوانەی لەوێ لەم کەرتەدا کاردەکەن بەزۆری ئاسیاییەکانن. لە سەفەرێکیش بۆ ولاتی سوید دەرکی

بەوەکردووە کە ئەم کەرتە لەم ولاتەدا مولتی ناسیۆنال نەکراوە و بگرە زۆر سویدیشە، بەلام دانبەوەدا دەنێ کە ئافرەت ئامادەبوونێیاشی لەم کەرتەدا هەیە. (28). ئەم جۆرە کەرتانە لە ولاتانی نێتۆرکدا ئاوا بەئاسانی و بەپەلە نابن بە شوێنێ کە پێشوازی لە گشت کەسێ بەبێ جیاوازی بکا. یەك لەبەرئەوەی دیاردەی ڕق لە بێگانەبوون و دوژمنایەتی پەناهندە جارێ هەر لە گەشەدایە و، دووش لەبەرئەوەی کە باری سیاسی و ئابووری جیهان جارێ زۆر ناتەبا و نادادپەروەرانەیە و، سێش لەبەرئەوەی لەلایەك خودی بێگانە و پەناهەندەکان جارێ لە تەك خۆیاندا لەکێشەدان و بۆچوونی خۆیان بۆ ژیانی تازەی ئێستایان یەکلانەکردۆتەوە و لەلایەکی تریش باری ئابووری و زانستیشیان ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی کە خۆیان بۆ شەڕی چوونە ناو ئەم کەرتانە ئامادەنەکەن.

یەك لەو شتانەی کۆمەلگەی زانیاری نوێ لەتەك خۆیدا هێناویەتی نێتۆرکە کە ئەمەش بووە بە بناغە بۆ گەشەی ئابووری و ئەم گەشەیەش دەخوازێ ڕێگا لەبەردەم ئەوەدا بکاتەوە کە گشت جیهان بگرێتەوە و ئابورییێ ئەوتۆ دروستکا کە سەرووی دەولەتی بێ و جەوهەرێ واشی هەبێ لەکارکردنێ بەردەوام و هەمیشەیدا بێ و لەگشت شوێنێ ئامادەبێ. ئەم ئابوورییەش بەم خاسلەتانەوە ئەوەمان بۆ ڕووناکاتەوە کە ئێمە خۆمان لەناو ئابوورییێ تەبا و بێ کێشە و یەکانگیر دەبینینەوە نەخێر بەلکو گشت چالاکیی و کارکردن و ئامادەبوونێکی ئەم ئابوورییە بۆ ئەوەیە کە زۆرترین دەسەلات و گەورەترین دەستمایە بۆ خۆی لەگشت شوێنێ و بەبێ جیاوازی و بەبێ سنوور مسۆگەرکا.

بەدلنیایشەوە چ ئەم نێتۆرکە و چش ئابووریەکەی پێویستێ زۆری بە زێد یان مالێکە. ئەم پێویستیەش مانای سیاسی هەیە وەك لە ئابووری. بۆئەوەی شوێنێکیش دەستنیشانکرێ و بکرێ بە مالی ئەم نێتۆرك و ئابوورییە گلوبالە ئەوا کاستێلس دێ و باسیEU مان بۆ دەکا وەك مۆدێلێ لەسەر ئەم نێتۆرکە و ئەم ئابوورییە نوێیەش. واتەEU دەکا بە دەولەتی نێتۆرك و نموونەیەك لەسەر جوگرافیای چاخی زانیاری یان بەوەلامێك بۆ پرسیارە سیاسییەکانمان. واتە بۆ ئەو پرسیارانەی کە ئەگەر هەمانبێ لەسەر ئەوەی چ فۆڕمێ جێی دەولەتی ناسیۆنال دەگرێتەوە و، یاخود ئەو فۆڕمە سیاسیەیEU لە خۆیدا بەرجەستەی کردووە چ جۆرە کردەیەکی سیاسی لێوەبەردێ. چونکە کاستێلس پێیوایە بەهۆی گۆڕانە گلوبالییەکانی نێتۆرك نەك بەهۆی دەولەتی ناسیۆنال و دیموکراسیەتێ ترادیسیۆنال (تەقلیدی) دەکرێ شوێنێك بۆ کردەی سیاسی بدۆزرێتەوە.

بەمشێوەیە لەمماڵەدا دەوڵەتی ناسیۆنال جێی نابێتەوە و نێتۆرکێ نانێوەند پێوەندییەکان سەرپەرشتی دەکا کە لەتوانایدایە دەسەلاتیش لەنێوان ئەندامەکانی ئەم ماڵەدا دابەشبکا. ئەم دەسەلاتەش لەناوەرۆکدا سەرووی دەسەلاتی ناسیۆنال دەبێ و لە پرۆژەێ ئەوتۆش پێکدێ کە گوزارە لە ناسنامەی ئەورووپایی دەکا و بەپێی ئەوەش کە توانایێ ئابووری و زانیاری تایبەتی هەیە خۆشی دەکا بە بنکە بۆ وتاری جیهانگیری و سەرمایەداری نێتۆرکی گلوبال.

کاتێ کە باس دێتە سەر کۆمەڵگەی نێتۆرك و یان سەر سەردەمی زانیاری ئەلەکترۆنی نوێ و ڕۆلی ئەم شتانە لە دروستکردنی دەسەلاتی سیاسی سەرووی دەوڵەتی و بازاڕهایەکی بازرگانی ئاڵۆزی پڕ لە مەرج دەبێ ئاوڕدانەوێ بۆ باری ئابووری و کۆمەلایەتی ئەو کۆمەڵگانەی کە لە توانایاندا نییە بێنە ناو گۆڕەپانی گۆڕانکاریەکانەوە لەئارادابێ. بۆئەوەی ڕوونتر بدوێین دەڵێین، ئەو کۆمەڵگانەی لە دروستکردنی شۆڕشە زانستیەکان بەشدارنەبوونە و داهێنەری ڕاستەوخۆی زانیاری نوێی سەردەم نین لەگەڵێ ڕووەوە بێ بەش و مەحروومن لە مافی نەك هەر بەرهەمهێنان بەڵکو لە مافی بردنەڕێوە و دابەشکردنیش. سێستەمی ئابووری و تەکنیکی گلوبالیش دۆزێ ئەوتۆی هێناوەتەپێشێ کە ئەم مافانەی هاوشێوەی یەك کردووە و ئەوی لە یەکێکیان بێ بەشبێ ئەوا لەوانی تریش بێ بەشدەبێ. کەواتە بوون بە بەرهەمهێنەر واتە بوون بە بوڕێوەبەر و دابەشکەر و هەروەها ئەوەی کە بڕیار دەدا و مافی پەیڤین و گۆڕین و نوێنەرایەتی هەیە تەنێ ئەوەیە کە بەرهەمهێنەرە و. ئەو دابەشکردنەش کە لەپاڵ بەرهەمهێنانەوە دروستدەبێ شێوە دابەشکردنێ تازەیە و بەری ئەو گەشەیەیە کە بەهۆی نێتۆرکەوە جیهان تیکەوتووە. چونکە ئەم دابەشکردنە تەنێ لایەنی بەرهەم ناگرێتەوە بەڵکو لایەنی کار و سەرمایەش دەگرێتەوە. بەرهەم و کار و سەرمایەی ئەمڕۆش زۆر یەکانگیری یەکن و هەروەها یەکانبەستی یەکدیشن و مانا بەبوونی یەکتریش دەدەن. ئەمانە تەنێ بەرژەوەندی و مەبەستە هاوبەشەکانیان یەکیاندەخا و خەون و ئامانجە گلوبالییەکانیان ڕێك و کۆکیاندەکا. زۆربەی خەسلەتەکانی کۆمەڵگەی نوێش باس لەوەدەکا کە ناوەڕۆکی کۆمەڵگەی گلوبالی ئەمڕۆ لەو جۆرە میکانیزمانە پێکهاتووە کە لەسەرەوە باسکران. واتە ئەوەی کە چۆن بەرژەوەندی و ئامانجەکان تایبەت و دەگمەن دەکرێن و بەجۆرێکیش بەرهەمدێن کە هەموو کەسێ لەتوانایدا نەبێ لە بەکاربردن و سوودوەرگرتن لێی بەشداربێ. بەمجۆرە

دەکرێ بڵێین، لەگەڵ داهاتنی لۆژیکی کۆمەڵگەی گلوبال بەرژەوەندیگەریی دەکاتە ترۆپك و بە تاقمێکیشەوە تیبەتدەکرێ کە زۆر ئاساییە ئەم تاقمە لە یەك دوو کارگە یان لە چەند وڵاتێ یان دەستەێ دامەزراو و ڕێکخراوی دیاریکراو پێکهاتبێ.

گەر بڵێین کاریگەری تەکنەلۆژیای زانیاری بەسەر ئابووری جیهانەوە زۆر بەهێزە ئەوا هەڵەمان نەکردووە. هەروەها گەر ئەم ووتنە سنووردارکەین و تەنێ تایبەتیەکانی ئەم کاریگەرییە بەسەر ئەو ئابووریانەوە بەرباسخەین کە لەئاست ئابووری جیهان نین یان گەشەی تەکنیك نەیتوانیووە ئەو ئابووریانە بەهێزکا کە نەهاتوونەتە ناو ئابووری گلوباڵەوە. بەخۆی دۆزی ئابووری وڵاتانی دەرەوەی ئابووری گلوبال یان ئەو ئابووریانەی لەناو ڕووبەری ئابووری جیهاندا کاریگەر نین (دەکرێ ئەم جۆرە ئابووریانە ناوی ئابووری جیهانی سێشی لێنرێ) هەمیشە کۆمەڵێ پرسیاری گوماناوی ئامادەن لەسەر ژیانی ئابووری وڵاتانی ئابووری گلوبال و مەسەلەهایەکی گرنگن بۆ خستنەژێرپرسیاری دەولەمەندی ئەم ئابووریانە و بەرزی دەرامەت و ئاستی بووژانەوەیان. ئەو کەلێنەش کە لەنێوان ئابووری وڵاتانی بەدەرامەت و وڵاتانی دەرەوەی بازنەی دەرامەت و ڕەفاهیەت دا هەیە لەگەل هاتنەکایەوەی نێتۆرك و ئەم ئابووریە زانیارییاوییەی ئەمڕۆ بەرینتر و قووڵتر بوو. لەوە ناخۆشتر ئولریش بێك Ulrich Beck ووتەنی هەژارانی جیهان، ئەوانەی تازە و کۆنن، ئەوانەی هەژاریەکەیان بە میرات بۆماوەتەوە و ئەوانەی کە کۆمپیوتەرەکان وایلێکردوون هەژاربن بەزەحمەت دۆزی مەئیوسی خۆیان دەناسنەوە(29). بەلام ئەمە ئەوەمان لەبیرناباتەوە کە ئەو هەژارییەی کە هەمیشە لەبەردەم دەولەمەندی و ڕەفاهیەتدا باسێ بوو بەلەدایکبوونی تەکنەلۆژیای زانیاری نەك هەر بەبێ چارەسەر مایەوە بگرە هەژاری بەجۆرێ ئەوتۆ نەشونمای کرد کە تا گەیشتە ئەوەی سنووری جوگرافی کلاسیکی خۆی تێپەڕێنێ و بکەوێتە ناوچەکانی کۆمەڵگەی زانیاریشەوە، بەلام وڵاتانی دەرەوەی کۆمەڵگەی نێتۆرك تەنیا بەدەست هەژاریەوە نانالێنن بەلکە بەدەست بلاوبوونەوەی نەخوێندەواری، برسیەتی، نەخۆشی، بێکاری و چەندین فۆڕمی تر لە زولمی کولتووری و کۆمەلایەتی و ئابووری و مەزهەبیشەوە دەنالێنن و تادەگاتە ئەو دەردەسەریانەش کە بەهۆی ڕژێمە دیکتاتۆر و دیسپۆتیستەکانەوە(ستەمگەراکانەوە) دووچاریدەبن. بۆیە مرۆڤ دەتوانێ جیاوازی لەنێوان دیاردەی هەژاریی لە وڵاتانی نێتۆرك و خاوەنی ئابووری

نوێ و ئەو جۆرە هەژارییە بکا کە لە ولاتانی دەرەوەی نێتۆرک دا باون. هەریەك لەم هەژاریانە ناوەڕۆکێ جیای هەیە و ئاکامی کۆمەلایەتی خۆی هەیە. لێرەدا مەبەستمان ئەوە نییە کە واتای هەژاری پۆلکەین بەقەدئەوەی کە دەخوازین ئەوە ڕوونکەینەوە کە ئەو هەژاریەی ڕەفاهیەت و دیموکراسیەت دروستی دەکا لەو هەژارییە جودایە کە بێدەرامەتی و دواکەوتووی و دیکتاتۆریەت دروستیدەکا. ئەوی یەکەم بەجۆرێ دروستدەبێ و دواتر گەشەدەکا کە مانەوەی ئەوەندە ترسناك نییە. بەلام هەرچی ئەوی دووەمە ئەوە هەژارێ هەمبشەییە و هەژاری نەوە لەدوای نەوەیە. ئەوی یەکەم بەئاشکرا بەرخۆریی و زانیاریگەریی و ئابووریخوازی دروستیکردووە بەلام ئەوی دووەم قەدەرێکی میتافیزیکیە و چارەنووسێ کۆمەلایەتییە. بەلام هەردووش لەوەدا یەکدەگرنەوە کە بەهەلەبەکاربردنی شیاوییە ئابووری و کۆمەلایەتیەکان و ویست بۆ پارە و دەسەلاتێ ئابووری لەپشت دروستبونیانەوەیە. لە ولاتانی خاوەن ئابووری نوێ و زانیاری تازە سەرمایەداری زانیاریاوی گلۆبال بۆ بەردەوامبوونی پرۆسەی سەرلەنوێ خۆبوونیادنانەوە جۆرە گۆڕانکاریەکی دامەزراوەیی کردووە کە بتوانێ ماکیاجی ئەو کەلەکەبوونی سەرمایەیە بکا کە کەوتۆتە دەستی دەستەبژێرێکەوە، جا چ وەك چەند ولاتێ یان چەند کارگەیەك یان چەند کەسانێ. ئەمەش گەلێ فۆڕمی ئابووری و کۆمەلایەتی وەرگرتووە وەك مافی وەرکرتنی کرێی خانوو و پارەی تێچوونی گەیاندنی ناو شار و تادەگاتە مسۆگەرکردنی مافی تێچوونی خواردن و خواردنەوە و چوونە لای پزیشك و نەخۆشخانە. ئەم مافانەش تاڕادەیەك لەگەلێ ولاتانی نێتۆرك دا(ولاتانی یەکیەتی ئەورووپای) وەك یەکە. بۆنموونە لە شوێنێ وەك سوید (ستۆکهۆلم) ماوەیەکە دیاردەی سوالکردن سەریهەلداوە و تەنانەت لە زیادبوونیشدایە. ئەگەرچی دامەزراوە سیاسیەکانی ئەم ولاتە چارەسەری خۆیان لەمبارەیەوە بۆ ئەم دیاردەیە هەیە بەلام لەمحالەتەدا نابێ لەبوونی ئەم دیاردەیەش بەهەلە بگەین. چونکە دیاردەی ناوبراو لەناو تاقمێکدا بووە(ناوکۆتیکە و ئەلکولیستەکان) بە باو کە پارەی یارمەتی کۆمەلایەتییەکانیان بۆ مەبەستی تر بەکاردەبەن. کەوابێ ئەم دیاردەی سوالکردنە دەبێ لەو دیاردەی سوالکردنە جوداکرێتەوە کە لە شوێنێ وەك مۆسکۆ یان کوردستان یاخود سوریادا هەیە. لەم شوێنانەدا سواکردن فۆڕمێکە لەکارکردن و تاکە ڕێگایەکیشە بۆئەوەی مرۆڤ بتوانێ ڕۆژانە بژی. ئێمە کە لێرەدا سواکردنمان، وەك دیاردەیەکی ناو جیهانی هەژاری، بەنموونە هێنایەوە مەبەستمان ئەوە نەبوو کە گومان لە

بوونی ئەو هەژارییە بکەین کە لە ناوجەرگەی ولاتانی نێتۆرک دا لە نەشونمادایە. مەبەستمان ئەوەیە بلێین کە نێتۆرک لە توانایدایە هەژاری پەرتووبلاوکات و تا ڕادەیەك بێ سنوور و بێ جوگرافیاشیکا یان وایلێکا کە لەگشت شوێنێ ئامادەبێ. ئەوەتا لەناوجەرگەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا جیهانی سێیەك(کە کاستێلس بە *جیهانی چوار* ناویدەبا) لە دروستبووندایە کە زانیاریگەری و ئابووریگەری ئەم ولاتە بەئاسانی دەخاتەژێرپرسیارەوە. ئەم جیهانەش( کاستێلس بە جیهانی چوار ناویدەبا) کە جیهانێ تازەیە بەری ئەو گەشە ناتەبایەیە کە تەکنەلۆژیای زانیاری لەتەك خۆیدا هێناویەتی. هەروەها ئەم جیهانە ئەو مالە هاوبەشەیە کە گشت بێ کار، بێ شوێن(بەتایبەت لە ڕیزی منالان و پەکەوتوو و پیرەکان) و سۆزانی و دووچاربوانی نەخۆشی ئایدز و تاوانکاران دەگرێتەخۆی.
وێرای ئەوەی ووترا، ئەو هەژاریەی لە ولاتانی نێتۆرکدا هەیە لەلایەك بەهۆی کۆچ و هەلاتن لە ولاتانی جیهانی سێوە بەرەو ولاتانی گلوبال دەگوێزرێتەوە و، لەلایەکی تر خودی ئەو پاڕادیگمە نوێیەی تەکنیك لە ولاتانی ڕۆژئاوا کاری لەسەر دەکا لەتوانایدایە ویست بۆ پارە و ڕەوشتی ئابووریخوازی دروستکا کە ئەمەش لەکۆتایدا جۆرە هەژارێ لەگەل خۆیدێنێ. هەروەها ئەو پاڕادیگمە تەکنیکیە نوێیە توانای ئەوەشی هەیە جوانیەکی ئەوتۆی بە ژیانی ولاتانی ڕۆژئاوا بدا کە ئەم ژیانە لەلایەن خەلکانی غەیرە ڕۆژئاواییەوە زۆر سەرنجڕاکێشبێ و شوێنێکیش بێ بۆ پارە پەیداکردن و خۆبوونیادنان. بەلام لەناوجەرگەی ڕۆژئاوا خودی پاڕادیگمەکە بەجۆرێ ئەوتۆ کاردەکا کە نەك هەر ڕۆلی لە بەهەژارکردن و بەپەراوێزکردنی خەلکی جیاهنی سێدا دیووە بەلکو ڕۆلی لە کەمدەرامەتکردن و سنووردارکردنی توانای ئابووری بەشێ زۆر لە دانیشتوانی ولاتانی نێتۆرکیش دا دیووە. چونکە ئەم پاڕادیکمە تەکنیکیە نوێیە توانیوویەتی سەرمایە لەدەست تاقمێ نێتۆکرات و پسپۆری بواری نەخت دا کۆکاتەوە و، هەروەها ئەم بوارانە واشلێکا ببن بە شوێنێ یان سیمبۆلێ بۆ دەسەلات و هەبوون. ئەلبەتە بەشێ زۆر لەوانەی لە ولاتەکانی جیهانی سێوە وەك پەناهەندە ڕوودەکەنە کۆمەلگەی نێتۆرك نەخوێندەوار و بێ سەرمایە و یان خێزانهایەکی ئەندام زۆرن و، هەروا بەئاسانی هەر وا زوو ناتوانن لە ولاتانی نێتۆرك ببن بەدەستی کار و وەك دانیشتوانی ڕاستەقینەی ئەو ولاتانەی ڕووی تێدەکەن ناتوانن ببن بە خاوەنی ئابوورێ چەسپاو و جێگیر. هەروەها زۆرجار نەك هەر نزمی ئاستی نەخوێندەواریان دەبێ بە تەگەرە لەبەردەم

بەرەو پێشەوەنەچوونی باری ئابووریان بەڵکو خودی ئەو کولتوور و خووڕەوشت و ترادیسیۆنەی کە هەڵگرین ڕۆژ بە ڕۆژ دەیانخاتە دەرەوەی بازنەی ئەو ڕەفاهیەتەی ولاتانی نێتۆرك بۆ بەشێ دروستیدەکا. چونکە سێستەمی پێشبڕکێی ئابووری سەردەم بۆ ئەمان هەرس ناکرێ و تێگەیشتنە ئەفسانەیی و موراڵیەکانیشیان هەمیشە هۆیەکە بۆئەوەی کە لە گەڵ گشت شتێکی ئەم سێستەمە لە دووبەراکایەتیدابن. هەرچی پێوەندی بەو زانیاری و زانینە نوێیەشەوەیە کە کارگە تازەکانی نێتۆرك داوای دەکەن نەك هەر لای خەڵکی ولاتانی جیهانی سێی دانیشتووی ڕۆژئاوا نییە بەڵکە لای بەشێ زۆر لە خەڵکی ولاتانی نێتۆرکیش نییە(30). لەلایەك ئەم زانیارییی و زانینانە بەخۆیان نوێن و پێویستیان بە خوێندنێ بالا و دەگمەن هەیە و، لەلایەکیتریش خەسلەتی ئەم جۆرە پاڕادیگمە بەجۆرێ دروست بووە کە ناکرێ گشتیکرێ و لەوەدرچێ کە بۆ دەستەبژێرێ نەبێ. بۆیە بۆ هەموو خەڵکی ولاتانی نێتۆرك نالوێ ببن بەو دەستەبژێرەی کە بەهۆی ئەم جۆرە پسپۆرییەوە ئەو هەموو سەرمایە و دەسەلاتە لەبەردەستیانداکۆبێتەوە. بۆیە بەرامبەر بەکێشەی ئەو نەخوێندەوارییەی لە ولاتانی دەرەوەی بازنەی نێتۆرك دا بلاوە ئاساییە باس لە کێشەی ئەو خوێندەوارییە باوە کرێ کە لە ولاتانی نێتۆرکدا بلاوە و بەشی ئەوەناکا کە کەسەکان بەهۆیەوە بتوانن کاری باشیان دەستکەوێ و یا لەو جۆرە کارگانە کاریان دەستکەوێ کە دەرامەتی چاك و جێگیرییەکی ئابووری بۆ کەسەکان مسۆگەردەکەن. کێشەی ئەوەش لەولاوە بوەستێ کە چۆن ئەم جۆرە کارگانە زوو زوو گۆڕان دەخەنە سیستەمی بەرهەمهێنان و گۆڕینی ئاستی چەندایەتی بەرهەمەکانیانەوە و بۆئەم مەبەستەش دەکەونە کەمکردنەوەی دەستی کار و خۆڕێکخستن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری. بۆیە دەشێ ئەم لایەنە وەك هەڕەشەیەك بۆ سەر دەستی کار تەماشاکرێ و لەگەڵ قوولبوونەوەی جیهانگیری ئابووریش ئەم لایەنە ئالۆزتربووە و ئەم لایەنە هەر هەڕەشە نییە بۆ سەر دەستی کاری ناشارەزا بەڵکو هەڕەشەشە بۆ سەر دەستی کاری شارەزاش. ئەمەش بەپێی ئەوەی زۆربەی کارگە گەورەکان بەشێ گەورە یان هەموو بەشەکەیان بەرەو ئەو شوێنانە دەگوێزنەوە کە نەك هەر مەوادی خاوی تیا هەرزانە بەڵکە دەستی کاری شارەزای هەرزانبشی لێدەستدەکوێ و زۆرجاریش لەبەرئەوەی مەسەلە یاسایی و ئینسانییەکان ئەوەندە بەووردی گەشەی نەکردووە خۆیان بەگەلێ ماف(مافی بێکاری، مافی مرۆڤ، مافی پاراستنی ژینگە و. . ) نابەستنەوە.

زۆربەی ئەوانەی لەسەرەوەش باسکران لەوە بەئاگامان دێنێتەوە کە گەشەی پەلەی تەکنیك لە ئەوڕۆدا شایانی ئەوەیە بۆ گشت کەسێ ببێ بە شوێنی تێڕامانی گەورە و بواری خولقانی پرسیاری جۆربەجۆر لەسەر ژیانی ئێستا و ئەوی دێ. هەروەها هاتنی ئەم گەشە تایبەتە و ئەم شەپۆلە لە گۆڕانکاری داوای خۆگونجان و خۆڕێکخستن لەگشت کەسێ دەکەن و دۆزێ ئەوتۆیان لەجیهانا هێناوەتە پێشێ کە دابڕان و خۆ دوورەپەرێزکردن لێی نەك هەر هەژاری و دەستکورتی لێوەوەبەردێ بەڵکو دەبێتە هۆی دروستبوونی ئافات و گرفتی کۆمەلایەتی و ئابووری و تەنانەت کولتووریش. خۆ گونجان و خۆ تەباکردن لەگەڵ تەوژمی گۆڕانکاریەکان مانای بردنەوە نییە و دوورەپەرێزبوون و دوورکەوتنەوەش لێی هەر هەمان مانای نییە. ئەم تەکنیکە نوێیە و زانیارییە تازەیەی لە خۆ گشتیکردندایە جۆرە ڕەوشت و ناوەڕۆکێکی لەتەك خۆدا هێناوە کە دوژمنی سەرسەختی دابڕانە. ئەو زانیاری و زانینەی ئابووری سەردەم کاری لەسەردەکا بەجۆرێ کەوتۆتە خۆ سەپاندن و خۆ جیهانیکردن کە لە قەدەر قەدەرتر خۆی نیشادەدا و زۆرترین توانا و شیاویشی لەبەردەمدایە کە بتوانێ چارەنووسمان دەستنیشانکا. بۆهەموو ئاشکرایە کە ئەم گۆڕانکاریانە ناتوانن ئەو وێنەیامان لادروستکەن کە تەنێ خۆشیمان بۆدێن و ئەو ترسەشمان لادەبەن کە سەبارەت بە گشت شتێ نوێ و گۆڕانێ تازە هەمانە. ترس لە تەکنیك و ئەو گەشەیەی بەهۆی تەکنیکەوە دروستدەبێ، کە دواتر ئەوەش گۆڕانکاری دروستدەکا، شتێ نوێ نییە و هەمیشە بابەتی باس بووە. بەلام ئەمڕۆ ترسەکە جەوهەری تری لە خۆدا بەرجەستەکردووە و گومان و پرسیاری دی بەرهەمهێناوە کە زۆربەیان تایبەتن بەو لایەنانەوەی کە سەفەری بەردەوامی گەشە پووچدەکەن و ئەو خۆشباوەڕی و دلنیاییە هەلدەوەشێننەوە کە گەشەی نوێی تەکنیك دەخوازێ لای هەموان دروستیکا. ئارەزووی تەکنیك بۆ دروستکردنی خۆشباوەڕی و دلنیایی بەشێ گەورەیە لە پێداویستیەکانی تەکنیك و کاکلی وتاری تازەی تەکنیکی ڕۆژئاوا یان ئەوە ئەو نهێنیەیە کە پاڕادیگمەکانی تەکنیك هەمیشە لەسەری ژیاوە. ئەم نهێنییە گەورەترین هەولی بۆ ئەوەیە کە بەهیچ جۆرێ نە گۆڕانکاریەکان بخاتە ژێر گومانەوە و نەش قسە بێنێتە پێشێ لەسەر ئاینده و ئەوەی پێیدەوترێ چارەنووسمان. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەم تەکنیکە تازەیە زۆر باوەڕی بەخۆیەتی و زۆر دلنیایە لەوەی کە ئێمەی بەئارەزووی خۆمان فڕێدەداتە ناو شیاویی تازە و گەرانتی نوێوە و بۆیە هەر لەبەرئەمەش هەرگیز ئامادە نییە هیچ

تەماشاكردن و بیركردنەوەیەكی تر جیا لەوی تەكنیك بەرهەمی دێنێ پەسەندبكا. وانە پاڕادیگمی تەكنیكی نوێ كە ئابووریخوازی زانیاریاوی لەگەل خۆدا هێناوە ئەوە بەڕاست نازانێ كە لەكاتێ كە توێژینەوە لەسەر گۆڕانكارییەكان دەكەین بەدووی ڕێگا چارەی سیاسی و كولتووری و سۆسیۆ-ئابووریدا وێلبین و باوەڕمان بەوە هەبێ كە ئەم پاڕادیگمە نوێیە توانای دروستكردنی ناتەبای و چەوسانەوەی ئابووری و دابڕانی كۆمەلایەتی هەیە. كەوابێ ئەوە گەشەی تەكنیكی نوێیە كە گۆڕانێ ئالۆز و كتووپڕی لە كۆمەلگادا دروستكردووە و بووەتە هۆی ئەوەی كە ژیانی مرۆڤ بەرەو گومڕایی و ئالۆزكاوییەك بیا كە كاریگەری بەسەر زۆربەی دیاردەكانی ناو ژیان و بوونمانەوە بەجێبهێلێ. ئەم گۆڕانانە كە هەر لەسەرەتاوە ئامانج ئامێز و مەبەستداربوونە هۆكاری تێكڕای جودایی و ناچوونستیەكانن. ئەوی ڕوویداوە لەژێر ناوی گۆڕان بەخۆی ئەو داڕشتن و خولقانە نوێیە دەگمەنە بووە كە تەخشەی بۆداتراوە و دواتر بەوردترین شێوە سەرپەشتیكراوە و هەولی پیادەكردن و بەگشتیكردنیشی دراوە. ئەمەش بەئاسانی ئەو بارودۆخە شاربازی و سیاسی و ئابووریەمان دێنتە وە یاد كە لە سالانی هەفتاكانا لە شوێنێ وەك ولاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا هاتووەتە پێشێ و ئەم شێوازی بەرهەمهێنان و بڕدنەڕێوەیەی سەپاندووە و كردووشیەتی بەتاكە ڕێگاچارەێ لەبەردەم ئەمەریكایەكان تا بتوانن خۆ لەودۆزە دەربازكەن كە لەماوەی سالانی شەست و هەفتاكانا جیهانی سیاسی(دوای هاتنەدەرەوەی جیهان لە جەنگی جیهانی دوو) و ئایدیۆلۆژی(پاش قوولبوونەوەی جەنگی سارد) و ئابووری (بەرزبوونەوەی نرخی نەوت ) تیای ژیاوە. ئەمانە هەموو وایان لە ئەمەركایەكانكرد بیر لە هێنانەكایەوەی پاڕادیگمی تەكنیكی نوێ بكەن و بەرەو ئەو ئاستەش لە گەشە بیبەن كە لەلایەن هیچ دیاردەیەكەوە هەڕەشەی لێنەكرێ. ئەم پاڕادیگمە تەكنیكییە نوێیە شیاویی و بارێ ئەوتۆی بۆ ولاتە یەككرتووەكانی ئەمەریكا خولقان كە ببێ بە شوێنی كۆبوونەوەی سەرمایە و دەسەلات و زانین.

# نیگەرانیی گلوبال و ئایندەی گرفتئامێز
## گلوبالیتێی تازەگەری سیاسی و کۆچەری مرۆڤی تازە

بیر و جیهان لەتەك یەكدا لە پێوەندیدان. ئەم پێوەندیەش ئاسان نییە لێرەدا هەولی ڕوونكردنەوەی بدرێ. هەموو ئەوەی كە مرۆڤیش، بەتایبەت مرۆڤی تازە، دەینووسێ بۆئەوەیە كە لەبارەی خۆیەوە بدوێ. بەلام گەلێ لە بیرەكانی مرۆڤی تازە مانایان بۆ ئەم پێوەندییە دروستكردووە و بەهایان بۆ قووتكردۆتەوە. ئەمەش ئەو عەدەمیەتە نوێیەیە كە مرۆڤی تازە دەستبەرداریناببێ. ئالێرەوە دەكرێ باس لە نیگەرانییكرێ. واتە غەدری مانادان بە ژیان و بەها دروستكردن بۆ بوونمان. زۆربەی ئەو تیۆریانەش كە ئەم كارەیان كردووە زۆرترین بەرپرسیاریەتی ڕەوشتی و ویژدانیان دەكەوێتەسەر. ئەوەتا سەرگەردانێكی بێ تخووب بوونمانی داگیركردووە و باسی پێكدادانی شارستانی و جیاوازی نێوان بەها ئاینی و كولتووریەكان بوونەتە بناغە بۆ زۆربەی كێشەكان و بەیەكاچوونەوەكان. ئەمە ئەو ڕاستیەیە كە لەمەولا تیای دەژین. بەلام پێویستیێ زۆریشمان بە گۆڕینی ڕوانینمان لەبارەی ڕاستیەكانی ژیانمانەوە هەیە. بۆئەوەی ڕوانینیشمان لەبارەی ڕاستیەكانەوە بگۆڕین پێویستمان بەوەدەبێ كە پێوەندییێ بووناوی نەك ئێپستمۆلۆژی و لۆژیكی لەتەك ئێستامان دروستكەین. ئەم پێوەندیە بووناویەش ڕاستیێ دژمان بۆ دابیندەكا كە ئێستامان زۆری پێویستە. ڕاستیێ دژیش نایێتەدی گەر فەلسەفێ دژ تایبەت بە ژیان دروستنەكەین. ژیانمان كە دەستبەرداری ڕاستی بووە ئاوا بەئاسانی ناتوانێ نە ئەم فەلسەفە دژە دروستكا و نەش پێوەندییێ بەجێ و تەندروستی لەتەك واتای ڕاستیدا دروستكا.

ڕاستی بوونیشمان كەوتۆتەناو چاخێ زانیاری ئامێزەوە كە بەرەو ئەو تێڕامانانەمان دەبەن كە بۆلەمەولا لە نیگەرانی دا بژین و ئەم نیگەرانیەش ناوچەیی یان لۆكالی نییە و بەلكو دیاردەێ گلوبال و سەرتاسەرییە. بەشێ زۆر لە نیگەرانیەكە سەرچاوە لەوەوە دەگرن كە ڕۆژانە لەسەر ئەوە ڕادەهێنرێن كە لەگەل تەوژمی سەرمایەداری گلوبال دا بژین و سل لە موغەمەراتەكانی ئابووری گلوبال نەكەین و لەوە تێخوردنەبینەوە كە تەكنیكی نوێ بەرەو

کوێماندەبا. لەھەمانکاتدا کەسەکان و گرووپەکان لەگشت شوێنێکدا بەدووی ئەو وەلامانەدا دەگەڕێن کە بشێ بۆ وەلام دانەوەی ئەو پرسیارە ڕۆژانەییانە بەکارببرێن کە بەمجۆرە دەستپێدەکەن: بۆ ئەم نیگەرانییە؟ بۆ دەبێ دوا قەدەری مرۆڤی تازە نیگەرانی بێ نەك شتێتر؟ ئەم نیگەرانیە لە پاداشتی چی؟.
ئێمەی مرۆڤی چاخی زانیاری دەبێ ھەمیشە لە چاوەڕوانی ئەو وەلامانەدا بین کە لە ئاشووب و ڕاڕاییەکان دەربازمان دەکەن و دەتوانن بین بە وەلام بۆ پرسیارە گرفتئامێزەکان. یان دەبێ وێلی ئەو پرسیارانە بین کە میکانیزمی ئاشکراکردن و والاکردنیان لە ناخی خۆیاندا چاندووە. تەنێ ئەو جۆرە میکانیزمانەش دادی مرۆڤی تازە دەدەن، مرۆڤی تازە، مرۆڤی چاخی زانیاری، پێی سەیرە بەم ئاکامە گەیشتووە و، ھەروەھا بەلایەوە شتێ نوێیە کە دوای ھەموو ئەو دۆزینەوە و داھێنانۆ و تازەگەریانە بەم چارەنووسە گەیوە. ئەلبەتە ئەمەش کارەساتێ ترە کە مرۆڤی چاخی تازە لەوەنەگا کە چی بەمەی گەیاند و چۆن بەمە گەیی. ئەمەی پێیگەیشتووین دەرئەنجامێ بەرچاویی ئەوەیە کە لە ڕابردوو کردوومانە. ڕابردوومان لە کۆلمان نابێتەوە و دەستبەرداری ئێستا و لەمەولاشمان نابێ. بۆیە بۆئەوەی لەم نیگەرانییە بگەین دەبێ ئاوڕێ لەو عەدرانە بدەینەوە کە ھەموو پێکەوە دژ بەیەك ئەنجامماندا‌وە. جارێ بەناوی ناسیۆنالیزم جارێ بەناوی ئینتەر ناسیۆنالیزم ھەروەھا جارێ بەناوی پەیڤە ئاسمانیەکان و جارێ بەناوی پەیڤە عیلمانیەکانەوە. بەواتاێ تر، ڕابردوومان تەنێ داھێنان و دۆزینەوە نەبووە بەلکو کوشتار و جەنگ بەیانکردن و شاربەدەرکردن و دوور خستنەوەی یەکتریش بووە. چەند ئەوەندە بەناوی زانستەوە کراون ھێندەش بەناوی ئاینەوە ئەنجامدراون (31). ئەو ملیرنەھایەی لە سەدەکانی ناوەڕاست بەناوی ئاین و بلاو کردنەوەی مەسیحیەت یان ئیسلام لەناوچوونە کەمتر نین لەو ملیۆنەھایەی ئایدیۆلۆژیا تازەکان (ناسیۆنالیزم، فاشیزم، کۆمۆنیزم) و تەکنیکی نوێ بوونەتە ھۆی لەناوبردنیان.
بەلێ لە ژێرسایەی ئایدیۆلۆژیای زانست لە نیگەرانیدا دەژین و ڕۆژانە بەناوی دۆزینەوەکانەوە پتر وابەستەی زانستی تازە دەبین و وابەستەبوونیشمان بەچەندین شێوازی جیا بەمرۆیی و بەڕەوشتی دەکرێ. نادادپەروەریەکان و نایەکسانیەکانیش کە ئەمڕۆ لەگشت شوێنێ وەك پەتا بلاوبوونەتەوە وامان لێدەکەن ڕەخنە ئاڕاستەی گشت ئەو ڕێباز و سێستەم و بیرانە بکەین کە بەم ڕۆژەیان گەیاندین و ئەم نیگەرانی و پەشێویەیان لەناخماندا دروستکردوە.

لەحالەتەدا و بۆئەوەی پتر لە کاستێلس نزدیکببینەوە دەکرێ باس لەسەر سێستەمی سەرمایەداری کە ئێستا ناوی وەك سەرمایەداری نوێ و سەرمایەداری گلوبال و سەرمایەداری زانیاری و یان قۆناغی پاش- سەرمایەداری لێدەنرێ بێنینە پێشەوە. ئەمەش لەبەرئەوەی لەلایەك سەرمایەداری لە کۆتاییدا ئەو هەول و کۆششە تاکی و دەستەجەمعیی یان ناوخۆی و جیهانییە یە کە ئەمڕۆ لەئارادایە بۆ دۆزینەوەی ڕێگای نوێ بۆ دروستکردنی پارە و یان ماناداں بەژیانی ماتریالی و بەگشتیکردنی بەرخۆریی و کردنی ئەمەش بە باوترین ڕەوشت بۆ مرۆی سەردەم. لەلایەکی دی کاستێلس لە توێژینەوەکانی سەبارەت بە چاخی زانیاری جەغت لەوەدەکا کە سەرمایەداری لەپشت هاتنەکایەوەی ئەو فۆڕمە زانیارییە نوێیەوەیە کە دەخوازێ پلانێتی ئەمڕۆمان بگۆڕێ.

کێشەکە دیارە لەوەدایە کە هەموو دانیشتوانی سەرزەوی وەك یەك ناتوانن بەری ئەم بەرخۆرییە بخۆن و ئەوی پێیدەلێن پارە بتوانن بەدەستیبهێنن. چونکە سەرمایەداری ناخوازێ/ناهێلێ ئەمە سەربگرێ. بەهۆی دروستکردنی " ئۆتۆنۆمی ئیندڤید"ەوە سێستەمێ کۆمەلایەتی پەرت و پاڕادۆکسالی دروستکردووە. ئەم سێستەمەش ئەو گەشە ئابووری و جێگیری کۆمەلایەتی نوێیەی بەبەردەوام مێدیاکانی ولاتانی نێتۆرك باسی لێوەدەکەن دەخاتە ژێرپرسیارەوە. لێرەدا نابێ بەهەلە لە واتای سەرمایەداری بگەین و پێمانوابێ کە ئەم واتایە تاکە واتای بەرامبەر و دژی واتای سۆسیالیزمە. لەبەرئەوەی ئەم واتایەیە بۆ گوزارەکردن لە سێستەمێ سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی بەکاردەبرێ کە مۆنۆپۆلی گشت فۆڕمەکانی ڕەوشتی مرۆڤی تازەدەکا. دواتر بۆ دەبێ پشت لە بەکاربردنی ئەم واتایە بکرێ کە لە کاتێکدا هەموو میکانیزم و دیاردەکانی ئەم واتایە ماون و خەریکی سەرلەنوێ خۆ بەرهەمهێنانەوەشن. بۆنموونە ڕووداوە سیاسیەکانی ولاتانی ئەوروپای ڕۆژهەلات و مەسەلەی ئاوابوونی دیاردەی کۆمۆنیزم کاریگەری خۆی هەبوو کە قسە بێتە پێشەوە لەسەر مەرگی مارکسیزم و ئاوابوونی سۆسیالیزم. وەکیتر ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی کە کەسێ وەك دریدا باسێ تایبەت بەم مەسەلەیە بەردەست ڕووناکبیرانی جیهان بخا و پرسیاری بۆ مەرگی مارکسیزم بهێنێتەپێشەوە. کتێبی" تارمایەکانی مارکس" ی دریدا هەولێ باش بوو بۆ کارکردن بۆ ڕوونکردنەوەی جیهانی نوێ و بیری مارکسیزم. ئەوی دریدا لەو کتێبەیدا خستییەڕوو ئامانجی دیاریکراوی خۆی هەبوو و ئاکامی تایبەتیشی بەرهەمهێنا

که ئێره شوێنی باسی نییه(32). بەلام بەکورتی دەکرێ ئەوه یاددخەینەوه که ناوبراو ئەیەوێ ئەوەمان لابەرجەستەکا که لەلایەك بۆ دەبێ قسه لەسەر مەرگی بیرێ بکرێ که ئامانجی ڕوونکردنەوەی جیهان بووه و ئەو ڕوونکردنەوانەش که لەوبارەیەوه دراون تا ئەمڕۆش بۆ گەیشتن له کێشه و کارەساتەکان، که ڕۆژانه دێنه سەر مرۆڤ و هەر بەردەوامن و بگره به تازەترین و به ئالۆزترین شێوەش خۆ بەرهەمدێننەوه، پێویستن. لەلایەکیتر ئەم بیریاره توانی خۆشی لەو تەوژمه جوداکاتەوه که بیریارانی ولاتەکەی پێوەی سەرقالبوون(33).

هەر ئەم لایەنه، واته باس لەسەر سێستەمی سەرمایەداری گلۆبال، هۆکارێ سەرەکیشه بۆ قسەکردن لەسەر سێستەمی نوێی نێودەولەتیش که ئەمڕۆ بووه به پالپشتێ گەورەی دیموکراسی لیبرالی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا. بۆئەوەی لەم بارەیەشەوه بدوێین بەپێویستی دەزانین جەغت لەوەبکەین که ئەوی پێیدەلێن ئابووری تازه بەخۆی بناغەیه بۆ ئەم سیستەمه و بەرپرسیاریشه له دروستکردنی هەندێ دیاردەی ترسناکی وەك ڕەگەزپەرستی و کەمدەرامەتی و دەستکورتی. هاتنی دیموکراسی لیبرالی ڕۆژئاواش ئەو چارەسەرەی بەدەستەوه نییه بۆ کۆمەلگەکانی تر وەك ئەوەی چاوەڕواندەکرا. بگره لەناو خۆشی زۆرترین کێشەی بەبێ چارەسەر هێشتوەتەوه و مرۆڤی تازەی ڕۆژئاواشی دووچاری گەورەترین پەشێویی و نادلنییایی کردووه. ئەو مۆدێله ژیاریەش بەهۆی سیاسەتی نیولیبرالیزمەوه پیادەدەکرێ هەولی فەرامۆشکردنی گشت فۆرمێکی تری ژیان و بیرکردنەوه دەدا. ئەلبەته جیهانگیریش ئەو تەوژمه ئابوورییەیه که زۆر لەتەك ئەم سێستەمه سیاسیه نێودەولەتییه نوێیەدا هاوکۆکه و ئومێدێ گەورەشه بۆ موغامەراتەکانی. ئاسان نییه مرۆڤی کۆمەلگەکانی تر لەوه بگەن که ئەزموونی دیموکراسی لیبرالی بەرهەمی کولتوورێ سیاسی تره و لەتواناشیدایه دۆزێ کولتووری ئەوتۆ دروستکا که ببێته هەوێنی گەلێ ململانێ و بەراوردکاری. ئەو دیارده سیاسی و کۆمەلایەتییه دزێوانەش (وەك جەنگ، هەژاری، بێکاری و. . ) که دیموکراسی لیبرالی لێیبەرپرسیاره ئەو مەدەنیەته دەخاته ژێرپرسیارەوه که مرۆڤی تازه تیایدەژی. خستنەژێرپرسیاری ئەو مەدەنیەتەش به پلەی یەك گومانکردنه له واتای دیموکراسیەت، ئەو واتایەی بووه به وێردی سەر زمان، و به پلەی دووش دیاریکردنی ماهیەتی تازەگەرییه یاسایی و سیاسیەکانی چاخی نوێیه. بەمه نابێ ئەوه لەیادکرێ که دیموکراسی سیاسی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا بەری سێ جۆره پەرەسەندنه که

شارستانی ڕۆژئاوا بەخۆیەوە دیوویەتی. لەم بارەیەشەوە دەچینەوە سەر تێگەیشتنی ڕۆبیرت دالسRobert Dahls کە پێیوایە مرۆڤ دەتوانێ لە گفتووگۆی دیموکراسی مۆدێرندا جیاوازی لەنێوان گەشەی سێ دیموکراسیدا بکا: یەکەم، دیموکراسی دەولەتی ئەنتیك (یۆنانی کۆن)، دووەم پێشکەوتنی دیموکراسی ناسیۆنال لە سەدەی نۆزدەدا و سێهەم ئەوەیە کە ئەمڕۆ بە باوەڕی ناوبراو چاوەڕوانین- واتە ئەوەی پێیدەووترێ شۆڕشی دیموکراسی گلوبال (34). بەلام دەشێ ئەوەش بووترێ کە دیموکراسی گلوبال هەلگری سەرجەم پاڕادۆکسەکانی مێژووی دیموکراسی ڕۆژئاوایە و لەو گرفتانە بەرپرسیشە کە دووچاری مرۆڤی سیاسی هاوچەرخ بووە. هەروەها بەو هەموو ئەزموون و ڕابردوەشەوە دیموکراسی ڕۆژئاوا ناتوانێ ئەو ڕەفا و ئازادیەی هەمیشە باتگەشەی بۆ دەکا بپارێزێ.
ئێمە لێرەدا دەمانەوێ باس لەوەبکەین کە دیموکراسیەتی مرۆڤی تازە نەبووە بە بوارێ یان ئامرازێ بۆ ئاشکراکردن و پەردە لابردن لەسەر ڕاستیەکان. نەك هەر لەبەرئەوەی ئەم دیموکراسیەتەی مرۆڤی تازە خۆی بووە بە ڕاستیەکان بەلکو لەبەرئەوەش کە مرۆڤی تازە جگەلەو دیموکراسیەتە شتێ تری نییە شانازی پێوەبکا. کۆی ئەو پرسیارانەش کە ئاڕاستەی ڕاستی دەکرێ لەئەمڕۆدا ئاڕاستەی دیموکراسیەت دەکرێ کە شوێنی گشت ڕاستیەکانی گرتۆتەوە. بیەلام مرۆڤی تازە بۆ لەخۆی ناپرسێ کە دیموکراسیەتی بۆچییە. کاتێکیش مرۆڤی تازە لەوەدەگا کە دیموکراسیەتی بۆ چییە ئەوکات لەوەشدەگا کە دەتوانرێ چی بە دیموکراسیەت بکرێ یان چۆن داواکانی خۆی پێبارکا.
ڕەخنە گرتن لە مۆدێلی دیموکراسی لیبرالی ڕۆژئاوا بەمانای پەسەنکردنی ستەمکاری نایێ بەلکو بەمانای لەلایەك ڕەتکردنەوەی گشت فۆڕمەکانی دەسەلاتی دیکتاتۆری دێ و هەروەها پاکژکردنی ئەو دوانەییەش دێ کە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا لەسەری دەژی. ئەمە بەباوەڕی ئێمە بناغەێ چاك بۆ ئەو دیموکراسیەتە نوێیە دادەنێ کە دوای لاوازبوونی تەوژمی یۆتۆپیای جیهانگیری ئابووری لەدایکدەبێ. هەروەها دیموکراسیەتی ڕۆژئاوایی ناتوانێ لەدەرەوەی ڕۆژئاوا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ گەر لە ناو خودی ڕۆژئاوا چارەنووسی خۆی دیارینەکا و ڕۆژئاواش ئامانجی خۆی لە مامەلە لەتەك ئەوانی تر یەکلانەکاتەوە. چونکە ئەوە تازەگەری سیاسی نییە کە ڕۆژئاوا تیای دەژی کاتێ زمانی سیاسی کەوتۆتە پەراوێزی زمانی ئابووری و هەروەها

ئەوی پێیدەڵێن هاوڵاتی برتییە لە سوبژێکتێ سیاسی و یاریەکیشە بەدەست پێشبڕکێ ئابووریەکانەوە(35).
ئێمە پێمان وایە وتاری تازەگەری سیاسی ڕۆژئاوا ناکاریگەر و بێ ئایندە دەبێ کاتێ کە دیموکراسیەتەکەی ئەم وتارە پڕ لە مانا نەبێ و ئەو سیاسەتە سەرپەرشتی نەکا کە ئیدیالی ژیان دەگۆڕێ و واڵە مرۆڤیش نەکا کە شادبێ. ئەو دیموکراسیەتەی مرۆڤی تازە دروستی کردووە ستەم و دەستکورتی لە بەشێ لە جیهان بەخێودەکا و لە بەشەکەیتریش بەرخۆریی و خۆپەرستی دەچێنێ. ئەمە ئەو عەدەمیەتە تازەیەیە کە یۆتۆپیای جیهانگیری ئابووری بۆیهێناوین. بەڵام سەختە لە ئەمڕۆدا ئەو باوەڕە لەناو خەڵکدا گشتیکرێ کە تازەگەری سیاسی ڕۆژئاوا لە عەدەمیەتێ سیاسی و کۆمەڵایەتی زیاتر هیچ شتێ تری بەرهەم نەهێناوە. ئەو تازەگەرییە سیاسیەش یان چاترە بڵێین عەدەمیەتی سیاسی ڕۆژئاوا هێندەی هەندێ ڕوناکبیری سیاسی و یاخود ئەو نووسەرانەی بنەچەی ڕوناکبیریان ڕیشەێ ئایدیۆلۆژی و سیاسی هەیە بناغەی بۆداناوە هێندە سەرۆکەکانی ولاتانی ڕۆژئاوا ئەو بناغەیەیان بۆدانەناوە. ئەو گفتووگۆ سیاسیە پڕاکماتیانەی لە سەرەتای سالانی1990کان لەبارەی ناوەڕۆك و ئاڕاستەی دیموکراسی ڕۆژئاوا لەژێر کاریگەری تەماشاکردنە سیاسیەکانی بۆنموونە کەسانێ وەك فۆکۆیاماFukuyama (خاوەنی تێزی کۆتای مێژوو) و دواتر ساموێل هۆنتیگتۆن Samuel Huntington ( خاوەنی تێزی پێکدادانی شارستانیەکان) هاتنەکایەوە زەرەرێ زۆریان لە پێوەندییە کۆمەڵایەتی و کولتووریەکاندا و کاریگەریێ نێگەتیفیشیان بەسەر دێیاتە ڕووناکبیرەکانەوە بەجێهێشت. ئێمە لە چەند شوێنێکدا(36) باسمان لە ئوسولی ئایدیۆلۆژی بیری فۆکۆیاما کردووە بەڵام لەچوارچێوەی ئەم باسە دا دێینەوە سەر هەندێ بۆچوونی ئەم ڕوناکبیرە کە ئەوندە خۆ لە گوزارەی کۆتای مێژوو کە تێمایەکی پاش-مێژووە نادەین. چونکە گوزارەی کۆتای مێژوو یان هەندێ گوزارەی تر کە پێشگری کۆتای (پایان) بەخۆگرت بەجۆرێ کاریان لەسەر کرا کە بوون بە دیاردەهایەکی ئایدیۆلۆژی. پێش ئەوەش کە بێینە سەر ئەم لایەنە ئەوەش یاددەخەینەوە کە کاستێلس وەك کۆمەڵناسێ ئەمەریکی نە وەك هەندێ ڕوناکبیر و بیریار کەوتۆتە ژێر سیحری سیاسەتی دەوڵەتی ئەمەریکی و نەش بناغە بۆ وتاری سیاسی ئەمەریکی دادەنێ، کە ئەمە(واتە کەوتنە ژێر سیحری سیاسەتی دەوڵەتی ئەمەریکی و هەروەها بناغە دانان بۆ وتاری سیاسی ئەمەریکی) بەخۆی ئەمڕۆ بووە بە ڕەوشتێ باوی زۆربەی نووسەر و ڕۆژنامەوان و

ئەکادیمیکەران. لە هەمان کاتیشدا کاستێلس هەر لەسەرەتای توێژینەوەکەیدا باس لەوە دەکا کە ئەو نە لەگەڵ تێمای کۆتای مێژووە و نەش لەگەڵ هەندێ بۆچوونی هیچەگرا و سینیستی(بێ ئاینده، بێ خەیال) دایە.
لەڕاستیدا دوای هەڵوەشانەوەی کۆمۆنیزم فۆکۆیاما کەوتە باسکردن لە "کۆتای مێژوو"، بەواتای ئەوەی کە دیموکراسیەتی لیبرالی بووە بە تاکە ئیدیالێکی مرۆیی و خەڵکێ زۆر لە گشت جیهانا ڕووی لە مۆدێرنیتێ کردوە و ئەمەش بەبێ یەك و دوو بۆ فۆکۆیاما بەمانای لەئامێزگرتنی دیموکراسی لیبرالی و ئابووری بازاڕ دێ. بەلام ناوبراو دوای ڕووداوەکانی 11/9 لە مانگی ئۆکتۆبەری هەمان سالدا لە سەرووتارێ کە لە WallStreet Journal دا بلاویکردۆتەوە باس لەوەدەکا کە ڕووداوەکانی 11/9 ئەوەیان یادخستەوە کە مێژوو جارێ کۆتای نەهاتووە. لەم سەروتارەدا فۆکۆیاما بۆئەوەدەچێ کە ڕووداوەکانی 11/9 ڕووداوەها یەکی مێژووین. لێرەدا مەبەستی فۆکۆیاما لە زاراوەی" مێژوو " شتێ ترە. ڕەنگە گەشەی درێژخایەنی مرۆڤایەتی بێ. بەلام لەهەمان کاتیشدا فۆکۆیاما لەم سەروتارەدا بەرەنگاری ئەو ڕەخنانە دەبێتەوە کە ئاڕاستەی دیموکراسیەتی لیبرالی دەکرێ و ئەو ڕەخنانەش کە باس لەوەدەکا کە ئەم جۆرە دیموکراسیەتە تەنێ بەکەلکی شارستانی ڕۆژئاوا دێ. چونکە بەپێی بۆچوونی فۆکۆیاما گەشەی دیموکراسی لیبرالی تەنێ مولکی ڕۆژئاوا نییە و بلاوبوونەوەی ئەو دیموکراسیەتەش لە ولاتانی ڕۆژهەلات و باشووری ئاسیا، ئەورووپای ڕۆژهەلات نیشانەیە لەسەر ئەوە (37).
بەلام موخابن فۆکۆیاما لەلایەك باس لە ئەوەناکا کە پاش کۆتای هاتنی مێژوو جیهانگیری وەك دوا ئایدیۆلۆژیا یان وەك ئایدیۆلۆژیای پاش مەرگی ئایدیۆلۆژیا دێتە مەیدان و نیشتمانێ ئابووری و دامەزراو لەسەر بناغەی زانیاری دادەمەزرێنێ. ئەمەش کارێ وادەکا سەدەێ بەناوی جیهانگیریەوە بێتەکایەوە یان سەدەی بیست و یەك یان میلێنیۆمی نوێ ببێ بە بە سەدەی هەمووان کە ئەوەش سەدە یا میلێنیۆمی جیهانگیرییە. بەلام ئەمە ئەوە ناگەێنێ کە خاوەنداری ڕاستەوخۆی ئەم سەدەیە هەمووانین و هەمووان ئەو کەسانەین کە لۆژیکی ئابووری و زانیاری ئەم سەدەیەمان بەدەستەوەیە. بەواتاێ تر مەرجە ئەوانەی تیۆریزە بەسەر لەمەودوامانەوە دەکەن ئەوە دەستنیشانبکەن کە میلێنیۆمی نوێ بریتییە لە ئومەمیەتی بازاڕ و، تازەگەرییە سیاسیەکانی ئەم بازاڕەش دەستی بەسەر گشت پلانێتی ئەمڕۆماندا گرتووە. ئەم بازاڕە شارستانیەتێ ئەلەکترۆنی لەگەل خۆ هێناوە کە ئامادەیە بێ بەهایی و بێ

مانایی بکا بە بەرزترین ڕەوشت. ئەوەی ئەم شارستانیە ئەلەکترۆنیە دەیەوێ بەگشتیبکا ئەوەیەکە کە دەبێ هیچوەختێ بیر لە بوونمان نەکەینەوە یا چاترە بلێین بیر لەوەنەکەینەوە کە بوونمانمان لەبیرکردووە و تەنانەت خودی بیریش بەدوژمنی سەرسەختی خۆی دەزانێ. هەروەها ئەم بازاڕە ڕۆشبیرێ ڕاسیۆنالی ئەوەندە توند و موجەرەدی لەناو خەلکدا بەرجەستە کردووە کە خۆی لە هەموو فۆرمەکانی ڕاسیۆنالیزم جیادەکاتەوە. بۆیە ئەو ڕۆشنبیرییە مێژووییەی فۆکۆیاما و هاوەلەکانی باویدەکەن بەرهەمی ڕاستەخۆی ئەو داوا سیاسی و کۆمەلایەتیانەیە کە جیهانگیری بازاڕ بەسەر پلانێتەکەمان دا سەپاندوویەتی.

لەلایەکی تر ئەم ڕوناکبیرە ئەمەریکاییە( واتە فۆکۆیاما) باس لەوەش ناکا کە تێکەلبوونی ئاکامەکانی ئەم دیموکراسیەتە بە بازاڕی ئازاد و بۆتۆپیای جیهانگیری زانیاری بیڕبڕەی تێکڕای گرفتە جیهانیەکانە. ئەم تێکەلبوونەش ئەو تازەگەرییە سیاسیەی ڕۆژئاوا ڕەتدەکاتەوە کە بووە بە مایەی لووتبەرزی ڕۆژئاوا و تەنانەت ئەم تازەگەریە سیاسیەش دەستی هەیە لە بلاوکردنەوەی یەك فۆرمی سیاسی، کە ئەوەش فۆرمی سیاسی ڕۆژئاواییە کە سەرچاوە لە مەدەنیەتی گریکی و دیسپۆتیستی(ستەمگەریی) ڕۆمانیەوە هەلدەگرێ. ئەم وتارە سیاسیەی ئەمڕۆ لە دونیای ڕۆژئاوا پیادەدەکرێ و توانیوویەتی بناغە بۆ حاکمداریێ کولتووری و سەربازی دابنێ تێکەلاوێکە لە سێستەمی( سیاسی-مەدەنی گریکی) و مۆدێلی (سیاسی - سەربازی ڕۆمانی). لاسایکردنەوەی ئەم فۆرمە یان سیستەمە سیاسیەش لە دەرەوەی ڕۆژئاوا ئاکامی زۆر خراپی خستۆتەوە. چونکە ئەم سیستەمە تێکەلاوە باشە و خراپە لەیەك کاتدا بەخێو دەکا و ئەو دوانەییە سیاسیەی ئەم مردێلە سیاسیەش دروستیکردووە زەرەری لە گشت مرۆڤایەتی داوە. بەدلنیایشەوە ئەوی لەسەرەوە بە مرۆڤی تازە ناومانا ( لەهەر شوێنێك بێ لە جیهان لە کوردستان یان لە هۆنکۆنگ، لە مۆسکۆ یان لە نیویۆرك) بەرهەمی ڕاستەقینەی ئەم سیستەمە سیاسیە دوانیی و تێکەلاوەیە. سادەترین نموونە ئەو یاریە سیاسیە پڕ لە ڕەوایەتی و ناساغەیە کە ڕۆژانە لەبارەی هەندێ ولاتەوە دەگێڕدرێ. دیموکراسیەتی میتافیزیکی ڕۆژئاوا سالاهایەکە ڕژێمهایەکی دیکتاتوور لێرە و لەوێ لە جیهانا بەخێو دەکا و بەپێی لۆژیکی بازاڕی سیاسی و سەربازی خۆی بەشداری لە هاتنەکایەوەیان دەکا و هەروەها هانییاندەدا و یان بەشداری لە لەناوبردن و سەرنگوومکردنیان دەکا. ڕەفتارە چەوتەکانی ئەمەریکا لە ولاتانی ئەمەریکای

لاتین بە پشتگیریکردن لە هەندێ ولاتی سەربازی و یان دروستکردنی ولاتهایەکی دیسپۆتیستی(شیللی بۆنموونە) و دواجار پەلپگرتن بەهەندێ ولات و دوورەپەرێزکردنی هەندێ ولات (ئەلبەتە ئەم دوورەپەرێزکردنە ئەوەندە بەزەرەری ئەو ولاتانە کەوتۆتەوە کارێ وایکردووە کە ئەو ولاتانە یان ڕژێمانە بەناوی ئایدیۆلۆژیا و خۆبەڕاست زانینەوە ببن بە تەور بەسەر سەری خەلکەکانیانەوە، کوبا بۆنموونە) ڕووێکە لە دوانەیی و میتافیزیکیەتی مۆدێلی سیاسی دیموکراسی ڕۆژئاوا. ئەمە تەنێ یەك نموونەن لەسەر ئەو چەوتیانە و لە شوێنێ وەك ئەمەریکای لاتینیش و جا نەخوازە ولاتانی تر، وەك ولاتانی جیهانی عەرەبی-ئیسلامی یان بەگشتی جیهانی ناوبراو بە جیهانی سێ و لەمدوایەش کۆمەلگە پاش-کۆمۆنیزمەکانی ئەورووپای ڕۆژهەلات و باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا، کە هەمیشە بوونە و دەبن بەشوێنی ڕاستەقینەی ئەو یاریانەی مۆدێلی سیاسی ڕۆژئاوا دەیگێڕێ. لەهەموو ئەوانە سەرنجڕاکێشتر، یان یاری یاریەکان ئەوکاتە دەستپێکرد کە دەولەتێ وەك ئیسرائیل لە شوێنێ وەك ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و لەناوچەیەکی پڕ لە سیاسەتسالار و یاریئامێزی وەك ئەمڕۆدا دروستکرا. بۆیە کاتێ کە هەر مۆدێلی سیاسی ڕۆژئاوا، بە پڕۆژە مەدەنی و دیموکراسیەکەشیەوە، جارێ تر دێ و باس لەوەدەکا کە هەندێ سێستەمی سیاسی و ڕژێم هەن کە هەڕەشەن بۆ سەر کۆمەلگەی مرۆڤایەتی، ئەمە پتر لەهەموو کاتێ ماهیەتی وتاری سیاسی ڕۆژئاوا و تازەگەریە سیاسیەکانی ڕەتدەکاتەوە. جیهانگیری ئابووریش، کە بەخۆی گەورەترین مەترسیە لەبەردەم مرۆڤایەتی، دەیەوێ وانەی ئەوە بە جیهان بلێتەوە کە تیرۆریزم و چەکی ئەتۆمی مەترسین لەسەر دیموکراسیەت. بەلێ ئەوانە مەترسین و لە هەڕەشە گلوبالیەکانی سەردەمن. بەلام چ ئەوانە و چ خودی جیهانگیری ئابووری و زانیاری و ئەمجار دیموکراسیەتیش بەرهەمی خودی پڕۆژەی مۆدێرنەی ڕۆژئاوان و بەری بیری پیاوە سپییەکەن. گەشەی تەکنیك، جیهانگیری سەرمایەداری و دیموکراسیەت هەموو ئەمانە پێکەوە بۆ مانادان بە ژیانی نوێ کاردەکەن و ڕۆلبیشیان لە دروستکردنی دۆزێ نێودەولەتی تازە هەیە کە نێتی زانین و دەسەلات و بەرهەمهێنان لە چەند شوێنێکدا کۆبێتەوە. ئەمەو دەکرێ ئەوەش بووترێ کە دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا لەژێرسایەی بازاڕی ئازاد و سەرمایەداری تازە بەجۆرێ گلوبالی گەشەدەکا. بەلام گلوبالیتێی ئەم گەشەیە مانایێ مرۆی و ڕەوشتی بۆ دیموکراسیەت مسۆگەرناکا بەقەدئەوەی بەرەو ڕەوایەتی و پۆلیسیەتی دەبا. زۆرجاریش

گوێمان لێدەبێ کە لەم بارودۆخە دیموکراسیەت لە تەگوچەڵمەدایە. بەلام ئەوەی ئەم دۆزە تەنگوچەڵەماویەی بۆ دیموکراسیەت دروستکردووە ئابووری بازارە کە بەرهەمی تێگەیشتنە ئابووریەکانی مۆدێرنەیە. ئابووری بازاڕ هەڕەشەشە نەك تەنیا لەسەر دیموکراسیەت بەلکو لەسەر ئەو دەولەتی ڕەفاهەی تیۆریزمەکەرانی لیبرالیزمیش باسیلێوەدەکەن. بەلام موخابن دیموکراسیەت لە ڕۆژئاوا بەجۆرێ گەشەی کردووە کە ناتوانێ بەبێ ئابووری بازاڕ بژی (38). ئەمەش ئەو دوانەییەیە کە وتاری سیاسی و کۆمەلایەتی مۆدێرنەی ڕۆژئاوا هەمیشە لەسەری ژیاوە. دوانەیی کۆمەلگەی دیموکراسی و سێیستەمی سیاسی نوێ، ئەوی پلانێتی ئەمڕۆ پێوەی گلاوە، کاتێ کۆتای دێ کە لەوەبکەوێ دوانەیی نەبێ و دەست لە بەخێوکردنی دوانەییەکان هەلگرێ. هاتنی زانیاریگەریش وەك شێوازێ لە بەرهەمهێنان نەك هەر ناتوانێ ئەم کێشانە چارەسەربکا بەلکو ئەم زانیاریگەرییە، وەك بەرهەمی ڕاستەخۆی ڕۆشنگەریی زانستی، ئاستی کێشەکان قوولتردەکا و ڕەهەندی تریشی بۆ دروستدەکا. ئەوەی مەبەستیشە لێرەدا یادیخەینەوە ئەوەیە کە ئەو سیاسەتە ڕادیکالەی کاستێلس نەخشەی بۆدادەنێ سیاسەتێ یۆتۆپییە و یان سیاسەتێکە تەنێ کۆمەلگەی نێتۆرك دەتوانێ خۆی لەتەکدا بگونجێنێ. ئەم جۆرە سیاسەتانەش بەرهەمی ڕاستەوخۆی تەکنەلۆژیای زانیارییە و کۆمەلگەی نوێ پشتێ زۆری پێدەبەستێ. هەربۆیشە ئاساییە مرۆڤ دەرك بەوەبکا کە پاڕادیگمی زانیاری نوێ سیاسەتێ یان باوەڕی سیاسی تایبەت بەخۆی دروستدەکا و توانا زانستی و تەکنیکییە تازەکەشی بۆ بەهێزکردنی وتارە سیاسیەکەی و پیرۆزکردنی واتا سیاسییە نوێکانی بەکاردەبا. ئەو سیاسەتەش کە چاخی زانیاری ئەمڕۆ لە دروستکردنی بەرپرسیارە سیاسەتێ پڕاگماتی بەئەزموونە و ئاماژەشە لەسەر نەك مەرگی سیاسەت بەلکو لەسەر ئەوەی کە سیاسەت پتر بەدامەزراویکراوە و زۆرتر لە گشت کاتێ تر بەهانەی زانستی بۆدەهێنرێتەوە یان بەگشتی سیاسەت بەزانستیکراوە. ئەم بەزانستیکردنەی سیاسەتیش جیاکردنەوەی سیاسەتی ولاتانی ڕۆژئاوایە لە سیاسەتی ولاتانی جیهانی سێ. بەلام کێشەکە لەوەدایە کە کاستێلس ئاماژە بەم لایەنەناکا و بەلکو لەبڕی ئەوە پشتگیری لە سیاسەتی تازەی ڕۆژئاوا و ئەمەریکا دەکا. ناشبێ ئەوەمان لەیادچێ کە کاستێلس ئەمەدەکا بەلام داوای باشکردنی سیاسەتکردنیش دەکا. لەو سمینارەی لە ستۆکۆلم(39) سازیکرد باسی لە ئەورووپاێ دەکرد کە لەڕووی سیاسی و ئابوورییەوە نموونەیی بێ و توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی

خۆی بەباشی هەبێ. ڕاستە گۆڕینی چۆنیەتی سیاسەتکردن لە ڕۆژئاوا مەسەلەیێ گرینگە بەلام ئەم گۆڕینە شتێ ئۆتۆماتیکی نییە. هەج گۆڕینێ مەبەستبێ بکرێ دەبێ شێوازی ژیانی ئابووری بگرێتەوە و بوونیادی ئەو تیۆریانەش سەرلەبەر بگۆڕێ کە بناغەیان بۆ ماف و یاسای کۆمەلایەتی و ئابووری داناوە.

جارێ تر دەگەڕێینەوە سەر ئەو باسەی کە پێشتر هاتینەوە سەری کە ئەوەش لەبارەی دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا بوو. بەلام پێش ئەوەی بگەڕێینەوە سەری دەمانەوێ بلێین کە ئێمە لە دووتوێی ئەم باسە کورتەدا نامانەوێ قسە لەسەر باسی دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا بە جۆرێ تایبەت بکەین و بەلکو ئەم قسەکردنە سەرپێییەمان تەنێ لە چوارچێوەی گفتووگۆکەمانە لەتەك کاستێلس دا. لە سەردەمی نوێدا زۆرجار کە باس لە سیاسەت دەکرێ باسەکە بە تەکنیکی نوێ و توانای ئەم تەکنیکە لە هێنانەکایەوەی فۆڕمێ نوێ لە سیاسەتکردن دەبەسترێتەوە. ئەمەش ڕەنگە هۆیەکەی بۆئەوە بگەڕێتەوە کە تەکنیکی نوێ شیاویێ زۆری خستۆتە بەردەم کردەی سیاسەتکردنەوە. لەوانە مانای ئینتەرنێت لە ژیانی سیاسیدا و ڕۆلی لە ساناکردنی کاری سیاسی. ڕەنگە زۆر توێژەرەوە و ڕۆژنامەوان وایبۆبچن کە بەهۆی گەشەی تەکنەلۆژیاوە دەکرێ سیاسەتێ هاوچەرخانە پیادەکرێ و دیموکراسیەتیش بەختێ گەورەی لەبەردەمدایە کە گەشەبکا(40). ئێمە پێمانوایە پەرەسەندنی دیموکراسیەت لە ڕۆژئاوا بە پەرەسەندی بازاڕەوە گرێدراوە و، ئەمەش ئەو دۆزەخەیە کە تازەگەریەکانی ڕۆژئاوا لە پشتیەوەیە. کاتێکیش پەرەسەندنی دیموکراسیەت لەگەل پەرەسەندنی بازاڕ وەك یەك دەڕوا دیموکراسیەت دەبێ بە شمەکێ بەهای خۆی هەیە. بۆیە لە کۆمەلگەی جیهانیدا دیموکراسیەت ناتوانێ خۆی بەهێزکا(41) نەك هەر لەبەرئەوەی کە کۆمەلگەی جیهانی لێوانلێوە لە ناتەبایی بەلکو لەبەرئەوەش، هەروەك کۆرنێلیۆس کاستۆریادیس Castoriedis Cornelius بۆیدەچێ، کە شارستانی مۆدێرن لەوەبۆتەوە پرسیار لەسەرخۆی بکا. بەلام نابێ ئەوەمان لەیادچێ کە ئەو بەهایەی لەسەرەوەباسکرا هەمیشە لەبەردەم هەڕەشە دا دەبێ کاتێ کە بازاڕ دووچاری کێشە دەبێ. بۆیە دیموکراسی نوێی ڕۆژئاوا، کە جەوهەری بەو ئابووری زانیاریاویەوە گرێدراوە کە سەرپەشتی دەکا، هەمیشە لە تەك خۆی و لەتەك بازاڕ لە یاریدایە. لەو شوێنانەش بازاڕ لەوپەڕی بێشبڕکێدایە هەمیشە دیموکراسیەت باوترین و ئەفسووناویترین پەیڤە. بەدلنیایشەوە قسەکردن لەسەر داهاتنی

فۆرمێ نوێ لە دیموکراسیەت بەناوی دیموکراسیەتی ئەلەکترۆنی هەر بەرهەمی ئەو پاراڤیگمە نوێیەیە کە گشت تەماشاکردن و پێوەندیەکانی گۆڕیووە. گەر بشلێین دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا هەر شتێ کۆمەلایەتی پووخت نییە بەلکو بەرپرسیارێ ڕەوشتی و سیاسیشی لە ئەستۆدایە و دامەزراوە گلوبالیە کانیشی گەورەترین ئەرکیان دەکەوێتە سەرشان بەمە دیارە دەمانەوێ هیوایێ زۆر بخەینە سەر دیموکراسیەتی ڕژئاوا. بەلام ئەو بازاڕە ئازاد و ئابووریخوازیەی ئەم دامەزراوە گلوبالییانە پشتگیری دەکەن مرۆڤێ شێواوی داهێناوە و، ئەم مرۆڤە لەمالەکەی خۆیدا بووە بە بۆرسەێ بچووك و دەزگاێ ئەلەکترۆنی. بازاڕ و سەرمایە و تەکنەلۆژیای نوێ مرۆڤی ئەمرۆیان لە زێد و نیشتمانی خۆی بەدەرناوە و کۆچەری بالی بەسەر ژیانی نوێدا کێشاوە. مرۆڤی تازە هەرچەندە زۆرترین شوێنی دۆزیوەتەوە و بەرینترین ڕووبەری لەبەردەستدایە بەلام هەر بێ زێدی و بێ خاکی پێوەدیارە و تاکە ئازەووی بووە بە گەڕان بەدووی مالێ تر و زێدێ جیا و یان بوون بە کۆچەرێ ئەبەدی. شەپۆلی لە ولات بەدەرهاتن و نیشتیمان بەجێهێشتن لە ولاتانی جیهانی سێ و ئەوروپای ڕۆژهەلاتەوە بۆ ڕۆژئاوا و ئەمەریکای باکوور تەنێ ئەو کۆچەرییە ڕووناکەنەوە کە مرۆڤی تازە پێوەی دەنالێنێ بەلکو کۆچەرییە سەرەکیەکە لەو شوێنانەدا بەهێزتر و پەلەترە کە پێیدەلێن کۆمەلگەکانی تەکنەلۆژیای زانیاری. کۆچەری لەناو ئەم جۆرە ولاتانە فۆرمێ تری وەرگرتووە و ئەو تێگەیشتنە کۆنانەی تێپەڕاندووە کە لەمەوبەر لەسەر کۆچەری هەمانبووە. بۆنموونە کۆمەلناسی ئەلمانی ئولریش بێك لە کتێبی (جیهانگیری چییە؟) بەجۆرێ تر لەم کۆچەریەی مرۆڤی ڕۆژئاوا دەدوێ و پێیوایە گەربێت و تەماشای ژیانی نوێ بکەین بۆماندەردەکەوێ کە پەیوەندی بە شوێنەوە نەماوە و مرۆڤ هەمیشە لە حالەتێ کۆچەریدایە و ژیانێ کۆچەرانەش لە سەیارە، لە فڕۆکە، لە قیتار و لەبەردەم ئینتەرنێت بەسەردەبا(42). مەسەلەی ئەوەش کە ژیان ڕەوتێ کۆچەری وەرکرتووە لەمبارەیەوە ڕەوشتی سیاسی نێودەولەتی و بزووتنەوەی دیموکراسی ئەمڕۆ زۆرترین بەرپرسیاریان دەکەوێتەسەر. هەروەکو لەمەوبەریش ووتمان ئەو ئابووریە تازەیەی ئەمڕۆ لەسەر بناغەی پرنسیپی بازاڕ کاردەکا هۆکارێ سەرەکییە بۆ بە ناتەندوروستیکردن و تێکدانی جەوهەری ژیانی نوێمان و بلاوکردنەوەی ڕوحی کۆچەری و نامۆیی و پەتای بەرەنگار بوونەوە یەکدی و بەگژیەکاچوونەوە. لەهەموو ئەوانەش سەیرتر ئەوەیە کە کۆچەری و ولات بەجێهێشتن ڕێگایەکە بۆ دروستکردنی دەرامەت و

دابینکردنی بژێوێك. بۆیە تەکنیکی بالا و زانیاری زۆر پێشکەوتووی ڕۆژئاوا ج بەهایەکی دەبێ لەکاتێکدا کە هەموو کەس لە مال و شوێنی خۆی وەرس بێ و هەولی ئەوەبدا کە شوێن بگۆڕێ نەك بۆ ئارەزوو و بۆ هەوەس بەلکو لەبەر ئەوەی ژیان ئەمڕۆ کەوتۆتە چەند ناوچەێ لەم پلانێتە گەورەیە و، ئەمەو دەرامەت و بەخت تاقیکردنەوەش خۆی لە هەندێ جێگا لەم جیهانە مەلاسداوە. بۆیە کۆچەری بۆ لەمەولا مانای فەلسەفی نابێ بەلکو خەسلەتێ دیار و زالی سەردەمە و ڕێگایەکیشە بۆ بیرکردنەوە لە بوونمان. بەلام کامە بوون؟ بەدلنیاییەوە ئەو بوونەی جیانگیری زانیاری لێرە و لەوێ بەجۆرێ پەرت و تێکەلاو بۆی خولقانووین. ئەوی لەسەرەوە باسکرا پتر پێوەندی بەو باسەوە هەیە کە پێیدەلێن تازەگەری سیاسی. تازەگەری سیاسیش لە بواری کۆمەلناسیدا تێگەیشتنێ زۆری دروستکردووە و داکۆکیکەرانیش لە تازەگەری سیاسی ڕۆژئاوا باوەڕیان بەوەیە کە وتاری سیاسی ڕۆژئاوا لەماوەی ئەم سێ سەدەیەی ڕابردوودا توانیوویەتی پێناسەی خۆی لەبارەی تاك و کۆمەل و دەولەتەوە بەدەستەوە بدا و مافە سیاسی و مەدەنی و کۆمەلایەتیەکان بەدەستبهێنێ و هەروەها پێشیان وایە نووسینی گەلێ لە کۆمەلناسەکان مانای خۆی بۆ ئەم تازەگەرییە سیاسیە هەبووە. بەلام نابێ ئەوە لەیادکەین کە زۆربەی ئەو کارانەی کۆمەلناسەکان لەم بارەیەوە کردویانە هەر هەموو گشت ئاڕاستەکانی ژیانی نوێمانیان ڕوون نەکردۆتەوە و جەوهەری شارستانی ڕۆژئاواشیان بەپێی بۆچوونی سۆسیۆلۆژی خۆیان بەرباسخستووە. ئەمە دووبەرەکایەتیێ زۆری لە نێوان ڕووناکبیرانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات دروستکردووە و زیانێ زۆریشی لەکاری نەك هەر ئەو ڕوناکبیرە ڕۆژئاواییانە داوە کە خاوەنی ئەندێشە و تێڕامانێ ترن لەسەر کێشە و گرفتەکانی ڕۆژهەلات بەلکو بەزۆری بە زیانی ڕوناکبیرانی ڕۆژهەلات گەڕاوەتەوە کە نەکراوە ئەو وێنە و دیدانەی لەسەر خۆیان و ڕۆژئاوا هەیانە بە ڕۆژئاوای بگەێنن.

## زانیاریگەری و تیرۆریزم

ڕەنگە بەشێ لە ئێمە پرسیاری ئەوەبکا کە تۆ بلێی فۆندەمینتالیزمی ئیسلامی هەڕەشە بێ بۆسەر کۆمەلگەی تازە و بەتایبەت چاخی زانیاری؟ هەروەها چاخی زانیاری چی بەم فۆندەمینتالیزمە دەبەخشێ؟. بۆئەوەی وەلامی ئەو دوو پرسیارە لە چوارچێوەی باسەکەمان بمێنێتەوە دەچینەوە سەر خودی کارەکەی کاستێلس. ئەمەش لەبەرئەوەی بەپێی تێگەیشتنەکانی کاستێلس بێ

لەسەر خولقاندنی ناسنامە ئەوا دەبینین فۆندەمینتالیزمی ئاینی(مەسیحی، ئیسلامی، یەهودی و تەنانەت بوودیش) دوای ئەوەی دێنە ناو نێتەوە کار بۆ دروستکردنی ناسنامەیێ تایبەت بەخۆیان دەکەن. لەهەمان کاتیشدا ئاماژە بەوەدەکا کە ئەم فۆندەمیتالیستانە وەك هێزهایەکی دژ بە جیهانگیریش دێنە مەیدان و کار بۆئەم مەبەستە دەکەن. ئەگەر چی هەولدەدەین تێگەیشتنەکانی کاستێلس لەگەل بارودۆخی جیهان هەنووکە بکەین بەلام نابێ ئەوە لەبیرکەین کە بەخۆی گەشە تووندڕەوەکانی جیهانگیری تیرۆریزمیان کردووە بە باوترین ئایدیۆلۆژیا و تیرۆریزمیش خۆی بووە بە دوژمنی سەرسەختی ولاتانی جیهانگیری و پەیامە زانیارییەکەی. کەواتە نەك هەر تیرۆریزم وادەردەکەوێ کە هەڕەشەیە بۆ سەر چاخی زانیاری بەلکو خودی چاخی زانیاریش بەشدارە لە دروستکردنی تیرۆریزمێ تایبەت بەلام بەناوی جیهانگیری ئابووری و زانیارییەوە. نەك هەر ئەوە بەلکو تیرۆریزم خۆشی وادەردەخا کە تووندڕەویەکانی جیهانگیری ئابووری و زانیاری و هەروەها هەلەکانی کۆمەلگەی مەدەنی گلوبال و عیلمانیەتی ڕۆژئاوا بووە بەهۆی دروستبونی. بەواتایێ تر، ئەوەی کە تیرۆریزم وەك دژە جەمسەرێکی جیهانگیری ئابووری زانیاری دەرکەوتووە ئەمە یاریەکی سیاسی گلوبال نییە بەلکو دەرئەنجامێ ڕاستەخۆی ئەو چەوتیانەشە کە مرۆڤایەتی دروستیکردون. بەمشێوەیە داڕمانی تاوەرەکانی نێوەندی بازرگانی جیهانی WTC نیشانە بوون لەسەر کۆبوونەوەی ڕق لە بەشێ لە جیهان و دەسەلات و پارە و زانیاریش لە بەشەکەی تر هەروەها کۆبوونەوەی زانین و پێشکەوتن و واتا تازەکان (وەك مرۆڤایەتی، ماف، مەدەنیەت، دادپەروەری، ئازادی) لە هەندێ شوێن و کەلەکەبوونی نەزانی و دواکەوتن و واتا کۆنەکان (بەربەریەت، ناڕەوای، کۆنەپەرستی، ناتەبایی، ستەمگەریی ) لە هەندێ شوێنی تر. زۆریش وای بۆدەچن کە لەدوای ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر نادلنیای لە جیهانا بلاوبۆوەوە. لەم ڕووەشەوە فەیلەسوفی بەریتانی تێد هۆندەریچ Ted Hounderich لەدوا کتێبیدا بەناوی" لەپاش تێرۆر" گەلێ ڕوونکردنەوە بەدەستەوە دەدا کە نیشانەن لەسەر ئەوەی تیرۆریزم دیاردەیەکی نائاسایی نییە (43). ئەلبەتە جاغت لەوەشدەکا کە نادادپەروەری گلوبال ڕوونکردنەوەێ دەرەکییە بۆ ڕووداوەکانی 11ی سێپتەمبەر(44). لەم حالەتەیشدا دەکرێ گەلێ نموونە لەسەر ئەم نادادپەروەریە بهێنرێتەوە کە بەشێ لە هۆکارەکانی ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر ڕووندەکەنەوە و بەلام دەشکرێ هەندێ لایەنی

تریش بەرباسخرێ کە بووخزی ولاتانی غەیرە ڕۆژئاوای بەرامبەر بەگشت شتێکی ڕۆژئاوای یاددەخەنەوە. زۆربەی ڕووداوە سیاسیەکانی ڕۆژانە ئەوە ڕووندەکەنەوە کە تەکنیکی ڕۆژئاوا هەمیشە لەگەڵ شەپۆلی جیهانگیری و گەشەی سەرمایەداری و باری دیموکراسیەتی ڕۆژئاوا یەکدەخرێ و وەك یەك پۆل لە شتی ڕۆژئاوای لێکدەدرێتەوە. واتە ئەوانەی تیرۆری 11ی سێپتەمبەریان ئەنجامدا یەك بۆ چوونیان بۆ گەشەی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا هەیە وپێیشیان وایە کە ئەم گەشەیە لە پشت نەك هەر نادادپەروەری جیهانەوەیە بەڵکو لەپشت بێ مانای و بێ بەهاکردنی ژیان و بلاوکردنەوەی بێ ئیمانی و بێ ڕەوشتیشەوەیە. ئالێرەدا گەشەی ڕۆژئاوا نەك هەر بێ ناوەڕۆکدەکرێ بەڵکو وەك هەڕەشە یەکیش بۆ سەر گشت پرنسیپ و بەها مرۆییەکان تەماشادەکرێ. ئەو پەرەسەندنەی لەبواری بیۆ-تەکنیك و کولتووری ڕۆژئاوا ڕوویداوە کارێ وایکردووە کە زۆربەی بزووتنەوە ئاینیەکان ئەم لایەنانە بکەن بە ڕەخنە و هەروەها بە فاکتەش لە سەر هەڵەکانی عیلمانیەت و دادپەروەری و موڕالی ڕۆژئاوا. تەنانەت دیاردەی جەنگ و بەرزبوونەوەی ڕێژەی تاوان و ستەمیش دەکەن بە فاکتە لەسەر ناکاملی ماهیەتی زانستی ڕۆژئاوا. ئەم ڕق و بێ باوەڕیەی بزووتنەوە ئاینیەکانیش کە زۆر ڕووداوی لێوەبەردێ زۆرترین پرسیاری لەنێو ڕۆژئاوایەکانا دروستکردووە کە ڕەنگە گرنگترینیان ئەو پرسیارە بێ کە هۆندەریچ لە کتێبەکەیدا باسیدەکا، کە دوای ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر هاتەکایەوە، کە ئەوەش بریتییە لە Why do they hate us? " بۆ ئەوان ڕقیان لێمانە؟". ئەم پرسیارە تا ڕادەیێ زۆر لە ڕۆژئاوا بوو بە وێردی سەر زمان و بە باوەڕی فەیلەسوفی بەریتانیش ئەم ڕقە بناغەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە گەلێ لە ڕق هەڵگرەکان یان بەبۆچوونی گەلێ لە غەیرە ڕۆژئاوایەکان ئەوانەی ژیانیان تێکداوە ئەوە ئەمەریکای و ڕۆژئاواییەکانە. ئاشکرایشە کە کاستێلس بەرهەمەکەی پێش 11ی سێپتەمبەری نووسیوە(لەنێوان سالانی 1998-1996 هەر سێ بەشەکەی نووسراوە) بەلام پێشبینی ئەوەی کردووە کە فۆندەمینتالیزمی ئاینی دێنە ناو نێتەوە و دەبن بە بزووتنەوەهایەکی پەرچەکرداریش دژ بە تەوژمی جیهانگیری. ئەمەش تەنیا فۆندەمینتالیزمی ئیسلامی نییە کە دێتە ناو نێتەوە و هەروەها ئەم هاتنە ناوەوەیەی نێتیش بۆ قسەکردن لەسەر ناسنامەی خۆی بەکاردەبا، بەڵکو فۆندەمینتالیزمی مەسیحی و یەهودی و کۆنفۆشیزمی و تەنانەت بوودیش ئەم کارە دەکەن.

بائەوەش بڵێین کە، دیاردەی تیرۆریزم بە گرووپێ ئاینی و ئیتنییەوە تایبەت نییە و تەنێ بە شوێن و یان دیدێکەوە نەبەستراوەتەوە. ئەوەی تیرۆریزم دەیەوێ پێمانبڵێتەوە پێشتر نازیزم و دواتر کۆمۆنیزم یاخود فاشیزم پێیووتووینەتەوە و، هەروەها ئەوی دیاردەهایەکی وەك کۆلۆنیالیزم و ئیمپریالیزم و تادەگاتە هۆلۆکۆست بەسەر مرۆڤایەتیان هێناوە هەر لەو ئاستەدایە کە ئەمرۆ لەژێرسایەی جیهانگیری ئابووری و یان تیرۆریزم لەهەندێ جێ لە دونیا بەسەر مرۆڤایەتی دێ. ئێستاش ئەو قسەیەی فۆکۆ لە گوێما دەزرینگێتەوە کە دەڵێ کاتێ کە باس لە فاشیزم دەکەین عەدرە ئەوە بە دیاردەیەکی وەك نازیزم ببیەستینەوە چونکە مێژووی فاشیزم لە دل و دەروونی مرۆڤ زۆر لەوەکۆنترە کە بۆ سالانی 1930ەکان بگەڕێندرێتەوە. هەر سەبارەت بە مەسەلەی تیرۆریزم و زانیاریگەریی دەکرێ ئەوەش بپرسین باشە دەکرێ بزووتنەوەی تیرۆریزم بەیەکێ لەو بزووتنەوە پەرچەکرداریانە لەقەلەم بدەین بەرامبەر بە شارستانی پارە پەرستی و دەسەلاتخوازی کە کاستێلس باسی لێوەدەکا؟ تیرۆریزم بەبێ یەك و دوو دیاردەێ پەرچەکرداری گلوبالە و بۆ لەمەودواش گەورەترین هەڕەشە و ترسیشە لەبەردەم ئەو هێزە گلوبالیانەی مافێ گلوبالیان خستۆتە بەردەستخۆیان. ئەم کێشەیە تا قۆناغێ دیش هەر درێژە دەکێشێ. تیرۆریزم لەم حالەتەدا نە شتێ ڕێکەوتە و نەش هەلەیەکەی لەدەستدەرچووە. بەلکو شتێ چاوەڕوان کراوە و پاداشتی هەلەکانی لەمەوبەر و نادادپەروەریەکانی پێشوشمانە. بەرهەمی ئەو ڕۆژانەیە کە کۆنتڕۆلمان بەسەر خۆمانەوە نەبووە و لە تەعامولمانا لەتەك یەکدا زۆر بێبەزەیی و نامیهرەبان بووینە. بەکورتی بەرژەوەندیە کانمان و ویستمان بۆ سڕینەوە و لەناوبردتی بەرامبەر و دژەکانمان بووە هۆی دروستبوونی ئەم قەدەرە کە هەروەك ڕاسیۆنالیزم و میتافیزیك و تەکنەلۆژیا قەدەرمانە. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوی سەرەوە دەکرێ بلێین کاستێلس باوەڕی بەوەیە کە لەگەل داهاتنی تەکنیکی نوێ و چوونە ناو کۆمەلگەی نێتۆرکەوە بزووتنەوەی کۆمەلایەتی جۆراوجۆر سەرهەلدەدەن و نێتیش بۆ بەرزکردنەوەی داواکانیان و هێنانە پێشەوەی باس لەسەر مافەکانیان بەکاردەبەن. جا ئەم بزووتنەوانەش کە دێنە ناو نێتەوە و کار بۆ بوونی ناسنامەی خۆیان دەکەن جۆراوجۆرن. جا ئەوە گرووپە ناسیۆنالیەکان بێ یان گرووپە ئاینی و ئیتنیەکان، هەروەها گرووپە کولتووریەکان بێ یان گرووپە کۆمەلایەتیەکان. کەواتە ئەمە گەلێ دەگرێتەوە، بەرهەلستیکەرانی جیهانگیری (بەهەموو ئاڕاستە کانیەوە هەر لە چەپەکانەوە

تادەگاتە ناسیۆنالیستەکان و ئیسلامیەکان و. . ) یان داکۆکیکەران لە سروشت و ئاژەل یان ئاشتی خوازەکان یان فێمینیستەکان.
گەڕان بەدووی بناغەکانی تیرۆریزمی گلوبال لە چاخی زانیاری، کە بەخۆی چاخێ گلوباله و ڕۆلیشی لە بەگلوبالکردن یان بەپێچەوانەوە لە بەلۆکالیکردنی دیاردە و ڕووداوەکان دا هەیە، گەلێ لە ئێمە والێدەکا ئەو پاڕادیگمە زانیارییە بخەینەژێر پرسیارەوە کە لەپال هاتنەکایەوەی گۆڕانکاریەکانەوەیە. چونکە چاخی زانیاری چاخی چەند کۆمەلگە و یان ولاتهایەکە کە چاخی یاخود سەدەکانی تریان تەواتر بڕیووە و بەبەراوورد بە وانیتر تێشیانپەڕاندووە.
هەروەها ئەم چاخە گەر ئەمە بەسەرهاتی خولقان و ڕەوتی پەرەسەندنی بێ ئەوا گەشەێ تاکلا دابیندەکا و ئەمەش هەڕەشە لە ئایندەی مرۆڤایەتی و واتای وەك مافی مرۆڤ و دادپەروەری کۆمەلایەتی و یەکسانی ئابووری دەکا.
لەبەرئەوەی ئەم پاڕادیگمە نوێیە ئابووریێ بۆ هەندێ کۆمەلگە یان ولات دابیندەکا کە دەبن بە شوێنێ ئامانجی هێرشی تیرۆریستان و ئەو شوێنانەش کە ئەم پاڕادیگمە ناتوانێ کاریتیاکا دەبێ بە دالدە و فابریکە(کارگە) ی دورستکردنێ پیشەسازی تیرۆریزم. کاتێکیش ئەم پاڕادیگمە دۆزێ کولتووریێ سیاسی ئەوتۆ دێنێتە پێشێ لە جیهانا کە باس بێنێتەسەر دروستکردنی ئاسایشێ گلوبال ئەم ئاسایشە دەبێ"بیرێ درێژخایەن بێ و ناشبێ بەوە گەر ئەمە هاوشان لەتەك گفتوگۆیەکی جیهانگیری ڕەخنەیی دەستپێنەکا. جیهانێ دلنیاش تەنیا بەهۆی کاری هاوبەشی گلوبال و بەکاربردنێ یەکسانانەی خەیراتی جیهان دێتەدی" (45). هەر ئەم لایەنە بۆ گەلێ پێیانوایە داوامان لێدەکا ستراتیژێ هاوبەش بۆ سەرلەنوێ دامەزراندەوەی دامەزراوە گلوبالییەکان بگرینەبەر بەلام بەجۆرێ باشتر و دوور لە خۆچەککردن و پاراستنی مافی نێودەولەتی و چارەسەرکردنی کێشەکان بەشێوەێ دادپەروەرانە و بەشداریکردن لە خولقانی ڕێگایەك کە تیایدا مافی مرۆڤایەتی بپارێزرێ و هەولی ئەوەش بدرێ کە شێوە کارکردنی گلوبال دوور لە ڕەوانبێژی شەڕ وەگەڕخرێ (46). بەلام نەخێر جارێ ئەو مۆدێلە سیاسیانەی لە ولاتانی ڕۆژئاوادا پیادە دەکرێ زۆری ماوە خۆی لە ڕەوانبێژی شەڕ دوورخاتەوە و ئەو شەڕەی لە پاداشت هەلەکانی کراوەتە سەری بە ئاشتی بگۆڕێ. ئەگەرچی توندڕەویەکانی جیهانگیری نە ڕێگای دەدا ئاشتی هەلبژێرێ و نەش خودی زاراوەی ئاشتی ئەو بەهایەی ماوە. ئەمە ووتنێکی ڕۆماننووسێکی سویدی یان گیۆ Jan Guillou م دێنێتەوە یاد کە لە ڕۆمانێکی بەناوی "ڕێگا پەرەو

ئورشەلیم" دەڵێ دەنگدان بۆ ئاشتی وەك دەنگدانە بۆ شەڕ. ئەمە نەك هەر لەسەر ئاستی گلوبال بەڵکو لەسەر ئاستی خۆشمان زۆر وایە. ئەو شەڕەی کە ماوەی زۆر لە کوردستان لەئارادابوو لە ئاشتی خۆشەویستر و پیرۆزتر بوو. بەلام دواتر بەهۆی بڕیاری سیاسیەوە بە ئاشتی بەلەجیاتیکرا. ئەم جۆرە ئاشتیانە تەنیا خۆدزینەوەی کاتیە لە شەڕ. لەوسەیرتر شەڕ بۆلەمەولا دەبێ بە داوایەك کە جەماوەریشی پێوە دەگلێندرێ. هەروەك ئەوەی کە لە کوردستان کرا یان ئێستا لە ئەمەریکا یان لە عێراق دا دەکرێ. تیرۆریزمیش هەر لەگەل دەرکەوتنی خۆی وەك فۆڕمێ لە شەڕ دەرخست. بەلام نابێ ئەوە لەیادکەین کە خودی شەڕ بالاترین فۆڕمی- دوا فۆڕمی- شەڕە و ئەوانەش کە هەر زوو لە نیازی تیرۆریزم گەیشتن تەنێ ئەوان لە مانای شەڕ تێدەگەن و شەڕناسن. بۆئەوەی شەڕی چاخی زانیاریش ڕەوائامێز و بێلەکە بێ دەبێ پێش هەموو شتێ بکرێ بە دیاردەی گلوبال و دواتریش ئەم جۆرە شەڕانە زۆر بە پەلە و لەناکاو دەستپێدەکەن و دواتر زۆر پڕاگماتیانە کۆتاییان دێ. هێزەکانی ناو چاخی زانیاری لەوە بەئاگان کە تیرۆریزم هەولی ئەوەدەدا ببێ بە هێزێ گلوبال و بەرامبەرێ گلوبال و جەمسەرێ دژ بە جەمسەری ئابووری زانیاری و کۆمەلگەی تەکنەلۆژیای زانیاری. گومانیشی ناوێ کە بووترێ، هێزە گلوبالیەکانی ناو چاخی زانیاریش، یان بەکورتی ولاتانی ڕۆژئاوا لە گشت کولتوورە سیاسیەکانی تر بەئەزموون ترن لە دیاردەی بەرامبەرگەرایی و بوون بە جەمسەر.

ئەوەی لە گشت ئەوانە سەیرترە ئەوەیە کە کاستێلس هیوای زۆری بە ناتۆ و ئەمەریکا هەیە و پێیشیوایە ئەوان دەتوانن کارێ زۆر بۆ دروستکردنی ئاشتیێ گلوبال بکەن(47). سەرچاوەی ئەم تێگەیشتنەی کاستێلس بەزۆری پێوەندی بەوەوە هەیە کە دامەزراوە نێودەولەتیەکان (ناتۆ یان یەکیەتی ئەوروپا) و تەنانەت ولاتانی نێتۆرکیش و سەرووی هەمووشیان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بەتوانا و شیاوێ زۆ گەیشتوون و دەکرێ ئەو توانا و شیاویانە بەجۆری بەکارببرێ کە جۆرە ئاسایش و دادپەروەریێ گلوبال بهێننەکایەوە. هەر لەو لێدوانە ئەلەکترۆنیەی(کە بەڕێگای e-post ئەنجامدراوە) لەگەل کاستێلس کراوە باس لە ڕۆلی ئەمەریکا وەك زلهێزێ دەکا بەلام بەجۆرێ کە گوایە ئەم زلهێزە لەسەر تێچوونی خۆی لەدەرەوەی ولاتەکەی کار بۆ ئاشتیدەکا و باسیش لەوەدەکا کە ئەم ولاتە ئەگەرچی لەئاکامی تەوژمی گەشەی نێتۆرك لەناوەوە دووچاری کێشەی زۆربووە (بێکاری، بێمالی، کرمینالیتێ)

بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ولاتێکە دەرگای لەسەر پشتە بۆ خۆ دۆزینەوە و خولقاندن (48).

لەڕاستیدا مرۆڤ ناتوانێ زۆر لەسەر بۆچوونەکانی کاستێلس لەبارەی ئەمەریکا لەلایەك و دیاردەی تیرۆریزم و ڕێگاچارەکانی ئەمەریکا و دۆستەکانی بۆ بەرەنگاربوونەوەی تەوژمی تیرۆریزم بڵێ. ئەمەش لەلایەك لەبەرئەوەی کە کاتێ 11 ی سێپتەمبەر ڕوویدا کاستێلس کارەکەی بەچاپگەیاندبوو و لەلایەکی تر لەبەرئەوەی کە شتێ تایبەت و ڕاستەوخۆی لەسەر تەوژمی تیرۆریزم و ڕەوشی سیاسی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نەنووسیوە. بەلام دەکرێ ئێمە باس بهێنینە پێشەوە لەسەر ئەوەی کە گەشەی نێتۆرك نەیتوانیووە دیاردەی ڕەگەزپەرستی و دوژمنایەتی بێگانە بسڕێتەوە کە لەگەڵ گشت کێشە و گرفتێکدا دێتە پێشەوە کە دواتر دێینەوە سەری. ئەو گەشەی تەکنیکەی کاستێلس باسیلێوەدەکا نەیتوانی والە سێستەمی سیاسی ولاتانی ڕۆژئاوا بکا نەکەونە ڕاوە پەناهەندە و سەخترین مەرج لەبەردەم پەناهەندە وەرگرتن دانەنێن و یاخود ئەو مافی مرۆڤەی خۆیان ئەندازیارەکەین پێشێلنەکەن و دووبەرەکایەتی نێوان ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاوایی، ئاسیایی و ئەورووپایی، ئیسلامی و مەسیحی زیندوونەکەن. بۆئەوەی ئەمانەش بکەن هەمیشە ڕەوایەتی بە کردەوەکانیان دەدەن و مانای یاسای و سیاسی دەدەنەپاڵ. هەر بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە جەغت لەوەشدەکەین کە سیحری یاسا و ماف و زانستی ڕۆژئاوا دەسەلاتێ زۆری لە گۆڕینی وێنەکانی و دروستکردنی ئیدیا و نیگای تر هەیە. ئەمەش لە ترادیسیۆنی سیاسی و فکری ڕۆژئاوا شتێ تازە نییە. هەروەها دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەوەی گەشەی تەکنیك و پاڕادیگمی نوێ دەپارێزێ و تەمەنی درێژدەکا ئەوەیە کە کۆمەڵگەکانی تەنیا دەروەسی ئەوەن کە دەبێ ئەم مۆدێلی ژیانە نوێیەی ئەمڕۆی دونیا پێوەیگلاوە دەبێ هەبێ و بەردەوامبێ. ئیشکردنیش بۆ بەردەوامی ئەم مۆدێلە تەنیا لە ڕۆژئاوا دەوەشێتەوە کە بەباشی کاری بۆبکا. ئەوەی مرۆڤایەتی لەژێرسایەی مۆدێلی ڕۆژئاوا لەسەر گشت ئاستەکان تیایدەژی بەرهەمی گشت کۆشش و هەوڵەکانی ڕۆژئاوا بووە هەر لە زانستی و سیاسی و ئابوورییەوە تادەگاتە کولتووری و ئاینی و ئیتنیش. ئەو جۆرە خۆ ئامادەکردنەی ڕۆژئاوا بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیان لە مۆدێلی ژیانی ڕۆژئاوا هەر سەرچاوە لەوەوەدەگرێ کە ڕۆژئاوا خۆی بەباشترین مۆدێلی سیاسی و کۆمەلایەتی و کولتووری و تەکنیکی دەزانێ. ئەمڕۆ مۆدێلی سیاسی و ئابووری ڕۆژئاواش

بەپێی ئەزموون و شیاویەکانی ڕێیازیتر دەگرێتەبەر بۆ کۆنترۆلکردنی جیهان و یەکجۆرکردنی شێوازی ژیان. واتای وەك کۆمەڵگەی مەدەنی، دیموکراسیەت، دادپەروەری، یەکسانی کۆمەلایەتی و مافی گلۆبال و چەندین واتا و دەربڕینیتر زۆرترین سیحریان لەئەمڕۆدا هەیە و گەورەترین پیرۆزی (سەرکەوتن) یشیان بۆخۆیان لەگشت شوێنێ دروستکردووە. ڕۆژئاوا نایەوێ گەمەی ئایدیۆلۆژی و ئاینی بکا بە بناغە بۆ دووبەرەکایەتی و بەرامبەرگەرایی. نەك لەبەرئەوەی باوەڕی پێی نییە نەخێر. بەلکو لەبەرئەوەی دۆزی سیاسی و زانستی کولتووری و ئابووری ڕۆژئاوا گەیشتۆتە ئاستێ کە پێویستی بە ئاڕاستە و ڕەهەندی ترە خۆی تیا تاقیبکاتەوە و ڕێی نوێ بگرێتەبەر بۆ ئەوەی ئەزموونی تازەی خۆی پەرشوبلاوکا بە دونیادا. واژەی وەك یەکسانی نێوان پیاو ژن، مافی منال، پاراستنی ژینگە، باوەڕبەخۆبوون و مافی گۆڕینی ژیندەر و دیموکراسیەتی هەبوویی (پارەداری) بەربلاوترین گوزارەی سەردەمی نوێمانن و ملیارەها لە دەوری خۆی دەتوانێ کۆکاتەوە. گشت کۆششەکانیش لەلایەن ڕۆژئاواوە بۆلەمەولا و دوای گەیشتنی ڕۆژئاوا بەم ئاستە لە گەشە بۆ ئەوەیە کە نەك هەر سنووری ڕۆژئاواگەریی فراوانکرێ بەلکو بۆ ئەوەشە کە مۆدێلی ژیانی ڕۆژئاوا بەگشتیکرێ و هەروەها ئەم مۆدێلە بکرێ بە چارەنووسی گشت مرۆڤایەتی یان چاترە بلێین هەموو پلانێتی (کەوکەبی) ئەمڕۆمان. بۆیە ئەوە تەنیا تیرۆریزم نییە کە بووە بەقەدەرمان کە دەبێ بیژێین و نیگەرانیمان تیادروستدەکا بەلکو شای نیگەرانیەکان ئەوەیە کە دەبێ هەموو یەك شێوازی ژیان بژین و، هەروەها مۆدێلێکی ژیان هەلگرینەوە کە زۆر بێ بەزەیی و نامیهرەبانە. موخابن قوودرەتی زانستی ئەمڕۆش کارێ وایکردووە کە قسەکردن لەسەر بەزەیی و میهرەبانی ئەو مانا کۆمەلایەتیەی نەمێنێ و خودی ڕەوشت و باوەڕیش کە بەرهەمهێنەری ئەمشتانەن (واتە بەزەیی و میهرەبانی) شوێنی خۆیان بۆ شتی تر چۆلکردووە، لەوانە بەمەدەنیبوون، ئازادی تاکەکەس و بڕوابەخۆبوون، کە ئەوانەش زۆرجار دەبنەهۆی دروستبوونی چەندین فۆڕم لە ڕەوایەتی و ئازادی جۆراوجۆر. هەموو ئەمانەش (ئازادی تاکەکەس، واتای ماف و دادپەروەری ڕۆژئاوا. . . . و) گەورەترین هەیبەتیان لە کۆمەلگەکانی دەرەوەی ڕۆژئاوادا بۆ خۆ داڕشتووە.

هەر لێرەدا و بۆ داخستنی ئەم لایەنە دەمانەوێ ئەوەش بلێین کە دوای ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر ناحەزێ زۆر لەدونیا هاتەکایەوە دژ بە ئیسلام

کە مەلبەندی سەرەکی ئەو ناحەزیانەش ئەو شوێنانە بوو کە پرشی تیرۆریزمی بەرکەوتبوو کە پێش هەموو شوێنێ ئەمەریکا ناوزەددەکرێ. ئەمەریکا کە لە سەرەتادا بەهۆی مێدیاکانیەوە توانی پەیامێ تری بە جیهان بگەێنێ دواتر ڕەوانبێژی ئەم مێدیایانەی سەرلەبەر و بەجۆرێ گۆڕی کە وێنەێ ئەوتۆ لە دونیا دا دروستکا کە تیرۆریزم لە ئیسلام جووداوازە. هەر دوابەدوای ئەوە ولاتانی ڕۆژئاواش هەمان شتیان گرتەبەر. ڕەنگە ئەمە ئاماژەێ بێ لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ لەوە بگا کە مێدیای جیهانگیری بەدەست ئەمەریکاوەیە. ئەم جیهانگەریەی مێدیاش مانای سیاسی گلوبالی گەورەی بۆ مێدیا دروستکردووە. ئەلبەتە ئەم مێدیایە لەسەر ئەو بناغەیە دامەزراوە کە ئامانجی دروستکردنی زانیارییە و هەروەها گەیاندنی ئەم زانیاریەش. چونکە ئەم زانیاریانە بۆ ولاتانی نێتۆرك زۆر مانادارە و بەهۆشیەوە دەکارن وێنەێ زۆر لەسەر خۆیان دروستکەن. لەوە سەیرتر ئەو وێنانەی بەهۆی ئەم جۆرە مێدیایەوە دروستدەبێ تێگەیشتنێ زۆر لەسەر ڕوانینەکانی ولاتانی ناوبراو ئەخولقێنێ و گشت شوێنێکیش بە هی خۆی دەزانێ بۆ بلاوکردنەوە و پەخشکردن. هەروەها ئەم مێدیایە لە هەج کاتێ کە بیەوێ ئەمە دەکا و بەو شێوازەش کە خۆی دەیەوێ. سەبارەت بەم خالەش کاستێلس وای بۆدەچێ کە ئەگەر مێدیاکان دەستیان لە شێواندنی هەنێ دیاردە و ڕووداو هەبێ بەلام دەکرێ ئەو شتانە بگەنە نێت و لەوێدا بلاوکرێنەوە. هەر لەم بارەیەشەوە نموونەمان لەسەر گرووپی ئەنتی-جیهانگیریەکان بۆ دێنێتەوە کە دەتوانن لە نێت دا مومارەسەی چالاکیەکانیان بکەن کاتێ کە لە سەرجادەکان لەلایەن پۆلیس و دواتر لەلایەن مێدیاکانەوە بەرەنگاریدەکرێنەوە. دەشکرێ بلێین کە ئەمە لایەنێکە لەسەر نێتی گەیاندن و هەمووی نییە. چونکە نووسەرێ کەنەدی بەناوی ناومی کلاین Naomi Klein (49) لە کتێبێکدا لەژێر ناوی ( No Logo )، ووردتر لەمە جەوهەری مێدیای تازە ڕوندەکاتەوە. لەو سەفەرەش کە ناوبراو لە ئۆکتۆبەری 2001 دا، لەپاش ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر، بۆ ستۆکهۆلم کردی لە سمینارێ تایبەت بەم لایەنانە ئەوەی ڕوونکردەوە کە مێدیای گلوبال زۆر ووریایەنە سەرپەرشتی دەکرێ و دەشبرێتە ڕێوە. هەروەها کلاین لەو سمینارەدا ئەوەشی ڕوونکردەوە کە لە دوای ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەرەوە گۆڕانێ زۆر هاتۆتە سەر دۆزی مێدیا لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. ئەلبەتە مەبەستی کلاین لەم گۆڕانە ئەوەبوو کە مێدیای ئەمەریکی پتر لە جاران دەسەلاتی بەدەستەوەیە و هەروەها بەو جۆرە کاردەکا کە لەگەل داواکانی ولاتە یەکگرتووەکان کۆکە.

لەو شتە سەیرانەی کلاین باسیکرد ئەوەبوو کە سەرۆکی ئەمەریکی جۆرج دەبلیو بۆش پێش ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەر ناوی سەرۆکی پاکستانی موشەرەفی نەدەزانی(50). بەکورتی کلاین دەیەوێ ئاماژە بەوەبکا کە مێدیا شتێ زۆری بەدەستەوەیە و دەسەلاتی" مارکە موسەجەلە" ش دەسەلاتێ گلوبالە و ئەمەش سەرچاوەکەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە نەك جێیێ تر. ڕەنگە جیاوازی لەنێوان تەماشاکردنە کانی کاستێلس و کلاین ئەوەبێ کە کلاین تەنیا مێدیای نوێ بەنموونە وەردەگرێ بۆڕەخنە گرتن لە ئەمەریکا بەلام هەرچی کاستێلسە مێدیا بەبەشێ لە شەپۆلی جیهانگیری دەزانێ و پێیشیوایە کە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری سوودێ زۆری بە مێدیا گەیاندووە و توانایێ بەربلاویشی بەردەست خستووە. کاستێلس بۆ دروستکردنی ڕوانینەکانی لەسەر مێدیای زانیاری و ڕۆلی ئەم مێدیایە لە کۆمەلگەی تازە کەلکێ زۆری لە تەماشا کردنەکانی نیل پۆستمانNeil Postman وەرگرتووە کە ئەوەش بناغە بۆ ئەو جۆرە جیهانبینییە دادەنێ کە ماسمێدیا بەرهەمێ ئایدیۆلۆژی و سینیستە(51).

بەلام ڕەوانبێژی تیرۆریستەکان گۆڕانی نەهاتەسەر و سەرباس و بنیاسیان ئەوە بوو کە ئەوان لەتەك کوفر دەجەنگن و ئەم جەنگەش بێکۆتاییە و سەرجەمی ڕەوانبیژیەکانیشیان سەرچاوەی لە قوورئانەوە هەلدەگرت. با ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە تیرۆریستەکان توانیان پێش و پاش ڕووداوەکانی 11 ی سێپتەمبەریش نێت بۆ گەیاندنی پەیامەکانیان بەکاربەرن و بەهۆشیەوە ئەوە ڕوونکەنەوە کە ئەمان لەگەل دوژمنانی ئیسلام لەجەنگێ ئەبەدیدان. پەیامی تیرۆریستان گەر خۆ ئامادەکردن بووە بۆ خۆکوشتن لەپێناو نەهێشتنی کوفر پەیامی ئەنتی تیرۆریستەکان نەهێشتنی تیرۆر بووە بە جەنگ دژ بە تیرۆر. ئەو خۆ ئامادەکرنەش بۆ خۆکوشتن یان بەکشتێ کولتووری مەرگ دۆستی تەنیا تایبەت نەبووە بە گرووپی 11 ی سێپتەمبەرەوە بەلکو ئەوە بووە بە فۆڕمێ بۆ مانادان بە پەرچەکرداری و دژەگەراییەکان لە سەردەمی نوێ. لەم حالەتەدا دەکرێ باس لەو خۆکوشتنی بەکۆمەلەکرێ کە سالانێ لەمەوبەر لە سویسرا کرا یان هەولی زاپاتیستەکانی مەکسیك بۆ ماناداں بە داواکانیان یان ئەوانەی چەند سالێ لەمەوبەر لە میترۆکانی تۆکیۆ دەستیان کرد بە ڕشتنی گاز. ڕەنگە ئەمانە زۆر لاوەکیین لەبەرامبەر ئەو تاوانانەی لە ئاوشوێتز یان بۆسنیە یاخود ڕەوەندە یا هەلەبجە کراون. وەلی بەداخەوە فۆڕمە تێکەلەکانی ژیان و هەلە هاوبەشەکانی مرۆڤ لە مێژوودا هەمیشە لە توانایدا بووە ئەم جۆرە خۆکوشتن و ئەویترکوشتنانە دروستکا و ماناشیان بداتەپال.

# زانیاریگەریی و جیهانگیریی

## خولقانی جوگرافیای نوێ یان مەرگی جوگرافیا؟

### جیهانگیری زانیاری

کۆمەڵناسی وەك پۆلێ لە پۆلەکانی زانستە مرۆییەکان لەگەڵ هاتنەپێشەوەی قسەکردن لەسەر دیاردەی جیهانگیری زۆرترین ئاوڕدانەوەی لەم دیاردەیە داوە. لەماوەی سالانی نەوەتەکان لە زۆربەی زانکۆ و ئینستیتووتەکانی ڕۆژئاوا سمینارێ ئەکادیمی زۆر گێڕدرا و کتێبێ زۆر لەلایەن ڕوناکبیر و بیریارو و ڕۆژنامەوانانەوە لەسەر ماهیەت و کاریگەری ئەم دیاردەیە بەسەر ژیانی نوێوە نووسرا. ئەوی لە دەرەوەی ڕۆژئاوا لەبارەی ئەم دیاردەیەوە وترا تاڕادەێ زۆر جیاوازتر بوو هەروەها لە چوارچێوەێ ڕەخنەی بێ سەروبەریش نووسرابوو. چونکە ڕوونکردنەوەکان بەزۆری هەولدان بوون بۆ وەسفکردنی ئاکامەکانی ئەم دیاردەیە نەك شیکردنەوەی بارودۆخی سەرهەلدانی ئەم دیاردەیە و ئەمجار پێشبینیدان لەسەر ئاییندەی ژیانی ئابووری و سیاسی و دۆزی کۆمەلایەتی و کولتووری دانیشتوانی سەرزەوی. بۆیە لێرەدا دەمانەوێ ئاسۆێ گەورەتر لەبەردەم تێگەیشتن لە چاخی ئەمڕۆمان بکەینەوە ئەوەش بەهۆی باس هێنانەپێشێ لەسەر زانیاریگەریی و بینینی کاریگەریەکانی ئەمە لە جیهانی گلوبالدا. زانیاریگەریش وەك بەرهەمی ڕاستەوخۆی عەقلانیەتی ڕۆژئاوا فۆڕمی تری بە کێشەکان داوە و ڕەهەندی دی خستۆتە ناو ژیانی ئەمڕۆوە. ئەمەش مانای ئەوەیە کە چارەنووسی مۆدێرنیتێ بەدەست جیهانگیرییەوە نییە بەلکو بەپێچەوانەوە جیهانگیری خۆی بریتییە لە مۆدێرنیتێ و زانیاریگەریش دوا شمەکی زانستی ڕۆژئاوایە. بۆ هەندێ لە کۆمەڵناس و تیۆریزەکەرە سیاسی و کۆمەلایەتیەکان کاتێ کە باس دێتە سەر جیهانگیری قسە لە سێستەمی سەرمایەداری دەکرێ. لێرەدا دەکرێ کۆمەڵناسی ئەلەمانی ئولریش بێك، کە کلاسیکەرێ مۆدێرنە، بەنموونە بهێنرێتەوە. بەلام بۆ هەندێ تر جیهانگیری باسکردنە لە پرۆژەی مۆدێرنەی ڕۆژئاوا و ڕۆلی ئەمە لە دروستکردنی وتارێ ئونیڤێرسالی (گەردوونای) و

وانستێ موجەرەد. لێرەدا دەکرێ زیگمۆنت باومان بەنموونە وەرگیرێ. بەلام بۆ هەندێ تر جیهانگیری باسە لەسەر زانیاریگەری. ئەم زانیاریگەریەش ڕێگایەکە بۆ سەرمایەداری جیهانی تا خۆی لە بوونیادێ ئابووری و کۆمەلایەتی کلاسیکەوە بەرەو بوونیادێ ئابووری و کۆمەلایەتی نوێ بەرێ. لەم حالەتەدا دەشێ باس لە کاستێلس کرێ(52).

پێش ئەوەی بێینە ناو گفتووگۆکەمان لەتەك کاستێلس دەمانەوێ ئاماژە بۆ ئەوەبکەین کە لەم سالانەدا باسێ زۆر هاتۆتە پێشێ لەسەر جیهانگیری و بەشێ زۆر لەو باسانەش لەسەر جیهانگیری ئابوورین. بەشێ لە باسکەران ئەو گەشەکردنە ئابووریەی لەمیانەی جیهانگیری ڕوویداوە بەشتێ پۆزەتیڤ دەزانن و باوەڕیان وایە کە لیبڕالیزمێ گلوبال لە پشت دروستبوونی دادپەروەریێ گەورەوە دەبێ و ئاستی ژیانیش لەگشت جیهان ڕوو لە بەرزبوونەوە دەنێ. وەلی هەنێ کەسیتر لەوانە ڕۆژنامەوانانی Spiegel (Schumann & Martin) لە کتێبی (پۆلی جیهانگیری) زۆر ڕەخنە لە جیهانگیری دەگرن و پێشیانوایە کە لەژێرسایەی ئەم جیهانگیرییە کۆنتڕۆلی لۆکال بەسەر ئابووری لەدەستدەچێ و هەروەها ئەم جیهانگیریەش دەبێتە هۆی بەنێوەندکردن وەکیتریش دەبێتە هۆی وابەستەیەتیش(53) بۆ هەندێ لە لێکۆلەرەوانی تر دەکرێ جیاوازی لەنێوان چەند جۆرە جیهانگیریێ کرێ لەوانە جیهانگیریێ باش، جیهانگیریێ خراپ و. . . هتد(54).

وەکی تریش دەشێ باس لەوەشکرێ کە کەم ڕۆژنامە و گۆڤار هەن باسیان لەسەر جیهانگیری نەهێنابێتە پێشێ. حودی باسەکانیش بەجۆرێ واتای جیهانگیرییان بەرباسخستووە کە هەمیشە باسێتر دەبێ لەتەك جیهانگیریەوە بەرباسخرێ کە زۆربەی ئەو باسەنەش لە دەوری ئەوە دەخولێنەوە کە ئەلتەرنەتیڤێك بۆ جیهانگیری دروستکرێ. بەلام ئەو نووسینانەی لەئاستێ ڕەسمی دەنووسرێن باس لەم جیهانگیرییە بەجۆرێ دێننە پێشەوە کە هەمیشە ئەو مەرجە لەبەردەمماندا دادەنێن کە تێگەیشتمان بۆ گۆڕانە گلوبالیەکان بگۆڕین و ئاکامی ئەم گۆڕانە گلوبالیانەش بەجۆرێ لاواز نەبینین.

بەلام هەرچی کاستێلسە بۆ تیۆریزەکردن بەسەر جیهانگیری کۆمەلناسیەك بەرهەمدێنێ و واش لە پۆلی کۆمەلناسی ڕۆژئاوا دەکا کە شوێنێ بۆ قسەکردن لەسەر نەك هەر جیهانگیری تەرخانکا بەلکو زانیاریگەریش تەرخانکا. پاشان کاستێلس کارەکەی بە مێتۆدێ نووسیووە کە سەرنجێ ئەوتۆ لای خوێنەری دروستدەکا کە قسەکردن لەسەر جیهانگیری ئابووری بە قسەکردن لەسەر

جیهانگیری زانیاری وابەستەیە و ئەو دیاردانەش لە ئاکامی ئەم وابەستەییتیەی ئەم دوو جیهانگیرییە دروستدەبێ جەمسەری گۆڕانەکان دەستنیشاندەکا و ئەمڕۆمان ڕووندەکاتەوە. ئەمەش کاستێلس هەرزوو کاری بۆکرد، بۆنموونە کە لەتەك پێتەر هالPeter Hall کارێ هاوبەش پێکەوە دەنووسن (لەژێر ناوی جەمسەرەکانی تەکنیك، 1994) پێیان وایە کە سەردەمی زانیاری دیاردەی تازەی ڕادیکالی لەگەل خۆهێناوە (55)، بەلام گرینگە ئەوەمان لاڕوونبێ کە ئەم دیاردە ڕادیکالانە تاچ ئەندازەییەك دەتوانن بەشداری لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەکانی کۆمەلگە گلوبالیەکان بکەن. ڕاستە کاستێلس لە سەرجەمی کارەکەیدا هەولدەدا ئاکامەکانی پاڕادیگمی زانیاری ڕوونکاتەوە وەلی ئەم ئاکامانە لە گۆڕانی بەردەوامدان و ئەمەش وادەکا گۆڕانی کۆمەلایەتی هەمیشە لەئارادابێ و کۆمەلگەی تازە جێگیری بەخۆوە نەبینێ. بەواتای تر کاستێلس گەلێ شت بەرباسدەخا کە تیایا مەبەستی ئەوەیە ئێمە لەژێرسایەی زانیاریگەری کەوتووینەتە ناو تازەگەرییەوە و ئەم تازەگەریانەش بوونیادی کۆمەلایەتی ئێمەیان سەرلەبەر گۆڕیووە. تازەگەریەکان وایانلێکردووین هەموو لەهەر شوێنێکدا بژین بە بازاڕی مالیەوە ببەسترێینەوە. چاومان بەچرکە لە بازاڕی دراو گۆڕینەوە نەترووکێنین. دۆزی ئابووری جیهانیش بەجۆری کاری خۆی دەکا کە" " دۆلار وەك چەکێ بەکاردەبرێ و گەشەی ناوخۆی ئابووری ئەمەریکیش هەمیشە کاریگەریی خۆی بەسەر بەشێ زۆر لەئابوری جیهان بەجێدێلێ(56). ئەوە هەر کوردستان یان ئێران یاخود ڕووسیا نییە کە مرۆڤەکان تیایا هەمیشە لە نرخی دراوی نیشتیمانی بەوردی بەئاگان بەلکو هەموو جیهانە و گشت پلانێتی ئەمڕۆمانە. "گشت کۆمەلگە- سیاسەت، مێدیاکان، ژیانی کولتووری و پەیوەندییە مرۆییەکان — بە بۆڕسەوە گرێدراوە و کێشەکانی ئەم بۆڕسەیەش کاردەکاتە سەر ئەم کۆمەلگەیە"(57) و بەبێ ئەوەی زۆربەی مرۆڤەکانی ئەم کۆمەلگەیە لەبواری ئابووری کەسێ پسپۆڕبن بەلام ناڕاستەوخۆ کەوتوونەتە ناو زانیاریێ ئابووری وشکەوە کە ڕۆژانە لە گۆڕاندایە.

وێڕای ئەوی لەسەرەوە باسکرا ئەوەش دەلێین کە تازەگەریەکانی تەکنیکی نوێ، کە سەرچاوە لە شۆڕشە تەکنیکیەکانی لەمەوبەری ڕۆژئاواوە وەردەگرێ، گشت بوارەکانی ژیانیان گرتۆتەوە و ئەمەش کارێ وایکردووە کە هەموو لەهەرجێیێ لەسەر ئەم گۆی زەوییە بژین چارەنووسمان بەو تازەگەریانەوە گرێدراوە کە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری تازە پێشکەشمانی دەکا. ئەوەتا

موغامەراتەکانی ژێنەتیك و چاندنی ئەندام و کۆپیکردن و نەشتەرگەری کۆسمۆتیك(جوانکاری) ج خورپەیەك دروستناکەن. گەشەی بازاڕی مالی ئەلەکترۆنی گلوبال و بلاوبوونەوەی بەگشت شوێنێکدا، بوونی سەرمایەداری بە سێستەمێ ئابووری زانیاری و هەولی بۆ مۆنۆپۆلکردنی گشت سەرزەوی، یان بوونی ژیان بە دەزگاێ ئابووری و بوونەوەریش بە خودی ئابووری ج گرفتێ نێودەولەتی لەگەل خۆ دروستنەکردووە. زۆربوونی بەکاربردنی تەکنیك لە گشت بوارێ لە ژیانا و هەروەها کاریگەریی ئەمە بەسەر بەرزبوونەوەی ڕادەی تەنیایی و دەوورەپەرێزی و پەرتی کۆمەلایەتی و هەلوەشانەوەی دابونەرێتی خێزان و وێرانسازیەکانی ژینگە ج نەهەماتی و سەرگەردانیەکی نەهێناوەتەکایەوە. کۆبوونەوە لەشارەکان و بوونی شار بە حووتێ بۆ قووتدانی دەوروبەر و هەروەها بوونی ئەم شارە بە کارگەێ ئەلەکترۆنی ج سەرابێ جوگرافی و دیمۆگرافی دروستنەکردووە. هەروەها ئاوابوونی ئایدیۆلۆژیای کۆمۆنیزم و گۆڕانی تێگەیشتنە کۆلێکتیفیەکان بە ئیندڤیدوالیتێ ترسناك، نەمانی مەترسی جەنگی سارد و هەڕەشەی سەربازگەریی سۆڤیەتی و جێگرتنەوەی بە دیاردەی تیرۆریزم و جیهانگیریێ ئابووری ج تێنەگەیشتنێکی سیاسی و کۆمەلایەتی نەهێناوەتەکایەوە.

ئەوی کاستێلس دخوێنێتەوە لەوەدەگا کە باسی جیهانگیری دەبێ بایەخێ گەورەی بدرێتێ، بەلام ئەم بایەخە ناشێ لە دیاردەی زانیاریگەری دوورخرێتەوە. ئەمەش نەك تەنیا لەبەرئەوەی زانیاریگەری لەژیانی جیهانگیریدا هەییەتی گەورەیە بەلکو لەبەرئەوەش کە سەرمایەداری زانیاری کە زۆرترین و بەهێزترین دەسەلاتی دروستکردووە ئەم دەسەلاتە بۆ سێستەمە ئابووری و سیاسیەکەش زۆر مانائامێزە و کاستێلسیش تیۆریزەێ زۆر لەبارەیەوە دەکا، کە بەدەگمەن کۆمەلناسێك لە سەردەمی ئەمڕۆماندا توانیوویەتی ئەم کارە بکا. بۆیە ئەوەی لەدوویتوێی ئەم باسەدا تایبەت بە جیهانگیری باسدەکرێ لە چوارچێوەی ئەو باس و خواسانەیە کە تایبەتن بە ڕەهەندی توێژینەوە و ڕوانینەکانی کاستێلس نەك خودی جیهانگیری وەك باسێ تایبەت. چونکە گەربێتوو جیهانگیری وەك دیاردەێ تایبەت وەرگرین لەحالەتەدا پێویستمان بە لێکدانەوەی ڕیشەی مێژووی ئەم دیاردەیە دەبێ هەروەها ڕوونکردنەوەی ئاڕاستە ئابووری، سیاسی، کولتووری و تەکنیکیەکەشی کە ئێمەش نیازمان ئەوە نییە ئەمە بکەین.

## شیاوکردنی واتای تر بۆ جوگرافیا

جیهاگیری بە بناغە زانیاریاویەکەیەوە ئەوەمان یاددەخاتەوە کە گۆڕینی جوگرافی گەورە بەڕێوەیە. ئەو گۆڕانە جوگرافیەش لەسەر بناغەی ناتەبایی و پەرتی بوونیادنراوە نەك شتێتر. ئەمەش وامانلێدەکا باس لە هاتنەکایەوەی تێگەیشتنێ جوگرافی تر بۆ جیهان یان خولقانی جوگرافیایێ نوێ بکەین. کاتێ کە گەشەی ئابووری –سیاسی و کۆمەلایەتی بەشێ زۆر لە جیهان بەسەردەکەینەوە دەبینین گۆڕانی جوگرافی گەورە لە جیهانا بەڕێوەیە. بەلام ئەم گەشە و گۆڕانە مانای ئەوە نییە کە ئێمە بەرەو چاخێ تەبا و یەکسان دەڕۆین. بەلکو ئەم گەشە و گۆڕانە هەر لەسەرەتاوە بەزۆر و بەپەلە ئەنجامدراوە و لەژێرسایەشیدا چەندین ناوچەی دواکەوتوو و فەرامۆشکراو لەدایکبووە. خودی ئەو هۆنکۆنگەی کە ئەمڕۆ وەك ناوچەێ تازەی جوگرافی لە بازاڕی ئابووری گلوبال تەماشادەکرێ شوێنێکە بۆ دروستکردنی ناتەبایێ کۆمەلایەتی و ئابووری و هەروەها دالدەیەك بۆ پەیداکردنی بێکاری و بێ مالی و هەژاریی. تەنانەت ئەمە لەو شوێنانەش دووبارەدەبێتەوە کە دەیانەوێ ناوە کۆنەکانیان بسڕنەوە و ناوی دی بۆ خۆیان داڕێژن وەك مۆسکۆ ی ئەمڕۆ یان یان پراگ یاخود ساوپالۆ.

هەر بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی ئەم لایەنە (واتە دروستبوونی تێگەیشتنی نوێ بۆ واتای جوگرافیا) دەگەڕێینەوە لای کاستێلس و ئەو باسەی سەبارەت بە هەلوەشانەوەی ستاتۆسی سیاسی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو باسیدەکا. ئاشکرایە کە لەپاش دارمانی یەکیەتی سۆڤیەت فۆرمێ کۆمەلایەتی تر لە ڕسیا و ولاتانی تری ئەوروپای ڕۆژهەلات دروستبوو. بەلام دروستبوونی ئەم فۆرمە نوێیە پێوەندی بەوەوە بوو کە ئەو شێوە ئابوورییە سەربازی و دەولەتیەی یەکیەتی سۆڤیەت گرتییەبەر ڕێگای لەوەگرت کە بکارێ لەگەل ئەو فۆرمە کۆمەلایەتییەی بەناوی نێتۆرك هاتەکایەوە بکەوێتە پێشبرکێوە. بەدلنیاییەوە ئەمەش گرنگی لە هەلوەشانەوەی ئەم یەکیەتییە دی و مانایێ تر بۆ جوگرافیا لەڕووی سیاسی و ئابووریشەوە دروستبوو. بەواتێ تر دروستبوونی ئابووری نوێ لەسەر بناغەی زانیاریگەریی و لە کۆمەلگە سەرمایەدارییەکانا مانای خۆی بۆ هەلوەشانەوەی بلۆکی سۆسیالیزم دی و ئەم زانیاریگەریەش دۆزێ جیهانی ئەوتۆی لەگەل خۆ هێنا کە ئەوی بکەوێتە دەرەوەی بازنەی پاڕادیگمی تەکنەلۆژییای زانیارییەوە بێتوانا دەبێ لەوەی کە ببێ بە خاوەنی ناسنامەیەکی کولتووری و سیاسی خۆی. بەمە گشت بە یەك جوگرافیاوە وابەستە دەبن کە

ئەوەش جوگرافیای ولاتانی نێتۆرکە کە لەسەر مانای ئابووری دروستدەبێ نەك شتێ تر. یان گشت نەتەوە و ناوچە جوگرافییە جیاجیاکان لە هەولی ئەوەدان لە میانەی هاتنەناوەوەی بازاڕی گلوبال و بەشداریکردن لە کڕین و فرۆشتنێ کە لەسەر بناغەی زانیاریێ بالا بوونیادنراوە مانا بە بوونی جوگرافییان بدەن. ئەمەش بارێ ئەوتۆ دێنێتە پێشەوە کە هەموو کەس و شوێنێ یان هەموو جوگرافیاکان وەك یەك نەتوانن بێنە مەیدانی بازرگانی گلوبالەوە و بۆیشە خۆیان بە جوگراقیایێ دیاریکراوە دەبەستن کە ئەوەش ولاتانی ڕۆژئاوا یان چاترە بلێین ولاتانی نێتۆرکە. ئەم ولاتانەش دەبن بە سەرنجڕاکێشترین ناوچە و زۆربەی شیاویەکانی ژیان و تواناکان لەوێدا کۆدەبنەوە.

واتە گەلێ لە جوگرافیاکان ئەو قوودرەتەیان نییە کە هاوبەشی لە بەرهەوپێشەوەبردنی ئابووری نوێ بکەن کە بناغەێ تازەی هەیە و، یان لەبەرئەوەی بەشێ زۆر لە ناوچە و یاخود نەتەوە و کۆمەلگەکان جارێ لە قۆناغی پێش شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازین (واتە کشتووکالی) و تەنانەت هەنگاوەکانیان لەبواری بەرهەمهێنانی پیشەسازییش گەلێ لاوازە(دیارترین نموونەش ولاتانی عەرەبی و ئەفەریقییە) بۆیە بەوە مەحکوومن کە خۆیان لەگەل سێستەمی سیاسی و ئابوری نوێ تێهەلکێشکەن. هەر لەبەرئەوە دەکرێ دەرك بەوەکرێ کە دروستبوونی ولاتهایەك بوونیادنراو لەسەر ئابوورێ نوێ، ولاتهایەك کە قۆناغی بەرهەمهێنانی پیشەسازی تێپەڕاندووە نەك هەر گەیشتۆتە قۆناغێ دواتر(واتە قۆناغی پاش پیشەسازی) بەلکو بەقۆناغێکیش گەیشتووە کە هەموو بوار و کەرتەکانی بەرهەمهێنانی بە لۆژیکێ تازە لە بەرهەمهێنان بەستۆتەوە کە دەکرێ ناوی لۆژیکی بەرهەمهێنانی زانیاری لێبنرێ، دەستی لە گۆڕینی واتای جوگرافیا و مانای شوێن هەیە. ئەمەش بەدلنییاوە کارێ وایکردووە کە ڕووبەری جوگرافی ولاتانی ناوبراو بەرینتر و پڕ لە شیاویش بێ.

هەر سەبارەت بەو تێگەیشتنە نوێیەی جیهانگیری زانیاری بۆ واتای جوگرافیا ناکرێ ئەوە لەیادکەین کە ئەم تێگەیشتنە نوێیە ناتوانێ نکولی لەوەبکا کە دروستبوونی ئەم تێگەیشتنە نوێیە لەسەر بناغەی پەراوێزکردنی هەندێ ناوچە و شوێن و یان جوگرافیا و ئابووری نەبووبێ. ئەم دیاردەیش لەگەل جیهانگیری زانیاریدا نەهاتۆتەکایەوە و بەلکو لەمەوبەر و لە قۆناغەکانی گشت سەرمایەداری لۆکالی و گلوبالیشدا بوونی هەر هەبووە و بێکاریگەر نەبوو. بەلام ئەوەی لەم حالەتەدا نوێیە ئەوەیە کە بەهاتنی ئابووری زانیاری و

قەتیسبوونی ئەم ئابووریەش لەناو یەك جوگرافیا دیاردەی ئەو پەراوێزکردنەی ئالۆز و گومڕا کردووە و پێوەندیەکانی نێوان ولاتانی نێتۆرك وغەیرە نێتۆرکیش بەجۆرێ خۆی دەردەخا کە دەستی لە دروستکردنی ئەم ئالۆزی و گومڕایە هەیە. واتە ئەوەی کە ناوی پەراوێزخوازی دەدرێتە سەر هەندێ ئابووری و ناوچە و یان بوونی نێوەندگەرایێ نوێ کە لەسەر بناغەی زانیاریگەریی دادەمەزرێ ئەمە ئەو فۆڕمە نوێیانەن کە لە ئاکامی جیهانگیری زانیاری دروستدەبن. پاشان نابێ ئەوەش پشتگوێخەین کە ئەم دیاردەیە (پەراوێزخوازی) تەنیا لەنێوان ئابوورییە زانیاریاویەکان و ئابوورییە پاشکەوتووەکانا ئامادەنییە بەلکو لەناو خودی ئابوورییە زانیاریاویەکانیشدا ئامادەیە. واتە ڕۆژانە ناوچە و جێگای تازە نەك لە جیهانا دروستدەبێ بەلکو لەناو خودی ڕووبەری ولاتێ دیاریکراویش دروستدەبێ. ئەوەتا لە چین ڕۆژانە ناوچە و یان شاری نوێ دروستدەبێ یان لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا بەبەردەوام شوێن و شارۆچکەی تازە دێنە دونیاوە کە دواتر دەبن بە نێوەندی زانیاری و بازرگانی نوێ بۆ خودی ئەمەریکا و ئەمجاریش جیهان. لەسەر ئاستی گلوبالیش دەکرێ دەرك بەم لەدایکبوونەی ستاتۆسی جوگرافی نوێ بکرێ ئەوەش لەسەر ئەو بناغەیەی کە ئەو شوێنە نوێیانە دەبن بە مۆلگەی کاری ئابووری و زانیاری چڕ و بالا. هەر دوور نەڕۆین ئەو زۆنە نوێیەی کاستێلس باسیدەکا بەناوی زۆنی ئۆقیانووسی ئارامی ئاسیای (هۆنکۆنگ، مالیزیا، تایوان، ئێندۆنیسیا) نیشانەیە لەسەر ئەو پەرتیەی دووچاری نەخشەی نوێی جیهان بۆتەوە. ئەلبەتە لە شوێنێ وەك جیهانی عەرەبی و ئەفەرقیش ئەمە ڕوویداوە. بۆنموونە دەرکەوتنی میسر وەك ولاتێ لە جیهانی عەرەبی و دواتر ئەفەریقیش هەروەها بوونی قاهیرەش بە چەقێ بۆ چالاکی ئابووری و بازرگانی ڕووێکە لە گۆڕانی جوگرافی بەمانا جیهانگیریەکەی. یان بەرازیل لە ئەمەریکای لاتین و ئەمجار پایتەختی ئەم ولاتەش کە دەیەوێ ببێ بە نێوەدێ مالی و بازرگانی لە قارەی ئەمەریکای لاتین. بەلام هەموو ئەو گۆڕانە جوگرافیانە فۆڕمی تری لە دەستکورتی و بێکاری لەگەل خۆهێناوە کە لەگەل فۆڕمە کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی پێشوو جوداوازە و یان بووەتە هۆی کۆبوونەوەی توانا و دەسەلات بە دەست چەند کەس و شوێن و توێژێکەوە کە ڕەنگە پێشتر بەدەست هەندێ دەزگای حیزبی و سیاسی و دامەزراوی دەولەتیەوە بوو بێ.

سەرباری ئەوی ووترا، جیهانگیری زانیاری لە توانایدایە چەند جۆرە کۆمەڵگەیێ(خێزانێ) دروستکا و لەناو گشت کۆمەڵگەیەکیش (خێزانێکیش) جۆراوجۆریێ زۆر بەرهەمبهێنێ. ڕاستە جیهانگیری ناوبراو کاری نوێ و بالا دەدۆزێتەوە بەلام ڕۆلی لە ونکردنی گەلێ جۆرە کار و پیشەی تر هەیە و بەهۆی ئەمەشەوە گەلێ توێژ و دەستەی تازە دێنە دونیا (ئەندازیاری کۆمپیوتەر و ئەلەکترۆنیکەری لاو و پسپۆڕ لە بواری ئابووری مالی و ئیدارەی بۆرسە) و بوونی خۆیان بە بوونی زانیاریگەریەوە گرێدەدەن. بۆیە دەکرێ بلێین گۆڕانە جوگرافیەکان کە لە ئاکامی گۆڕانی ئابووری و کۆمەلایەتیەوە دروستدەبن قووربانیێ زۆر دەخەنەوە و لەپێش هەمووشیەوە ئەو ناوچە و جێگا و یان کەس و چینانە لەناو دەچن کە تەنێ لە هێزێ کاری دەستی و پیشەی ناکارەما و بێ زانیاری زیاتر شتێ ئەوتۆ شك نابەن. تەنانەت دروستبوونی جیاوازیش لە مووچە لایەنێ تری ئەو نەهامەتیانەیە کە زانیاریگەری لەگەل خۆی دەیهێنێ و دەبێتە هۆی دروستبوونی نەك تەنیا ناوچە و یان شاری جیاجیا بەلكو توێژ و خێزانی جیاجیاش. ئەمەش كاریگەرێ زۆر بەسەر ڕادەی ژیان و ئاستی كۆمەلایەتی و كولتووری خەلكەوە بەجێدێلێ و ئاستی زانیاری كەسەكان دەبێ بە خالی جیاكارەی كۆمەلایەتی و سیمبۆلی كولتووری نوێش دروستدەكا. بۆیە شارو یان ناوچە زانیاری و مالیەكان دەبنە بە شوێنهایەكی سەرنجڕاكێش و دانیشتوانەكانی لەئاكامی گۆڕانەكای جیهانگیری زانیاری دەبنە بە چەند پۆلێكەوە و خەلكێ زۆر لەم جێگایانە شێوە ژیانێ كۆچەرانە و پەناهەندانە دەژین. ئەمەش لەبەرئەوەی كە مانای شوێن بە مانای كار و ئەویش بە مانای پارەوە گرێدەدرێ. بۆیە جیهانگیری زانیاری نایەوێ مانایێ ئەفسووناوی بۆ شوێن و زێد داتاشێ و بەلكو لەبڕی ئەوە دەیەوێ ئەو شوێن و زێدانە بكا بە شوێن و زێدی هەموان كە بووە مۆلگەی دروستكردنی پارە.

## جیهانگیری زانیاری و ڕۆلی لە خولقاندنی ناسنامە

ڕوانین و توێژینەوەكانی كاستێلس لەسەر چاخی زانیاری ڕێگا لەبەردەم قسەكردن لەسەر جیهانگیری دەكاتەوە، ئەو باسەی پتر لەگشت باسێ تر لە سالانی 1990 كان ورووژێنەر بووە. ئەم باسەش گەلێ بەشی لێدەبێتەوە كە گرنگترینیان ئەو تێمایەیە كە كاستێلس سەبارەت بە ڕۆلی زانیاریگەری لە خولقانی ناسنامە پێیناسراوە. بۆیە بەلامانەوە گرینگە كە هەر لەم سەرەتایەوە

بێینه سەر ئەو تێمایە و ئەو لایەنانەش بەرباسبخەین کە کاستێلس پێیوایە تازەن و هەروەها بە دیاردەی جیهانگیری زانیاریەوە بەستراونەتەوە.
بەپێی تێگەیشتنی کاستێلس ئەو جیهانە نوێیەی تیای دەژین سەرچاوە لە سێ پرۆسێسەوە هەڵدەگرێ: 1- شۆڕشی تەکنەلۆژیای زانیاری، 2- سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی ئابووری کە بەهۆی قەیرانی سەرمایەداری و سۆسیالیزمەوە هاتەکایەوە، 3- سەرهەڵدانی بزوتنەوە کولتووری کۆمەلایەتیەکان. ئەوی سێهەم بۆ کاستێلس مانای زۆرە و دەبێ بە دەروازەیەك بۆ قسەکردن لەسەر مافە مرۆیەکان و یەکسانییە ئیتنیەکان. لێرەوە کاستێلس دەیەوێ باسێ تایبەت لەسەر سیاسەتی ناسنامە بهێنێتە پێشەوە. ئەم باسانەش بەو گۆڕانکاریانەوە پشت بەست دەبن کە زیانیاریگەری دەیهێنێتە پێشەوە. واتە ئەو شیاویانەی تەکنیکی نوێ لەبەردەم ئیندڤید دروستیدەکا تا بێتە ناو نێتەوە. ئەمانەوێ بڵێین کە کاستێلس ئەو کۆمەڵناسەیە دەیەوێ ئەوەمان یادخاتەوە کە گەشەی کۆمەڵگەی زانیاری پرسیار دەخاتە ڕوو لەمەڕ چۆن ناسنامە لەژێرسایەی هەلاوگۆڕانەکانی تەکنیکی نوێ ئەخولقێ و ئەو فۆڕمە کۆمەلایەتیە نوێیانە چین کە لە ئاکامی گەشەی تەکنکیی نوێ دێتەکایەوە و خۆشی باوەڕێ زۆری بەوەیە کە ناسنامە فۆندەمێنتێ کۆمەلایەتییە و سەرچاوەی کردەکانیشمانە. هەر لەمیانەی کاستێلسەوە لەوەدەگەین کە جیهانگیری زانیاری مانای بۆ دروستکردنی ناسانەمەش داهێناوە و فۆڕمێ جۆراوجۆری لەم ڕووەوە پراکتیزەکردووە یان ناسنامەی تازەی خولقاندووە (ئاشتیخوازی، دۆستانیژینگە، فێمینیزم، ئەنتی- جیهانگیری -ئەتاك-). ڕەنگە لێرەدا ئەمانە خوێنەر بەرەو ئەو سێرکردنە بەرن کە خولقانی ناسنامە لەژێر کاریگەری نێت باس لە ناسنامەی کۆلێکتیڤی دێنێتەپێشەوە. ئەمەش تاڕادەیەك و بەپێی تەماشاکردنەکانی کاستێلس بۆ ناسنامە بەو مانایە دەکەوێتەوە کە ئیندڤیدەکان لەناو ئەو بزووتنەوە کۆمەلایەتیانە پێکەوە کاردەکەن و، هەروەها بەجدی تێدەکۆشن بۆ هێنانەکایەوەی ناسنامەێ هاوبەشی دژیش (کاستێلسیش لە بەرگی یەکەم و دووەمی چاخی زانیاری بناغەێ زۆر بۆ ئەم باسانە دادەنێ) (58).
سەرباری ئەوەی لەسەرەوە ووترا دەمانەوێ ئەوەش بلێین کە زیادبوونی مانای بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان بەتایبەت ئەوانەی وەك بزووتنەوەهایەکی پەرچەکرداری دژ بە جیهانگیری و زانیاریگەریی گەشەدەکەن ئەو جۆرە ڕوانینانەن کە ئاستێ تریان هەیە. لە لێدوانێکیش کاستێلس پێوەندیێ زۆر لەنێوان بزووتنەوەی سەوزەکان و بۆنموونە ئەوی لە Genua لە ئیتالیا

ڕوویدا دەبینێتەوە. چونکە کاستێلس پێیوایە ئەوی لەوێڕا ڕوویدا جۆرە بزووتنەوەیەکی ڕادیکالی بوو کە تیایا ئامانج گۆڕانی جیهان بوو. ئەمەش لەبەرئەوەی کە بەهاکان پێوەندیان بە ئازادییەوە هەبوو(59). مرۆڤ لەمیانەی قسەکانی کاستێلس بە ئاسانی دەرك بەوەدەکا کە ناوبراو دەیەوێ باس لە ڕۆلی ئەم بزووتنەوانە لە دروستکردنی ئیندڤیدوالیزم (تاکگەڕایی) و ئازادی دەکا. هەروەها کاستێلس لەم لێدوانەدا گرنگی بەوەش دەدا کە تەکنەلۆژیا و ئابووری گلوبال و بزووتنەوە کۆمەلایەتی و کولتووریەکان هەموو پێکەوە ڕۆلیان لە هێنانی کۆمەلگەی نێتۆرك دا دیووە. تەنانەت ئەوی لە Seatlle لە ئەمەریکادا ڕوویدا بەوە لەقەلەم دەدا کە ئەوانە نوێنەرایەتی دامەزراوە دیموکراسیەکان دەکەن. ئەگەرچیش ئەم بزووتنەوانە لە شەپۆلی جۆراوجۆر پێکهاتوون بەلام هەموو خۆیان وەك بەرهەلستیکەری جیهانگیری دەزانن و هەولی ئەوەش دەدەن کە سێستەمی سیاسی نوێ دەخەنە ژێرپرسیارەوە. هەر لەم بوارەشدا دەکرێ ئاماژە بەوەش بکەین کە بەپێی بۆچوونی کاستێلس بەشێ لە دیاردەکانی سەردەممان ڕوونکردنەوەی خۆیان لە جیهانگیری ئابووریدا دەبیننەوە. ئەو دیاردانەش هەر لە ڕووخانی یەکیەتی سۆڤیەت و گەشەی فۆندەمینتالیزمەوە دەگرێتەوە تادەگاتە یاخیبوونی زاپاتیستەکانی مەکسیکۆ و میلیشیا ڕاستڕەوەکانی ئەمەریکا و Aun Shinrikyo، واتە ئەوانەی گازی ژەهراوییان لە میترۆکانی تۆکیۆ بلاودەکردەوە.

بەخۆی کاستێلس بینینەکانی لەسەر گەشەی بزووتنەوەکان لەسەر مۆدێلی شیکردنەوەکانی ئالان تۆرێن بوونیاددەنێ و بایەخێ زۆریش بە ئامانجە کۆمەلایەتی و پەرچەکرداریەکانیان دەدا. ئەو بزووتنەوانەش هەروەك دەردەکەوێ دژایەتیێ ڕاستەوخۆی سیاسەت و ئابووری و کولتووری گلوبال دەکەن. هەریەك لەو بزووتنەوانەش بەجۆرێ هەولی ئەوە دەدەن کە ئەو دژایەتیەیان لە نێتدا نیشانبدەن، بۆنموونە نازیە سویدیەکان یان ئیسلامیە توونڕەوەکان و یاخود گرووپی Attac، هەروەها بناغە بۆ بنەمای ئایدیۆلۆژیان دابنێن. ڕەنگە گەلێ لەم بزووتنەوە کولتووری و کۆمەلایەتیانە لە گۆڕەپان و لەسەر جادەکانی ئەورووپا دووچاری زەبرووزەنگی پۆلیس بن بەلام دەتوانن زۆر بەئاسانی بچنە ناو نێتەوە و باس لە داواکانیان بکەن. ئەم داوایانەش لەئەمڕۆدا زۆر گەشەی کردووە و بناغەی بۆ چالاکیێ زۆر یەکانگیر و گشتی داناوە. ئەلبەتە کاستێلس بەشێ لەم بزووتنەوانە وەك ڕێکخراوهایەکی ئەوتۆ تەماشادەکا کە هەولی گەڕانەوەی چرکە مێژووییەکانی

لەمەویەرمان دەدەن. نەك هەر ئەم ڕێكخراوانە بەڵكو هەندێ ڕێكخراوی دیش هەن وەك فێمینیزم و ئاشتی و ژینگە كە وەدووی گۆڕانكاریەكان دەكەون و لەگەڵ گۆڕانە تەكنیكیەكان باس لە گۆڕانی كۆمەلایەتی و گۆڕان لەناو سێستەمی خێزان و دامەزراوی كولتووری و دیاردەی سێكسوالیتێ و ئاشتیش دەكەن. ئەمانەش بۆ كاستێلس ئاماژەن لەسەر ئەوەی كە گۆڕانی ناسنامەیی لەئارادان.
هەر بۆیشە كاستێلس لە توێژینەوەكانی سەبارەت بە كۆمەڵگەی نێتۆرك جەغت لەوەدەكا كە سیاسەتكردن بۆ لەمەولا دەكەوێتە ناو نێتەوە و، نێتیش كە بەردەوام لەبەكاربردندایە دەبێ بە شوێنی چالاكی سیاسی. بەمە كاستێلس باس لەوەدەكا كە لەگەڵ هاتنی شەپۆلی جیهانگیری كاری سیاسی دەكەوێتە ناو نێتەوە. بەلام نابێ ئەوە لە تێگەیشتنمان دەربێنین كە كاتێ سیاسەتكردن دەكەوێتە ناو نێتەوە ئەمە لەلایەن كارگە گەورەكانەوە زۆربەكاردەبرێ و هەروەها ئەم جۆرە سیاسەتكردنە لە بەرژەوەندی ئەو ڕەوتی ژیانە ئابووریخوازیەشە كە داگیریكردووین.
دەبێ لێرەدا پێ لەسەر ئەوەش داگرین كە ئەوە تەنیا كاستێلس نییە لەئەمڕۆدا باس دێنێتە سەر سیاسەتی ناسنامە و وەك هێزێ بزاوتی گەورە لەگشت جیهانا تەماشایدەكا بەڵكو گەلێ كۆمەڵناس و تیۆریزەكەری سیاسی تریش ئەم كاردەكەن. بەلام هەمیشە گرینگیەكە بەباوەڕی ئێمە لەوەدایە كە باسەكان لەمەڕ ناسنامە دەبێ بە باری سیاسی و ئابووری جیهانەوە ببەسترێنەوە. كاتێ كۆمەڵگەی مەدەنی و دیموكراسیەت، ئەوەی ڕۆژئاوا هەمیشە شانازیپێوەدەكا، ڕوو لە لاوازی دەنێ دەبێ لەوە بەئاگابین كە ژیانی سیاسی ڕۆژانە لەژێر كاریگەری ئەوە ڕوو لە ئالۆزی دەنێ و دەسەلات جەمسەری تر وەردەگرێ.
كەچی ئەوەی كاستێلس پێشبینیدەكا ئەوە نییە. چونكە كاستێلس باس لە لاوازی دەسەلاتی سیاسی دەكا(لێرەدا دەولەتی ناسیۆنالیش مەبەستە) و باس لە دروستبوونی ناسنامەی سیاسی دژیش دەكا. واتە هەولدان بۆ دروستكردنی ناسنامە لە فەرهەنگی سیاسی كاستێلس دا ڕێگایەكە بۆ مانادان بە ژیانی كۆمەلایەتی و كولتووری نوێمان. هەروەها بزووتنەوە سیاسییە كۆنەكانی، وەك خەباتی كرێكاران و مانگرتن و سەندیكای كرێكاران، ئەو مانایەی بۆ كاستێلس نییە لەچاو بزووتنەوە كۆمەلایەتی و كولتووریەكان. بەبۆچوونی گەلێ كەس بەتوێژینەوەكانی كاستێلس دیارە كە ئەم كۆمەڵناسە ئیسپانییە نرخێ ئەوتۆ بۆ بزووتنەوە ناسیۆنالیەكان دانانێ و پێیشی وانییە ئەم بزووتنەوە ناسیۆنالیانە بزووتنەوەهایەكی بنەچەیی بن بۆ گۆڕینی دەسەلات. ئەمەش لەبەر

گەلێ هۆ. لەلایەك پێیوانییە دەوڵەتی ناسیۆنال بۆ لەمەولا داوای لەسەر بێ وهەروەها دەسەلاتیش لە ناو دەوڵەتی ناسیۆنالدا لەنگەری نەگرتووە. لەلایەێ تر ئەم پێیوایە لەگەل داهاتنی پاڕادیگمی زانیاری نوێ هێزی تر سەرهەڵدەدەن کە لەگشت شوێنێ ئامادەن و ئامانجیشیان تەنیا دەوڵەتی ناسیۆنال نییە بەڵکو دەوڵەتی پۆست ناسیۆنالە و داواکانیشیان گلوبالییە و لەوەش گەیشتوون کە دەسەلات لە دەرەوەی دەوڵەت بوونی هەیە. ئەگەر بەووردی تەماشای ماهیەتی قسەکردنەکانی کاستێلس بکەین هەست بەوەدەکەین کە ناوبراو باس لە چەند شوێنێ لە جیهان دەکا. چونکە بەشێ زۆر لە دانیشتوانی سەر زەوی جاری لەژێر سیحری دەوڵەتی ناسیۆنال ژیان بەسەر دەبەن و ولاتهایەکی زۆر هەن ئەوەی هەیانە ناسیۆنالیتێێ دەوڵەتییە و گشت هەوڵێکیشیان بۆ پاراستنی ئاگایی ئەو ستاتۆسە سیاییە کە پێکیانهێناوە(بۆنموونە جیهانی عەرەبی و گشت ولاتانی ئیسلامیش). ئەمەو جگەلە گەلێ لە دانیشتوانی سەرزەوی کە خەو بە دروستکردنی دەوڵەتێکەوە دەبینن(کەمترین نموونە دەکرێ باس لە کوردەکان و فەلەستینیەکان بگرێ). بۆیە تێزی کاستێلس لەبارەی ئەوەی کە دەسەلات لە جیهانا ڕوو لەوەدەکا کە بکەوێتە ناو نێتەوە و هەروەها دەسەلات لە دەرەوەی چوارچێوەی دەوڵەتە جارێ ئەو ڕیالیتێیەی نییە. تەنانەت لە ولاتانی نێتۆرکیشدا دەوڵەت ئابووری خۆی هەیە و تواناشی لە بردنەڕێوەی کۆمەلگە هەیە. ناکرێ نکولی لەوەکرێ کە کاستێلس بۆ بەهێزکردنی تێزەکانی هەمیشە ئارگومێنت بەردەستدەخا و توێژینەوەکەی پێ فرە ڕەهەند دەکا. لەم ڕووەشەوە کاستێلس باس لەوە دەکا کە ئەوی پێیدەلێن "ناسنامەی سیاسی دژ" لە توانایدایە بناغە بۆ دروستکردنی پرۆژەێ دانێ. ئەم پرۆژەیەش سەرەتا بۆ فۆڕمێ نوێ لە کۆمەلگەیەکی مەدەنی دادەنێ. ئەم جۆرە کۆمەلگە مەدەنیەی کاستێلس باسیدەکا دەکرێ لەزۆر ڕووەوە بە کۆمەلگەی نێتۆرك تایبەت بێ. چونکە بزوتنەوە کولتووری وکۆمەلایەتیەکانی کۆمەلگەی نێتۆرك هەم ئەو شیاویەیان لەبەردەم دایە کە کاری خۆیان بکەن و هەم داوا سیاسی و کۆمەلایەتیەکانیش ئەو توانایەیان تیایە کە کاری بۆبکەن. پاشان کاستێلس ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە ئەم ناسنامە دژانە بوونیادە تازەکانی دەسەلات بەکاردەبەن کە ئەمەش لەڕووی نێتۆرکەوە ئۆرگەنیزەدەکرێ (ڕێکدەخرێ). ئەمەش تاڕادەیەك جەوهەری قسەکانی کاستێلسە لەسەر دەسەلات و ناسنامە. چونکە بۆ کاستێلس کۆمەلگەی نوێ فۆڕمێ تری لە دەسەلاتی دروستکردووە کە ئەمەش ناسنامەی تری خولقاندووە. پێش ئەوەی بێینە سەر ئەم لایەنە

دەمانەوێ ئەوە ڕوونکەینەوە کە سیستەمی دەسەلاتی تازە لەمیانەی چەند شتێکەوە دەناسرێتەوە یاخود دەسەلات لە چەند شوێنێکدا خۆی قایمدەکا. دەسەلات لە نێت دا ئامادەیە و دەولەتیش خالێکە لەنێوان نێتەکاندا یان دەسەلات لەناو نێتی بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکاندا ئامادەیە. بەگشتی ئەوانەی کاستێلسیان خوێندووەتەوە پێیانوایە کاستێلس لەگەل هەموو ئەو شێوە باسە نوێیانەی لەسەر دەسەلات نووسیوویەتی بەلام ڕووخساری دەسەلاتی زۆر نادیار کردووە و لە باسەکانی مرۆڤ دەرك بەوەدەکا کە دەسەلات بەوەناچێ بۆلەمەولا شوێنێ دیاریکراوی هەبێ. وێرای ئەوە کاستێلس ئەوە ڕووندەکاتەوە کە دەسەلات لە چاخی زانیاریدا دەکەوێتە دەستی چەند دەستەێکەوە. ئەمەش مانای ئەوەیە دەسەلات دەکەوێتە ناو کودە کولتوورییە بناغەییەکانەوە. چونکە تەنێ لەناو ئەو کودە کولتووریانەدا مرۆڤەکان دەتوانن گوزارە لە خۆیان بکەن. کاستێلس دەیەوێ ئەوەمان لا بەرجەستەبکا کە دەسەلاتی چاخی زانیاری وەك دەسەلاتی جاران نییە کە لە دامەزراوە جێگیرەکانا بێ بەلکو ئەم دەسەلاتە گەلێ شوێنی تری هەیە بۆ کارکردن، بۆنموونە ماسمێدیا یەکێکە لەو شوێنانە. بەلام نابێ بە هەلە لەوەبگەین کە دەسەلاتی نوێ هەمووی برتییە لەمە. چونکە هەلاوگۆڕانی زانیاری گرینگی هەیە لە گۆڕینی شوێنی دەسەلات. واتە دەسەلاتی نوێ لەژێر سایەی هەلاوگۆڕانەکانی زانیاریدا خۆی لەنێوان ئاکتۆرە کۆمەلایەتی و بزووتنەوە کولتووری و دامەزراوەکانا دەبینێتەوە و هەروەها لەگەڕاندایە بەدووی ئەوەی کە شوێن و نێوەندی جیا بکا بە بنکەی خۆی(60). هەر لێرەدا ئەوەش دەلێین کە کاستێلس هەمیشە باس لە سەرمایەداری دەکا و مەبەستیشی لەمە دەسەلاتە نەك شتێ تر. کەواتە بەپێی توێژینەوەکانی کاستێلس بێ کاتێ کە سیستەمی سەرمایەداری بەهۆی هاتنەکایەوەی پاڕادیگمی زانیاری نوێ سەرلەنوێ خۆی بوونیاددەنێتەوە بەمە دەسەلاتیش خۆی نوێدەکاتەوە.
بەپێی ئەوانە بێ کە لەسەرەوە باسکرا خوێنەری کارەکانی کاستێلس هەست بەوەدەکا کە دەسەلات بۆ کاستێلس شوێنێ دیاریکراوی نییە و بەرەنگاربوونەوەشی هەر بێ نێوەندە و شوێنێ دیاریکراوی نییە. هەر بۆیشە دەبینین بزووتنەوەی فۆندەمینتالیستی ئیسلامی، کە یەکێکە لەو بزووتنەوانەی کاستێلس وەك دژە هێزێ باسیدەکا، چالاکیەکانی پتر کەوتۆتە ناو ولاتانی نێتۆرك و ئامانجەکەشی پتر دژایەتیکردنی ڕۆژئاوایە نەك ئەو ولاتانەی کە پێیدەلێن ولاتانی ئیسلامی کە ستەمی ڕژێمەکانی ئەو ولاتە ئیسلامیانە بووە بەهۆی دروستبوونی ئەو بزووتنەوە ئیسلامیانە. ئەم جۆرە بزووتنەوانەش

هەروەك بزوتنەوەی سەوز و ئاشتی و فێمینیزم و دژە جیهانیەکان نێتۆرك بۆ خولقانی ناسنامەی خۆیان و هەروەها بۆ ماناداان بە بوونی سیاسیان و بەرزکردنەوەی داواکانیان بەکاردەبەن. بەمجۆرە دەشێ مرۆڤ لەمیانەی توێژینەوەکانی کاستێلس، بۆ چۆنیەتی خولقانی ناسنامە و دروستکردنی کولتووری دژ، بەو تێگەیشتنە بگا کە لە چاخی زانیاری دا دەسەلات دەکەوێتە ناو نێتۆرکەوە و ئەمەش دەکەوێتە دەستی چەند دەستەبژێرێکەوە. ئەم دەسەلاتەش بەدلنیایەوە دەکەوێتە ناو کودە کولتووریەکانەوە نەك دامەزراوە جێگیرەکان. لێرەدا کاستێلس بەهای ئەوتۆ بۆ سەندیکا و حیزب و کلیسە و هەندێ دامەزراو دانانێ و پێشیوانییە بۆلەمەولا ئەوان ئەو هەڕەشەیەبن لەبەردەم دەسەلاتی نوێی ڕۆژئاوا و یان لەمیانەی ئەوانەوە ئیندڤیدەکان بتوانن" شتێ تر" بکەن. ئاشکرایە کە کاستێلس گشت هەوڵێکی لە توێژینەوەکانی دا سەبارەت بە خولقانی ناسانە و ماهیەتی دەسەلات لە چاخی ئەمڕۆمان کە بەچاخی زانیاری ناویناوە بۆ ئەوەیە کە ئەوە نیشاندا کە دەسەلات لە شوێنێ دیاریکراو و دەرکپێکراو کۆنابێتەوە هەروەها ئاماژە بەوەشدەکا کە ئەم دەسەلاتە شوێنی بۆ نیە و دوالتر دەکرێ لە گشت شوێنێ ئەم دەسەلاتە ئامادەبێ. بۆنموونە ماس مێدیا یەکێکە لەو شوێنانەی میکانیزمی دەسەلاتی نوێی تێدایە بەلام هەمووی نییە.
بەلام نکولی لەوەناکرێ کە کاستێلس وەك ئەوروپایەك زۆر خەمی دروستکردنی ناسنامەیێکی ئەوروپایی دەخوا و پێیشی وایە دەکرێ ئەوروپایەك لەسەر بناغەی ناسنامە دروستکرێ و ئەمەش بەقەولی کاستێلس دەکرێ بەهۆی چوار خالەوە دروستکرێ. بەجێگەیاندنی خوێندنی هاوبەش، بلاوکردنەوە و بەکاربردنی فراوانی ئینتەرنێت، سیاسەتی زمانی پان-ئەوروپایی و سیاسەتی مێدیای ئەوروپای(61).
قسەکردنەکانی کاستێلس لەسەر ناسنامە ئەو قسەکردنە ناڕاستەخۆیەیەتی کە لەسەر دەسەلات دەیهێنێتە پێشەوە. بەلام گێڕانەوەکانی کاستێلس لەسەر نێتۆرك بەقەولی نووسەرێ سویدی ڕوخساری دەسەلات نادیاردەکا. لە بەرگی دووەمی کتێبەکەشی لەبارەی" دەسەلاتی ناسنامە"وە کاستێلس هەولی ئەوە دەدا کە دەسەلات لەتەك ناسنامە دا یەکخا و پایەکی تیۆریش تایبەت بە پێوەندی دەسەلات بە ناسنامەوە دروستکا و ڕیزێ دیاردەی کۆمەلایەتی تازەش وەك نموونە لەسەر ئەو پێوەندیەی نێوان دەسەلات و ناسنامە دەهێنێتەوە(62).

ڕاسته لەئەمڕۆدا فۆرمێ زۆر له خولقاندنی ناسنامه له ئارادایه. ئەمەش بۆ کاستێلس تەنیا بەرهەمی ئەو گۆڕانانەیه که مرۆڤایەتی لەژێرسایەی زانیاریگەریدا پێیدەگا. واته تەکنیکی نوێ که نێتۆرك بەرهەمدێنێ تەنێ نابێ به ئامرازێ بەدەست کارگەکانەوه بۆ دروستکردنی پاره بەڵکو ئامرازێکیشه بەدەست ئەوانەی که ناتوانن ئەم تەکنیکه نوێیه بۆ دروستکردنی دەولەمەندی بەکاربەرن و لەبڕی ئەوه بەکاریدەبەن(دێنه ناو نێتەوه) بۆ ڕوونکردنەوەی ناسنامەی خۆیان و خولقانی ئەو ناسنامه ئیتنی و ئاینیەی مەبەستیانه. ئەمەش ئەو تێمایەمان یاددەخاتەوه که لەژێرکاریگەری تێگەیشتنەکانی کاستێلس گەشەیکردووه که دەڵێ زانیاریگەریی و جیهانگیریی فۆرمه ترادیسیۆنالیەکان بۆ نوێنەرایەتی سیاسی و کۆنتڕۆلی کۆمەلایەتی هەڵدەوەشێنێتەوه. واته باسی کاستێلس لەسەر ناسنامه بەگشتی پەیوەندی به دامەزراندنی ناسنامەوه هەیه له کۆمەڵگەی نێتۆرکدا. ئەو هاوبەشیه کولتووریەش (ئاینی، نەتەوەی یان ناوچەیی) مانایێ زۆری بۆ دروستکردنی ناسنامه له کۆمەڵگەی زانیاریدا دەبێ. کەواته فۆندەمینتالیستی ئاینی، ناسیۆنالیزمی کوردی و هاوبەشی ناوچەیی هەموو پێکەوه ئەو پەرچەکرداریه نوێیانه دروستدەکەن که له سەردەمی زانیاریدا له گشت شوێنێ گەرادادەنێن. هەروەها ئەمانه ئەو هێزه دروستدەکەن که دەبن به پەرچەکردارێ دژ بەرامبەر به دیاردەی جیهانگیری و دامەزراو و ڕێکخراوەکانی. ئەم پەرچەکرداریانه دەبن به بناغه بۆ دروستبوونی کودی کولتووری نوێ که پێشتر بوونیان نەبووه. لەهەموو ئەوانه سەیرتر کاستێلس هەڵوەشانەوەی خێزان، ئەمەش که لەئاکامی گەشەی تەکنیکی نوێوه ڕوودەدا، دەکا به بناغه بۆ دروستبوونی ناسنامەی سێکسی. ناسنامەی سێکسیش یان چاتره بلێین یەکسانی لەنێوان ژیندەرەکان به هەڵوەشانەوەی پاتریارکالیزم(باوکسالاری) بەهێزدەبێ. کێشەکه لەوەدایه کاستێلس باس لەو مەترسیانه ناکا که له میانەی هەڵوەشانەوەی خێزان دروستدەبێ. هەڵوەشانەوەی خێزان هەر یەکسانی لەنێوان ئافرەت و پیاو دروستناکا بەڵکو ئەو سیمبۆلانەش دەسڕێتەوه که ناونراوه دایکایەتی و باوکایەتی، پیاویەتی و ژنێتی و تەنانەت مانای خوشك و برایەتیش لاوازدەکا و ڕێگا لەبەردەم گشت شزوز و لادانه سێکسی و کۆمەلایەتیەکان دەکاتەوه. بەواتایێ تر، جیهانگیری زانیاری قەیرانێ زۆر دەخاته ناو خێزانەوه و مانای باوکایەتی و دایکایەتی و هەروەها خزمایەتی ناهێڵێ و پێوەندی نێوان خێزان به قوودرەتی پاره گرێدەدا و ژیانی سێکسیش لەنێوان ژن و مێرد یان پیاو و ئافرەت سەرلەبەردەگۆڕێ.

ئامارێ دیاریکراومان لەبەردەستدا نییە کە لێرەدا پشتی پێببەستین بۆ ڕوونکۆدنەوەی ئەوەی کە چەند منال ڕۆژانە لەلایەن دایك و باوکانیانەوە تەعەدای سێکسیان لێدەکرێ یان چەند برا پەلاماری خوشکەکانیان دەدەن یان چەند خوشك دلیان دەچێتە براکانیان یاخود چەند باوك دلیان دەچێتە کچەکانیان یان بەپێچەوانەوە چەند دایك تەماع لە کوڕەکەی دەکا. ئەمانە هەموو پێکەوە خێزانێ ئۆدێیی لەسەر بناغەی کولتوورێ ئەلەکترۆنی ناڕەوشتی دروستدەکەن و دیاردەی وەك هۆمۆ ڕیالیتێی خۆی لەناو خێزانەوە وەردەگرێ و دواتر دەشبێ بە کولتوورێ بالا و هەروەك هەموو شمەکە تەکنیکیەکای تر لە بازاڕی گلوبال دا بەها بۆخۆی دەدۆزێتەوە. ئەمانە و چەندین دیاردەی دزێویتر لە ئاکامی هەلوەشانەوەی نەك هەر خێزان دروستدەبن بەلکو لە ئاکامی پووکانەوە و ئاوابوونی خۆشەویستی و ڕەحم لەنێوان ئەندامەکانی خێزان و، هەروەها خێزان و ئەندامەکانی کۆمەلگەش دروستدەبن.

لەو سمینارە نێودەولەتیەی لە 19-16 ی ئەپریلی 1997 دا لە Santa Cruz لە کالیفۆڕنیا لەسەر (جیهانگیری و بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان) سازکرا کاستێلس بە باسێ لەسەر( جیهانگیری، بەزانیاری گەرییکردن و بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان) بەشداریدەکا. لەوێڕا ناوبراو باس لەوەدەکا کە جیهانگیری و زانیاریگەری بەهۆی نێتۆرکی پارە و تەکنەلۆژیا و دەسەلاتەوە داگیرماندەکەن (63). ئەمانە هەموو باس لە مانا و هۆکاری دروستبوونی ناسنامە دەکەن. پاشان بۆچوونەکانی کاستێلس بناغە بۆئەوەش دادەنێن کە بۆلەمەولا تەباییەك لەنێوان لەلایەك ژیانی سیاسی ڕۆژانە و حیزبە سیاسیەکان و لەلایەکیتر دەسەلات دا نییە. ئەمە وادەکا باسلەوەکرێ کە کۆمەلگەی مەدەنی لاوازدەبێ و لەم کاتەشدا گەڕان بەدووی دروستکردنی مانا دەبێ بە پرسیارێ لەبارەی سەرلەنوێ بوونیادنانەوەیەکی داکۆکیکەرانەی ناسنامە. لەم حالەتەدا کاستێلس چەند جۆرە سیاسەتێ ناسنامەی دژە کولتوور باسدەکا کە هەندێ لەوانە دەکرێ وەك نموونەهایەك تەماشاکرێ کە بۆسەر جیهانگیری هێرشن- جا فۆندەمینتالیزمی مەسیحی بێ لە ئەمەریکا یا دیاردەی ئیسلامیزم لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست یان بزووتنەوەی زاپاتیستەکانی مەکسیکۆ- بەلام هەنێ بزووتنەوەی دیش هەن کە لەسەر ئاستی لۆکال کاریخۆیاندەکەن جا بزووتنەوەی ئافرەتان بێ یان ژینگە. ئەمە و کاستێلس ئاماژە بۆئەوەشدەکا هەستی ناسیۆنالی بۆلەمەولا بۆ دروستکردنی دەولەت ئەو گرنگییەی نییە. چونکە دەولەت لەدەرەوەی دەولەت بوونی هەیە و هەروەها سیاسەتی ناسنامە هیچ

پەیوەندیەکی بە خولقانی دەولەتەوە نییە. لێرەوە کاستێلس دەیەوێ ئاماژە بۆ کەمبوونەوەی هێزی پارتیەکان و لاوازبوونی دەسەلاتی سەندیکاکان بکا. بازارپیش لەم دەموو وەختەدا توانایێ زۆر پەیدادەکا و گشت ئابووری بەخۆیەوە گرێدەدا. هەر ئەم لایەنە باسی ئەوەش دێنێتە پێشەوە کە ئۆتۆریتێی کۆمەلایەتی نێوان کار، سەرمایە و دەولەت هەلدەوەشێتەوە. ئەمەش وادەکا گەلێ کەس مەرجەکانی ژیانیان لەدەستبدەن و پێوەندی کۆمەلایەتی ڕوو لەکزی دەنێ و خێزانی پاتریارکی ڕوو لە هەلوەشانەوە دەنێ و ئایدیۆلۆژیا سیاسیە کلاسیکەکانیش لە لیبرالیزمەوە بۆ سۆسیالیزم مانای خۆیان لەدەستدەدەن. ئەم ناسنامە دژانە بناغە بۆ فۆرمێ نوێ لە کۆمەلگەیەکی مەدەنی دادەنێن و بوونیادە تازەکانی دەسەلاتیش بەکاردەبەن. هەر لەم بارەیەشەوە دەشێ ئەو لایەنەش باسکرێ کە دیسانەوە پێوەندی بە بۆچوونی کاستێلسەوە هەیە لەبارەی خولقانی ناسنامە و ڕۆلی نێتیش لە دروستکردنی ئەمە. بۆنموونە ئینتەرنێت خالی یەککرتنەوەیە لەنێوان گشت ئەمان و چین و ڕەگەز و توێژە جیاجیاکان. مەبەستی کاستێلس لێرەدا ئەوەیە کە کاتێ تۆ لەبەردەم نێت دا دادەنیشی و دەستدەکەی بە چات نازانی لەتەك چ ژیندەر و ڕەگەز و میللەتێ چاتدەکەی. ڕەنگە بۆ شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری ئەمە گرنگ نەبێ بەلام گرنگیەکە لەوەدایە کە چۆن نێت بەکارببرێ و هەروەها نێت چ مانایەکی بۆ چارەسەرکردنی ناتەباییە سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتیەکان هەبێ.

## زانیاریگەری و ستاتۆسی دەولەتی ناسیۆنال

کاستێلس باس لەوەدەکا کە سێستەمی سیاسی دەولەتی ناسیۆنال لە هەلوەشانەوەدایە. ئەم دەولەتەش ئەو دەولەتەیە کە بەرهەمی پرۆژەی مۆدێرنیتێی ڕۆژئاوایە. ڕاستە فۆرمەکانی ململانێی سیاسی گۆڕاوە و نمایشی سیاسی نوێ گەشەی کردووە و لە دەرەوەی دامەزراوە جێگیرەکانا بزووتنەوەی سیاسی و کۆمەلایەتی هاتۆتەکایەوە. بەلام ئەمانە و گەلێ گۆڕانی دیش ناکرێ بکرێن بەنموونە لەسەر هەلوەشانەوەی نێوەندگەرایی سیاسی ولاتانی پێشکەوتوو یان ئەو ولاتانەی هەر زوو لەباسەکەدا بە ولاتانی زانیاری ناومانبرد. لەبەرئەوەی قوودرەتی ئابووری و زانیاری ئەولاتانە ڕەوایەتیێ زۆری بۆ وتاری سیاسیان دروستکردووە و هەروەها ڕەوایەتیشی بۆ ڕەفتاری سیاسیان دۆزیوەتەوە. سیاسەتی تەقلیدی ( ترادیسیۆنال) گەلێ لەولاتان جارێ لەلایەن تەوژمی نێت و زانیاریەوە کاری تێنەکراوە و لە گەلێ شوێن لە دونیا

هەر خێڵی سیاسی و بنەماڵەی سیاسی دەستڕۆشت و حوکمڕانن. هەروەها تەوژمی کولتووری و کۆمەڵایەتی و ماڵی گلوبال جارێ ئەو کاریگەرییەی نەکردۆتە سەر ئۆتێریتێتی سیاسی هەندێ لە دەوڵەتە ناسیۆنالیەکان. لە وڵاتانی زۆر گەشەکردوودا تەکنەلۆژیای زانیاری شیاوێ زۆری خستۆتە بەردەم کردەی سیاسی و هەروەها پێوەندی نێوان سیاسەت و کۆمەڵگە وەك خۆی نەماوەتەوە. چونکە لە ئەمڕۆدا ئابووریخوازی گەیشتۆتە لوتکە و بۆ گەلێ لە لێکۆڵەرەوە کۆمەڵایەتیەکان ڕەهەندی سیاسی لە وونەبووندایە و تەکنۆکرات و فینانس (نەخت) ناسەکان شوێنی سیاسیەکانیان گرتۆتەوە. خۆی لە خۆیدا ئەم تێزە لە ڕاستیەوە دوورنییە بەلام سیاسیەکانی وڵاتانی یەکیەتی ئەورووپا و ئەمەریکا جارێ هەر لەتوانایاندایە وێنەی ئابووری دروستکەن و سیحری خۆیان لە ژیانی سیاسی و ئابووری هاوچەرخدا هەبێ. جیهانگیریش دۆزێ ئەوتۆی هێناوەتە پێشێ کە سەرۆکی وڵاتانی نێتۆرك لە دامەزراوە نێودەوڵەتیەکاندا( وەك ناتۆ، یەکیەتی ئەورووپا و نەتەوە یەککرتووەکان) زوو زوو کۆبوونەوەبکەن و بڕیاری سیاسی و ئابووری و سەربازی و ئەمنی هاوبەشیش داڕێژن.

پاشان هەقیقەتێ تریش هەیە کە گرینگە لێرەدا بەرباسخرێ ئەوەش ئەوەیە کە زۆربەی ئەوانەی لە ئەمڕۆدا باس لە دۆزی سیاسی جیهان دەکەن پرسیار لە مانا و ستاتۆسی خودی سیاسەت دەکەن بەمەش دەیانەوێ ئەوە یادخەنەوە کە سیاسەت تا چ ئەندازەیەك بۆ لەمەولا بوونی هەیە یان دەکرێ چی بە سیاسەت بکرێ. لەڕاستیدا مەسەلەی ئەوەی کە سیاسەت بۆ لەمەولا کاری چییە و هەروەها دەکارێ چی بکا بۆ گەلێ لە تیۆریزەکەرانی سیاسی زۆر ڕوون نییە. بەلام بەشێ تر لە تیۆریزەکەران وای بۆدەچن کە هاتنەکایەوەی ئابووری گلوبال گرنگی لە گۆڕینی تێگەیشتنی سیاسی دیووە. بەلام ئەم گۆڕانە هاوتایە لەگەڵ گەشەی بازاڕ و هەروەها کاریش دەکا بۆ فراوانخوازی بازاڕی جیهانی نوێ و دۆزینەوەی پێوەندی ئابووری کە بەخۆی لەناوەڕۆکدا پێوەندیهایەکی ئابوورین. هەر سەبارەت بەم لایەنەش دەشێ ئەوەش بووترێ کە فراوانبوونی پێوەندییە ئابووریەکان ڕەهەندی مانا تازەکانی سیاسەتی تازەش دەستنیشاندەکا. وەلی چ ئەم تازەگەریانە و چش پێوەندیەکان هەردوو هەر دامەزراوە نێودەوڵەتی و ڕێکخراوە ترانس ناسیۆنالیەکان دایدەڕێژن. وێرای ئەوە ئەم پێوەندییە ئابووریانە بەرهەمی ئابووری نوێن کە ئەم ئابووریەش بەوە ناسراوە کە بناغەێ زانیاری هەیە و ئەم بناغەیەش ناتەبایی خستۆتە ناو

ژیانی گلوبالەوە بۆیە دەکرێ بلێین ئەم مەسەلەیە کارێ وادەکا کە مرۆڤ داوایێ زۆری لەسەر سیاسەتی نوێ هەبێ. گومانی ناوێ کە کاستێلس کارێ زۆر بۆ یادخستنەوەی ئەم ناتەباییانە دەکا و هەمیشەش ڕوونکردنەوە لەبارەیانەوە دەدا.

سەرباری ئەوی ووتمان دەشێ ئەوەش باسکەین کە ئەوانەی ڕەخنە ئاڕاستەی جیهانگیری دەکەن و پێیان وایە ئەم دیاردەیە هەڕەشەیە بۆسەر دەولەتی ناسیۆنال پەرپەچی بۆچوونەکانی کاستێلس دەدەنەوە. ڕەخنەی کاستێلس لە دەولەتی ناسیۆنال بەجۆرێ سادە و تەقلیدی نەگیراوە بەلکو کاستێلس لە زۆربەی شوێندا ئەوە ڕووندەکاتەوە ئەوە نێتۆرکە کە جێی دەولەتی ناسیۆنال( و دەسەلاتی سیاسیش) دەگرێتەوە. بەلام کاستێلس لە یەکێ لەسەردانەکانی بۆ سوید جەغت لەوەدەکا کە مۆدێلی سیاسی سۆسیال دیموکرات ڕۆلی خۆی لە گەشەدان بە تەکنیك و دروستکردنی کۆمەلگەێ ئیندڤیدوال و ئابووریێ بەهێز هەبووە. هەمیشەش کە باس لە جیسهانگیری دەکرێ باس لە چارەنووسی دەولەتی نسیۆنال دەکرێ ئەمەش بەزۆری لەو شوێنانەدا بابەتی گفتوگۆێ بەردەوامە کە مەلبەندی تەوژمی جیهانگیری ئابووری زانیارییە. واتە ئەوروپا. ئەمەش لەبەرئەوەی باسی ئایندەی دەولەتی ناسیۆنال گرنگێ زۆری بۆ پارت و ڕێکخراوە ناوخۆیەکانی ولاتانی ڕۆژئاوا و و دامەزراوە نێودەولەتیەکان یش (یەکیەتی ئەوروپای، نەتەوە یەککرتووەکان، ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی) هەیە. ئەوەی لە گۆڕەپانەکانا ڕوودەدا (لە جەنەوا، سیاتل، یۆتۆبۆرگ، پراگ ) جێ سەرنجی نەك هەر خەلکی گشتی و یان ئایدیۆلۆژی و ڕوناکبیرانە بەلکو شوێنی ئاوڕدانەوە و بایەخی مێدیاکانیشە. هەروەها تێڕامان لە چارەنووسی دەولەتی ناسیۆنال بۆ گەلێ لە نووسەرو و ڕۆژنامەوان و ڕوناکبیران بابەتی باسیشن لەسەر ئایندەی دیموکراسیەت و دادپەروەری کۆمەلایەتی و یەکسانیش.

ڕاستە یەك لە ڕووەکانی شیکردنەوە زانستیە کۆمەلایەتیەکان لەبارەی جیهانگیری هەنووکەوە ڕەخنەگرتنە لەو تێزە باوەی کە جیهانگیری ئابووری دەولەتی ناسیۆنال دەنێژێ بەلام ئێمە ئەمە بەوردی لێرەدا ڕووناکەینەوە بەقەدئەوەی هەولی ئەوەدەدەین،کە ئارگومێنتی ئیمپیری کاستێلس لەم بارەیەوە نەخەینەڕوو کە وای بۆدەچێ ئەمە ڕاست نییە(لێرەدا دەکرێ گەلێ نموونە لەسەر کاری کۆمەلناسەکان بهێنینەوە بەلام کارەکەی بێك یەکێکە لەو کارانە کە ڕوونکردنەوەێ قوولی تیابەدیدەکرێ : سەبارەت بە بۆچوونی بێك دەشێ ئەوە

بووترێ کە ئەم کۆمەڵناسە پێیوایە ئابووری بەجیهانیکراو بناغەکانی ئابووری نەتەوە و دەوڵەتی نەتەوە دەنێژێ- بڕوانە کتێبی جیهانگیری چییە؟). چونکە قسەکردن لەسەر مەرگی دەوڵەتی ناسیۆناڵ داوای ڕوونکردنەوەی جیاوازی نێوان جیهانگیری ئابووری و جیهانگیری سیاسی دەکا و هەروەها ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە ئەگەر مەرگی دەوڵەتی ناسیۆناڵ کاربکاتە سەر ئایندەی دیموکراسیەت.
نەك هەر کاستێلس تاڕادەیەك بۆ زۆربەی کۆمەڵناسان و هەروەها بۆ گەلێ لەوانەی باس دێننە پێشێ لەسەر تەکنەلۆژیای تازەی ڕۆژئاوا پرسیارکردن لەسەر کاریگەری تەکنیکی نوێ بەسەر دیموکراسیەتەوە جێی باسە و هەروەها ئەوەش کە ئەگەر بشێ دوای نەمانی دەوڵەتی ناسیۆناڵ کۆمەڵگەی مەدەنی لە چوارچێوەی دۆزێ سیاسی و ئابووری گلۆباڵدا بپارێزرێ و کۆمەڵگەیەکی مەدەنی گلۆباڵ پێکبێ. سەبارەت بە کاستێلس دەکرێ ئەوە بووترێ کە ناوبراو گەشەی تەکنیکی نوێ دەکا بە بناغە بۆ چوونە پێشەوەی کۆمەڵگەکان و بەهێزبوونی دەوڵەتهایەکی پۆست ناسیۆنالی لەسەر بناغەی نێتۆرك. لەم ڕووەشەوە بۆ کاستێلس نموونەی بالا یەکیەتی ئەورووپایە کە لەتوانایدایە ئەمە مسۆگەرکا. بەلام پێناچێ یەکیەتی ئەورووپا بتوانێ بەئاسانی ئەمەبکا تا نەبێ بەماڵێ پڕ لە دلنیایی و لە ئاسایش و هەروەها ماڵێك کە چارەسەر بۆ کێشەی بێکاری و نارکوتیکە و دیاردەی بێماڵی و سۆزانیەتی و ئایدز و ڕەگەزبەرستی و چەندین دیاردەی هەلە و چەوتی تر دانەنێ. دواتر لەگەل زیادبوونی چوارچێوەی ئەم یەکیەتیە کێشەکان زیاتردەکەن و کارگە گەورەکانیش پتر سەرقالی گوازتنەوەی کارگەکانیان دەبن بەرەو ئەو ولاتانەی کە دەکرێ بە نرخێ هەرزان بەرهەمە کانیانی تیا بەرهەمبهێنن. ئەمە تاڕادەیەك بووە بە گەورەترین هەڕەشە لەبەردەم هاولاتیانی یەکیەتیەکە یان هاولاتیانی ئەو ولاتانەی خاوەنی ئەم جۆرە کارگە گەورانەن و هەروەها کارگە مولتی ناسیۆنالیەکان ڕۆلێ زۆریش لە پەرتکردنی ژیانی کار لە ولاتانی خۆیاندا دەبینن. بۆیە لەئاکامی ئەمانە کۆمەلگەی مەدەنی لە گرفتدا دەبێ نەك هەر لە دەرەوەی کۆمەلگەی نێتۆرك بەلکو لەناوجەرگەی کۆمەلگەی نێتۆرکیش. کۆمەڵناسی ئەلەمانیش ئولریش بێك لەو کتێبەی سەبارەت بە جیهانگیری لەژێرناوی(جیهانگیری چییە؟) نووسیوویەتی ئەم لایەنە بەباشی ڕووندەکاتەوە. بەبۆچوونی بێك کۆمەلگەی جیهانی ئەمڕۆ لەپێش هەموو شتێکەوە لەلایەن بزووتنەوەی سەرمایەداری ترانسناسیۆنالەوە بەڕێوەدەچێ. هەر لێرەدا پێویستە

کاره ناودارەکەی کۆمەڵناسی ئەمەریکیGiovanni Arrighi (لە سەدەی نۆزدەی درێژدا) لەیادنەکەین کە لەمیانەی ڕوونکردنەوەکانی بۆ جیهانگیری بایەخێ زۆر بە جیهانگیری سیاسەت دەدا و جەغتیش لەوەدەکا کە کۆمپانیا مولتی ناسیۆالیەکان ٪70 ی بازرگانی جیهان پێکدێنن. . ئەم کۆمەڵناسە لە ڕیزی ئەوانەیە کە نایەوێ سەرهەڵدانی جیهانگیری ئابووری بە ئێستاوە ببەستێ(64). وەکی تریش گەر تەماشای گەشەی سەرمایەداری گلوبال بکەین بەتایبەت لەپاش سالانی 1970 وە دەبینین جیهانگیری ئابووری لەدەموو وەختێ گەشەکردندایە. هەر لەم ماوەیەشدا ژمارەی کارگە مولتی ناسیۆنالیەکان لەزیادبووندان و ئیشێ زۆریش لەدەرەوەی دەولەتی ناسیۆنال دەکەن. ئەم کارگانە وورده وورده توانیان دەست بەسەر بەشە هەره گەورەکەی بازرگانی دەرەکیدا بگرن.
هەموو ئەوانە دەمانباتەوە سەر باسی ئەوەی کە سیستەمی ئابووری گلوبال سەرەتاکانی بۆ ئەو ساتانە دەگەڕێتەوە کە مۆدێرنەی ڕۆژئاوا گەشەدەکا و دواتر ئەم گەشەیە واله ئابووری ڕۆژئاوا دەکا بچێتە قۆناغێ ترەوە کە ئەوەش لە سەرەتای سەدەی بیستدا دەردەکەوێ واتە دوای کامل بوونی سیستەمی جیهانی(هەروەك ئیمانوێل والشتاین ئاماژەی پێدەکا). پێش ئەوەی بێمە سەر بۆچوونەکانی کاستێلس لەم بارەیەوە ئەمەوێ ئاماژە بە دیدێکی مێژووکردی فەڕەنسی فرناند برۆدێل Fernand Braudel لەبارەی بەکاربردنی گوزارەی ئابووری گلوبال و ئابووری جیهان بکەم. ئەوەی بۆ برۆدێل گرینگە ئابووری جیهانە نەك ئابووری گلوبال. ئەلبەتە ئەمەش لەسەر هەمان ڕەوتی والشتاین. جا برۆدێل بۆئەوەی ئەم لایەنە یەکلاکاتەوە جەغت لەوەدەکا کە ئابووری گلوبال مەبەست تیایا ئابووری گشت جیهانە وەك یەکەیەك، بەقەولی سیسمۆندی Sismondi هەموو بازاڕی گەردوون، بەلام ئابووری جیهان مەبەست تیایا ئابووری بەشێکە لە پلانێتەکەمان (65).
بەلام کاستێلس زۆر ووردتر ئەم لایەنە ڕووندەکاتەوە دوای ئەوەی جەغت لە ڕۆلی تەکنیکی نوێ لە پەرەدان بە ئابووری گلوبال دەکا. ئەمەش کە کاستێلس دەیکا مەرجە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو گەشە خێرایەی لەم دوو دەیەی دوای هاتنەسەر ئابووری ڕۆژئاوا. واتە دوای ئەوەی ڕۆژئاوا لە 1980 کان بەلاوە کەوتەناو پاڕادیگمێ زانیاری نوێوە ئەوەی پێیدەلێن ئابووری کەوتە ژێرکاریگەری ئەم پاڕادیگمە نوێیە و لەهەموو ڕوویەکەوە ئابووری بەتەکنیك کراو. ئەمەش بووە هۆی هاتنەکایەوەی گەیاندنی تەلەفۆنی، سیستەمی

زانیاری، بەرهەمهێنان لەسەر بناغەی ئەلەکترۆنی و دروستبوونی سیستەمی گوازتنەوەی زۆرخێراو و بازاڕی مالی ئەلەکترۆنی نێودەولەتی. ئەمانە بناغەی چاکیان بۆ خولقانی بارودۆخی نێودەولەتی دامەزراند کە ئابووریی سەرووی(ترانس) ناسیۆنالی دامەزری، بەلام دامەزرانی ئەم جۆرە ئابوورییە پێداویستی هەموو ئابووریەکان نەبوو بەلکو ئەو ئابووری یان چاترە بلێین ئەو کۆمپانیا نێودەولەتیانە بوو کە پێویستیان بە بازاڕ و شیاویی تر بوو بۆ کەمکردنەوەی تێچوون و بەرزکردنەوەی قازانج. هەرچی هابرمازە چوار ڕەهەند لە دیدی سالانی سەدەی بیست، کە بەخۆی زۆربەی ئەوانەی باس لە جیهانگیری ئابووریدەکەن بایەخ بە سەدەی بیست دەدەن، دیاریدەکا: 1- بووژانەوە و بلاوبوونەوەی بازرگانی شمەك، 2- بەرزبوونەوەی وەبەرهێنانی ڕاستەوخۆی دەرەکی، 3-نەشونمای کارگەی ترانس ناسیۆنال، 4-سەرهەلدانی بازاڕی مالی ئەلەکترۆنی(66). بەپێی ئەو تەماشاکردنانەی لای سەرەوەبێ گەشەی کارگەی ترانس ناسیۆنالی و سەرهەلدانی بازاڕی مالی ئەلەکترۆنی لەو خالانەن کە زۆربەی ئەوانەی توێژینەوەیان لەبارەی جیهانگیری ئابووریکردووە بایەخیان داوەتێ. کەوابێ ئەمە تەنیا کاستێلس ناگرێتەوە بەلکو یەکێکە لە گرووندەکانی تیۆریزەکردن بەسەر دیاردەی جیهانگیری زانیارییەوە.

سەرباری ئەوەی وەتمان، کاستێلس بە جەغتکردنی لەسەر ئابووری گلۆبال خۆی لەگەلێ کۆمەلناس و توێژەرەوە جیادەکاتەوە. چونکە بۆ کاستێلس ئابووری گلۆبال لەو جۆرە ئابووریە جودایە کە (والشتاین) ناوی دەبا بە ئابووری جیهانی. چونکە بەپێی توێژینەوەکانی کاستێلس بێ ئابووری گلۆبال ئەو ئابوورییە کە بناغەی زانیاری هەیە و ئەم توانا زانیاریەش بەسەر گشت کەرتە ئابووریەکانا بلاوبۆتەوە. نابێ ئەوە لەیادکەین کە گەلێ لەو هەولانەی لەو دەمووەختەی باس هاتنە پێشەوە لەسەر دیاردەی جیهانگیری بۆئەوەکرا کە ئەم دیاردەیە بکرێ بە دیاردەی ئابووری و بەشێ تریش کاریان بۆ ئەوەکرد کە وەك دیاردەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی باسیلێوەبکەن. هەردوو هەولەکە بەتەواوەتی پەیان بەو لایەنانە نەبرد کە دیاردەی ناوبراو خستیە ناو ژیانەوە و مرۆڤایەتی پێوەگلاند. چونکە گەیشتن لە ماهیەتی جیهانگیری ئەوەمان بۆدەکا بە یەقینات کە نابێ ڕاڤەکردنەکانمان سادەبێ.

کاتێ قسەدێتە سەر جیهانگیری و شوێنی دەولەتی ناسیۆنال دەتوانین سەرەتا باس لەو ئارگومێنتانە بکەین کە مانایان بۆ لاوازبوونی دەولەتی ناسیۆنال

هەیە و دواتریش باس لەو ئارگومێنتانە دەکەین کە چۆن دەولەتی ناسیۆنال جارێ شوێنی خۆی هەر هەیە. سەبارەت بەوی یەکەم دەکرێ بلێین کە دەولەتی ناسیۆنال لەبەر ئەم هۆیانە دەکرێ باس لە نەمانی یان لاوازبوونی بکرێ. 1- دەولەتی ناسیۆنال لەژێرسایەی جیهانگیری دەکەوێتە ناو ڕێکەوتنی سەرووی دەولەتیەوە (وەك: G8، EU، OECD، FN، WTO، IMF) و بەشێ زۆریش لەمانە ڕێکخراوی ئابوورین و بەلام دەشکرێ بووترێ کە دامەزراوی سیاسیشن، 2-گەشەی مافێ نێونەتەوەی کە دەکرێ وەك مافێ ترانس(سەرووی) ناسیۆنال دەستنیشانکرێ. ئەم لایەنەش ئەوە ڕوودەکاتەوە کە هیچ ولاتێ ناتوانێ خۆی لە کاروباری ناوخۆی دەولەتێ یان دامەزراوێ سەرووی دەولەتی هەلقوورتێنێ، 3- دەولەتی ناسیۆنال جێگای سیاسی لاوازدەبێ و بوونی سیاسیشی دەگۆڕدرێتە جیهانگیری کولتووری. بەهۆی گۆڕانی پێوەندی نێوان جوگرافیا و ناسنامەی کولتووریش ئەمە کاردەکاتە سەر ناسنامەی دەولەتی ناسیۆنال و کاریگەریەکەش دەبێتەهۆی ئەوەی مانای سیاسی دەولەتی سیاسی وەك خۆی نەمێنێ و بگۆڕێ، 4 - گەشەی کێشە و کۆنفلیکتی ئەوتۆ کە دەکەونە دەرەوەی سنوورەکانی دەولەتی ناسیۆنالەوە، لەوانە وێرانسازی ژینگەی گلوبال. بەلام دەشکرێ باس لە چوار خالی دی بکرێ کە لەسەر مانەوەی شوێنی دەولەتی ناسیۆنال نیشانەن. 1- مانای دەولەتی ناسیۆنال بۆ دەسەلاتی سەربازی، 2- ڕۆلی دەولەتی ناسیۆنال لە دەستگرتن بەسەر تەوژمی کۆچ کە لەگەل جیهانگیری گەشەیکردووە، 3- لەم چەند دەیەی دوایدا هەست بەبینینی هاریکارێ بەهێز لەنێوان ناسنامەی نەتەوەی، ناسیۆنالیزم و سیاسەتی دەولەتی ناسیۆنالدا دەبینرێ، 4- بەنێودەولەتیکردنی دەولەتان دەکرێ وەك شتێ تەماشاکرێ کە لەهەندێ بواردا دەبێتە هۆی بەهێزکردنی دەولەتەکان نموونەش لەسەر ئەوە یەکیەتی ئەورووپاییە کە دەسەلاتێ ناوچەییە(67).

بەتەماشاکردنێکی ئەوی لەسەرەوە لەسەر دەولەتی ناسیۆنال ووترا ڕەنگە خوێنەر بەرەو ئەو تێگەیشتنانە بەرن کە ئەم کارەی کاستێلس بناغە بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی نیو-لیبرالیزم دادەنێ. بەلام گەر مرۆڤ بەوردی کارەکەی کاستێلس بخوێنێتەوە ئەوەی بۆ دەردەکەوێ کە ئەمە ڕاست نییە. چونکە کاستێلس بەئاشکرا و هەر لەسەرەتاوە ماهیەتی پاڕادیگمی زانیاری ڕووندەکاتەوە و ئەوە پێشان خوێنەر دەدا کە چۆن ئەم پاڕادیگمە بۆ خۆ سەرلەنوێ بوونیادنانەوەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی بناغەبووە.

هەروەها ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە چاخی نوێ لە شوێنێکەوە سەردەردەکا کە ئامانجی سیاسی و ئایدیۆلۆژی و دواتر ئابووری خۆی هەبووە لە گۆڕینی شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی بە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری. پاشان کاستێلس گومان لەوە ناکا جیهانگیری زانیاری و ئابووری ڕێگایەك نەبن بۆ دروستکردنی پارە و دەسەلات بەلام شێوازی توێژینەوەکانی ڕەنگە بەجۆرێ داڕێژرابێ خوێنەر پێویستی بە وەدووگەڕان و پشکنینێ زۆر بێ تا بکارێ لەوە بگا کە کاستێلس زۆر گفتووگۆئامێزانە(کۆنفێرشێل) کار بۆ ڕوونکردنەوەی دیاردەکانی ناو چاخی نوێمان دەکا. بەلام ناشتێ ئەوە لەیادکەین کە کاستێلس زۆر باس لە لایەنی باشی سێستەمی سیاسی گلۆبال دەکا ئەوەش بەدلنیاییەوە دوای پێکەوەکارکردنێ نێودەولەتی زۆر و هەروەها هەول بۆ دروستکردنی نێتێ سیاسی و ئابووری هاوبەش. وەلێ حەیفێ زۆرجار هیواکانی کاستێلس بەقازانجی ولاتانی خاوەن زانیاری نوێ دەگەڕێتەوە و، پێشیوایە کە ئەم ولاتانە لەتوانایاندایە کۆمەکێ زۆر بەوانی تربکەن گەر تەکنیکی نوێ بەجۆرێ ئاڕاستەکرێ کە ئەم کۆمەکەبدا. ئەمە هەر شادبینیێ ڕووت نییە بەلکو دروستکردنی هیواشە بەو زانیاریە نوێیەی ئەمڕۆ لەئارادایە کە گوایە لەتوانایدایە دادپەروەری و یەکسانیێ گلوبال دامەزرێنێ. گەر تەکنکیی نوێ دەتوانێ ئەمە بکا باشە ناوچەێ لە جیهان بەناوی جیهانی چوار، لەبڕی ئەو جیهانی سێیەی جاران، دروستبووە و یان بوونی تەکنیکی نوێ بووەتە هۆی ئەوەی درزێ ئەوتۆ بخاتە ژیانەوە کە لە گشت کات و شوێنێ لەسەر گۆی زەویدا ئامادەبە.

کاستێلس لەمیانەی توێژینەوەکانی لەبارەی ئابووری و زانیاری گلوبالی ئەمڕۆ کە سێستەمی سیاسیش دەخاتە ژێرپرسیارەوە باسێ زۆر دێنێتە پێشەوە لەسەر مەسەلەی ماف. گومانیشی ناوێ ئەم مافە گەلێ فۆڕمی وەرگرتووە کە هەر لە باسی تاکەوە دەگرێتەوە تا دەگاتە مەسەلەی هەلوەشانەوەی پاتریارکالیزم لەناو خێزان و هۆمۆسێکسوێلیتێ. بەلام کاستێلس دەبێ ئەوەش بزانێ کە ئەم جۆرە مافانە تەنیا بۆ هەندێ گرووپ و ناسنامە یان لە چەند شوێنێ لە جیهان پەسەندکراوە. لەبەرئەوەی جارێ لە گەلێ کۆمەلگە و لەناو گەلێ لە کولتوورەکانی چاخی زانیاری دیاردەی وەك لیسبیس و هۆمۆسێکسوێل لە شتە گوناهەکانن و پاتریارکالیزمیش(باوکسالاری) زالترین کولتوورن. بۆیە گشتیکردنەکانی کاستێلس هەمیشە دووچاری کێشە دەبێتەوە. پاشان کاستێلس زۆر داکۆکی لەEU دەکا و پێیوایە مالێ ئایندەییە. بەلام ئەوەی کە زۆر

سەیرە کاستێلس ئەوە ڕوناکاتەوە کە بۆچی فۆڕمی مافی یەکیەتی ئەورووپای شەرعییە(68). هەزاری و بێکاریش، کە گەورەترین پرسیارن لە ژیانی جیهانگیری زانیاری و ئابووری ولاتانی ڕۆژئاوا، دەستیان لە خستنەژێر پرسیاری دادپەروەری کۆمەلایەتی جیهانگیریش دا هەیە و ئەم لایە ئەمڕۆ گرینگێ تیۆری زۆریشی هەیە.

چونکە باسی ماف پێوەندێ زۆری بە باسی جیهانگیری سیاسی و کولتووریشەوە هەیە. گەر لەئاستێ گلوبالیش تەماشای بابەتی ماف بکەین دەبین ئەوەی پێیدەلێن ماف دیاردەیەکە دروستکردنی بەپلەی یەك بە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکاوە بەستراوەتەوە و بەپلەی دووش بە دامەزراوە نێودەولەتیەکانەوە. کاتێکیش کاستێلس جەغت لەو باوەڕە دەکا کە ناتۆ و ئەمەریکا پێکەوە سێستەمی ئاسایشی نێودەولەتی دروستدەکەن ئەمە وا لە گەلێ لە توێژەرەوە یاساییەکان دەکا کە گومان لە تێگەیشتنەکانی کاستێلس بۆ ماف بکەن ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو ئاسایشەی لەژێر سایەی ناتۆ و ئەمەریکا دروستدەبێ تاڕادەیەکی زۆر لەسەر بناغەی سیاسەتێ پراگماتی دادەمەزرێ.

## فۆڕمێ نوێ لە مرۆڤی کورد

مرۆڤی ئەمڕۆی کورد یان مرۆڤی تازەی کورد ئەوەندە بەتەنگ دەرئەنجامەکانی چاخی نوێوە نایێ. ئەو تەنگەتاوی و پەشۆکاویانەی چاخی نوێ لەگشت کۆمەلگە و شارستانیەتەکانا دروستیکردووە بۆ ئەم مایەی تێڕامانێ گەورە و بەردەوام نییە. چونکە ئەم مرۆڤە کوردە تازەیە نایەوێ پێدراوەکانی یان دەستکەوتەکانی ئەم چاخەی هەرگیز بە چاخێ تر بەراوردبکا. ئەوی ئەم مرۆڤە کوردە تازەیە لەئەمڕۆدا پێیگەیشتووە هەرگیز بەخۆیەوە نەیدیووە و بۆیە نایەوێ لەوە بگا کە چاخی تازە نایەکسانی و نەهامەتیێ گلوبالی لەتەك خۆ بەدیاری بۆهێناوە. بۆئەم دروستکردنی ناسنامەێ سیاسی تاکە خەونێکە و ئەمڕۆش بەشیاوترین بار دەزانێ بۆ دروستکردنی ئەمە. ئەم مرۆڤە خۆی وانیشان دەدا کە لە تێکڕای گەمەکان گەیووە و زۆرترین هەنگاوی تێپەڕاندووە تا دوا ڕیسك ئەنجامبدا. بۆیە نایەوێ لە شەکەتی هیچ کەس و گرووپێ بپرسێ و باس لەوەش دەکا کە فێربوونێ زۆری لە ئەزموونەکانی ڕابردوویەوە دەستگیربووە. تۆبلێی وابێ یان ئەمە تەنیا وڕێنەیەکی سیاسییە. بەدلنیاییەوە ئەمە تەنێ وڕێنەێ سیاسی نییە بەلکو ڕیسکێ ترە هەروەك ڕیسکەکانی لەمەوبەر. بە گرووپ کۆچکردن و هەلاتن ئەوەندە شوێنی تێڕامانی

نییه. دیاردەی هەژاری و دەستکورتی و بێکاری (بۆنموونە بەپێی ڕاپۆرتێکی پەرەپێدانی نەتەوە یەککگرتووەکان 3 ملیارد کەس لەسەر زەوی بە 2 دۆلار کەتر لە ڕۆژێ دەژین کە بەبێگومان مرۆڤی نوێی کورد بەشێکە لەو ژمارەیە). پێیوانییە ئەمانە کێشەهایەکی درێژخایەنن. ڕێگانەگرتن لە کوشتنی ئافرەت. تەنێ لەتوانایدایە کە پاساودانی کولتووری بۆ بکا. بیرنەکردنەوە لە دۆزینەوەی چارەسەر بۆ دیاردەهایەکی وەك نەخوێندەواری، پیسکردنی ژینگە و فەرامۆشکردنی منال. ئەمانە بۆ ئەو کێشەی کۆمەڵگە ئەرستۆکراتیەکانن. دیارینەکردنی بوودجێتێ دیاریکراو بۆ خێزانی ئەوانەی گیانیان لەپێناوی کوردایەتی لەدەستداوە. ئەم نەك تەنیا ناتوانێ ئەمە بکا بەڵکو ناتوانێ کێشەی شەهیدە زیندووەکانیش چارەسەرکا و یان بەگشتی ناتوانێ ڕێگا لە دیاردەی شەهیدبوونیش بگرێ. ماناوەی تائێستای دیاردەی تیرۆر. ئەم پێویستی بە بوونی ئەم دیاردەیە هەیە تا بەهۆیەوە خۆی نێودەولەتی بکا. زیادبوونی دیاردەی دزێوی وەك سوال، سۆزانیەتی و بێ مالی و بێ ئیشی. ئەمانەو چەندین دیاردەو بەسەرهاتیتر ئەو شادبینی و بێباکیەی مرۆڤی کوردی تازە دەخەنە ژێر پرسیار و گومانەوە. ڕۆژانە ئەم مرۆڤە زۆرترین سەختی دێنێتە ڕێگای خۆی تادەگاتە یەکێ لەم ولاتانەی پێیدەڵێن ولاتانی نێتۆرك. بەڵام دواتر ژیانی یان هەر لەنیوەی ڕێگا کۆتای دێ یان بۆ سالانێك لە ئۆردوگاکانا دەمێنێتەوە و دووچاری تێکەلاوترین کێشەی دەروونی دەبێ و چەندین مرۆڤ، مرۆڤی تازە، لەناخی خۆیدا دروستدەکا. هەر بەگەیشتنیشی خۆی تەنێ بۆ کارکردن و هەموو جۆرە کارکردنێ تەرخان دەکا. ئەمەشدەکا تەنیا لەپێناوی ئەوەی ئەوانە بژێنێ کە گفتی داونەتێ و یان بەخێوکردنی ئەو ئارەزوانەی لەپێناویانا هەلاتووە. بۆیە بەهیچ جۆرێ ئەمە کاری ئەو نییە کە ڕاڤەکردن لەبارەی کۆمەڵگەی خۆی دواتر ئەو کۆمەڵگانەی تیای دەژی ئەنجامبدا. یان هیچ نەبێ ئەوە لە قۆناغێ تر ئەنجامدەدا. ئەمە بەسەرهاتی هەزارەهایە وبەهەقایەتی چەند کەس و حالەتێ ڕیزبەڕ و تایبەت ناسرێنەوە. ئەم مرۆڤە کوردە تازەیە دواتر بەوەوەناوەستێ کە تەنێ خۆی بە سەرسەختیەکانی ژیانە نوێیەکەیەوە ببەستێتەوە بەڵکو سونەتی ژیان وایلێدەکا کەسانێ تریش بەم ژیانە موێیەوە بگلێنێ. هەر لە هێنانی کەسانێ وەك باوك و دایك تادەگاتە ئەوەی دولبەرێکیش بگێنێتە لایخۆی. هێنانی دولبەرێکیش بۆلای خۆی حەماقەتەکە گەورەتر و ئالۆزتردەکا. چونکە ئێرە (واتە هەندەران) شوێنی کوشتنی دولبەرایەتی و پەیوەندیەکانە. یان ئەو دولبەرایەتیەی لە شوێنە

ئەفسووناویەکانا دروستدەبێ دەبێ هەر لەوێ بەخێوبکرێ. ئەمەو نامانەوێ بچینە ناو ئەو ڕێگایانەی کە ئەم مرۆڤە کوردە دەیگرێتەبەر بۆ دۆزینەوەی دولبەرێ. چونکە لە دیاردە هەرە ناشرینەکانی کۆمەڵگەی تازەی کوردی ئەوەیە کە دولبەر دۆزینەوە بووە بە یاریەك کە هەردوو خۆیان بەبراوە دەزانن. یان هەر خۆی دولبەرایەتی بووە بە یاری و بگرە باوترین یاریش. هەر بۆنموونەش دەکرێ تەماشای ئەو خێزانانە بکەین کە لەم سالانەی دوایدا دروستبوونە کە سەرەتا چ خۆشەویستیێ پەلە لە پال دروستبوونیانەوە بووە و دواتریش چۆن هەر بەهەمان خێرای هەلوەشاوەتەوە و بگرە زۆرجار بە کوشتنی لایێکیش کۆتای هاتووە. باوکی کۆردی تازەش کە بەرگەی غوربەت ناگرێ بەهەمان ئەو خێرایەی بەرەو هەندەران هاتووە ڕووە و نیشتمان دەگرێتەوە. ئەلبەتە باوکێ کوردی زۆر کە ئێستا گەڕاونەتەوە بۆ ژیان لە کوردستان مانای وەك کوردایەتیش دەدەنە پال ئەم گەڕانەوانەیان. ئاشکرایشە هەر زۆربەی ئەوانەش کە دەگەڕێنەوە بە تەنیا دەگەڕێنەوە و منالەکان بەسەر ژنەکانیان بەجێدێلن. ئەوانەی کە ڕابردووێ سیاسیان هەیە یان لەبواری مێدیا کاردەکەن یان خەریکی کاسبی و وردە بازرگانین. بەشێ زۆر لەوانەش ژن دێنەوە و ژنەکانیشیان بە بیست سال و تادەگاتە چل سال لەخۆیان منالترن. سەیرە زۆربەی ئەو ئافرەتانەش کە بەو پیاوانە شوودەکەن کە ژنی تریان هەیە یان هەبووە ئەو ئافرەتانەن کە بەشبەحالی خۆیان خوێندەوارێ باشیان هەیە یان لەبواری مێدیا کاردەکەن و تەنانەت بەشێکیان لەو بزووتنەوە ئافرەتانەیانەش چالاکن کە حیزب و ڕێکخراوەکان دروستیانکردووە. هەچ ئامارێکیش لەو بارەیەوە بکرێ ئەوەمان بۆ دەردەخا کە زۆربەی ئەو ئافرەتانەی لەم سالانەی دوایی شوویانکردووە ئەوا بەدلنیاییەوە بە هەندەرانیەکان بووە یان بەوانە شوودەکەن کە یان لە هەندەرانەوە بەیەکجارەکی هاتوونەتەوە یان دەسەلاتدارێ سیاسی و حیزبین. زۆربەی ئەو ئافرەتانەش شارنشینن و هەروەها بەشێکیشیان فێمینیست و کیژە نووسەرەن. لەهەموو ئەمانە سەیرتر ئەوەیە کە ئافرەتێ زۆر بەهۆی ناردنە دەرەوەی وێنەی بۆ هاوڕێ و کەسوکاری شوویکردووە یان کەسوکاری لە هەندەرانەوە بڕیاری خواستن و دانەشوویان بۆ داوە و، زۆربەی ئەو ئافرەتانەش لەکەمترین ماوە بڕیاری خۆیان داوە و ئەویش تەنیا بە یەك دوو تەلەفۆن یان نامەگۆڕینەوە ئەمەیان کردووە و لەسەر دروستکردنی خێزان ڕێککەوتوون. قایلبوونی ئافرەتانی کوردستان بە شووکردن بە نامە یان بە تەلەفۆن و دواتر

دیتنی دولبەرەکەی لەسەر ئاوەکەی حاپوور یان لە یەکێ لە بالوێزخانەکانی ولاتانی دەورووبەر(سوریا ، تورکیا ، ئێران) ئەمە بەخۆی گەورەترین کارەساتە کە بەسەر ئافرەتی تازەی کورد هاتووە. مەبەستیشمان لە وشەی تازە (مرۆڤی کوردی تازە، باوکی کوردی تازە، ئافرەتی یان پیاوی کوردی تازە) ئەوەیە کە بەداهاتنی چاخی زانیاری نەك هەر سیستەمێ بەرهەمهێنان و بردنەوڕێوە و ڕێکخستنی ئابووری و هەروەها بزووتنەوەهایەکی کۆمەلایەتی نوێ و دیاردەهایەکی کولتووری تر یان لۆژیکێ کولتووری نوێیمان دەستکەوتووە بەلکو بووشین بە خاوەنی خێزانێ نوێ و بنەمالەێ تازە و تێگەیشتنێ تر بۆ ئەڤینداری و سێکس و دایك و باوکایەتی و خوشك و برایەتیش. خێزان تەنێ ئەوکاتە سەرکەوتنی خۆی بەدەستدێنێ کە هەلوەشابێتەوە و کەسەکان هەریەك لە ژورێ قایمکرێ. ئەمە ئەو بڕوا بەخۆبوونەیە کە جیهانگیری زانیاری لەگەل خۆی دەیهێنێ. مرۆڤی کوردی تازەش کە دەمێك نیە کەوتۆتە ناو کۆمەلگە هاوچەرخەکانەوە ناتوانێ لەتەك دیاردە سەرسەخت و ڕووداوە پەلە و خێراکانی دونیای داهێنان و دۆزینەوە هەلکا و بۆیشە شتێ سەیر نییە کە بچکۆلەترین فورسەت ببینێتەوە ئامادەیە بیقۆزێتەوە بۆ گەڕانەوە و پێخستنەناو زێدی خۆیەوە. بەلام ئەم زێدەش لەگەل شەپۆلی گۆڕانەکانی جیهانگیری زانیاری دووچاری چەندین کێشە و تەنگوچەلەمەی ئابووری و کۆمەلایەتی و کولتووری سەیر سەیر بووە.

## جیهانگیری ترس و گومان

خوێنەری بەرگی یەکەمی کارە کۆمەلناسیەکەی کاستێلس سەرنجی ئەوەشی لا دروستدەبێ کە لەم توێژینەوەیە باسێك تایبەت نەکراوە بەو ترس و یان ڕقەی لە هەندێ کۆمەلگە و کولتوورەکانا سەبارەت بە تەکنیك بەگشتی و بە داهێنان و دۆزینەوە زانستی و زانیاریەکانی ڕۆژئاوا بەدیدەکرێ. ئەم ترس و ڕقەش لە ئەمڕۆدا و دوای زۆربوونی نووسراوی خودی ڕۆژئاوایەکان لەسەر هەلەکانی زانستگەری و بوونی زانین بە دەسەلاتێ پۆلاین و بەکاربردنی ئەم زانینەش لەلایەن دەسەلاتی سیاسیەوە بۆ بەزانستیکردنی ڕەوایەتی و بەهێزکردنی ڕەفتاری سیاسیان و، بەرپرسیاربوونی زانستی نوێ و مرۆڤی زامستی لە دوانەیەکانی ڕۆژئاوا شایانی قسەکردنە. ترس و ڕقیش لە تەکنیك بەگشتی و لە داهێنان و دۆزینەوە شتێ تازە نییە و گومان و پرسیارێ نوێ نییە. بەلام ئەم پرسیار و گومانە ئەمڕۆ بەزۆری لەو ولات و کۆمەلگانەدا

سەوزدەبێ و دواتر نەشونمادەكا كە خاوەنی پاڕادیگمێ زانیاری تایبەت بەخۆیان نین. دواتر زۆرجار ئەم ترسە ڕیشەی خۆی لە مەسەلە كۆمەلایەتی و كولتووریەكانا دەبینێتەوە. بۆ گەلێ لە كۆمەلگەكان و بەتایبەت ئەو كۆمەلگانەی جارێ شوێنێ بۆ باوەڕ و ئیمان لەئارادایە ڕێژەی ئەم ترسە لە تەكنیكی ڕۆژئاوا لە ترۆپكدایە و هەوێنی گشت گومانێكە لە تەكنیكی تازەی سەردەم. بۆ هەموو كارێكی كۆمەلناسیش گرینگە ڕوونكردنەوەی كەلكی زانین و زانیاری بۆ مرۆڤ و ڕونكردنەوەی ئەو دەرئەنجامانەی مرۆڤ بەهۆی زانین و زانیاریەوە پێیدەگا. چونكە بەشێ زۆر لە ترسەكان لە تەكنیك سەرچاوە لەوەدەگرن كە زانینی زانستێ لە ڕۆژئاوا مانای ڕوشتێ و ویژدانی خۆی كوشتووە. زەقترین نموونەش ئەو گەشەیە كە لەبواری بیۆ-تەكنیكدا ڕوویداوە ئەوەش بەهۆی ئەو دەستكەوتنانەی بایۆلۆژیا لەژێر كاریگەری تەكنەلۆژیای زانیاری پێیگەیووە (كۆپیكردن و هەروەها دروستكردنی مرۆڤ و گۆڕینی ڕەگەز).

هەروەها كاستێلس تەنێ باس لە تەكنیكێ نوێ دەكا كە ئەمەش تاڕادەكی زۆر هەلەیە. چونكە ولاتێ زۆر جارێ تەكنیكەكەیان زۆر نزمە و ناتوانن بەشداری نە لە بازاڕی تەكنەلۆژیای جیهانییكەن و نەش دەكارن پێداویستیەكانی ناوەوەی خۆیان دابینبكەن. بۆیە ئەم جۆرە ولاتانە نەك هەر بە بازاڕی تەكنەلۆژیای ئابووری گلوبالەوە وابەستەدەبن بەلكو ناتوانن ببن بە ئابووریهایەكیش كە خاوەنی توانایێ ئەوتۆ بێ كە چارەسەری كێشە ئابووریەكانی ناوەوەی خۆیان بكەن. تاڕادەكیش زۆربەی ولاتانی جیهانی عەرەبی وێنەیەكن لەم جۆرە ئابوورایانە و وابەستەبوونیشیان بە بازاڕی جیهانیەوە كێشەی نەك ئابووری و سیاسی بەلكو كۆمەلایەتی و كولتووریشیان بۆ دروستدەكا. بێتوانای ئابووری و تەكنیكی ئەو ولاتانە (واتە ولاتانی عەرەبی) شتێ ئاشكرایە بۆ دانیشتوانەكانی و ناكرێ ئەو ڕاستیە لە دانیشتوان بشاردرێتەوە. بۆیە هەموو نزدیكبوونەوەیەك لەنێوان ڕۆژئاوا و ئەو ولاتانەی لەسەرەوە ناویان هات بۆ دانیشتوانەكەی مانای سیاسی هەیە و ئاكامی خراپ لە زەمینی سیاسیاندا دروستدەكا. بۆنموونە هەچ نزدیكبونەوەیەك لەنێوان سوریا و ئەمەریكا یان ولاتێ ڕۆژئاوایی وەك بەریتانیا دروستبێ لەلایەك لە نێوەندی سیاسی و كۆمەلایەتی جیهانی عەرەبی مانای سیاسی دەدرێتەپال و لەلایەكیتر ئەو پێوەندیەش بەخۆی بە چركە سیاسیەكەشەوە گرێدڕدرێ و ئایندەشی هەر ئەو چركە سیاسییە دیاریدەكا كە ئەو ئایندەیەش هەمیشە لە دەرەوەی داوای دانیشتوانی ولاتەكە دەبێ. لێرەدا كێشەكە تەنیا ئەو زەمینە سیاسیە نییە كە

بەمجۆرە دروستدەبێ بەڵکو ئەو هەستەش کە بۆ تەکنیك و داهێنانەکانی وڵاتانی پێشکەوتووش هەیە. کە ئەمەش دیسانەوە مەسەلەی ئەو ترسە (ترس لە داهێنانی ڕۆژئاوا) دێنێتە پێشەوە کە لەسەرەوە باسکرا. ئەلبەتە لەم چەند ساڵانەی دوایدا ئەم ترسە فۆڕمی تری وەرگرتووە ئەوەش بەهۆی هاتنی تەوژمی جیهانگیرییەوە. ترسیش لە جیهانگیری هەروەك ترسە لە تازەگەری و دواتر لە دیموکراسیەت و مافی مرۆڤ و کۆمەڵگەی مەدەنی. چونکە ئەمانە هەموو پێکەوە گەشەیانکردووە و بۆ یەك مەبەستیش. ئەو هێز و شوێنانەش کە هەمیشە لە پشت ئەم گەشەیەوە بوونە ئەو سێستەمە سیاسی و ئابووری و زانیارییانە بوونە کە لە مێژوودا بە سیستەمهایەکی مرۆیی ناسراون. هەروەها ئەم سێستەمانە بەجۆرێ ناویان ڕۆشتووە کە مرۆڤایەتیان لە تاریکستان و بەربەریەتەوە بردۆتە ناو مەدەنیەت.

بۆئەوەی پتر ئەوی لەسەرەوە ووترا ڕوونیکەینەوە ئەوەش دەڵێین کە لەگەڵ هاتنەکایەوەی گشت دیاردەیەك بەشێ زۆر لە نووسەر و بیریارانی ڕۆژئاوا هەولی ئەوەدەدەن کە کەمووکوڕی و تەنگوچەڵەمەکان بەرباسبخەن و بەشداری لە دۆزینەوەی ڕێگاچارە بکەن و ڕەخنە ئاڕاستەی هێزە دیارو و نادیارەکان بکەن. بۆنموونە گەلێ لە ڕوناکبیران لە ڕۆژئاوا هەر زوو لەوەگەیشتن کە دیاردەی جیهانگیری زانیاری ڕێگایەکی ترە بۆ مۆنۆپۆلکردنی(قۆرخکردنی) پلانێتی ئەمڕۆمان و سازکردنی ڕێگایێکیش کە بەهۆی جیهانگیریەوە کار بۆ ئەوەکرێ کە گشت جیهان شێوازی ژیانی ڕۆژئاوا هەڵگرێتەوە. موخابن ئەم کارکردنەش ڕۆژبەدوای ڕۆژ لەکەم شوێن لە دونیا تەگەرەی دێتەڕێ و ئەوی کە زۆر ئەمڕۆ لە ناکۆکی و بەربەرەکایەتیدایە لەتەك ئەم شێوازە ژیانە ڕۆژئاواییە جارێ بەپلەی یەك جیهانی ئیسلامییە. ئەمەش بەزۆری وەك دانیشتوانی ئەو جیهانە نەك ڕژێمەکانی. کەواتە لەوێنەی وەك سودان کەمە و تەنانەت لە پووکانەوەشدایە. بەلام جارێ دانیشتوان لەگەڵ گشت شتێکی ڕۆژئاوایی هەر لە حالەتی دووبەرەکەیاتی و دوژمنکەرایدان. ئاسایشە بلێین کە ئەمەش لەژێر سایەی باوەڕ بەردەوامی بەخۆی دەدا نەك شتێتر.

ئەوەی گرینگە لێرەدا ئاماژەی پێبکرێ ئەوەیە کە زانیاریگەری کە بەهۆی تەوژمی جیهانگیرییەوە دەگەێنرێ لەلایەك کۆمەڵگەێ دروست دەکا بەناوی کۆمەڵگەی گلوبال. ئەم جۆرە کۆمەڵگەیەش، کە جارێ تەنیا لەهەندێ شوێن لە دونیا سەوزبووە، کۆمەڵگەێ نێتۆکراتە کە توانا و دامەزراوی نوێی لەگەڵ خۆهێناوە. بەلام ئەم توانا و دامەزراوە نوێیانە هەروەك توانا و دامەزراوە

کۆنەکان شیاویی دەخەنە بەردەست چینێکەوە. ئەو چینە کۆمەڵایەتییە نوێیانەش کە لەژێر کاریگەریی دەسەڵاتی نێت دا دروستدەبن هەروەك چینە کۆمەڵایەتییە کۆنەکان لەنێویەکدا ناتەبا و ناکۆکن. وێرای ئەوە، ئەم نێتە ئەزموونێ تازەیە لە دەسەلات و بەرهەمهێنان و کاریگەری ڕاستەوخۆشی بەسەر دامەزراوی کولتووری و ڕێکخراوە کۆمەڵایەتییەکانیشەوە هەیە. لەم کۆمەلگەیەدا دەسەلاتی سیاسی و مالی هەردوو بە نێتەوە گرێدەدرێ و ئەمەش وادەکا جۆرە دەسەلاتێ سەرووی سەرمایەداری دروستبێ کە ناوەرۆکەکەی دەسەلاتێ زانیارییە یان نێتی زانیاری سەرووی گشت نێتەکانی تر دەبێ هەر لە خێزان و حیزبەوە بگرە تادەگاتە تێگەیشتن بۆ ئازادی و ماف و دیموکراسیەت و سێکس بەم دەسەلاتە تازەیەوە پابەند دەبێ.
لەلایەکی تر ئەو زانیاریگەرییەی بەهۆی تەوژمی جیهانگیرییەوە دەگەێنرێ ئامادەنییە هیچ باوەڕێ پەسەندکا جگەلە باوەڕی خۆ بەجیهانیکردن زیاتر. جیهانگیریش پێیوایە تەنیا بەهۆی ئەم زانیاریگەرییەوە دەتوانێ جیهانێ تایبەت بە خۆی وەك دوا مۆدێلی سیاسەت و کولتوور و ئابووری دروستکا. کە ئەمەش لە هەندێ کۆمەلگە و ناوچە ڕق دروستدەکا. چونکە خۆیان لەو ئاستە نابینەوە. دوای نابێ ئەوە لەبیرکەین جیهانگیری واتە زۆرترین قوودرەت و ئەلبەتە قوودرەتێ نوێش کە بناغەکەی زانستی نوێیە نەك ئاین یان ڕەوشت. ئەمەش بەدلنییەوە ناحەزی دروستدەکا و بەتایبەت لەو شوێنانەی ناتوانێ گۆڕانەکانی تەکنیکی نوێ هەرس بکا. هەر بۆیشە ئازادی لە پارە پەیداکردن لەگەل تەوژمی جیهانگیری بوو بە باوترین ڕەوشت و ئەم جۆرە ئازادیەش گالتەکردنە بەخودی ئەو مافی مرۆڤەی هەموو جارێ باسدەکرێ. ئەوانەش کە هەمیشە باس لە مافە و ئازادیەکانی جیهانگیری دەکەن تەنێ سیاسی و بازرگانەکانن. چونکە تەنێ سیاسی و بازرگانەکان لەوەدەگەن کە جیهانگیری چەند شیاوی خستۆتە بەردەستیان.

# مانوێل کاستێلس
# وەك مارکسی چاخی زانیاری

## دروستکردنی کۆمەڵناسیەك تایبەت بە چاخی زانیاری

ئێمە لەم گفتوگۆیەدا باس لە سۆسیۆلۆژیای مارکس و فیبەر M .Weber ناکەین بەڵکو ئەوە نیشادەدەین کە چۆن ئەم کارەی کاستێلس بە کاری مارکس یان ڤیبەر شوبهێنراوە. هەروەها بۆ ئەوەی ئەم لایەنە نیشاندەین هەولدەدەین ئەوە بەرچاوبخەین کە چۆن کاستێلس کۆمەڵناسیەك تایبەت بە چاخی زانیاری دادەمەزرێنێ. خوێنەری کارە سێ بەرگیەکەی کاستێلس دەرك بەوەدەکا کە چاخی زانیاری کارێ کۆمەڵناسی ئەکادیمییە و هەولێکیشە لەلایەن کاستێلسەوە بۆ دروستکردنی تیۆریێ کۆمەلایەتی تایبەت بە چاخی ئەمرۆمان و ئەو شارستانیەتە ئەلەکترۆنیەی بەرێوەیە. نەك هەر ئەوە بەڵکو واش لە پۆلی کۆمەڵناسی تازەدەکا زۆرترین تیۆریزەکردن بەسەر دیاردە و ڕووداوە سیاسی و کولتووریەکانەوە بکا. ئەو کۆمەڵناسیەی کاستێلس سەبارەت بە چاخی زانیاریمان دایدەمەزرێنێ تێکەلاوێکە لە گەلێ بوار و پۆلی تر. چونکە باسە کۆمەڵناسیەکانی کاستێلس بواری ئابووری و کولتوور و کۆمەڵگە و هەروەها جوگرافیا و دیمۆگرافی و ژینگەناسی و ماف و یاسا و ئارکتێکتوور و شارناسی دەگرێتەوە. هەروەها خوێنەر هەر زوو هەست بەوەشدەکا کە کاستێلس بە بنەماێ ڕووناکبیری زانکۆیی و ڕابردوویێ چەپانەوە هاتۆتە گۆڕەپانی توێژینەوەکانی و بەئاگایێ بەربلاو چاخی نوێ، کە بە چاخی زانیاری ناوزەدیکردووە، باسدەکا و لەوێشڕا زۆرترین بایەخ بە سێ باسی گرینگ دەدا کە ئەوەش تەکنەلۆژیای زانیاری و جیهانگیری و بابەتی ناسنامەیە. بەلام هەموو ئەوانە والە خوێنەری ئەم کارە کۆمەڵناسییە ناکەن کە لەلایەك گومان لە هەندێ بۆچوون و تەماشاکردنی ئیمپیری ئەکادیمی کاستێلس نەکا و، ڕەخنە لە ڕێگا چارەکانی ئەم ڕادیکالە زانکۆیی و کۆنە مارکسیستە

بۆ کێشە سیاسی و ئابووری و کولتووریەکان نەگرێ. کارکردنی کاستێلسیش لەسەر چاخی زانیاری شتێ کتووپڕی ئەکادیمی نەبووە بەڵکو پێشتر کاری لەسەر هەمان ئەم شێوە باسانە کردووە. ئەوی کاستێلس لە "شاری زانیاری، 1989" باسبێوەدەکا دواتر لە چاخی زانیاری دێتەوە سەری یان شێوەی کارکردنی لە کتێبی "پرسیاری شارنشینی" و "شار و گراسروتس، "دەچێتە هەمان خانەی مێتۆدی و تێۆری کتێبی "چاخی زانیاری".
هەر زوو کاستێلس وەك مارکسی چاخی زانیاری و یان کۆمەڵگەی نێتۆرك ناوی دەرکردو و بوو بە بیریار و کۆمەڵناسێ کە لێکدانەوە بۆ سەرمایەداری نوێی جیهان ئەنجامدەدا. لەمیانەی ئەو لێکدانەوەیەش کۆمەڵناسیەك تایبەت بە جیهانگیری دروستدەکا. بۆیە دەکرێ لەلایەك وەك مارکسی جیهانگیری و وەك کۆمەڵناسێکی جیهانگیری تەماشاکرێ. لە وڵاتی سویدیش کارەکەی کاستێلس کرا بە بیانوویەك بۆ مارکسیستان بۆ هێنانە پێشەوەی باس لە مێدیاکانا لەسەر مارکس. بۆیە یەکێ لە ڕۆژنامە گەورەکانی سوید بەناویDagbladet Svenska لە پێشەکیەك لەسەر کاستێلس بۆ بلاوکردنەوەی چەند خوێندنەوەیەك لەبارەیەوە ئاماژە بەوەدەکا کە مرۆڤ دەمێکە بەدووی مارکس یان ماکس قیبەری"کۆمەڵگەی زانیاری"دا دەگەڕێ. باشترین کەسیش کە دەکرێ بە باوەڕی ڕۆژنامەکە بۆ ئەم شوێنە هەڵبژێرێ ئەوە کاستێلسە(69). بەلام دەشێ جەغت لەوەبکەین کە ئەم بیریارە کۆمەڵناسە لەناو ئەو ڕەخنانەی لە عەقل و هیۆمانیزم و ئیمپریزم دەگیرێ ڕوو لە ترادیسیۆنی مارکس دەنێ. هەروەها زۆرتر لە ئەنتۆنی گیدێنسەوە A. Giddens نزدیکە وەك لە هابرماز، ئالان تۆرێن دەکا بە سەرچاوە وەك لە میشێل فوکۆ. لە ڕوونکردنەوە کولتووریەکانیشی زۆرتر پۆست مۆدێرنێ مارکسیستانەیە لەسەر شێوازی داڤید هارڤیDavid Harvey نەوەك پۆست مۆدێرنێ سیاسییانەیە لەسەر ڕەوتی ژان بۆدریار. بەکورتی کاستێلس پیاوی ڕۆشنگەرییە و باوەڕێ زۆریشی بە مرۆڤ، عەقل و ئایندە هەیە (70). ئەمەش تاڕادەیەکی زۆر لەو کۆمەڵناس و بیربارانەی جیادەکاتەوە کە بەڕەخنەگرتنیان لە عەقل و عەقلگەرایی ڕۆژئاوا بناغە بۆ شێوازێ تر لە توێژینەوە و لێکدانەوە دادەنێن. ئەمە باوەڕی کاستێلسە و لەمیانەی کارەکەی کارێ زۆر بۆ ئەم لایەنەدەکا ولەسەر بەکاربردنی ئەم عەقلگەراییە و داهێنان و دۆزینەوەکانی پێشنیار و بەلگەی زۆر بەدەستەوە دەدا. بەلام لەهەمان کاتدا ڕەخنەێ زۆریش لە سێستەمی ئابووری و کۆمەلایەتی ڕۆژئاوا دەگرێ و پێیشی وایە کە سەرلەنوێ

خۆبوونیادنانەوەی ئەم سێستەمە لە کۆتای سالانی 1970 کانەوە مانایێ زۆری بۆ سێستەمی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و ڕێکخستن هەبووە. ئەم گۆڕانەش بەدلنیایەوە بەهۆی ئەو پاڕادیگمە نوێیەی زانیارییەوە هاتۆتەکایەوە کە لەولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا هاتە دونیا. بەلام ئەم شادبینیەی کاستێلس ناشێ گومانی لێنەکرێ و ڕەخنەی ئاڕاستەنەکرێ. چونکە جیهانگیری ئابووری لەگەل داهاتنی تەکنەلۆژیای زانیاری زۆرترین دەسەلات پەیدا دەکا و هەروەها لەگەل چوونە قۆناغی ئابووری زانیاری بەرهەمهێنانی زانیاری ڕێگا لەبەردەم بازرگانی زانیاری و تەکنیکی تازەدا دەکاتەوە و ئەمەش تەنێ بواری ناردن و فرۆشتن لەبەردەم ئەو ئابووریانە دا دەکاتەوە کە ئەم توانایەیان هەیە. واتە گوازتنەوەی ئابووری ڕۆژئاوا لە قۆناغی پیشەسازیەوە بەرەو قۆناغی پاش پیشەسازی و دواتر زانیاریگەری، کە ئەمەش ئابووریێ تازە و بەتوانا دروستدەکا کە گشت ئابووریەکانی تری جیهان ئەو توانایەیان نییە. ئەم توانایەی ڕۆژئاواش وا لە ئابووری و کۆمەلگە و کولتووری ڕۆژئاوا دەکا دەست بەسەر ئابووریەکانی تر بگرێ و بەخۆشیەوە گرێیدا.

بە باوەڕی لارش ئیشامارLars Iishamar، کە نووسەرێ سویدییە، هاوشێوەییەك لەنێوان کاستێلس و مارکس دا هەیە. ناوبراو ئەم هاوشێوەییە لە هەندێ شتدا دەبینێتەوە. بۆنموونە، کاتێ مارکس سەرمایەی بە سێ بەرگ نووسی لە لەندەن دەژیا و ئەو کاتە لەندەن پیشەسازیترین شاری جیهان بوو. بەلام کاستێلس کاتێ بەرهەمە سێ بەرگییەکەی لەبارەی چاخی زانیاری دەنووسێ لە کالیفۆرنیا و زانکۆی بێرکلی دانیشتووە لەبەری ئەوبەریشەوە سیلیکۆن ڤالی، ناوجەرگەی شۆرشی دیگیتال، بەباشی دیارە. ئەلبەتە چ مارکس و چ کاستێلیش هەردوو تیۆرییە کۆمەلایەتییەکانیان بەتێگەیشتن لە توێژینەوەی ئیمپیریەوە بوونیاددەنێن. ئەو گرنگیەی سلیکۆن ڤالی لە بەئەنجامگەیاندنی توێژینەوەکانی کاستێلس دا هەیبووە هەر ئەو گرنگییەیە کە مانشێستەر Manchester لە لێکدانەوەکانی مارکس دا دیوویەتی. کاستێلس ئەوێ دەکا بە شوێنێ بۆ قسەکردن لەسەر هاتنی چاخێ تازە (چاخی تەکنەلۆژیای زانیاری) یان کۆمەلگەێ تر (کۆمەلگەی نێتۆرك) و ئابووریێ نوێ (ئابووری ئەلەکترۆنی) بەلام پێشتر مارکس ئەمەی لە شوێنێ وەك مانشێستەر کردووە بۆ باس لە هاتنی قۆناغی پیشەسازی یان شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی. هەردوو باس لە داهاتنی فۆڕمێ کۆمەلایەتی و ئابووری نوێ دەکەن و ئەو گۆڕانکاریانە بەر لێکدانەوە دەخەن کە بەهاتنی ئەم شێوازە

تازانەی بەرهەمهێنانەوە دروستبوونە. ئەمەو هەردووش باس لە بونیاد، سیستەم و گۆڕانکارییەکان دەکەن. مارکس بۆ نووسینی کارکەی لەبارەی سەرمایەوە گۆڕانکارییەکانی سەدەی هەژدە و نۆزدە لەبەرچاودەگرێ. هەرچی کاستێلسە سالانی پاش ئەم دوو سەدەیە لەبەرچاودەگرێ بۆ ڕونکردنەوەی گۆڕانکارییەکان و دروستبوونی کۆمەڵگەی پیشەسازی و کۆمەڵگەی زانیاریی. واتە کاستێلس هەروەك مارکس هەولدەدا سەردەمی خۆی ڕوونکاتەوە. هەرلەمبارەیەشەوە نووسەرێ مێژوویی سویدی هۆکان ئارڤیدسۆن H. Arvidsson ئەوە ڕووندەکاتەوە کە ئەو شێوە کارکردنەی کاستێلس دەستیداوەتێ بۆ لێکدانەوەی دۆزی جیهانی ئەوڕۆ وایکردووە کە گەلێ هاوشێوەییەك لەنێوان کاستێلس و مارکس دا ببینن. بەباوەڕی مێژووکردی ناوبراو کارل مارکس و ماکس فێبەر فەیلەسوفهایەکی کۆمەلایەتی بوونە کە سەرقالی ڕوونکردنەوەی کۆمەڵگەکانی خۆیان بوونە و شیکردنەوە و زانینی ئیمپیرییان پێکەوە خستۆتەکار. ئەلبەتە مرۆڤ دەتوانێ کارەکتێریزەی جیاوازی لەنێوان کاستێلس و مارکس و فیبەر دا بکا وەك جیاوازی لەنێوان زانستی کۆمەلایەتی و مێتۆدێ مێژوویی. بۆ هەردوو لە مارکس و فیبەر مێژوو سەرچاوەیەکی بنەڕەتی بووە بۆ زانین لەمەڕ ئێستا و ئاینده. لای ئەمان هەولدان لەئارادایە بۆ جوداکردنەی هێزەکانی نەشونما کە ئەمەش گرنگی خۆی هەیە بۆ ئەوەی کە مرۆڤ بکارێ ئەو کۆمەڵگەیە بناسێتەوە کە تیای دەژی. بەمجۆرە مێژوو دەبێ بە دەروازەیەك بۆ ئەوەی تێگەیشتنێ کۆکمان لەسەر جیهان و ژیان بداتێ. کەچی لای کاستێلس مێژوو وەك سەرچاوەیەکی زانین بوونی نییە. بەواتایەکی تر مێژوو ئەو بایەخەی بۆ کاستێاس نییە. ئەلبەتە ئەم بێ مێژووییەی کاستێلس ئارگومێنتەشونی کارەکەی کەمدەکا. ئەمەش لەبەرئەوەی کاستێلس لەعەودالی دۆزینەوەی، توێژینەوە و تێگەیشتنی ئەوەیە کە لە سەردەمی ئێمەدا چی تازەیە و، هەروەها بۆئەوەی بتوانێ لۆکالیسێرەی ئەوەبکا کە تازەیە و پاشان لێکدیان بکاتەوە پێویستی بە مێژوو دەبێ. ئەمەو جگەلەوەی کە کاستێلس لە کارەکەیدا بەشێوەیەکی ناپەرچەکرداری و نائاکاییانە بەراوردی مێژوویش دەکا. بەباوەڕی هەر ئەم نووسەرە مێژووییە ئامرازی بناغەیی کاستێلس بۆئەوەی کۆمەڵگەی مۆدێرن ڕوونگاتەوە بۆنموونە لەسەر ڕیزێ بەدواچوونی مێژوویی دامەزراوە بەلام بەدواچوونێ کە هەرگیز پرۆبلێماتیزمەکراوە و هەر لەبەرئەوەش خۆی وەك شتێ نادیار دەردەخا. بۆ ئەوەی ئەو لایەنانەی لایسەرەوە ڕوونکەینەوە

دەگرێینەوە سەر دید و ڕوونکردنەوەکانی خودی کاستێلس. بەپێی تێگەیشتنی ئەم کۆمەڵناسە ئەمەریکییە بۆئەوەی مرۆڤ لە چاخێ بگا دەبێ ڕیزێ چەمك بەرهەمبهێنێ. هەر بۆیشە ناوبراو ئەمەی لە دوتوێی ئەو سێ بەرگەدا بە باشی پێڕەو کردووە و، پاشان ئەم توێژەرەوەیە بۆ ئەوەی شیکردنەوەی قوول و چەند جەمسەر لەسەر دیاردەکانی کۆمەڵگەی زانیاری نوێ و سەردەمی تەکنەلۆژیای زانیاریی بەدەستەوە بدا چەندین واتاو و دەستەواژەی نوێی خولقاندووە و لەدووتوێی کارە کۆمەڵناسیە جیهانییەکەیدا جێگیری کردووە. تەنانەت بەپێی دیدی لارش ئیشامار یش بەرگی یەکەمی ئەم کارە سێ کوچکەییە، کە لەبارەی گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرکەوەیە، گرنگترین بەرگیەتی و لەوێشڕا کاستێلس بەباشترین شێوە بۆچوونە تیۆری و ئیمپیرییەکانی بەرباسخستووە. ئەمەو کاستێلس هەر لە بەرگی یەکەم بەجۆرێ وەسەرەتا دێ تا ئەو سێرکردنەمان لا دروستکا کە کۆمەڵگەی تازەی ئەمڕۆ لە کۆمەڵگەی پیشەسازی لەمەوبەر جوداوازە. بەپێی ناونیشانی بەرگی یەکەم بێ نێت ئەو ڕۆلە سەرەکی و مێژووییە دەبینێ کە پیشەسازی پێشتر دیوویەتی. هەربۆیشە کاستێلس بەهۆی وشەی نێتەوە زۆرتر دەلێ لەوی مەبەستیەتی. بەهۆی ڕوونکردنەوە ئیمپیرییەکانیەوە بۆ نێت (هەروەها ئینتەرنێت یان نێتی کۆمپیوتەر) لەوەدەگەین کە چۆن کۆمەڵگەی نێت کاری خۆی دەکا و ئەم نێتەش لەناو ئەم کۆمەڵگەیەدا ستروکتورێ بناغەیی کۆمەلایەتی بۆ خۆی پەیداکردووە. ئێمە هەموو لەم کۆمەڵگەیەدا لەئاستێ بەرزدا بە نێتۆرکێ جۆراوجۆرەوە بەستراوینەتەوە. چونکە نێت بەجۆرێ سەیر هەموو بوارەکانی کۆمەڵگای نوێی پێکەوە بەستووە و دواتر دەباتە ڕێوەش. ئەمەش تێندێنسێ مێژووییە لە چاخی زانیاری کە پرۆسێس و فونکشوونە زالەکان وەك نێتۆرك ڕێکخراون. کاتێکیش کە کۆمەڵگەی نێتۆرك ستروکتورێ سۆسیالی بناغەیی نوێ بۆخۆی دابیندەکا دەبێ بە خاوەنی ئابوورێ نوێ، ئابوورێ گلوبال و زانیاراوی و پشتبەستووش بە کولتوورێ نوێ. لێرەدا مەبەستی کاستێلس لە کولتوورێ نوێ کولتووری ڤێژواڵە یان کولتووری ڤێژواڵی ڕاستییە. بەپێی دیدی ئیشامر ئەم واتایەی کاستێلس زۆر لەو تێزەی مارشال ماکلوهانMacLuhan. M ەوە نزدیکە کە مێدیا پەیامە. بەخۆی ڕاستی ڤێژواڵ لای کاستێلس سیستەمێکە کە خودی ڕاستی لە جیهانێ مێدیایدا بەندکراوە و لەوێدا دیاردەکان تەنیا لەو شاشەیەدا دەرناکەوێ کە تیایدا ئەزموونەکانی ئێمە کۆمۆنیسێرەدەکرێ (دەگەێنرێ) بەڵکو هەروەها دەگۆڕدرێتە خودی ئەزموونەکان. بەمجۆرە دەکرێ

بلێین کاتێ لەبەردەم تەلەفزیۆن دادەنیشین پرۆگرامێ لە پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆنەکە وامانلێکا هەست بەوە بکەین کە ئەوی دەیبینین لە ژیانە ڕاستەقینەکە ڕاستترە، ئەمەش نەك هەر لەبەرئەوەی کە ئەوە ئەزموونەکانمان، بەهاکانمان و بابەتی قسەکردنەکانمان دەباتە ڕێووە، بەڵکو هەروەها بەومانایەی کە ئەوە کار لە ویستی ئابووری و سیاسی دەکا. کاستێلس لەوباوەڕەدایە کە وێنەی ڕاستی لە گۆڕاندایە بەپێی ئەوەی نێت بەفیعلی کار لە تێژیانی کات و جێگا دەکا. ئەلبەتە بەشێ زۆر لە توێژەرەوەکان قسە لەسەر کارتێکردنی دوولایەنی کات و شوێن بەسەر یەکەوە دەکەن کەچی کاستێلس لەبڕی ئەوە باس لە واتای تەوژمی-شەپۆلی- شوێن و بێ کاتی کات دەکا.

بۆ ئەوەی لە شێوازی کۆمەڵناسی کاستێلس بگەین پێویستە تێخوێندنەوەی جۆراوجۆرمان بۆ توێژینەوەکەی هەبێ تا لەوەبگەین کە چۆن کاستێلس هەولیداوە بەهۆی قسەکردن لەسەر باسی نێت و خود قسە لەسەر ڕووداو و دیاردە گەورەکانی چاخی زانیاریمان بکا. بۆنموونە کە باس لە نێت دەکا باس لەوەشدەکا ئەم نێتە ڕێگا بۆ تاوانێ ئابووری زۆر خۆشدەکا کە ئەمیان بۆ کاستێلس بووە بە شوێنی باس. دواتر ئەم لایەنەش وەك یەکێ لە کێشەکانی چاخی زانیاری کاستێلس مەجبووردەکا ئاوڕێ لێبداتەوە. تاوانەکان کە لەڕووی نێودەولەتییەوە وریایانە ئۆرگەنیزەکراوە پرسیارێ گەورەشە لەژیانی سیاسی و ئابووری کۆمەڵگەی نوێ. ئەم لایەنە دیاردەێ گەورەیە و کاستێلس شانبەشانی هەندێ تاوانی گەورەی تر (بۆ نموونە وێرانسازی ژینگە، پێشێلکردنی ماف) بەرباسیدەخا. بەخۆی خودی ئەو باسەی کاستێلس کار بۆ توێژینەوەی دەکا، کە ئەوەش نێتە، بەشێوەێ خۆی دەردەخا کە دەسەلاتێ وونە و قەدەرێ مێژووی و شارستانی تازەیە. ئەم دەسەلاتە وەك ئەو دەسەلاتە نییە کە کۆمەڵگەی پیشەسازی لەمەوبەر (سەدەی هەژدە و نۆزدە) دروستیکردبوو. ئەمەش لەبەرئەوەی کە دەسەلاتی نێت نێوەندێ ئاشکراو و دیاری نییە. ئەو ئابووریەش کە ئەم دەسەلاتە نوێیە پشتی پێدەبەستێ بەوە ناسراوە لەدەوری نێتۆرکێ گلوبالی پشتبەستراو بە سەرمایە، زانیاری و زانینێ تەکنیکی بالا کۆبووەتەوە. هەر سەبارەت بە دەسەلات و نێت کاستێلس ئەوە ڕووندەکاتەوە کە دەسەلاتی ڕاستەقینە بەدەست ئۆپێراتۆرەکانەوەیە. لەبەرئەوەی ئەو دەسەلاتە ئابوورییەی لەئەم ئێستادا دامەزراوە لەسەر بناغەی شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە. لەم حالەتەدا دەکرێ بووترێ کە زانیاریی و کولتوور تەنێ مانادار نیین بۆ بەرهەمهێنان بەڵکو بەخۆیان ئەوەن. سیستەمی

بەرهەمهێنانی نوێش کە زانیاری بردنەڕێوە و یان بایەخدانە بە زانیاری دەسەلاتێ ئابووری بالا ئەخولقێنێ کە نە جەستە و نەش ماشین (ئالەت) لەتوانایەتی دروستی بکا. بەبێکومانیش بناغەی ئەم سیستەمی بەرهەمهێنانە ئەو تەکنیکە زانیارییە نوێ و گەشە زیاد لەپێویستەی ئەو سی سالەی ڕابردووی جیهانە. لێرەدا شیاوە کاستێلس وەك ئابووریناسێکی سالانی شەست و هەفتاکانی پاش پیشەسازی تەماشاکرێ، وەك دانیال بێل. ئەم قۆناغەش (واتە پاش پیشەسازی) ئەو قۆناغەیە کە کۆتای بە خولی سەرمایەداری پیشەسازی هێنا و کۆمەلگەیەکی هێنایەکایەوە کە تیایدا زانیاری و زانین جێگای کار و سەرمایەی گرتەوە. بەپێی کارەکەی کاستێلسیش بێ لەم چەند دەیەی دواییدا شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی ڕێگای بۆ جۆرێ نازە لە بەرهەمهێنان چۆلکرد کە ئەوەش شێوازی بەرهەمهێنانی زانیارییە. ئەم شێوازەش لە بەرهەمهێنان پتر لە شێوازەکانی پێشوو چالاك ترە لە بواری کارکردن، بەرهەمهێنان، ڕێکخستن و دابەشکردن. بەلام تا چ ئەندازەێ سوودمەندتر و مورالی ترە ئەوە لەهەندێ شوێنی تردا باسمان لێوەکردووە.

کاستێلس لەکارەکەیدا بە بەردەوام باس لەوەدەکا کە ئەوە نێتۆرکە چاخی ئەمڕۆمان دەستنیشاندەکا و هەموو ستروکتورە هێرارکییە جێگیرەکانیش لەلایەن ئەم نێتەوە دەستییەسەرداگیراوە. بەپێیئەوەی ئەم نێتە کە دەستی بەسەر گشت پلانێتەوە گرتووە فۆرمێ گلوبالی هەیە و ئەرکی پەخش و کۆکردنەوەی زانیارییە. بەلام ئەم زانیارییە هەر لەسەرەتاوە کاستێلس بەجۆرێ لێکیدەداتەوە کە قەدەرێ شارستانییە و بۆیشە هەولێ زۆر دەدا کار لەسەری بکا.

بەباوەڕی ئارڤیدسۆن کاستێلس وەك جۆرێ لە مەوادیخام تەماشای زانیاری دەکا کە لەمیانەی کارپێکردندا ببێ بە زانین. ئەم جۆرە ڕوونکردنەوەیەی کاستێلس بۆ زانیاریی و زانین لەگەل تێبینیەکانی بۆ مانا و دەسەلاتی نێتۆرك دەگونجێ. واتە نێتۆرك لەتوانایدایە زانیاری بگۆڕێتە زانین و گرنگیش لە بەرهەمهێنانی کۆمەلگەی مۆدێرندا ببینێ. بەلام بۆ ئەم نووسەرە ئەم نێتەی کاستێلس باسیلێوەدەکا شتێ تازە نییە و لەسەدەکانی ناوەڕاست دا ئامادەبووە و پادشاکان و بنەمالە ئارستۆکراتییەکان نێتۆرکی خۆیان هەبووە و توانیوویانە زانیاری تایبەت فۆرمولێرەبکەن و چاخی خۆیان نخەنە سایەیەوە. هەرلەوماوەیەشدا کلیسە دەسەلاتی سیاسی بەربلاوبووە و زانیاری تایبەتی خۆی هەبووە و هەروەها هەمیشە لە مێژوو کۆنفلیکت و جەنگەکان ڕیشەیان لە کۆنفلیکتەکانی نێوان ئەم نێتۆرکەوە وەرگرتووە.

خوێنەری کارەکەی کاستێلس ئەوە دەزانێ کە جیاوازی ئەم توێژینەوەیەی کاستێلس لەوی مارکس بۆ سەرمایەداری کلاسیك کردوویەتی لەوەدایە کە کاستێلس بەهەموو شێوەیەك ڕاماندەکێشێتە ناو ئەو باسەی کە ئێمە مرۆڤی چاخی ئەمڕۆ بەهۆی تەوژمی ئابووری نوێوە بەرێگاوەین بەرەو کۆمەڵگەی نێتۆرك. یان لەگەڵ کە گوێمان لە دەستەواژەی نێتۆرك دەبێ دەبێ ئەوە بزانین کە ئابووریێ تازە داهاتووە کە جوداوازە لە ئابووری پێشوو. ئەم ئابوورییە تازەیەش لەلایەن کاستێلسەوە بە ئابووری زانیاری ناودەبرێ. لە خاسلەتەکانی ئەم ئابوورییە ئەوەیە کە ئابووریێ گلوباڵە و توانای گەشە و بڵاوکردنەوەی زانینێ نوێی هەیە. هەروەها بناغەی ئەم ئابوورییە نوێیە ئەوەیە کە مرۆڤەکان لە کۆمەڵگەی نێتۆرك دەستیان داوەتە ئەوەی لەتەك یەکدا خۆ یەکخەن. لەناو ئەم ئابوورییە تازەیەدا بازرگانی پارە، کاغەزی بەهادار و هێزی کار بەرێگای نوێ کاری خۆیان دەکەن. ئەم تەوژمە نوێیانەش خالی یەککرتنەوە و چەقی توێ دەخولقێنێ کە لەوێڕا دەسەلات و دەولەمەندی کۆدەبێتەوە، و ئەم ئابوورییە نوێیە جیهان لەڕووی مالییەوە پێکەوەگرێدەدا. ئەم لایەنانە کە پێویستی بە ڕوونکردنەوە بووە مارکسێکی خۆی ویستووە تا شیکردنەوە لەبارەیانەوە بدا. چونکە شیکردنەوەکانی مارکسی یەکەم تەنێ بەجۆرە ئابووریەکەوە تایبەت بوو کە ئەمڕۆ پیر بووە.
هەر بۆیشە کاستێلس لە دووتۆی باسەکانی دەبەوێ ئەوە لەیادنەکەین کە ئەو مۆدێرنەیەی ئەمڕۆ تیای دەژین وابەستەیە بە زانیاریی و نێتۆرکەوە. واتە مۆدێرنەی ناوبراو هەولی زانیاری کۆکردنەوە، ڕێکخستن، بەکاربردن و گەشەپێدانیشە و لەهەمووگرنگتر ئەوەیە کە کاستێلس بەرەو ئەو سێرکردنەمان دەبا کە ئەم زانیارییە لە نێتۆرکدا کۆدەبێتەوە و کاریشدەکا. بۆ مێژووکردێ ئابووری سویدی بەناوی لارش ماگنوسۆنLars Magnusson (71) ئەو شۆڕشە میکرۆ ئەلەکترۆنییەی لەدوای جەنگی جیهانی دووەوە پیادەدەکرێ ئەوەیە کە لە نێتۆرك دا بەشدارە. گەشەکردنەکەشی لەلایەن پێ سێ و ئینتەرنێتەوە پەلەی تیاکرا. دوای ئەوەش کە پێ سێ بە نێتۆرکەوە بەسترا توانی ئەو ئابووریە تازە و کۆمەڵگە گلوباڵە دروستبکا کە تیایداین. بەمە توانای کۆمپیوتەر گەیشتە ئەوەی نێتۆرك لەخۆبگرێ و شیاوی تازە بۆ ئابووری نوێ بەردەستبخا و توانای نوێ بۆ بەرهەمهێنان و شێوازی نوێ بۆ ڕێکخستنی کار و بازرگانی کردن بردنەڕێوەو و دارایکردنی کاروبارەکان بخولقێنێ. واتە شێوازی بەرهەمهێنان کە دەگۆڕێ شێوازەکانی تریش لەگەل

خۆی دەگۆڕێ و ئەم گۆڕانەش سێستەمی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتیش بەخۆیەوە گرێدەدا. ئەم جۆرە تەماشاکردنەی ئەم مێژوو کردە سویدیە سەرچاوە لە توێژینەوەکانی خودی کاستێلسەوە هەڵدەگرێ کە فۆرمی تازەی سێستەمی ئتبووری و سیاسی سەرمایەداری ئەم گۆڕانانە پیادەدەکا. دوای تێپەڕبوونی 150 ساڵێ بەسەر کارە ناودارەکەی مارکس بەناوی"سەرمایە" سێستەمی ئابووری ڕۆژئاوا نەك تەنیا بوونیادی کۆمەڵایەتی و سیاسیی گۆڕاوە بەڵکو سێستەمێ زانیاری و زانینی نوێش هاتۆتەکایەوە کە بەشداریێ زۆری لە گۆڕینی تێکڕای دیاردە ڕۆژانەیەکانیش کردووە.

ئەوەی زۆر سەرنج ڕاکێشە لە ڕاڤەکردنەکانی کاستێلس سەبارەت بە سێستەمی ئابووری زانیاری ئەمڕۆ ئەوەیە کە زۆر جەغت لەسەر ئەوەدەکا کە ئێمە لە کۆمەڵگەی نێتۆرك دا دەژین و ئەم کۆمەڵگەیەش بەوە دەناسرێتەوە کە سەرمایە تیایا گلوبالانە ڕێکدەخرێ و کەچی کار ئیندڤیدوالیزەدەکرێ و نرخێ خۆی وەك فاکتووری بەرهەمهێنان لەدەستدەدا. نووسەرێ وەك میکایل نوبێریNyberg aelMik (72) ئەوە باسدەکا کە ئەو ئیندڤیدوالیزمکردنەی کار، کە کاستێلس باسیدەکا، لە خودیخۆیدا کۆتایهێنانە بەو یاسایانەی خۆهەڵبژاردنی سەرمایەداری سنووردارکردووە. ڕەخنەی ئەوەشی لێدەگرێ کە ئەگەرچی کاستێلس ئاگای لە چۆنیەتی بەجەمسەرگەرییکردنی جیهان هەیە بەڵام دەیەوێ ئەوەمان فێرکا کە نایەکسانی ئەو شتەیە کە پێوەندی بە چینەوە نییە و لەبڕی ئەوەش لەسەر شتێ دی دەدوێ، وەك دیسکریمینێرینگ (فەرقگەرایی)، کە پێوەندیان بەهێزی کارەوە هەیە نەك بێ کاری کە ئەوە مارکس باسی لێوەکردووە و بە گەشەی سەرمایەداریشەوە بەستوویەتەوە. هەروەها ئەوەی پێیدەوترێ بەرخۆریی ئابووری دوو لەسەر سێی جیهان دەگرێتەوە. ئەو بەشە زۆرەی جیهان کە لە دەرەوەی جیهانی نێتۆرکە پڕە لە گرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کولتووری. هەروەها هەر ئەم نووسەرە سویدیە میکایل نوبێری پێیوایە کە ئەوەی پێیدەڵێن کرێکاری ئیندڤیدوالیزمکراو لە فۆرمێ کاری نادڵنیا زیاتر شتێتر نیە(73). ئەمەش بەدڵنیاوە جۆرە ڕەخنەیەکە لەو شێوە ڕوونکردنەوەی کەکاستێلس سەبارەت بەم لایەنانە داویەتی، کە جیاوازە لەو شێوە کارکردنەی مارکس لەسەر پێوەندی نێوان سەرمایەدار و کرێکار(پرۆلیتاریا) کردوویەتی. چونکە مارکس ئەوەی بەلایەوە گرینگە لایەنە چینایەتیکەیە هەروەها ئەو بێ ئایندەییەی چینی کرێکار لەژێر سایەی سێستەمی سەرمایەداری تیایدەژێ. هەرچی کاستێلسە وەدووی جۆرە پۆلکردنێ

تر کەوتووە و بەپێی ئەو گۆڕانە ئابووری و تەکنیکیەی هاتۆتە سەر سەرمایەداری باس لە بوونی جیهانێ دەکا بەناوی جیهانی چوارەم کە پێیوایە ئەم جیهانە لە گشت شوێنێ ئامادەیە. ئەلبەتە ئەم جیهانەش تەنێ کرێکاری بێکاری تیا نییە بەلکو پەناهەندە و هەژار و سۆزانی و بێمال و پەکەوتە و چەندین جۆرە کەسی تریش لە خۆدەگرێ. بۆیە بۆ کاستێلس واتای سەرمایەدار هەروەك واتای کرێکار بەربلاوە و فۆڕمێ زۆری وەرگرتووە. چونکە تەکنەلۆژیای زانیاری دەستە و توێژێ زۆر تازەی لە کۆمەلگەکانی خۆی دروستکردووە و گەلێ دیاردەی نوێشی لەو کۆمەلگانە هێناوە دونیا کە شوێنی ڕاستەقینەی بەرهەمهێنانی ئەم تەکنەلۆژیا تازەیە نییە.
لەهەمان کاتیشدا شیکردنەوەکانی کاستێلس بۆ ئەم چرکە هاوچەرخەی تیای دەژین بۆنی جۆرە ئومێدوارێکی لێدێ کە ڕەنگە لە باوەڕیی بە توانا باشەکانی مۆدێرنیزەکردنەوە هەلقوولابێ. بۆیە بە باوەڕی مێژووکردی سویدی هۆکان ئارڤیدسۆن(74) ئەم کۆمەلناسە سەرکەوتوونابێ لەوەی کە بتوانێ ئەوەمان نیشانبدا کە چۆن نێتۆرك و تەوژمی زانیاری و شێوازی بەرهەمهێنانمان خۆی لە ئێپۆکەکانی پێشوو جیادەکاتەوە. لەبەرئەوەی ئەم مێژووکردە سویدیە خودی ئەو ئێپۆکەی-چاخەی-کاستێلس باسی لێوەدەکا(واتە نێتۆرك) بە ئێپۆکێ بێ مێژوو لەقەمەدەدا. ڕەنگە واتای مێژوو بۆ کاستێلس تەنیا ئەو چرکەیەی ئەمرۆ بێ کە تیای دەژین. یان ئێستامان ئەو چرکە مێژوویە دەستەجەمعییە کە هەموو هەلگریین. دیسانەوە ئەم لایەنە دەمانباتەوە ناو کێشەێ تر کە ئەوەش ئەو بەگشتیکردنەیە کە کاستێلس چاوەڕێیدەکا کە لە ژێرسایەی تەکنیکی تازە بکرێ هەموو بیژێین. بۆنموونە کاتێ کە چاخی نوێمان کارێ وایکردووە هەموو بەوەی پێیدەلێن ئینتەرنێت ببەسترێینەوە گومان لەوە ناکرێ کە ئەم ئینتەرنێتە توانیوویەتی هەموو شێوازە پەلەکان بۆ بلاوکردنەوە و گەیاندنی مەرجەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردنی زانیاری بگرێتەبەر و، بەلام ڕۆلی ئەوەشی دیووە کە مانای کات و شوێنیش لەیەك کاتدا بگۆڕێ ئەگەرچی ئەمە تائێستا بەچەند شوێنێکەوە تایبەتە. کەواتە مرۆڤ ڕۆژانە و لەهەج کات و شوێنێ لەسەر ئەم پلانێتە نخوازێ، دەکارێ خۆی بە ئینتەرنێتەوە گرێدا بەلام ئەم گرێدانە تایبەتێتی خۆی هەیە. چونکە ئەم ئینتەرنێتە لەگشت شوێنێ کاریگەری بەسەر بەرهەمهێنان و دابەشکردنی شمەك و خزمەتگوزاریەوە وەك یەك نییە. هەروەها شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری بەتەواوەتی شێوازی بەرهەمهێنانی پیشەسازی نەسڕیوەتەوە و لەگشت شوێنێ لەسەر ئەم پلانێتەی

تیای دەژین زانیاریگەری نەبووە بە شێوازێ لە بەرهەمهێنان. ڕاستە تەوژمی زانیاری پەلە لە بواری بازرگانی شۆڕشی گەورەی کردووە بەلام هەموو ئابووریەکان وەك یەك ئەمە ناژێن. پاشان ئەوی پێوەندی بە دراو و کاغەزی بەهادارەوە هەیە تەنیا ئەو بایەخەی بۆ چەند ئابوورێ هەیە و لە چەند ولاتێ بووە بە کەرتێ بۆ خولقانی دەولەمەندی و دەسەلات. بۆیە ناشێ و ناکرێ ئەوە لەیادکەین کە تائێستاش کە ولات و ئابووری تەنیا لەسەر ئەو بناغەیە نەشونما دەکا کە پشتی بە بەرهەمهێنان و بازرگانی دەبەستێ. بۆیە خوێنەری چاخی زانیاریەکەی کاستێلس ئاساییە بەو باوەڕە بگا کە ئەم چرکە پاش پیشەسازییەی گەلێ لە کۆمەلگەکان دەیژێن نیشانەیە لەسەر ئەوەی سەرمایەداری زانیاری نوێ سەرمایەداری پیشەسازی تێپەڕاندووە. لە ماکدۆنالسەوە بگرە تا دەگاتە کارگەکانی تەلەفۆن و ئۆتۆمۆبیل وەك یەك فۆڕم لە کارکردن ئۆرگەنیزەدەکرێ(ڕێکدەخرێ). ئەم ئۆرگەنیزەکردنەش چوارچێوەی کۆمەلایەتی و کولتووری گۆڕیووە و تێگەیشتن بۆ خێزان و حیزب و کلیسە و هەندێ ڕێکخراو و دامەزراو وەك خۆی نەماوە بۆیە سێرکردنەکان بۆ ناسنامەی سیاسی و کۆمەلایەتی گۆڕانی هاتۆتەسەر کە ئەمەش کارێ وایکردووە کە تێۆریزەکردن لەبارەی بابەتی ناسنامەی سیاییەوە گۆڕانی بێتەسەر. ڕاستە کاستێلس هەولی شیکردنەوەی بزووتنەوە کۆمەلایەتیە نوێکان لە سێستەمی کۆمەلایەتی گلوبال دەدا بەلام جەغت لەوەدەکا کە ئەم بزووتنەوانە نێتۆرك فۆڕمی ڕێکخستنیان پێدەبەخشێ کە دواتر بەشێ زۆریان دەبن بەهەلگری ڕەفتاری فۆندەمیناتلیستی و زەبرووزەنگاوی. گەلێ لەوانەی خوێندنەوەیان بۆ کارەکەی کاستێلس ئەنجامداوە ڕەخنە لەوە دەگرن کە چۆن کاستێلس تەماشای بزووتنەوەی زاپاتیستەکان لە مەکسیکو و بزووتنەوەیAum Shinrikyo (ئەوانەی گازی ژەهراویان لە مێترۆکانی تۆکیۆ بلاودەکردەوە) بەدوو بزووتنەوەی پەرچەکرداری دژ بە جیهانگیری لەقەلەمدەدا. هەروەها بزووتنەوەی فۆندەمینتالیستە ئاینییەکان و بزووتنەوەی ژینگە و فێمینیزم بە بزووتنەوە هایەکی ناسنامەیی و دژ لەقەلەمدەدا و، پێشیوایە بیری ئیکۆلۆژی (ژینگەپارێزی) لە توانایدا ناسنامەی مرۆڤایەتی نوێ بخولقێنێ. واتە ناسنامەێ سۆسیۆ- بیۆلۆگی.

کاستێلس لە کارەکایدا توێژینەوەێ گەورەمان بەردەستدەخا، کە ئەم توێژینەوەیە ئاڕاستەێ دیاریکراوی هەیە و لەنێوان پەیڤین لەسەر ئێستا و ئایندەمان خۆی بەرجەستەدەکا. هەروەها ئەم جۆرە توێژینەوانە جۆرە خشتەێ

زانینی گلوبال بەردەست سەرجەم توێژەرەوە و ڕوناکبیرانی جیهان دەخا بەلام ڕوونکردنەوەکانی لەبارەی جیهانی سێ لاوازە. یان لەبڕی ئەوە باس لە بوونی جیهانێ تر دەکا کە ئەوەش جیهانی چوارە. ئەم جیهانە لەڕووی جوگرافیەوە لە گشت شوێنێکدا ئامادەیە لە نیویۆرك هەروەك لە کوردستان. بەواتایێتر جیهانی چوار لەو شوێنەدایە کە بێکاری و کەمدەرامەتی و چەوسانەوە و تاوان و نادادپەروەری کۆمەلایەتی سەرپشکن. کاتێکیش کاستێلس باس لە دروستبوونی ئەم جیهانە دەکا ئامازە بە مەترسی ئەم جیهانە لە هەندێ شوێن لە جیهانا ناکا. بەتەماشاکردنێکی ئەو خشتە و هێلکاری و ئامارە جۆراوجۆراو و سەرچاوانەی کاستێلس بۆ تێروتەسەلکردنی باسەکەی بەکاریبردوون ئەوەمان بۆدەردەکەوێ کە کاستێلس بەشێ لەم جیهانەی( بۆنموونە جیهانی عەرەبی - ئیسلامی) ئەمڕۆمانی فەرامۆشکردووە. ڕاستە بەشە گەورەکەی جیهان بەرهەمهێنەری نێتۆرك نین و زۆرتر دەچنە خانەی بەکاربرانی تەکنەلۆژیای زانیاریەوە بەلام دەکرێ باس لەو ئالۆزکاری و کێشانە کرێ کە نێتۆرك بۆ سێستەمی سیاسی و کۆمەلایەتی ئەم ولاتانە دروستیدەکا. چونکە هاوردنی بەرهەمە تەکنیکیەکانی ڕۆژئاوا و یان بەکاربردنی نێتۆرك تەنێ ئەو گەشەیە دروستناکا کە هەندێ تەماشایدەکەن و ستایشیدەکەن بەلکو ئەو گۆڕانانەش دروستدەکەن کە دواتر گەشەکە دەخەنە ژێرپرسیارەوە. چوونە ناو نێت ئاکامەکەی تەنێ دروستکردنی ناسنامەی لێوەوبەرنانێ بەلکو شێوانی ناسنامەش بەرهەمدێنێ. لە نێت دا کاتێ کەسێ یان گرووپێ بەناوی کەس و گرووپێ ترەوە قسەدەکا یان نێت دەبێ بە شوێنی منالبازی و سێکسکرین و شووکردن و ژنهێنانێ بێ بناغە ئەمانە ئەو فۆڕمە کۆمەلایەتیە ساختە و دزێوانە دروستدەکەن کە کاریگەری بەسەر کولتوور و ژیانی کۆمەلایەتییەوە بەجێدێلن.

ئێمە پێمانوایە مەرجە جیاوازی لەنێوان تراديسیۆنە ڕوناکبیریە جۆراوجۆرەکانا بکرێ. چونکە ئەم جیاوازیکردنە مانای زۆری بۆ ئەوە هەیە کە چۆن هەریەك لە ئێمە لە ژینگە ڕوناکبیریەکان دەگەین و هەروەها چۆنیش تەماشای گشت ژینگەی کولتوری و کۆمەلایەتی دەکەین کە تراديسیۆنێ کۆمەلناسی لە پشتەوەیە. کاتێ کە باس دێتە سەر کاستێلس وەك کۆمەلناسێ دەبێ هەمیشە ئەو ژینگە ئەکادیمی و ڕۆشنبیریەمان لەبەرچاوبێ کە کارەکەی کاستێلسی لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا و ئەوروپا (ئەلبەتە لێرەدا ولاتانی باکووریش یان سکەندەناڤیش مەبەستە) لە ئامێز گرت. ئەمە لایەنە بۆ ئەو

کەسانەی دەیانەوێ تێگەیشتنێ لەسەر کارەکەی کاستێلس بەدەستەوە بدەن خالێ گرینگە. لەبەرئەوەی یەك لە سەختیەکان لە گەیاندن لە نێوان کۆمەلناس و خوێنەرانی ئەوەیە کە خوێنەرانی لەبەردەم کارێکدا خۆ دەبیننەوە کە زانیاریێ ئەوتۆیان لەسەر چۆنیەتی بەرهەمهێنانی ئەم بەرهەمە نییە(75). هەروەها ئەو باسانەی ناوبراو کردوونی بە تەوەری توێژینەوە(تەکنەلۆژیای زانیاری، جیهانگیری ئابووری، خولقانی ناسنامە) لەلایەك لەتەك بارودۆخی زانستی و ئابووری و سیاسی ڕۆژئاوا دەگونجێ و لەلایەکی دیش ئەو باسانە تەوەرەی گەلێ توێژەرەوە و کۆمەلناسی دین و نێوەندە زانکۆیی و ڕوناکبیریەکان باسێ زۆریان لەبارەیەوە هێناوەتە پێشێ. هەموو ئەوانەش باس لەوەدەکەن کە ئەوە کۆمەلگەکانی ڕۆژئاوایە کە شوێنی ئەو تەوژمە نوێیانەیە و هەروەها دامەزراوەکانی ئەم کۆمەلگانەیە کە لێکدانەوەکان لەبارەی ئەم جۆرە باسانەوە هەنووکە دەکا. بەواتێ تر، پێش ئەوەی کاستێلس بێتە سەر باسی تەکنەلۆژیای زانیاری / یان پاڕادیگمی زانیاری نوێ هەروەها باسی جیهانگیری و سیاسیەتی ناسنامە گەلێ کۆمەلناس و تیۆریزەکەری سیاسی و تەکنیکناس لێکدانەوەیان لەبارەوەکردووە. بەلام فۆڕمی لێکدانەوەکانی کاستێلس بە بەراورد بەوانی پێشخۆی شێوازێ جیاتری وەرگرتووە و، هەروەها ڕەوتی ئیمپیری باسەکانی کاستێلس و پشت بەستنیش بە هێلکاری و نەخشە و ئامارێ زۆر کارەکەی فوولتر کردووە و بایەخدانیشی لەیەك کاتدا بە نێت و سێستەمی کۆمەلایەتی سەرمایەداری و ڕۆلی بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان لە دروستکردنی ناسنامەێ پەرچەکرداری بوونیادێ تری بۆ تێگەیشتنەکانی داڕشتووە. کەچی دەبینین لەناو ئەو هەموو کۆمەلناس و تیۆریزەکەرە سیاسیانەدا ئەم بەرهەمەی کاستێلس بە (سەرمایە) کەی مارکس یان (ئابووری و کۆمەلایەتی) یەکەی ماکس فیبەر بەراوردەکرێ. ئەمەش زۆرجار وادەکا تەماشاکردنی جۆراوجۆر سەبارەت بەم کارەی کاسێلس دروستبێ. چونکە کاستێلس هەر لەسەرەتاوە باس لە نێت و خود دەکا، هەروەك ئەوەی مارکس باسی لە سەرمایەدار و کرێکار کردووە. بەلام کێشەکە لێرەدا ئەوەیە کە کاستێلس باوەڕی بە نێت هەیە و پێیشیوایە دەکرێ ئاڕاستەی نێت بەجۆرێ بگۆڕدرێ کە بەجۆرێ باش بەشداری لە بەرەو پێشەوەبردنی کۆمەلگە بکا و خودیش بکەوێتە ناو نێتەوە و هەروەها ئەم نێتە بەشێوەێ چاك لەلایەن ئەم خودەوە بەکارببرێ. واتە نێت بۆ خود دەبێ بە بوارێ بۆ داکۆکیکردن لە مافەکانی و خستنەڕووی دید و یۆتۆپیاکانی. بەلام موخابن کەشەی ئەهریمەنانەی نێت و ئامانجی بازاڕ بۆ

دروستکردنی ئەم گەشەیە بۆ کاستێلس بەتەواوەتی نەبووە بە بوار بۆ توێژینەوە. بەلام مارکس تا ڕۆژی مردنیشی پێیوابوو ئەم دژەگەرایییەی نێوان کرێکار و سەرمایەدار هەر لە پەرەسەندن دا دەبێ تا سەرمایەداری بەهێزترین فۆرمی کۆمەلایەتی بێ. پاشان بۆ مارکس ئەوەی کە زۆر گرینگە ئەوەیە کە مرۆڤ بەهۆی کارەوە ژیانی خۆی دەگۆڕێ و پەرە بە شیاویەکانی خۆی دەدا، بەلام هەر ئەم کارەش کارێ وا بەسەر مرۆڤ دێنێ کە مرۆڤ لە خۆی نامۆ دەبێ. بۆئەم مەبەستەش نەك هەر کۆمەلناسیەك تایبەت بە سەرمایەداری دروستدەکا بەلکو فەلسەفە و زانستێ ئابووریش. هەمیشە ئەو کۆمەلناسیەی مارکس کاری لەسەر کردووە لەسەر بناغەی لێکدانەوەی ئابووری دروستبووە کە ئەوەش ئاڕاستەی ئەو گۆڕانکاریانە کراوە کە لە کۆمەلگەی سەرمایەداری ڕوویانداوە. هەرچی ماکس فێبەرە پێیوانییە کە کاری کۆمەلناسی تەنیا ئەوەیە کە کردەی مرۆڤایەتی دیارییکا بەلکو ئەوەشە کە ماناکان یان بەواتایێ تر بەهاکانیش دیارییکا. بەمجۆرە بەفەولی هابرماز بێ کۆمەلناسی بۆ ماکس فیبەر زانستێکە کە بەهۆی ڕوونکردنەوەوە هەولدەدا لە کردەی کۆمەلایەتی بگا(76). ئەگەر لەم ڕووەوەوە بەوردی تەماشای کارەکەی کاستێلس بکەین دەرك بەوەدەکەین کە ناوبراو تیۆرێ تایبەت بە سەرمایەداری نوێ دادەمەزرێنێ. بەلام ئەو سەرمایەدارییە پێشتر مارکس تیۆریزەی بەسەرەوەکردووە کە ئەوکات ئەم سەرمایەداریە شێوازێ بەرهەمهێنانی پیشەسازی لە پشتەوە بوو و چاخێ کۆمەلایەتی و ئابووری ئەوکاتەشبووە. بەلام کاستێلس تیۆریزە بەسەر چاخێ کۆمەلایەتی و ئابووری ترەوە دەکا و سەرمایەداریش وەك جاران نەماوە و بەلکو چووەتە قۆناغێ ترەوە کە ئەوەش قۆناغی پاش سەرمایەدارییە یان بەقەولی کاستێلس سەرمایەداری نوێیە کە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاری لە پشتیەوەیە. تیۆریزەکردنیش بەسەر ئەم شێوازە تازەیە تەنیا تیۆریزەکردن نییە بەسەر فۆرمێ نوێ لە بەرهەمهێنان بەلکو بەسەر فۆرمێ نوێ لە دەسەلات و ئەزموونیش. دواجار نابێ ئەوەش لەبیرکەین کە ئەم شێوازە تازەیە بوونیادێ کۆمەلایەتی و کولتوورێ نوێشی لەتەك خۆهێناوە. بۆیە کاستێلس ڕەخنەێ تووند لە مۆنۆپۆلیزەکردنی زانیاری و زانیتێ نوێ دەگرێ و پێیشیوایە ئەم زانیاری و زانینە نوێیە تا ئێستا لە دەست چەند ولاتێکدایە. ئەو لێکدانەوانەش مارکس لە سەردەمی خۆی بۆ شەپۆلی شمەك و سەرمایە کردوویەتی ئەمڕۆ کاستێلس بۆ شەپۆلی زانیاری دەیکا و ئەوەش ڕووندەکاتەوە کە چۆن ئەم شەپۆلە نوێییە فۆرمی نوێی

قوودرەتی دروستکردووە. هەروەها کاستێلس لە لێدوانێك باس لەوەدەکا کە باشترین شتێك کە بتوانێ بیکا بۆ ئەوەی جیهان چاکبکا ئەوەیە کە بایەخ بە کارەکەی بدا و هەولبدا لە ئابووری، کۆمەلگە و کولتوور لە جیهان نوێ دا بگا و کۆششی ئەوەشکا ئەمە بگەێنێتە خەلك. هەر لەم لێدوانەشدا کاستێلس داوای ئەوەدەکا کە خەیالبازەکان لە دەسەلات دوورخرێنەوە.

مرۆڤ لەم قسانەی کاستێلس گەلێ شت بەدیدەکا کە ڕەنگە هەر ڕوونکردنەوەی تیۆری پووخت نەبێ بەقەد ئەوەی کە هەولێکیش بێ بۆ ڕوونکردنەوەی جیهان و گۆڕینی فۆرمێ دەسەلات یان ڕوونکردنەوەی ئەو دەسەلاتەی بەرێوەیە. واتە ئەو دەسەلاتەی تەکنەلۆژیای زانیاری لەسەر ئاستی دامەزراو (دەولەت) و ڕێکخراوەکان(کارگە مولتی ناسیۆنالیەکان) دروستیدەکا. بەلام کاستێلس ئەم بەرهەمەشی بۆ کەسانێ نووسیووە کە پسپۆڕن. ئەوی زۆر شارەزای باری ئابووری نوێ جیهان نەبێ، هەروەها لەو خزمەتە بەئاگانەبێ کە تەکنیکی نوێ بە ئابووری گەیاندووە یان لەو گۆڕانەی لە کولتووری جیهان بەهۆی زانیاری نوێوە ڕوویداوە، ناتوانێ لە ناواخنی کارەکەی کاستێلس بگا. ڕاستە کاستێلس کۆمەلناسیەك تایبەت بە زانیاریگەری و کۆمەلگەی نێتۆرك بەرهەمدێنێ بەلام ئەم کۆمەلناسییە تایبەتە بە گەشەی کۆمەلایەتی و زانستی و مادی چەند کۆمەلگە یان ولاتێکەوە. گەلێ لە کۆمەلگەکانی ناوچەکانی ئێمە ئەو کۆمەلگە نێتۆرك و زانیاریاویە نین کە کاستێلس باسیلێوەدەکا. هەروەها ئاکامەکانی ئەم زانیاریگەرییە لەسەر ئاستی کولتووری و دەروونی و ئابووری لە ناوچە و کۆمەلگەکانی ئێمەدا دەرك بە ڕەنگدانەوەیەکی تەواوەیان ناکرێ.

سەرباری ئەوی لایسەرەوە ووترا ئەوەش دەلێین کە کۆمەلگە نابێ بە کۆمەلگەی نێتۆرك کاتێ کە پەرەبۆل (سەتەلایت) بەسەر سەربانی هەندێ لە خەلکی ئەم کۆمەلگەیەوە دەبێ یان هاولاتیانی ئەو کۆمەلگەیە بۆی هەبێ لە شوێنی ئیشەکەی یان لەمالەوە نێتۆرك بەکاربەرێ یاخود دانیشتوانی شار موبایلتەلەفۆن لە گیرفانیان بێ. چونکە ئەگەر ئێمە تەماشای مێژووی سەرهەلدانی نێتۆرك کەین دەبینین لەسەرەتا لە ولاتەیەکگرتووەکانی ئەمەریکا پەیدابووە و یەکەمجار لە بواری سەربازی سەری دەرهێناوە و ئەو توێژینەوانەش کە لەم بوارەدا کراون لە پشت هاتنەکایەوە و دواتریش نەشونمای ئەم نێتۆرکە بوونە و بۆ سێستەمی سیاسی و ئابووری و سەربازییش مانادار بوونە. ئەلبەتە ئەم دۆزەش هەرئاوا لەخۆڕا نەبووە و هۆکار و ئامانجی سیاسی و ئابووری لەپشتیەوە بووە. هەموو ئەو لایەنانەش

بووەتە هۆی دروستبوونی گۆڕانی کۆمەلایەتی و جوگرافی و کولتووری و کاریگەری خۆشیان بەسەر ڕەوتی ئابووری و زانستی و کۆمەلایەتی جیهان بەجێهێشتووە. کە دەشلێین جیهان پێش گشت شوێنێ ئەو ولاتانەمان مەبەستە کە باری ئابووری و کۆمەلایەتی و شارستانیان لەئاستی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکایە. بۆیە گواستنەوەی ئەو پاڕادیگمە زانیاریە نوێیە، کە سەرەتا لە شوێنێکی ئەم جیهانە هاتۆتەدونیا و دواتر لە شوێنەای تر جیهان پەرەیسەندووە و کەوتۆتەکار، لە جێیکەوە بۆ جێیتر نامۆیی و دابڕانی کۆمەلایەتی و کولتووری و کێشەی دەروونیش دەخاتەوە. ئەم نامۆیەش بەزیانێ زۆری ئەو شوێنانە دەگەڕێتەوە کە میوانداری ئەم پاڕادیگمە دەکەن کە بەخۆیان هیچ پاڕادیگمێ زانیارییان بەرهەمنەهێناوە. چونکە تەکنیکی نوێ کە دێتە ناو کۆمەلگاوە گۆڕان دروستدەکا و ئەم گۆڕانەنەش بۆ بەشێ زۆر لەو کولتوور و کۆمەلگانەی خاوەنی هیچ پاڕادیگمێ زانستی و تەکنیکی نەبوونە ژیانێ تراژیدیان بۆ دروستدەکا. ئەوەش لەبەرئەوەی بەکاربردنی دەستکەوتەکانی زانیاریگەری تەنیا بۆ ئاسانکردنی ژیانی ڕۆژانە بەکارنابرێ و بەلکو پێش هەموو شتێ ئەم زانیاریە نوێیەی ئەمڕۆ دەیەوێ گەردوون داگیرکا لەناواخنیدا پاڕادۆکس و ناتەبایێ زۆر لەخۆدەگرێ.
وێرای ئەوەی ووتمان کاستێلس کاتێ کۆمەلناسیەك تایبەت بە تەکنەلۆژیای زانیاری دادێنێ خۆی لەبەردەم چەندین فۆڕم لە داڕشتنی کۆمەلناسی کەسانێ تری پێش خۆی، کە کاریان بۆ ڕوونکردنەوەی گەردوونی تازە و باری ئالۆزی جیهانکردووە، دەبینێتەوە. بۆیە هەلوێستەکردنەکانی کاستێلس لە ولاتانی ڕۆژئاوا تاڕادەیەکی زۆر توانی جێگای خۆی بکاتەوە. ئەلبەتە جگەلە هەندێ کێشەی تیۆری و میتۆدی کە لێرە و لەوێ بوون بەجێی سەرنج، وەکیتر شوێنی خۆی بەچاکی لە نێوەندی کۆمەلناسی جیهانی کردەوە و بووش بە سەرچاوەێ چاك لەسەر دۆزی ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسی هەنووکە. بەلام خوێنەرانی کاستێلس لە هەرشوێنێك بن لەم جیهانە دەتوانن پرسیار لەسەر بۆ هاتنی ئەم چاخە و مانا و گرینگی بۆ مرۆڤایەتی و ڕۆلی لە دانی چارەسەر بۆ کێشە زۆرەکانی جیهان بکەن. ئەمەش بەتایبەت کاستێلس تیۆریزە بەسەر گەلێ لایەنی سیاسی و ئابووری ئەوتۆوە دەکا کە هەموو لایەك دەگرێتەوە. ڕاستە کاستێلس ئابووریناس و تەکنیك ناس نییە بەلام لە چوارچێوەی باسەکەی هەولێ زۆری داوە کە زانیاری و ڕاڤەکردنێ زۆر لەسەر ئابووری هەندێ ولات و بارودۆخی گەشەی تەکنیکی لە هەندێ ولات

بەدەستەوەبدا. وێرای ئەوە کاستێلس ئەگەرچی کاری سیاسی لەناو دەوڵەت نەکردووە، کە لە لێدوانێکدا دانیپیادێنێ(77)، بەڵام لە گەڵێ شوێن لە توێژینەوە و لێدوانەکانیدا بۆچوونی سیاسی خۆی هەیە و دیدی ئایدیۆلۆژیش فۆرمولێرەدەکا. ڕەنگە تەماشاکردنەکانی بۆ گەلێ باس و خواس وای لەگەلێ خوێنەران کردبێ کە وەك چەپ و یان مارکسیست تەماشایبکەن. بەڵام سەیرەکە ئەمە نییە بەڵکو ئەوەیە کە کاستێلس هەولدەدا لە توێژینەوەکانیدا ئەوە نیشاندا کە گەشەی نێتۆرك لەتوانایدایە تەبای و دادپەروەی دروستکا و تەماشای ئەمەریکاش وەك نێوەندێ بۆ دیاردەی مولتی کولتوڕالیزم و فێمینیزم بکا. ئەوەی ئێمە لێیگەیشتووین فێمینیزم خستنەسەرجادەی ئافرەت و قایمکردنی لە کارگەکان و بەستنەوەی بە بەروبوومەکانی بازاڕی بەرخۆری مۆدێرنە نایێ. ئەوە فێمینیزم نییە کە ئافرەت لەوەدەخا کە ئیندڤیدێ کۆمەلایەتی بێ. ئەولایەنانە گرفتەکانی ئافرەتی چاخی زانیاری گومڕاتردەکەن و ڕێگایەکیشن بۆ مانادان بە ئیندڤیدوالیتیێ هەلە و دروستکردنی ئافرەتێ تازە کە تەنیا خەریکی ئارایشکردن بێ، ئەمەش لەبەرئەوەی بازاڕ ئەمە داوادەکا و تەنێ لەبەرژەوەندی کارگەکاندایە کە ئافرەتێ تازە بوونی هەبێ و بۆئەوەی ئەمەش هەبێ دەبێ ئەم ئافرەتە کڕیارێ باشی بەرهەم و شمەکەکانی بازاڕی مۆدە و دیزاینی نوێ بێ. هەروەها ئەوە سروشتی ئافرەت نییە کە لە بەرامبەری پیاو دانرێ و یان ببێ بە سیمبۆلێ بۆ ساغکردنەوەی شمەك. کولتوری مۆدێرنیش جۆرە تێگەیشتنێکی لەناو خەلك بەرجەستەکردووە کە هەج بیرکردنەوەێ تر لەدەرەوەی بازاڕ و کارگەکان بۆ ئافرەت هەبێ ئەوا تاوانی باوکسالاری و دواکەوتویەتی دەدرێتەپال. ئاشکرایشە کە تەکنیکی نوێ لەتواناشیدایە گشت دیاردەو و ڕوداوێ بەزانستی بکا و پاساودانی زانستیانەش بۆ گشت شتێ بهێنێتەوە. ئەمڕۆ ئافرەتی ئەمەریکیش گەورەترین نموونەی ئافرەتە لە جیهانا و لە گشت شوێنێ لە جیهان بووە بە مایەی لاسایکردنەوە و پەسەندکردن. نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەمەریکا بووە بە چەقی ئەو ئافرەتەی ناومانناا ئافرەتی تازە و هەروەها پیاوی تازەش. ئەم دوو بوونەوەرە تازەیەش تەنێ خەریکی بەخێوکردنی جەسەد و پەیداکردنی پارە و مومارەسەکردنی سێکسن بەهەموو جۆرەکانییەوە (هەر لە سێکسی گرووپەوە تادەگاتە سێکسی دیگیتال، ئەمەش بەهۆی کڕینی دەزگای ئەلەکترۆنی و ئامرازی سەیر سەیری سێکسی کە شوێنی ئەندامە سورشتیەکان دەگرنەوە) و لەگەل گشت کەسێ. وشەی خۆشەویستیش زۆرجار لە پشت زۆربەی ڕەوایەتی و پاساودانەکانەوەیە. خۆشەویستی

بۆلەمەولا ئەو هەقایەتە نهێنی و سەرمەدیە نییە کە مرۆڤی پێش مرۆڤی تازە بۆیدەژیا. نەخێر. ئەمە ئەو جۆرە خۆشەویستیەیە کە لەگشت شوێن و کاتێ دەکرێ دروستبێ و یان هەلوەشێتەوە. ئەم جۆرە خۆشەویستیە ماهیەتێ پۆرنۆگرافی (خەلاعی) و شەهوەتاوی هەیە. تەنانەت مولتی کولتووڕالیزمەکەش (فرە فەرهەنگی) ئەو ناوەڕۆکەی نییە کە کاستێلس ئارەزووی دەکا. لە شوێنێ وەك ئەمەریکا کە جیهانگیری ئابووری و زانیاری تیایا لە لوتکەدایە ڕەوڕەوەی ئەوە بەدەست چەند کارگە و دامەزراوێکەوەیە. ئەم جەمسەرگەرییە نەك ئەو مولتی کولتووڕالیزمە بەدرۆدەخاتەوە بەلکو ئەوەش ڕەتدەکاتەوە کە ئەگەر ئەو جیهانگیرییە توانیبێتی دادپەروەری کۆمەلایەتی دروستکا و کێشەی ئیتنی چارەسەرکا. ئەمەریکایەك کە ئەمڕۆ وەك سۆڤیەتی جاران لەسەر مانادان بە نێوەندگەرایی نیشتیمان پەروەری و دروستکردنی مرۆڤێ (یان دوامرۆڤێ) دەڕواتەڕێوەوە کە ناوی ناوە مرۆڤی ئەمەریکی، ناتوانێ لە کێشەی نەك مرۆڤەکانی تر بگا بەلکو پێش هەموو شتێ نایەوێ لە گرفتە کولتووری و کۆمەلایەتی و ئابووریەکانی خۆشی بگا. ڕۆژانە لەسەر ڕەوشی خراپی ڕەشپێستەکان و کێشەی گروپە ئیتنی و ئاینیەکان و بالاخوازی لوبی یەهودی لە ئەمەریکا هەقایەتمان دێتەبەرگوێ. ئەوە هاولاتی ئەمەریکی نییە کە هەمووی تەکنیك کارێ نوێ و ئەندازیارێ مۆدێرنە. ئەمە نەك هەر لە ئەمەریکا مەحالە بەلکو لە ولاتانی ئەورووپاش نەهاتۆتەدی.

لەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە، ئەوەی پێیدەلێن کۆمەلناس و شیکردنەوە لەسەر کۆمەلگەی تازە و ڕووخسارەکانی ئەم کۆمەلگەیە دەدا پێویستە جەغت لەسەر ئەوەبکا کە ئەو گەشە زۆر و پەلە بەردەوامەی تەکنیك دەکەوێتە ئەستۆی زانا و ئەندازیار و توێژەرەوەکان و هەرئەوانیشن ڕێگای جۆراوجۆر لەبەردەم داهێنان و دۆزینەوە و خولقان دەکەنەوە واش لە ژیان دەکەن ئەم ئاڕاستەیە وەرگرێ. ئەو دەسەلاتەش کە خراوەتە بەردەست ئەم دەستەبژێرە شیاوێ زۆری بۆ مسۆگەرکردوون و کردووشوونی بە کودی تازەگەریەکان. ئەمانن کە لە پشت مانا تازەکانەوەن بۆ کات و شوێن و ڕەهەند یان بەلانیکەمەوە بەرامبەر بە دارمانی ویژدان و ڕەوشت بەپرسن، هەروەها ئەو کەسانەن کە وامانلێدەکەن ڕاستی بوونمان دیگیتالیزەکرێ و بان هەبوونمان ببێ بە ئونێڤێرسوم(گەردوون) ێ ئەلەکترۆنی و لەسەر شاشەی کۆمپیوتەر ببینینیەوە. کەواتە زۆر گرینگە لە ئامانجی ئەو داهێنان و خولقانانە بگەین کە زانیاریدۆستان و ئەندازیارانی زانستی نوێ پێیگەیشتوون. گومان لە مەبەست

و ویستی ئەم دەستەبژێرە ڕۆلی خۆی هەیە لە دیاریکردنی ئەو ئامانجانەی لە پشت گۆڕینی مانای ژیان و ماهیەتی بوونمانەوە هەیە. . هەروەها ئەو کۆمەلناسیەی پشت لە گومان لە گۆڕانکاریەکان دەکا ناتوانێ مانا بە توێژینەوەکانی بدا.

# گفتووگۆ لەتەك خۆدا
# وەکیتریش دواندنی "مرۆڤی تازە"

بۆ ئەوەی پاشەکیەك تایبەت بەم کتێبە بنووسین بە پێویستی دەزانین گفتووگۆیەك لەتەك خۆدا بەئەنجامبگەێنین. نووسینی ئەم گفتووگۆیەش بێمانادەبێ گەر لە چوارچێوەی ئەو ڕەهەند و ئاقارانە نەخولێتەوە کە خوێندنەوەی کاستێلس و نووسین لەبارەیەوە نەبووبێتە هۆی دروستبوونی هەندێ لە سێرکردن و ڕوانینەکانی.
گەردوونی ئەوڕۆ لە گشت شوێنێکەوە مرۆڤێ بۆ ژیان پەروەردەکا کە بەپێی گشت پێوانەکان تەنیا دەشێ ناوی "مرۆڤی تازەی" لێنرێ. ئەم مرۆڤە تازەیە کە زۆرنرین قسەکردن هەلدەگرێ و نێوەندە لر تێکڕای دیاردە و ڕووداوەکانیش، نووقمی بێ بەهایی و تەنگەتاوی و شادبینیێ بێ خەیالە. بەرەنگاربوونەوەی دزێوی و بێ ئەندێشەی و پووچئامێزی ئەم مرۆڤە و دەرخستنی ناخی کەچەند ناچووست و بێ مەغزایە هەر بەرەنگاربوونەوەێ ئێپستمۆلۆژیمان لێداواناکا بەلکو داوای ئەوەشمان لێدەکا کە گەڕانێ پەروەردەی (پێداگۆگی) و دەروونیش بەنێو هەبوونی ئەم مرۆڤەدا بکەین. بۆ ئەوەی ئەم لایەنەش بەدەستەوە بدەین بەپێویستی دەزانین لە خەوشی تەماشاکردن و تێگەیشتنەکانی "مرۆڤی تازە" بدوێین. ئەم مرۆڤەش، کە لەگەلێ بۆنەی تر باسمان لەسەری هێناوەتە پێشێ، ئەو بوونەوەرەیە کە بووە بە چەقی بەرهەمهێنان و بەکاربردنەکانیش. لێرەدا کە تەنێ خوێندنەوەێ پووخت و ڕاگوزاری بۆ دۆزی ئەم مرۆڤە دەکەین ئەوە لە بیرناکەین کە ئەم وەك بەرهەمی بیری تازە بەری بیرکردنەوەێ فەلسەفی بووە کە ئەمەش ئەو بیرە بوو لە مرۆڤ کە گشت نییە. بەلام ئایا ئەم بیرە لە مرۆڤ (یان خود) تێڕامانێ باو و بلاوبوو یان بیرێ بوو لە مرۆڤێ ناسراو یان مرۆڤی جوگرافیایێ دیاریکراو!. ئەمە وامانلێدەکا بەبێ ڕاڕای بلێین ئەم مرۆڤە هەر لەسەرەتاوە ڕێگای لەبەردەم ئەوەدا کردۆتەوە کە ببێ بە مرۆڤێ فەلسەفی و

دواتریش میراتی گشتی فەلسەفی ئەم مرۆڤەش بوو بە گەورەترین پالپشت بۆ ئەوەی ئەم مرۆڤەی ئەمڕۆی لێدەرچێ. بۆیشە ئاساییە باس لەوەبکەین ئەم مرۆڤە فەلسەفییە(کە بەخۆی مرۆڤی ڕۆژئاوایە) دۆزێ ئەوتۆی بۆ هاتە پێش کە ببێ بە مرۆڤێ گەردووناوی و بەخۆشی ئەوەندە کاری بۆ خودگەرایی خۆی کرد تا توانی وێنەێ نموونەیی بۆخۆی بکێشێ. ئەم وێنەیەش نە ئەوەتا لێیدەبێتەوە و نەئەوەتاش بەخۆی ئامادەیە دەستبەرداربێ. چجای بۆ ئەوانەش کە توانای کێشانی وێنەی خۆیانیان نەبووە کە ئەمەش بووە بە گرفتێ گەورە بۆ دروستبوونی لەیەکنەگەیشتن و لەیەکتر تێڕانەمان.

لە ئێستادا گەیشتن لەم مرۆڤە گەیشتنە لە نهێنیەکانی چاخی نوێ و ژیانی دوای تازەگەریی و دۆزینەوە مەزنەکان. چونکە مرۆڤی ناوبراو گەلێ قۆناغی جیاواز لە ئاشووب و شەڕ و نەهامەتی تێپەڕاندووە و تا گەیووەتە قۆناغێ کە زۆرترین و قوولترین دەسەلات و ئەزموونی تیا کۆکردۆتەوە. دەسەلاتێ جۆراوجۆری نادیار و بێ ڕەهەند و هەروەها ئەزموونێ تێکەلاو و قووتدرەتئامێز. بۆیە هەلە ناکەین گەر لەم مرۆڤە، مرۆڤی تازە، بپرسین کە چۆن لە چاخی نوێ دەگا کە چاخی خۆیەتی و دوا قەدەریەتی لەئەم ئێستادا؟ چۆن لەم چاخە دەگا کە بەری ئەندێشە و تێڕامانی خۆیەتی؟. دەشێ بەوە قایلبین ئەم چاخە وانەی ئەوەمان پێبلێتەوە کە ڕۆژانە دەبێ بێین و باس لە ڕووداو بکەین و دواتر ئەوانە بە ڕووداوهایەکی مێژوویش لەقەلەمبدەین؟. ئایا سەرهەلدانی دیاردەی جیهانگیری یان تیرۆریزم یان بوونی بوونەوەر بە یاریەك بەدەست تەکنیکی نوێوە دەکرێ وەك ڕووداوهایەکی مێژووی تەماشاکرێن کاتێ هەریەك لەمانە نەك هەر نەیانتوانیووە کێشەی بوونەوەر چارەسەرکەن بەلکو هەموو هەولدەدەن ئەم بوونەوەرە بەهەموو شێوەیەك بسڕنەوە و لەبڕی دیاردە و ڕووداو دروستکەن. جا دەشێ تۆ ئەی" مرۆڤی تازە " ئەمانە وەك وەچەرخاندنی مێژووی لە ژیانی بوونەوەر سێرکەی ؟ ئایا ئەمە ئەو عەدەمیەتە-هیچگەرایی- نوێیە نییە تۆ ئەی"مرۆڤی تازە"، لەگشت شوێنێ سەرقالی بە دروستکردنیەوە؟.

سەیرە تۆ ئەی"مرۆڤی تازە" باس لە هاتنی چاخێ نوێ دەکەی تۆ چی لە چاخێ دەکەی لەگشت شتێ شمەك(کالا) دروستدەکا، هەر لە ئەڤینداری و تیرۆریزم و سێکس و منال هەلگرتنەوە تادەگاتە ڕەگەز و ژیندەرگۆڕین و واتای خێزان و وانەکانی فەلسەفە لە زانگۆکان. بەدلنیایشەوە ناشێ ئەوە لەبیرکەی ئەی" مرۆڤی تازە" کە تۆ لەپشت هەموو ئەو بەشمەککردنانەوەیت

که مرۆڤایەتی پیایتێدەپەڕێ، که بەخۆتیش قوورباتی یەکەمی ئەم بەشمەککردنەیت. ئەوەی که تەنیا چەند جێیێ ببێ بە مۆلگەی ئازادی و دادپەروەری و ماف ئەمە بەخۆی گەورەترین سلکردنەوەیە لە گشت شتەکانت و باشترین هەوێنیشە بۆ دروستکردنی ناجێگیری و نایەکسانی لە گشت گەردووندا. یان چۆن دەکاری باس لە شێوازێ نوێی ژیان بکەی لەکاتێکدا کە لەگەڵێ ناوچە و جوگرافیا لەسەر پلانێتی (کەوکەبی) ئەمڕۆمان هەزاری مادی و مەعریفی تاکە فۆرمێکی ژیان و بژێوین.
بڕوانە تۆ ئەی "مرۆڤی تازە" چاخی نوێمان هەروەك چاخەکانی تر لەوەنەکەوتوە کە ئاین و ڕەگەز نەکا بە بناغە بۆ پۆلکردن و دەروازەیەك بۆ جیاکردنەوەی کەس و شوێن و شتەکان لەیەکتر. هەروەها کاتێ بەمەدەنیبوون و بەشارستانیبوون دەبێ بەخالی جیاکارە و ڕێسایەك بۆ ڕیزکردن و جوداکردنەوە بەمە بوونەوەر خۆی لەبەردەم زۆرترین هەڕەشە و گەورەترین ترسدا دەبینێتەوە. کاتێ گەشە و پێشکەوتن دەبن بە دیاردەهایەکی جوگرافی و ناوچەی و خەلکانێ زۆر قەدەریان وادەبێ کە لە ناوچە و شوێنێتر لەم جیهانە بێنەدونیا ئەمە کارێ وادەکا کە تۆ دەبی بە قوورباتی جوگرافیاش و ئینتیماتیش بۆ بەمەدەنیبوون و بەشارستانیبوون پێوەندی بەوەوەدەبێ کە بەرەچەلەك لە کوێ هاتوویتەتە دونیا. هەربۆیشە تائێستا پرسیاری "خەلکی کۆی؟" گەورەترین حەساسیەتی دروستکردووە و بۆ خەلکانێ زۆر بووە بەمایەی پەشێوی و دلگرانی. ئەمە ماهیەتی ئەو فرە(مولتی) کولتووریەیە کە تۆ پێوەی سەرقالی. تۆ لەبەرئەوەی لە دیاردەی گەمەی نێوان کولتوورەکان، لە نێوان یەك و لەناو خۆ، ناگەی بۆیە پێتوایە دیاردەی فرە کولتووری کێشەی دیاردە و ڕووداوە نوێکان چارەسەردەکا. ئەم تێگەیشتنانەت بەری ئەو پێکهاتە سیاسییە تازەیەیە کە بێمانای و ناتەباییەکانی لە دوانەییەکانی ناو زانیاریگەریەوە وەرگرتووە کە هەژاری و دەولەمەندی پێکەوە بەخێودەکا و بێ ئیشی و دەستکورتیشی کردووە بە بەشێ سەرەکی لە ژیانی ئابووری نوێی جیهان. ئەمەش تەمەنی ئازادی و مەدەنیەت، ئەوی تۆ گشت پلانێتی هەنووکەت پێوە سەرقالکردووە، کورتدەکەنەوە و دەشبن بە قوورباتی ئەو دوانەییانەی بەرهەمیان هێناوە. ئەم دوانەییانە کە کاریان ئەوەیە ناهاوتایی و پارادۆکس لەئاستێ گلۆبالدا پەروەردەکەن دەستبەرداری ئەوەش نابن کە شارستانی دابەش پێشکەوتوو و دواکەوتوو، مەدەنی و بەربەری نەکەن. ئەم دابەشکردنەش کە ڕۆژانە زەمینە بۆ ئاگایی مرۆڤی تازە دادەنێن گروند بۆ

ئەوەش دادەنێن کە شارستانی لەسەر بناغەی ڕەگەز و خوێن دروستکەن. بەلام ئەمانە لە ئاشووب و شەکەتی زێتر شتێ تریان لێبەرهەمنانێ. بۆیە ئەوانەی پێیان وایە جیهانگیری زانیاری ئازادی و ماف و سێستەمێ لە دادی تایبەتی لەناخی خۆیدا حەشارداوە، کە بوونیادێ تێکەلاو و ناکۆکیان هەیە، ناماقوولیاننەکردوە.
ئەوەتا ئەی"مرۆڤی تازە" بڕوانە چاخی نوێمان خستوومانیەتە بەردەم ڕیزێ لە واتا و چەمکەوە کە هەموو هەلگری پاشگر (لۆژی، یزم) و پێشگری (پۆست، میتا) تایبەتن و هەمووش باس لەوەدەکەن کە ئێمە لە چرکەی پایان و کۆتای دا دەژین و ئیدی پێویستمان بە تێڕامانێ زۆر و گومانێ بەردەوام نییە. هەموو ئەوانەش کە زەمینەی مەعریفی و فکری خۆیانیان لەناو هەندێ کولتوور و ترادیسیۆنی تایبەتدا هەیە لەدەرەوەی ژینگەی خۆیان هەست بە فوولترین نامۆیدەکەن. بەهەلەبەکاربردن و تێکەلکردنی واتا و چەمکەکان بەیەکتر بوونە بەگەورەترین کێشە لەبەردەم ئەو لێکدانەوانەی لەسەر هەنووکە دەکرێن و دەیانەوێ تیۆریزە بەسەر ڕووداوەکانەوە بکەن و چارەسەر بۆ کێشەکان بدۆزنەوە. هەرجارەی کەوتنە ژێر تەوژمێ فکری و ڕێبازێ فەلسەفی و ئەدەبی و یان هەولدان بۆ بەکاربردنێ تێکەلاوانەی شەپۆلە کۆمەلایەتی و ڕوناکبیریەکان نەك هەر کێشە لەبەردەم تێگەیشتن لە دیاردەکان و ڕوونکردنەوەی کارەساتەکان دروستدەکا بەلکو بەشداری لە بەهێزکردنی ئەو عەدەمیەتەش دەکا کە خۆت ئەی"مرۆڤی تازە" دووچاربیوویتە.
تۆش بۆ ئەوەی ئەم عەدەمیەتە نوێیە بگەێنیتە گشت کەس و شوێنێ دەبێ بەوەوە ببەسترێیتەوە کە جیهانێ لە میدیا دروستکەی و دەسەلاتێ واش بەردەستی نخەی کە سەرپەرشتی گشت پلانێتی ئەمڕۆ بکا. ئەویش بۆ هێشتنەوەی دەسەلات لە دەستخۆی قۆرخی گشت شتەکان دەکا و، ناو لە گشت شتێکمان بەوجۆرەی ئارەزووی لێیە دەنێ. دەبێ چ هیوایێ بەم دەسەلاتە تازەیە بکرێ و چۆن دەتوانێ ئەم دەسەلاتە کە بوونیادێ ئەلەکترۆنی هەیە باس لە گیرۆدەی و گرفتەکانی تۆ بکا ئەی "مرۆڤی تازە"!.
ئەمە چ چاخێکە دەستی لە دروستکردنی گالتەجاری هەیە هەر لە گاتەکردن بە جەستە و ئاکار و ویژدانەوە تادەگاتە شەهید و سێکس و واتای پرنسیپ. بۆئەوەی ئەم گالتەجاریەش مەیسەربێ دەبێ تۆ لە گشت شوێنێ درۆبکەی. درۆکردنیش بۆ تۆ مانادانە بە ژیان و ڕێگایەکە بۆ خولقانی ماهیەتێ تر بۆ بەهامرۆییەکان. تۆ نە لە هەندەران دەگیرسێیتەوە و نەش لە نیشتیمان. تۆ

تەنیا لەوشوێنە دەحەوێیتەوە کە باش و خۆش دەژیت. چونکە تۆ تەنێ بۆخۆت و بۆ ئەو چرکەیە دەژی کە تیایت.
تۆ ئەی"مرۆڤی تازە"لە وانەکانی سیاسەتی گلوبالەوە ئەوە فێردەبی تۆ بۆئەوەی وەك سیاسیێ نێودەولەتی تەماشاکرێ دەبێ زۆرترین و ترسناکترین درۆ بکەی. تۆ دەبێ هەر درۆبکەی تا ناسنامەێ سیاسی گلوبال نخەیتە بەرباخەلتەوە. تۆ درۆدەکەی دواتر ئەم درۆیانەت زۆرزانی و لێهاتووی دەدرێتەپال. تۆ بەمە دەبی بە قارەمانێ ناسیۆنالی و دوا باوکی نەتەوەیی. تۆ درۆدەکەی و تاپێتیشدەکرێ لەوی ووتووتە لێی پاشگەزدەبیتەوە و دواتریش خۆت وەك باشترین یاریزان نیشاندەدەی. تۆ ئەمەدەکەی تا ڕێگا لەبەردەم ئەوەدا بکەیتەوە کە ژیان لەسەر یادەوەریەکان، یادەوەری دەستەجەمعی یان گەلیی، بنایتبنێی و ئەو باوەڕەش لەنێوماندا بلاودەکەی کە ئەفسانە لەسەر ڕابردوومان دروستکەین و یادێ قارەمانئامێزانەش بوونیادبنێین. موخابن ئەمە ئەو ڕێگایە نییە کە دەبێ بۆ گەڕان وەدووی بنەچە و ڕیشەی شتەکان بگیرێتەبەر. ئەمە ئەو ڕێگایەیە کە سەرچاوە لە زانینی تازەوە هەلدەگرێ کە لە بێ ئەسالەتیدا نووقم بووە و هەروەها گشت هەولێکی ئەم زانینەش بۆئەوەیە کە هەموو بە نێتەوە گرێدا و نێتیش بکا بە ڕەچەلەکمان. لێرەوە نە کولتوور نە ئاین و نەش تۆ خۆت ئەو مانایەت دەبێ.
تۆ چاخی نوێ بۆئەوەی واتلێکا لە تێکەلاوی بژی دەبێ باوەڕت بە کولتوور نەمێنێ و تەماشای کولتووریش نەکەی وەك فاکتەێ بناغەی بۆ جیاکردنەوەی دیاردە سیاسی و کۆمەلایەتیەکان لەیەکتر. ئەم چاخە لەوەتیشدەخا ئارەزووی ڕونکردنەوەی کولتوور بکەی و توانای ئاوڕدانەوەتیش بۆ ڕابردوو هەبێ و، هەروەها باوەڕیش لە سەر ئایندە بوونیاد بنێی. بۆ" ئەو"- واتە چاخی زانیاری- زۆر گرینگە تۆ هەنووکەی بی و کڕیارێ باشی شمەکە ڕۆژانەییەکان بی و خۆت لە هەموو بەرپرسیاریەك بدزیتەوە.
تۆ ئەگەرچی دەزگاێ زانستی زۆر و بالات دروستکردوە بەلام چارێ ناتوانی چارسەری گونجاو و پەسەندکراو بۆ ناتەبایی و ناچووستیەکان بدۆزیتەوە. تۆ لەوە بەئاگانیت کە ئێپۆکی(سەردەم) زانیاری ئەمڕۆ بەرپرسە بەرامبەر بە ئاشووب و هەلوەشانەوەکان. ئەم زانیاریە نوێیە نایەوێ خۆی لە ڕوونکردنەوەی کەلەپوورە ئاینی و تیۆلۆژیەکان بدا و ئەوەمان بۆ یەکلابکاتەوە کە بوونمان لەبەردەم هەڕەشەی شێواندایە. یان تێکەلاو بوونمان بەو جۆرە بە زانست و زانین لە میحنەتەکانمانی زیادکردووە. تۆ ئەم دەزگا زانستیە بێ

بەزیی و نامیهرەبانەت دروستکردووە بەلام قسە لە بەخێوکردنی جەستە و هەقایەتەکانی ئەڤینداری و منالپارێزی دەکەی. بۆیە ڕەخنەگرتن لە بوونیادی سیاسی و کۆمەلایەتی هەمیشە دەبێ ببێ بە ئامانج ئەو گۆڕانکاریانەش کە چاخی تازە لەگەل خۆی هێناویەتی بەبێ لێکدانەوەی ئەو بوونیادە مەحالە تێگەیشتنی. ڕەخنە لەو بوونیادە ڕەخنەیە لە هەلەکانمان و ڕوونکردنەوەی مەغزای ئەو تازەگەریانەشە کە ئێمە ڕۆژانە پێیدەگەین.
چونکە تۆ ئەی "مرۆڤی تازە" بەهەلە لە کاری ڕەخنە گەیشتوویت و ماهیەتی غروری تۆ ئەو پاڕادیگمە زانیاریەیە کە وایلێکردوی گوێ بۆ هیچ شتێ تر هەلنەخەی. تۆ دەبێ لەگەل بوونی خێزانێ بەختیار بی کە ئەوەش لەسەر بناغەی یەکسانی لە خێزاندا دێتە دی بۆئەوەی ئەمەش بێتەدی ئەوا خێزان پێویستی بە بوونی خۆشەویستییە / واتە بەمانەوەی سۆز و ڕێزە لە خێزانا، نەك هەلوەشانەوەی خێزان و پەرتوبلاوکردنی ئەندامەکانی و کردنی هەریەکەیان بە شمەکێ لە بازاڕی ئازاد. تۆ چی لە یەکسانی دەکەی کە ببێ بە هەوێنی پووکانەوەی خێزان و خستنەسەرجادەی ئەندامەکانی بەناوی ئازادی تاکەکەس و بڕوابەخۆبوون. تۆ چۆن لە توونددوتیژی ئافرەت کەمدەکەیتەوە و ئافرەت بە پیاو یەکساندەکەی کاتێ کە تۆ نیازت لەم یەکسانیە کردنی ئافرەتە بە شمەکێ لە بازاڕ و یان بە کرێکارێ کە ڕۆژانە لە دوو شوێنی جیا کارکا تا بتوانێ ببێ بە کڕیارێ باش لە بازاڕی ئازاد. ئەوە چ یەکسانیەکە کە خێزان دوای ئەوەی لەسەر بناغەی خۆشەویستی بوونیاددەبێ، کە ڕەمزەکانی لە فلیمە پۆرنۆگرافیەکانی(خەلاعی) هۆلیودەوە وەردەگرێ، دوای کورترین ماوە هەلدەوەشێتەوە. هەلوەشانەوەکانیش ئەوەندە ئەهریمەنانە دەبن کە زۆرجار بەکوشتنی لایێ کۆتای دێ. ئەمە بەخۆی نەك هەر مانای نەمانی خۆشەویستییە بەلکو مانای نەمانی ڕەحم و بەزەیشە. تۆ دەزانی ڕۆژانە چەند خێزان لە کۆمەلگەی نێتۆرك لەبەر سەختی ژیان و نەبوونی خۆشەویستێ ڕاستەقینە هەلدەوەشێتەوە؟ تۆ دەزانی ڕۆژانە چەند منال لەدەرەوەی زەواج لەدایکدەبن و چەند کەس ترسیان لە پێکهێنانی خێزان هەیە و لە دروستکردنی منال سلدەکەنەوە ؟ بەلام تۆ دەزانی تازەگەریەکان ئەمەیان گۆڕیووە بە هەلگرتنەوەی منال لە ولاتانی هەژار و بێدەرامەت و یان بەخێوکردنی ئاژەل و جانەوەر لەناومال ؟ ئەمە ئاکامی تازەگەریەکانە کە" تۆ " دوای ئەوەی سەرنەکەوتی لەوەی لەگەل ژیندەر و ڕەگەزی خۆت هەلکەی دەتەوێ لەگەل مار و دوپشك و جرج لە مالێکا هەلکەی و ئەوە نیشاندەی کە تۆ توانای ئەلیفکردنی جانەوەرت

هەیە؟. بەمە تۆ سەرکەوتنت بەسەر سروشت گەورەترین گرفتی کولتووری بۆ دروستکردووی کە جارێ تۆ لەسەرەتاکەیدای. چونکە بێ کولتووری دابڕان و تەنیای و پوکانەوە دەگەیێنێ. بەلام تۆ هەموو ئەمانەت بە هێنانەکایەوەی کولتووری ئەلەکترۆنی چارەسەرکردووە کە پێتوایە دۆزینەوە گەورەکانت لەبواری گەیاندنی ئەلەکترۆنی بەختیاری و شادبینی دەخاتە ناو بوونەوە. نەخێر وانیە. چونکە ئەو کات نەك هەر کولتوور بگرە ڕەووشت و ویژدانیش دەبن بە بەشێ لە داهێنانە ئەلەکترۆنیەکان.
بۆیە ڕەخنەگرتن لە ڕەووشت دەبێ بە ڕەخنەگرتن لە بوونیادی زانستی و سیاسی و کۆمەلایەتی نوێ دەستپێبکا. ئەم ڕەخنەیە دەبێ ئاڕاستەی هەموو فۆڕمەکانی توونددوتیژی ببێتەوە نەك جێگۆڕکێیان پێبکا. هەر بۆنموونە ئازادکردنی ئافرەت بە دروستکردنی تەنیا یەکسانێ ئابووری و کۆمەلایەتی ئەبستراکت نایەتەدی بەلکو بەهێشتنەوەی خۆشەویستی و ڕێز و میهرەبانیش لەناو خێزاندا دێتەدی، هەر لەنێوان ژن(دایك) و مێرد(باوك) وە تادەگاتە ئەمان و منالەکان و بەپێچەوانەوەش. خێزانی یەکسان و ئازاد واتە خێزانێ کە ڕەحمئامێزە و نایەوێ تێگەیشتنەکانی بازاڕ بێتە ناو دەرزەکانی ناو مالەکەی. نایەوێ مالەکەی ببێ بە مالێ زانیاری و بۆرسەی بچووك. خێزانی بڕوابەخۆبوو ئەو خێزانەیە کە ئەندامەکانی توانای لێبووردنی لەیەکتر هەبێ و چارەسەری کێشەکانی بەجۆرێ دادئامێزانە بکا، کە پرنسیپی خێزان لەم حالەتەدا پاراستنی خۆشەویستی و ڕێز بێ لەناو خێزان نەك دروستکردنی پێوەندیێ ئابووری و هەروەها خێزان بکرێ بە کارگەیێ چکۆلە و هەریەك سەرقالبێ بەدروستکردنی پارچەیێ لە پارچەکانی ئەو ئارەزووە ڕۆژانەییانەی تەلەفزیۆن و پڕۆگرامە هیچگەراییەکان بناغەی بۆ دادەڕێژن. چونکە بەرنامە تەلەفزیۆنیەکان ناتوانن فێری ئەو دابوونەرێتانەمانکەن کە هەموو بەحەسرەتیەوەین. لەپێش هەموویانەوە مانەوەی ڕێز، نەك کۆیلایەتی، لەناو خێزان. ڕێز لەناو خێزان مانای گوێگرتنە لەیەکتر نەك بەگژیەکا چوونەوە و بناغەدانان بۆ پووکانەوە لەهەج چرکەیێ کە کەسەکانی ئارەزووی بکەن. بەلێ ئەمانە و تەنێ بەمجۆرە و بە هێشتنەوەی ڕێز و خورمەت لەناو خێزان، کە زانیاریگەری نایەوێ بیهێلێ و بە شتی کلاسیك و پاشکەوتووی دەزانێ، دەشێ خێزان بپارێزرێ. ئەم ووشانە(هەر لە خودی وشەی خێزانەوە تادەگاتە وشەی زەواج و ڕێز و حورمەت) و چەندین ووشەی تر، وەك شەرم و ئاکار و سۆز و میهر، کە لە ئاوابووندان، تەکنیکی نوێ دیگیتالیزەی کردووە و بە ووشە

ئەلەکترۆنیەکان بەلەجیاتی کردووە. تەکنیکی نوێ کە سیلەی ڕەحم دەکوژێ و بە نێت بەلەجیاتیدەکا و ئەمەش لەسەر ئاستی خێزان دەبێتە هۆی هەلوەشانەوەی پێوەندییە مرۆییەکان و ناشتنی ئەو گەرمییەی لە ژیانی خێزانی دا بەدیدەکرا. قسەکردن لەسەر مانەوەی بەزەی و ڕێز و سۆز لە خێزانا مانای داکۆکیکردن نییە لە ستەمی ناو خێزان و هێشتنەوەی توندوتیژی بەرامبەر بە منال و ئافرەت. نەخێر. بەلکو مانای پاراستنی ئەو ڕەکیزانەیە کە دەتوانن خێزان بەختیار و بێ کێشەکەن. کە کەسەکانی ناو خێزان لەمیانەی ئەو ڕەکیزانەوە بتوانن پردی پێکەوە مانەوە و یەکترخۆشویستن بپارێزن. ئەم پێکەوەبوون و یەکترویستنەش ڕیشەی باوکسالاری لەناو خێزانا بتەوناکا بەلکو دەتوێنێتەوە. ئەوەی بۆ لەمەولا هەڕەشەیە لەسەر خێزان ئەوا باوکسالاری نییە بەلکو ئەو ئابووریسالارییەیە کە دەست بەسەر خێزانا دەگرێ و گشت ئەندامەکانی بەخۆیەوە گرێدەدا و هەمووش دەبن بە هەلگری ڕەووشتی بازاڕ و ژێردەستەی جیهانگیری زانیاری. واتە دروستبوونی سالارێ نوێ کە ئەوەش نێتسالارییە.

هاتنەدونیای نێتسالاری Netokrati سەرووی گشت فۆڕمەکانی سالاریخوازییە و ترسناکترین بوونیادی کۆمەلایەتی و کولتووریش لەتەك خۆ دەهێنێ. ئەم نێتە کە جۆرێ تازەیە لە دەسەلاتی ئابوری و سیاسی پەیوەندی لەناو خێزان و لەناو مال دەگۆڕێتە پێوەندی لەگەل بەرهەمەکانی تەکنیکی نوێ (ڤیدیۆ، سیدی، مۆبێلتەلەفۆن، ئینتەرنێت). لەدەرەوەش خودی خێزان پێوەندی خۆی لەتەك مەکتەبی کار پەیداکردن و دائیرەی زەمان و مەکتەبی یارمەتی کۆمەلایەتی بەهێزدەکا. خێزان لە ئاکامی ئەمانە بەجۆرێ هەلدەوەشێتەوە کە هەریەکە لە ئەندامەکانی لەبەرئەوەی ئابوورێ تایبەتی خۆیان هەیە لە ژوورێ تەنیای بەزانیاریکراودا ژیان بەسەردەبەن. هەروەك لەسەرەوەش ئاماژەمان پێکرد ئەوی کە دەبێ ببێ بە ئامانج ئەوەیە کە چارەسەر بۆ کێشەکان بدۆزرێتەوە کە ئەمەش وەدووگەڕانێ زۆری دەوێ. چونکە هەلوەشانەوەی حێزان تەنیا بەمانای نەمانی باوکسالاری نائ بەلکو بەمانای پەرتبوونی خۆشەویستی ناو خێزان و بەقووربانیبوونی منال و دروستبوونی چەندین فۆڕم لە سالاریخوازیش دێ. هەربۆیشە ئەو تەوژمی فێمینیزمەی جیهانگیری زانیاری ئەمەریکی دروستیکردووە تەنیا هەولێکە بۆ دروستکردنی بەرامبەرگەرایی کە تیایا پیاو و ئافرەت هەریەکە خۆیان بە لایکی ناو ئەو یارییە دەزانن. واتە دروستبوونی یاریی ئافرەتگەرایی و پیاوگەرایی. ئەمە

ڕێگایەکە بۆ دروستکردنی دوژمنایەتی لەنێوان نێر و مێ کە تەنیا بەکەڵکی سێستەمی ئابووری زانیاری گلۆبال دەکەوێتەوە.
بۆیە "مرۆڤی تازە" تۆ چی لە دادپەروەریەك دەکەی لەسەر هەڵوەشانەوە و پووکانەوە دروستبێ. دادپەروەریەك کە لەسەر پرنسیپەکانی بازاڕی تازە بوونیاددەنرێ. دادپەروەریەك کە وەك گشت شمەکێ تر لەم بازاڕە بەهای هەیە و وێنەکانی لە گۆڕاندایە. بۆ تۆ دادپەروەری هەروەك ستەم قۆناغێکە لە گۆڕانی کۆمەلایەتی و گەشەی چرکەی سیاسی. تۆ دوای مێژوویێ قوول و درێژ بەوە گەیشتووی کە لە دادپەروەری و لە واتای داد و ماف دەگەی. بەلام موخابن ئێستاش تێگەیشتنت بۆ دادپەروەری هەر وەك تەماشاکردنی لەمەوبەرتە بۆ ستەم. تۆ واتلێکراوە و بەسەرتا فەرزکراوە دادپەروەر بی. بۆیە دادپەروەریەکەت هەمیشە وابەستەی ئارەزووەکانتە و تاوێ دادپەروەری و تاوێ ستەمکار، لەشوێنێ لەم جیهاتە لێوانلێوی لە دادپەروەری و شوێنێ تری ئەو جیهانە دەکەی بە دۆزەخی دادپەروەری. تۆ بێ ئەم دوانەیی و ناتەباییە لەتەك خۆتا ناژی. ئەوە بوونتە و ئەمجار هەقیقەتیشت. بۆیە ڕەخنەگرتن لە ڕەووشتی کۆمەلایەتی دەبێ بە ڕەخنەگرتن لە مانای دادپەروەری و گشت واتا هاوشانەکانی تری(وەك ماف، دیموکراسیەت، یەکسانی) دەستپێبکا. " تۆ" کە خۆت لە ڕەخنەی کولتووری دەدزیتەوە ناتوانی نە ڕەخنە لە ڕەوشتی کۆمەلایەتی بگری و نەش لە بوونیادە تازەکانی سیاسەت و ئابووری دەگەی. چونکە بە ڕەخنەگرتن لە کولتوور لە ڕەخنە لە گشت دیاردە ئابووری و کۆمەلایەتی و سیاسیە دزێوەکان نزدیکدەبیتەوە. بۆئەوەی لە گۆڕانکاریە تازەکانی کۆمەڵگەی نوێ بگەی، بۆئەوەی لە بەزمەکانی کۆمەڵگەی داخراو و دژەکەی(واتە کۆمەڵگەی کراوە) بگەی یان لە کۆمەڵگەی مەدەنی و دژەکەی بگەی(واتە کۆمەڵگەی زۆرداری) دەبێ تێگەیشتنت بۆ کولتوور هەبێ. تۆ ناتوانی لە کولتووری نوێ بگەی، کە بەرهەمی بەئەلەکترۆنیبوونی پەیوەندییە مرۆیەکان و گشت بەها کۆمەلایەتی و پرنسیپە سەرتایەکانی مرۆڤە، گەر لە سەرجەم کولتووری مرۆڤایەتی نەگەیشتوویێتی. تۆ چۆن دەتوانی باس لە تەبای کۆمەلایەتی و یەکسانی کولتووری بکەی کاتێ کە گالتە بە کولتوور دەکەی. کولتوور بریتی نییە لەوەی کە هەموو نەتەوەیەك دابونەریتی خۆی هەیە لە خواردن سازکردن یان شێوازی خۆی هەیە لە بەرگ پۆشین. تۆ کەی لە کولتوور گەیشتی ئەوکاتە لە جیوازیەکان دەگەی. ئەوکات لەوەدەگەی کە تۆ بۆ دەتەوێ کولتووری گشت پلانێتی ئەمرۆمان بکەی بەیەك جۆر لە کولتوور کە

ئەوەش بۆ تۆ کولتووری دیگیتالە. ئەو کولتوورەی هیچ پێوەندیەکی بە سۆز و وەفاداری و شەهامەتەوە نییە و، تەنیا پسپۆڕیْ مادیە و لایەنە ئابووریەکان ڕێکدەخا. دلنیابە ئەم کولتوورە نوێیەی تۆ ڕۆژانە بەدگومانێکی پڕ مەترسی لە گشت شوێنیْ دروستدەکا و، دەرگا لە میلینیۆمیْ دەکاتەوە کە بەبێجیاوازی بژین، کە وەدووی هەوەسەکانی خۆمان وێلبین لەهەر شوێنێك بن ئەم هەوەسانە لەسەر ئەم پلانێتە. ویستی ئێمە بۆ هەوەس و ئەوەی کە ویستی خۆمان سەرووی ویستی کەسانی تر دخەین ئەمە شتیْ چاوەڕێکراو بوو. ڕۆژانە ئەم کولتوورە دەمانخاتە ناو گەڕووی دیاردە و ڕووداوە گلوبالییەکانەوە. بەگلوبالبوونی دیاردە و ڕووداوەکانیشمان مانای ئەوە نییە ئێمە لەوە بەدوورین سەرلەنویْ پۆلنەکرێین.

بۆیە ئەی "مرۆڤی تازە" تۆ لە مانای ڕووداوەکان ناگەی و لە دۆزی هەنووکەی خۆتیش بەئاگانی. چونکە بوونی تۆ بە ئامرازیْ بۆ مانادان بە دیاردەکان و دروستکردنی پێناسەی پچڕپچڕ و کاتی بۆ کێشە و ڕووداوەکان نیشانەیە لەسەر بەهەلە تێگەیشتنەکانت و بوونت بە فاکتەریْ بۆ ڕوودانی ئەوانە. مانەوەی بەردەوامت لە نێوان دوو هێزی دژ بەیەك و ویستت بۆ زەوتکردنی گشت مانایەك تایبەت بەخۆت سەرچاوەی ئاشووبەکانن. تۆ بەمجۆرە تاکاری هیچ پێناسەیەك لەسەر مرۆیی خۆت و چالاکییە مرۆییەکان بدەی. ئەو کەلێنە دیگیتالیەش بەهۆی تەکنەلۆژیای بالاوە بوونیادنراوە پرۆسێسی کولتووری سەرووی نەتەوەی دروستکردووە کە کولتوور و نەتەوەکان دوور لەیەك تەماشادەکا. ئەم کەلێنە دۆزیْ دروستدەکا کولتوورە ئەفسووناویەکان دەرگا لەسەر خۆیان دادەخەن و نەیانەویْ بێنەدەریْ. ئەمە ترسیْ تازە نییە لە ژیانی کولتوورە جیاجیاکان. ئەم ترسە هەمیشە هەبووە و بەلام لەئەوڕۆدا و لەژێرسایەی جیهانگیری زانیاری و جیهانگیری توندڕەوی ئەم ترسە پتر ئالۆز و بەئەزموونتر خۆی دەردەخا و کاریْ واشیکردووە کە کولتوورە جیاکان و شارستانییە لێکنەچووەکان زۆرتر لە جاران حەساسیەت بکەوێتە نێوانیان و لەیەکدی بترسن و لەیەك بەگومانبن. بۆیە بیْ مانا نییە کاتیْ توندڕەوی لەگەل هەلکردنی بای جیهانگیری ئابووری دەیەویْ ببیْ بە کولتووریْ سیاسی و هەروەها وتاریْ سیاسی دژ بە وتاری سیاسی دیموکراسی.

بۆیە زۆربلێی نییە کە بمانەویْ بلێین یەکسانکردنی کولتوورەکان بەیەکتر داهێنانیْ هەرزانیەهای سێستەمی جیهانی نوێی لیبرالیزمی نوێیە. ئای لەم

گوزارمیه (واته سێستەمی جیهانی نوێی لیبرالیزمی نوێ) که بەخۆی پەتایّ سامناکی هەنووکەیە کە بەتازەترین شێوە ناتەبایی و ناچووستیەکان بەیاسایی و بەزانستیدەکا. چەند وورپایە لەوەی بتکا بە خەلکی ناوچەی کۆمەلگە داخراوەکان و نازناوی وەك نادیموکراسی و داخلەدل و بێ ئاگا لە پرنسیپە نوێکانی مافی مرۆڤت بداتە پال، ئەمەش بەتایبەت کاتێ کە دیتی کە تۆ هێنەر و کڕیارێ باشی شمەکە بێناوەرۆکەکانی کۆمەلگەی کراوە نیت، کە تۆ خۆت والاناکەی لەبەردەم بازاڕی تازەی سەردەم و، کە هەژاری ئابووری و مەعریفیت واتلێدەکا لە کولتووری بازاڕی نوێ نەگەی - واتە ئەوەی کە هەموو بەرێوەین ببین بە کالا و نرخێ بۆ خۆمان لە یەکێ لە بازاڕە کراوە جیهانیەکان بدۆزینەوە-، ئەوا تۆ ئەوسا زۆر ئاساییە وەك پاشکەوتوو و ناساغ تەماشاکرێی و داواتلێکرێ تەماشاکردنەکانت بگۆڕی. دروستکردنی وێنەی سادە لەسەر ئەویتر و هەروەها وێنەی ئالۆز لەسەر خۆ یارییەکی کۆنە و تۆ ئەی "مرۆڤی تازە" لە گشت کەسێ زیاتر پێیئاشنایت. کەواتە تۆ چی لە کولتوورێ دەکەی دۆران و بردنەوە لەیەك کات و پێکەوە وەك یەك پەروەردە دەکا. ئەم کولتوورە نایەوێ لە شوێنێ بگیرسێتەوە و بۆ لەمەولاش براوە و دۆڕاو جوگرافیایان بۆ نییە و بۆیان هەیە لەگەڵت شوێنێ سەوزبن. هەروەها تۆ چی لە کولتوورێ دەکەی بەتۆقانی ئەویتر بناغە بۆ خۆی دادەنێ. یان دەرگا لە هەزارینەیەك دەکاتەوە کە بە شەڕ خستنە نێو کولتوورەکان دەستپێدەکا. ئەمانە ڕیشەی توندڕەوی و ناتەبایی درێژدەکەن. بۆیە ئەوانەی پێیانوایە ناڕەوایی و نادادپەروەریەکان لە پشت دروستبوونی توند وتیژی و ستمەکانەوەن هەلەیان نەکرووە. لەو ڕۆژەوەی شەڕ بەناوی تیرۆریزمەوە سەریهەلداوە ڕادەی دەستکورتی و بێمالی لە زیادبووندایە. تەنانەت توندڕەویەش، بەهەموو شێوەکانیەوە، قۆڕمی جۆراوجۆری تری وەرگرتووە. تۆ بۆ ئەوەی لە بنەچەی بەرهەلستکاری و بەرەنگاربوونەوەکان بگەی دەبێ لەوەبگەی کە لە هەچ شوێنێ کەمدەرامەتی و نایەکسانی*لەدایکبێ لەوێ "ئەوانە" لە لوتکەدا دەبن. ئەوە دواکەوتن و هەژاری و نەخوێندەواری نییە کە لە پشت شێوانی ژینگەی ڕەوشتی جیهانەوەیە بەلکو ئەوە ئەو فەلسەفە ڕەوشتییە سوودگەراییە ڕەها و سینیستیەیە (بێ خەیال، بێ ئایندە) کە بوونمانی داگیرکردووە. بەدلنیایشەوە ئاماژە بۆ ئەوەدەکەین کە ئەم جۆرە سێرکردنانە بۆ ژیان و بوونمان ڕێمان نادەن بیر لەوەبکەینەوە کە پێیدەلێن بوونەوەر. کە تۆخۆت پێش گشت کەسێ لێوەرسی.

تۆ چۆن "جیهان لە شەڕ پاکدەکەیتەوە"(جیهان لە شەڕ پاکدەکەینەوە دەربڕینێکی سەرۆکی ئەمەریکی ئێستایە کە لەدوای ڕووداوەکانی یانزەی سێپتمبەرەوە بەکاریبرد) کە لە سەدا هەفتای ئەم جیهانە لەناو هەژاری و لەکەناری هەژاریدا دەژی. ئەمە ئەو ئەفسانە نالایق و بەدکارەیە کە نێتسالاری Netokrati لەگەل خۆی هێناویەتی کە وەکیتر بەرهەمی دۆزینەوە گەورەکانە و بەرهەمی فەلسەفەی ئابووریخوازیی نوێشە. ئەوە مایەی شەرمە کە چاخێکت بەنێوی زانیاری تایبەت بەخۆت داهێناوە کە دەتەوێ گشت پلانێت(کەوکەبی)ی ئەمڕۆی پێوەبگلێنی کەچی خەلکانێ زۆری ئەم پلانێتە شەوانە بەبرسێتی سەردەنێنەوە و پتر لە 300 سالیان دەوێ تا بە تۆ بگەن (لە توێژینەوەیەك کە پرۆفیسۆرێ بەناوی فرانسیسکۆ ڕۆدریگیس Francisco Rodrigues لە زانکۆی ماریلاند Maryland ئەنجامیداوە ئەوەی نیشانداوە کە ولاتانی جیهانی سێ پێویستیان بە سێ سەد سالە تا بەو ئاستە تەکنیکیەی ولاتانی پاش-پیشەسازیی بگەن). تۆ کۆمەلگەیەکت بۆ خۆت دابینکردووە کە تەنێ لەژێر زەبری ئەو گۆڕانە ئابوورییە بێڕەحمانە پێکدێ کە زانیاریگەریی بوونیادی داڕشتووە. ئەو گۆڕانەش کە ئەم نێتسالارییە لەسەر ئاستی نێودەولەتی دروستیکردووە بوونیادهایەکی کۆمەلایەتی ئەوتۆی لەتەك خۆدا هێناوە کە ناشایستەی و بێ ئەندێشەی لێدروستدەبێ. ئەگەر نا ئەی ئەوە چ زانین و زانیارییەکە لەوە بێدەنگدەبێ کە ڕۆژانە لە جیهانا نزدیکەی 800 ملیۆن کەس لەژێر زەبری بەدخۆراکی دا دەژین کە ئەمەش یەك لەسەری ژمارەی دانیشتوانی سەر زەوییە یان ئەو بەشە دەولەمەندەی جیهان لە سەدا 86 ی داهاتی نەتەوەی بەدەستەوەیە و لە سەدا 82 ی بازاڕی ناردنیشی مۆنۆپۆلکردووە.

هەر بۆیشە ئەی مرۆڤی تازە ئەوانە هەموو زەمینە بۆ دروستبونی خوورپە زیاددەکەن. لەژێرسایەی ئەو ناڕەوایی و بێ ئایندەییانە ڕێژەی خوورپەکان لە زیادبووندان. ڕۆژانە گەیاندنە نوێکان دەمانخەنە ناو گەڕووی خوورپەی نوێوە. گشت خوورپەیەکیش بۆ ئێمە قووربانیەکی ترە و سەرەتایەکە بۆ کەوتنە ناو جوگرافیایەکی نوێوە. ئەلبەتە ئەم جوگرفیایە ئەو جوگرافیایەیە کە واتای نوێی بۆ جێگا و کات، خاك و زێد، مالەوە و غەریبی، نیشتیمان و تاراوگە داڕشتووە. خوورپەکان هێندە پەلە و خێرا دێن و دەڕۆن ڕێ بەوە نادەن لەوە بگەین بیر لە چی دەکەینەوە / بکەینەوە یان چۆن بیرکەینەوە. چونکە ناوەڕۆکی خوورپەکان لەسەر ئەوە بەندن کە دەبێ ئێمە سادەبین و

لەوەگەڕێین ئیدی گومانبکەین بەلام زۆری مەبەستە ئەوەمان یادخاتەوە کە بوونمان/ ژیانمان لە گۆڕانە. ئەمەش، واتە ئەوەی کە ژیان لە گۆڕانە، بووە بە وێردی سەر زمان. خوورپەکان، تازەگەریەکانی چاخی نوێمان، لەڕادبەدەر باس لە گۆڕان دەکا، باس لەوەدەکا کە "ئێمە دەبێ بگۆڕێین". ئەمەش ئەو گوزارە جادوئامێزەیە کە بۆلەمەولا لێماننابێتەوە. چونکە ئەم جۆرە چاخەی بەڕێوەیە گشت نهێنیەکانی خۆی لە واتای گۆڕانا حەشارداوە. بۆ ئەم گۆڕان ماهیەتی بوونیەتی و بۆ ئێمەش ناشتنی ئەو پرنسیپانەن کە لەسەری پەروەردەکراوین. ئەو گۆڕانەی چاخی زانیاری بانگەشەی بۆ دەکا میکانیزمەکانی لە شێوازی بەرهەمهێنانی زانیاریگەرییەوە وەرگرتووە. ئەم شێوازەش دوا شمەکی شارستانی نوێیە کە پێیگەیووە. سەیری ئەم خوورپانەی بەهۆی زانیاریگەرییەوە دەیژێین ئەوەیە کە ڕێگای نوێی زۆر و شیاوی جۆراوجۆرمان لەبەردەمدا دەکەنەوە بەلام موخابن ئەم ڕێگا و شیاویانە هەر دەمانبەنەوە ناو خورپەکان، ناو تارمەیەکانی چاخی زانیاریەوە. ئێمەش وەك بوونەوەر هەمیشە لە مێژووی فەلسەفە و ژیانا ترسێکمان بەرامبەر بە خوورپەی گۆڕانەکان هەبووە. گشت چاخێکیش کە هاتووە پتر لایەنی خوورپەکانی گرتووە و زۆریش لە ترسەکانمانی فوولکردووە و بوونیشمانی گەلێ پەرت و بێ تخووب کردووە.

ئێمە لە ژێرسایەی خوورپەکان ئێستا پتر لە گشت کاتێ تر لەوانە بیردەکەینەوە کە هەمان شتە، یان بیری ئێمە لەئەمڕۆدا و لەژێر زەبری خوورپەی گۆڕانەکان و ترسیش لە گۆڕانەکان کەوتووینەتە ناو یاری بیرکردنەوە تەنێ لەوی ئامادەیە، لەوی لەبەردەمماندایە. واتە لەوی هەیە. ئەمە ئێستا تایبەتێتی بیرکردنەوەمانە لە هەنووکەمان. بیرکردنەوەکانمان لەسەر شێوەی زانیاری نوێ بوونیادنراوە کە ئەوەش بیری ئامادەیە. ئەمەش بیرێکە کە وەك پرۆگرامەکانی تەلەفزیۆن بۆمان ئامادەکراوە. بیری ئامادە وەك وەلامی ئامادەیە وایە کە بەرهەمی کولتووری زانیارییە. لێرەوە وەدووکەوتن پەکیدەکەوێ و وەکیتریش بە دەستەبژێرێکەوە تایبەتدەکرێ. تۆ کە بە کلیکێ زانینە نوێکان و دوا هەولت دەستگیربێ ئیدی ناخوازی وەدووی هیچ پرسیارێ بکەوی بۆ ئەوەی وەلام دروستکەی. چونکە خەزێنەی وەلامەکان ڕۆژانە پڕدەکرێن و بە ئامادەکراوی دەخرێنە بەردەستت. ئەمە تەنیا کێشەی ئێپستمۆلۆژیت بۆ دروستناکەن بەقەدئەوەی کە پێشوەخت کێشەی پێداگۆگی (پەروەردەیی) شت بۆ دێننەپێشەوە. هەروەها وەلامە ڕەها و دیارەکان کە

لەسەریان ژێرخانی فکری خۆت بوونیاددەنێ زۆر بە هێمنی پێتدەڵێن کە بیرکردنەوەکان بۆ لەمەولا دەکەونە دەرەوەی پرۆسێسەکانەوە. ئەم بیرکردنەوە ئامادانەش لەگەڵ شوێن دروستبوونە نەك کات. ئەگەر نا دەبا تۆ ئێستا لەناو جیاوازیەکانا گوزەرتکردبا، کە ئەوانەش (واتە جیاوازیەکان) لەگەڵ کاتدا دروستدەبن. بۆیشە ئێستا تۆ لە گشت کاتێ زیاتر بێ بەزیت بەرامبەر بە پێوەدی نێوان کات و شوێن. کە ئەمەش جەوهەری ڕاستەقینەی تۆ دەردەخا کە کێیت و دەتەوێ بوون بەرەو کوێ بەری. یان لێگەڕێ زانیاریخوازی بەرەو کوێی بەرێ.

# سەرچاوە و پەراوێزەکان:

1- بڕوانە بەرگی یەکەمی کارە سێ کوچکەیەکەی کاستێلس لە ژێرناوی (گەشەی کۆمەڵگەی نێتۆرك) کە لایخوارەوە ئاماژەی پێکراوە. ئەم بەرگی یەکەمەی چاخی زانیاریەی کاستێلس بۆ نووسینی دەروازەیەك بۆ بیری کۆمەڵناسی ناوبراو بەکاربراوە. هەروەها گفتووگۆکانیش بەگشتی هەر ئاڕاستەی ئەم بەرگی یەکەمە کراوە.

Manuel Castells, Informationsåldern.

Ekonomi, samhälle och kultur. Band 1: Nätverkssamhällets framväxt. Över: Gunnar Sandin. Daidalos. 1999.

2-George Soros, Den globala kapitalismens kris. Över: Stefan Lindgren. Norstedts. 1999, s 19.

3-Kevin Kelly, Nya ekonomin 10 strategier för en uppkopplad värld. Över: Karl G Fredriksson. Stockholm Timbro. 1999.

4- Christian Schade & Morten Steiniche, Virtual Reality. Över: Martin Högvall. Alfabeta. 1994, s 169.

5- ئاشکرایە داڤید هارڤی یەکێکە لە سەرچاوەکانی بیری کاستێلس سەبارەت بە گۆڕانی شوێن و گۆڕانی دۆزی کولتووریش. بۆیە بۆ زێتر بە ئاگابوون لە ڕەوتی شیکردنەوەکانی کاستێلس دەکرێ خوێنەر بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەم سەرچاوەیە.

David Harvey, The condition of postmodernity an entuiry into the origins of cultural change. Oxford Blackwell, 1989.

6- Ibid.

7-Peter Hall, Vårldsstäderna. Över: Jan Ivarsson. Aldus/Bonniers. 1966, s 10.

8- Jesper 69 Green & Sune Johansson, CyberWorld. Alfabeta. 1994.

9-Ibid.

10-Manuel Castells, ''Utvecklingsmöjligheter i informationsåldern'', Ord & Bild, 1999: 3. ss 51-62.

11-Ulf Karlström, '' En radskrivare för makten ،Clarte ،2000: 4 ،ss 21-25.

12- Niclas Östlind, ''Netopi'', Hjärnstorm, nr:71-72, ss 2-19.

13-K. Mikal, Borås Tidningen, Kultursidan, 1999-08-20.

14-Christian Schade & Marten Steiniche, Virtual Reality. Över: Martin Högvall. Alfabeta. 1994, s 9.

15-Ibid. , s 13.

16- Jan Baudrillard, Amerika. Över: Johan Öberg. Göteborg Korpen. 1990.

17- لەباسێ تایبەت بە بیری بیریاری فەڕەنسی ژان بۆدریار و بیری پۆست مۆدێرنیتێ ئەم لایەنەمان ڕوونکردۆتەوە. بڕوانە ئەم سەرچاوەیە:

ئازاد حەمە، بیری پۆست مۆدێرنیزم، بەشی یەکەم، چاپی سوید، 2001، لاپەڕە 241-260

18- Manuel Castells, ''Utvecklingsmöjligheter i informationsåldern '', Ord & Bild, 1999: 3. ss 51-55.

19-Manuel Castells, ''Framtiden är nu '', Ord & Bild, 1999: 3. ss 64-69.

20-Zygmunt Bauman, Auschwist och det moderna samhället. Över: Gustaf Gimdal och Rickard Gimdal. Daidalos. 1998, ss 21-26.

باومان لێرەدا (لە کتێبی ئۆشوێتز و کۆمەلگەی مۆدێرن) باسێ بە"" کۆمەلناسی لە پاش هۆلۆکۆست"" هوە تایبەتدەکا. لەوێرا ئەوە نیشان دەدا کە دیاردەی بەکۆمەلکوشتنی جوولەکان وایلێکردین باوەڕمان بە زانینی ڕۆژئاوا نەمێنێ.

21- Dagem, kultursidan, 20001801.

22- Jesper 69 Green & Sune Johansson, CyberWorld. Över: Jan Henrik. Alfabeta, . 1994.

23-Ibid.

24-Manuel Castells, Internetgalaxen: reflektioner om internet, ekonomi och samhälle. Över: Gunnar Sandin, 2002.

25-Nicklas Lundblad, '' Internetgalaxens geograf tror ännu på den nya ekonomin'', Svenska Dagbladet, kultursidan, 2002-01-04.

26-Anthony Giddens, Modernitetens följder. Studentlitteratur. Lund. 1996, ss. 103.

27- Moderna Tider, Bokrec, 1998::96, ss. 40-41.

28-Vision, kultursidan, 250301.

29-Ulrich Beck, Vad innebär globaliseringen?. Över:Joachim Retzleff. Daidalos. 1998, s 81.

30- Niclas Östlind, ' Netopi', Hjärnstorm, nr:71-72, ss 2-19.

31- بۆ ئەوەی خوێنەر پتر لەم ڕوەوە بەئاگابێ چاترە بگەڕێتەوە لای باومان کە لەم دوو کتێبەی لایخوارەوە

یەکەم : ئاوشوێتز و کۆمەڵگەی مۆدێرن، دووەم: مەرگ و نەمری لە کۆمەڵگەی مۆدێرندا) ئەوەمان بۆ ڕووندەکاتەوە کە چۆن کۆمەڵگەی مۆدێرنە بە زانستە تازەکەیەوە مەرگ و کوشتار پیرۆزدەکا:

-Zygmunt Bauman, Auschwist och det moderna samhället. Över: Gustaf Gimdal och Rickard Gimdal. Daidalos. 1998.

-Zygmunt Bauman, Döden och odödligheten i det moderna samhället. Daidalos. 1994.

32- لەم ڕوەوە بگەڕێوە سەر ئەو پەڕەگرافەی لەم بارەیەوە بەناوی (ڕۆلی هەلوەشانەوەگەریی دریدا لە تارمایی ناسی) لە کتێبی بیری پۆست مۆدێرنیزم دا نووسراوە:

ئازاد حەمە، بیری پۆست مۆدێرنیزم: بەشی یەکەم، چاپی سوید، 2001، لاپەڕە 356-355.

33- لێرەدا مەبەست ئەو تەوژمەیە کە سالانی هەشتاکان و نەوەتەکان لە فەرەنسا باوکرابوو لەسەر بەرپەچدانەوەی بیری مارکسیزم کە بەزۆری بیریارانی پۆست مۆدێرن تیایا سەرپشکبوون.

34-Thomas Brante, '' Ekonomismen inte bara ytlig utan farlig'', Svenska Dagbladet, 2001-09-18.

35- بۆزێتر ڕوونکردنەوە لەبارەی (چارەنووسی دیموکراسی لە ئەورووپا) بگەڕێرەوە لای تیۆریزەکەری سیاسی ئینگلیزی لاری سایندێنتۆپ و ئەم سەرچاوەیە:

-Larry Siedentop ، Democracy in Europa. London Allen Lane 2000.

36- لەچەند باسێ ئاوڕمان لەم لایەنە داوەتەوە. بۆنموونە بڕوانە ئەو باسەی بەنێوی( وونبوونی سیمیۆلۆژیا لە ڕەخنەی عەقل) لەم کتێبەی لایخوارەوە نووسراوە:

ئازاد حەمە، ڕەهەندی تێڕامان و جەستەی وتاری ڕۆشنبیری هاوچەرخ، چاپی سوید، 1995، لاپەڕە 233-231. هەروەها لە باسێ لەژێر ناوی (پایانی مێژوو/یان فۆناغی پۆست مێژوو) لەم کتێبەی لای خوارەوە:
ئازاد خەمە، بیری پۆست مۆدێرنیزم، بەشی یەکەم، چاپی سوید، 2001، لاپەڕە 121-118.

37-Henrik Bergquist, '' Historien är fortfarande slut '', Svenska Dagbladet 2001-12-04.

38-Björn Elmbrant, Hyperkapitalism. Atlas, 2001, s 9.

39- لە دیسەمبەری سالی 2000 دا کاستێلس لە شاری ستۆکۆلم لە ABF سمینارێکی لەبارەی "کۆمەلگەی نێتۆرك و ئابووری تازە "سازکردووە.

40- لەم سەرچاوەیەی(دیموکراسی ئەلەکترۆنی) لایخوارەوە نوسەر ئەیەوێ ئەوەمان نیشاندا کە گەشەی تەکنەلۆژیا لەتوانایدایە بناغە بۆ سیاسەتکردنێ تر دانێ:

Anders R Olsson, Elektronisk demokrati. Demokrati utredningens skrift. 1999: 16.

41- دەکرێ خوێنەر لەم بارەیەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە (ڕەهەندەکانی جیهانگیری) بگەڕێتەوە و بەتایبەت ئەو بەشەی لەبارەی "کۆمەلگەی جیهان و دیموکراسیەت " هومیە:

Håkan Thörn, Globaliseringens dimensionen: nationalstat, världssamhälle, demokrati och social rörelse. Atlas. . 2002.

42-Ulrich Beck, Vad innebär globaliseringen?. Daidalos. 1998 .s 102.

43-Ted Hounderich, After the terror. Edenburgh University Press. 2002.

44-Carl-Filip Bruck, '' Moralfilosofin till korta efter terrordåden'', Svenska Dagbladet, 2002-10-01.

45-, '' En tredje väg efter den 11 september'', Aftonbladet .2002-05-25.

46-Ibid.

47- Manuel Castells, '' Framtiden är nu'', Ord & Bild, 1999: 3, ss. 64-69.

48-Ibid.

49-Naomi Klien, No logo, no space, no choice, no jobs, no logo: märkea marknaden, motståndet. Ordfront, 2001.

50- Eva Bäckstedt, '' Klein vill se världen i tv '', Svenska Dagbladet, 2001-10- 22.

51-Neil Postman, Skolan och kulturarvet om vikten av att motverka massmedia i barnens liv. Bonniers. 1980.

52- بۆ ئەم مەبەستەش خوێنەر دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر کتێبەکەی بێك (جیهانگیری چییە؟) و باومان (جیهانگیری) و هەروەها کاستێلس (هەردوو بەرگی یەکەمی کێتێبەکەی چاخی زانیاری) کە لە شوێنی تر ئاماژەی پێکراوە .

53- Moderna Tider, Bokrec, 1998: 96.

54-Håkan Thörn, Globaliseringens dimensionen: nationalstat, världssamhälle, demokrati och social rörelse. Atlas. 2002.

55-Karl Steinick, '' Välkommen till nätverkssamhälle'', Helsingborg Dagbladet, 1999- 07-11.

56-Hans-Peter Martin & Harald Schumann, Globaliseringsfällan: Angreppet på demokrati och välfärd. Över: Joachim Retzlaff. Symposion. 1997, s 15.

57-Björn Elmbrant, Hyperkapitalism. Atlas. 2001.

58-Manuel Castells, Informationsåldern. Ekonomi, samhälle och kultur. Band 2: Identitetens makt. Över: Gunnar Sandin. Daidalos. 2000.

59-Martin Aagård, '' Globaliserings- Marx'', Falu Kuriren, 2001-08-27.

60-Thomas H Eriksen, Moderna Tider, 1998: 96.

61-Jasenko Selimovic, '' Det är nu vi väljer morgondagens Europa '', Göteborg- Posten ،2001-06-30.

62-Diana Mulinai, '' Nätet och masskulturen'', Arbetet ،2000- 08-26.

63-Håkan Thörn, '' Nationalstatens kris? '', Häften för Kritiska Studier, 2000: 4.

64-Giovanni Arrighi, Det långa 1900-talet. Om makt, pengar och kapitalets globalisering. Över : Gunnar Sandin. Daidalos. 1996.

هەر لەم بوارەشدا (واتە سەبارەت بە ڕۆلی کارگە مولتی ناسیۆنالیەکان و کۆنی ئابووری گلوبال) دەکرێ خوێنەری ئەم باسە بگەڕێتەوە لای ئیمانوێل والشتاین Immanuel einWallerst یش .

65-Fernand Braudel, Kapitalismens dynamik. Över: Gunnar Sandin. Gidlunds. 1988, s. 68.

66- Häkan Thörn, " Nationalstatens kris? ", Häften för Kritiska Studier, 2000: 4.
67-Ibid.
68-Jonas Ebbessen, " Castells utmanar rättens ikoner" ،Svenska Dagbladet, 2000-09-17.
69- Svenska Dagbladet ،1999-08-20.
70-Michael Lövgren, " Är det så världen ser ut? ", Hjärnstorm, nr: 71-72, s 20.
71-Lars Magnusson, " Vad är nytt i den nya ekonomin", Svenska Dagbladet ،2000-07-06.
72-Mikael Nyberg, " Tro inte på den mannen", Aftonbladet, 2000-12-18.
73-Mikael Nyberg, , Kultursidan, Falukuriren, 2001-08-01.
74-Håkan Arvidson, " Castells ger oss ett otolkat överflöd av data. ", Svenska Dagbladet, 2000-08-07.
75-Pierre Bourdieu, Kultur och Kritik. Daidalos. 1991, s 259.
76-Jurgen Habermas, Samhällsvetenskapernas logik. Daidalos. 1988, s 29.
77-Manuel Castells, " Framtiden är nu ", Ord & Bild, 1999: 3, ss. 64-69.

**بەرهەمەکانی تری نووسەر:**

1- ڕەهەندی تێڕامان و جەستەی وتاری ڕۆشنبیری هاوچەرخ، چاپی یەکەم، سوید، 1995.
2- فرمێسکەکانی ئیرۆس Eros/ سێ قەسیدە، چاپی یەکەم، سوید، 1995.
3- بیری پۆست مۆدێرنیزم - بەشی یەکەم -، چاپی یەکەم، سوید، 2001.
4- ئێتۆس لە دوورگەکانی شیعر، چاپی یەکەم، سوید، 2001.

In the last debate, I explain how in the Swedish media Castells looks like Marx or Weber and how his Sociology had a great impact on us, and on others anywhere in the world.
Last but not the least, most of the discourse is an important introduction to the landscape of social and cultural life in Information Technology. In this discourse, I also try to investigate, how the idea of Information Technology is being challenged and how the future of Knowledge looks like in Our New Age. However, it is very important to know, who owns the Information and the Net in Our World and how they use them?

In the most of discourse, I try to analyse the impact of the Net and its meaning in our world. At the same time, I would like to explain the role of the Other on the Net and the relationship between the Self and the Other in the Information Age. Because the Net has already changed how we think and has been quickly incorporated into the popular society and culture.

Azad Hama
Stockholm, 2003

Arabic or Islamic Societies must have their own Castells to analyse their Age, but I would like to point out that Western Societies must consider themselves very lucky to have a sociologist like Castells, who explains their Age. In this discourse, I would also like to ask Castells, why it is not clear whether the Third World societies think globally or locally? When can they produce their anti-globalization movements or social movements against the Network Civilizasation? Will their anti-globalization movements have any meaning for Our New Age? I asked the above questions because Castells thinks that social movements in the Information Age are essentially mobilized. Castells considers ecologists, feminists, religious fundamentalists, nationalists, and localists are the political subjects of the Information Age. I attempt in the third debate to talk about relationship between Our New Age and the phenomenon of Terrorism. Why Terrorism is one of the social movements against the Network Society? How Informationalism can be an end to Terrorism? In the same debate, I try metaphorically to talk about Kurdish nomadism, as A New Kurdish Human, and its impact on their being.

The fourth debate is a critical article on Castells's concepts of Informationalism and Globalization. I believe that Castells is the person, who has constituted a great theory about the Informationnalism and Globalization. However, I think that the Network Paradigm can not be enough to build a Society free from Poverty, Unequality and the global criminal economy. In this debate, I would like to make it clear how the Information Technology is changing our basic concepts about the existence, the self-governance, the subject and the civilization. In this debate, I also create a space for social and political discourse about the Globalization and the National-state. Moreover, I analyse how the political economy of Globalization produces an ambivalent rise in our world.

Technology does create a Virtual Reality, we must know that this reality does not exist anywhere. This discourse also on the one hand tries to show how the Informational capitalism puts us in an ambivalent rise and world. On the other hand this discourse clarifies how Informational Society produces its own culture and economy, and how the new technology has changed our view of the world.

In the second debate, I discuss the idea of how global is Our Age? How much of the Age is on the Net? I also explain the condition of the human being in the Information Age and try to find the Poverty (A New form of Poverty) in the Wealthy societies. The new war today, in the Network society, is between this form of Poverty and A New form of Wealth. I think, we must ask professor Castells, what is at the bottom line of that war? Is not the New Economy, as an Informational Economy, behind that war? I would like, for a reason or another, to criticize some of Castells's aspects about Western Network Societies. Furthermore, I analyse some of the socio-political situations in The Third World, but in this specific case; I would like to ask Castells, where are the Arabic-Islamic Societies placed in the Global Information Age ? Where are they heading? We must also know that the rise of the Fourth World does not mean that the Third World does not exist any longer. When we talk about the Self in the Network Society, we should ask Castells what about the Self in the societies of Third World?

The Third World societies have not had their own Technology Revolutions. I think they have not joined the Network Society. In other words, they are still outside the Computerisation Age. It should be noticed that The Information Age (Castells's book) may not be an important and comprehensive theory for the Third World societies (special the Arabic- Islamic Societies) because they are not a part of the Net. His theory is neither well known nor widely discussed in the Arab countries. Here, I do not mean that

Manuel Castells, born in Spain in 1942, is Professor of Sociology, and of City and Regional Planning at the University of California, Berkeley, where he was appointed in 1979, after teaching for 12 years at the University of Paris.

Mr. Castells has a global knowledge about this Age. His book is rich in information. In his book, he attempts to depict an accurate picture of Our New Age. The information Age is a great sociological and intellectuall work that shows, how we live in a moment of powerful change and confusion. In fact, Castells, as a global sociologist, thinks in a world of global flows of wealth, power and images, the search for identity- collective or individuel, ascribed or constructed – that becomes the fundamental source of social meaning.

In actuality, I think without the sociology of Manuel Castells, today's Sociology or the Sociology about Information Technology, is meaningless. I believe that Castells, in his trilogy, tried also to construct his own sociology about this age after a deep and comprehensive reading of the transformation of Our Age. In other words, Castells tried to produce thoughts about Our New Age that opened the door for many sociological and intellectual questions.

In the second chapter, when I debate with Castells; on the one hand I interpret the structure of the thoughts of Castells from the first volume (The Rise of the Network Society) and its style. Then I propose the consequences of his analyes. On the other hand, I try to criticize not only some of his understanding, but also I read critically others' understanding of Our Age. In this chapter, there is a discussion about a particular interest for the political, intellectuall and philosophical aspects.

In the first debate, I try to give a clear image of what kind of Age we live in. I also ask, how this Age can be acceptable if we do not know how the New World live with us and when Our Contemporary World can be realized. If Cyber Space

**Preface**

This book is the first book either in the exile or in Kurdistan about the Professor of Sociology Manuell Castells's thought and his sociological project about Our Age. I spent two years on writing this book. This book is a book about a book, which is an intense intruduction in Kurdish to Manuel Castells's thought from the first volume of his trilogy about "The Information Age". When I had read all the three volumes (more than 1,400 pages) of Manuel Castells, I thought it was very important to review the first volume of his trilogy.

Castells's book (The Information Age) is divided into three parts, which the publisher has wisely transformed into three volumes (The Rise of the Network Society, The Power of Identity and End of Millenuium). In the first volume (which I review) Castells tries to analyse the Net (see contents of this volume in this book), while in the second volume (The Power of Identity) analyses Communal Heavens (Identity and Meaning in the Network Society), The Other Face of the Earth(Social Movements against the New Global Order), The Greening of the Self (the Environmental Movements), The End of Patriarchalism (Social Movment, Family, and Sexuality in the Information Age), A powerless State?, Informational Politics and the Crisis of Democracy, and in the third volume (End of Millenuium) is attemptting to interpret The Crisis of Industrial Statism and the Collapse of the Soviet Union, The Rise of the Fourth World (Informational Capitalism, Poverty, and Social Exclusion), The Perverse Connection (the Global Criminal Economy), Development and Crisis in the Asian Pasific (Globalization and the State), The Unification of Europe (Globalization, Identity, and the Network State).

In the reality one of the main objects of the project of this book is the critical reading of The thought of Manuel Castells's. I would also like to have some discourse about his Sociology from the first volume of The Information Age.

## *Contents*